بەرگی یەکەم

# گەلاوەریوەکانی درەختی تەمەنم

## یاد و بیرەوەری

1950 - 1971

گوندی پاراو

حوسێن موحەممەد عەزیز

2719 ک - 2018 ز

# گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم

## ( یاد و بیرەوەری )

بەرگی یەکەم - چاپی دووەم

( 1950 – 1971 )

حوسێن موحەممەد عەزیز

2719 ک - 2018 ز

ISBN 91 – 975903 - 9

گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم ( یاد و بیرەوەری )

بەرگی یەکەم ( 1950 – 1971 )

چاپ: دووەم

دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز

بابەت: یاداشت

ساڵ: 2018

کوردستان، سولەیمانی

وێنەی بەرگ گوندی ( باراو )

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان، ژمارەی ( 1780 )ی ساڵی ( 2014 )ی پێدراوە.

# ئەم ژیننامەیە پێشکەشبێ بە

* ئەو دایکە بەسۆزە دڵسۆزەی، بە شیری سپی خاوێنی نێو کانیی مەمکەکانی بەخێوی کردم. بە ئەو دایکە کۆڵنەگرە بە پەرۆشەی، لە هەموو دایکێ پتر، بە دەسمانەوە تووشی چەرمەسەریی و کوێرەوەریی بوو. بە ئەو دایکە خۆڕاگرە ورە بەرزەی، ژان و ئازارێکی زۆری چێشت و خۆشی لە ژیانی خۆی نەدی. بە ئەو دایکە کۆڵنەدەرە سەربەرزەی، لە ئاستی ئەو هەموو ناخۆشی و چەرمەسەرییەدا، سەری بۆ هیچ کەسێ دانەنەواند و چەڵەمەکانی ژیان پشتی پێ کوڕ نەکرد. بە ئەو دایکە بیر تیژە ژیرەی، بە ورەی بەرزی خۆی، کۆسپ و تەگەرەکانی سەر ڕێی ژیانی تەختکرد و جەرگی تاریکی شەوی شەقکرد، بە خاتوو ( رەحمە شێخ حەسەن )ی خۆشەویستم!

* ئەو باوکە بەڕێزەی، گەورەی کردم و خوێندنی پێ تەواوکردم، تا لە ژیاندابوو، نەیهێشت، دەس لە کەس پانکەمەوە!

* ئەوەی نوێی کورد!

# ناوەڕۆك

بەشی چوارەم

* * *

# ئەم ژینەوەری و بیرەوەرییەم بۆ نووسی؟!

هەر لە منالییەوە، حەزم لە خوێندنەوە کردووە، بەڵام ئەوەی بیرم لێ نەکردبێتەوە، نووسین بووە. هەرچەندە زۆر حەزم لە نامەنووسین بووە، لەبەرئەوە زۆر بەدەگمەن ڕێککەوتووە، وەڵامی نامەیەکم نەدابێتەوە، یا دوامخستبێ. لە هەمان کاتیشدا، هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان، بیرم لە ئەوە نەکردووەتەوە، خۆشی و ناخۆشی، چیرۆکی ژیانی تایبەتی خۆم، ڕووداوەکانی دەوروبەرم تۆماربکەم و پێشکەشی بە هاوزمانەکانمی بکەم!

ئاشکرایە، تا تەمەنی مرۆ هەڵکشێ، ئەزموونەکانی ژیان، پتر کەڵەکەدەبێ و بەسەر یەکدیدا دەترشێن. بەڵام ئەورۆ لە ئەو بڕوایەدام، گەر یەکێ بەسەرهاتەکانی ژیانی تایبەتی خۆی و ڕووداوەکانی دەوروبەری وەک فیلمێکی سینەما، لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانیدا تۆماربکا، بۆئەوەی نەوەکانی داهاتووی نەتەوەکەی کەڵکی لێ وەرگرن، ئەوا تاوانێکی گەورە بەرانبەر خۆی و نەتەوەکەی دەکا. گەر ئەو بەسەرهات و ڕووداوانە، ڕووی ئێو خەڵکیان هەبێ و کەڵک بە کۆمەڵ بگەیەنێ! چونکە ئەو مرۆڤانەی بیرەوەرییەکانی خۆیان نانووسنەوە و دوای ئەوەی دەمرن، شتێ بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەیان بە دیاری بەجێ ناهێڵن. جگە لە ئەوەی چەن کەسانێکی هەژارن، لە هەمان کاتیشدا نیشانەی ئەوەیە، لە بوارە جیاجیاکانی ژیانیشیاندا، دەسڕەنگین نەبوون!

لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ برادەری نزیکی خۆم، لە مێژە داوایان لێ کردووم، ئەو زانیارییانەی سەبارەت بە هەردوو پارتی نەتەوەیی (کاژێک) و (پاسۆک) دەیانزانم، لە دووتوێی پەرتووکێکدا تۆماریانکەم و پێشکەشی بە خوێنەوارانی هێژای نەتەوەکەمی بکەم، تا ئەو شتانەی لە سەردەمێکی دیاریکراودا ئاگام لێیان بووە، بۆ هەمووانی ئاشکراکەم!

جگە لە ئەوەی خۆشم دەمەوێ، هێندێ لە ئەو نهێنییانەی لەنێو قووڵایی مێشکمدا کەڵەکەبوون و پاراستوومن، لای من ئاشکرا و لای خەڵکی شاراوەن، ڕاشکاوانە بۆ هەموو لایەکی ڕوونکەمەوە، تا هێندێ کەس لە ئەوە پتر، بە پێی بەرژەوەندی تایبەتی و بە ئارەزووی دڵی خۆیان، لە ئەم لا و ئەو لا باسیان نەکەن، خۆیانی پێوە بانەدەن و فرۆفیشالی پێوە نەکەن، لەسەر حیسابی ژیان و ماندووبوونی خەڵکی دیکە، ئەمنوکەوی بیرەوەرییە تەماویی و ئەنتیقییەکانی خۆیان نەکەن، ئەلاری بەرژەوەندییە تایبەتەکانی خۆشیانی پێ نەڕازێننەوە!

هێندێ جاریش هێندێ کەس هەن، زۆر بێ ویژدانانە، ڕۆڵی چەن کەسێ بە خراپ باسدەکەن و زیاد لە پەرەکەی خۆشیان، پێی لێ ڕادەکێشن، یا هێندێ ڕاستی لنگەوقووچ دەکەن. بۆیە پێویستە،

ئەوانەی تا ئێستە ماون، گەر هەڵەیەکیان لە ئەم نووسینەدا بینی، لێی بێدەنگ نەبن و بۆم ڕاستکەنەوە، گەر کەموکوڕییەکیشی تێدابوو، ئەوا دەتوانن، باسکی پیاوەتی و مەردایەتی لێ هەڵماڵن و تەواویکەن.

لە ڕاستیدا، ئەم کارە هەروا کارێکی ئاسان نییە، چونکە مێژووی هێندێ لە ڕووداوەکانم، بە تەواوی بیرنەماوە و کەسی واش شك نابەم، یا هەن و من دەسم پێیاندا ناگا، تا لێیان بپرسم. ئەوانەی کۆنیش نووسیوومن، ج لە دوای حەفتاکانی سەدەی ڕابوردووەوە بن، بە تایبەتی ئەو یاداشتانەی لە نێوان ساڵی (1974-1975)دا تۆمارمکردبوون، بە داخێکی گەورە و گرانەوە، هەموویان لەنێوچوون. ئەو زانیارییانەی لە ئەم دواییانەشدا، ڕۆژانە لای خۆم نووسیوومن، شتێکی ئەوتۆ نین، شایانی باسین و بڵاوکرێنەوە!

لەبەرئەوە نەمدەزانی، لە کوێوە دەسپێبکەم و چۆن کۆتاییپێبێنم، بەڵام دوای ئەوەی ساڵی (1987) خوێندنم لە (یەکێتی سۆڤێت) تەواوکرد و لە شاری (ستۆکهۆلم) گیرسامەوە، لەگەڵ ڕەوانشاد (ئازاد مستەفا) یەکمانگرتەوە، بۆ ئەوەی کارەکان بە شێوەیەکی ڕێکوپێك و ڕاست جێبەجێبکەین و هەموو شتەکان بمرینەوە سەریەك. پێشنیازمکرد، شتێ سەبارەت بە مێژووی (کاژێك) و (پاسۆك) بنووسین. لەبەرئەوە داوام لێ کرد، واز لە هەموو نووسینێکی دیکە بێنێ و دەس بە نووسینەوەی ئەو مێژووە بکا، کە خۆی پتر لە هەموو کەس، لە دوای ڕێککەوتننامەکەی (11 ی مارسی 1970) وە، ئاگای لێ بووە. ئەویش پێشنیازەکەی پێ باشبوو، یەکسەر بێ چەند و چوون قایلبوو. پاشان لەسەر سێ خاڵ ڕێککەوتین:

1. پێوەندی بە دوکتۆر (کوردۆ عەلی)یەوە بکەم، هەرچی دەکومێنتێکی (پاسۆك) و نامە تایبەتەکانی هاوبیر (ئازاد)ی لا هەیە، لێی وەرگرمەوە، بۆ ئەوەی لە نووسینەکەدا کەڵکیان لێ وەرگرێ.
2. بڕیارماندا، لە ئەو شوێنەوە دەسپێبکا، کە ڕۆژی (19- 03- 1979) چووەتەدەربوە، چونکە ئاگای لە زۆربەی ڕووداوەکان بوو. دوای ئەوەی ئەم زانیارییە پێویستانە دەنووسێتەوە، گەر نەخۆشی و مەرگ مەودای دا، ئەوا ئەوانی دیکەش تەواوکا. پاشان هەردووکیان پێکەوە کۆکەینەوە، بژاریانکەین و ڕێکوپێکیانکەین. گەر فریاش نەکەوت، ئەوا ئەم نووسینە لەبەردەستدا دەبێ، لە هەڵێکدا من ئەوانی دیکە تەواوکەم.
3. کاك (ئازاد) گوتی: من بابەتەکە دەنووسمەوە، دوو دانەی لەبەر دەگرمەوە، دەسخەتەکە لای خۆم هەڵدەگرم، کۆپیکانیش یەکێکیان لای (فەرهاد شاکەلی) دادەنێم و ئەوی دیکەشیان بۆ تۆ دەنێرم.

ئەوەبوو، هەر ئەو ڕۆژە نامەیەکم بۆ (کوردۆ عەلی) نووسی و داوای شتەکانم لێ کرد، بەڵام ئەو لەگەڵ کاک (ئازاد) تێکچووبوو، ڕکوکینە بەری چاو و دڵی گرتبوو، بە هیچ جۆرێ ئامادە نەبوو، هاوکاریبکا. پاشان من ڕەوانەی هۆردووگەی (گۆتلاند) کرام. لە ئەو ماوەیەدا، زووزوو تێلیفۆنم بۆ کاک (ئازاد) دەکرد، هێندێ جاریش بڵاوکراوە و نامەی بۆ دەناردم. لە نامەیەکدا بۆی نووسیبووم: (مژدەت دەدەمێ، وا دەسم بە نووسین کرد و ئەوەی تۆ داواتکرد. تا ئێستە نزیکەی سی لاپەڕەیەکم لێ تەواوکردووە.)

مانگی دەی ساڵی (1988) بوو، سەرێکم لە شاری (ستۆکهۆڵم) دا و سەردانی کاک (ئازاد) یشم کرد. تازە منداڵەکانی لە (ئێران) ەوە گەیشتبوون. ئەو ئیوەڕۆیە لە ماڵی ئەوان بووم. دوای نانخواردن، دەفتەرێکی خستە بەردەمم و گوتی: فەرموو. تا ئێستە هەر هێندە فریاکەوتووم، (43) لاپەڕەم لێ تەواوکردووە، بزانە چۆنە؟ منیش هێندێ لاپەڕەم لێ خوێندەوە و دەسخۆشانەم لێ کرد، دامەوە دەستی و گوتم: هیوادارم، بەردەوامبی و تەواویکەی. ئەویش گوتی: ڕەنگە لە ئەوە زیاتر نەتوانم، بەردەوامبم. زۆری پێ نەچوو، گەڕامەوە بۆ (کیشینیۆڤ) و نزیکەی ماوەی ساڵێ مامەوە.

ساڵی (1990) بە یەکجاری لە (سۆڤێت) گەڕامەوە و لە (ستۆکهۆڵم) جیگیربووم، بە داخەوە کاک (ئازاد)، گیانی پاکی بە بەهەشتی بەرین سپاردبوو. لە (بێستوون) ی کوڕیم پرسی: باوکت هیچی بۆ داناوم؟ گوتی: نەخێر. چەن جارێکیش خوالێخۆشبوو (کەریمی شێخ سەلام) م ڕاسپارد، ئەو نووسینەی بۆ منی داناوە، لێی وەرگرێ. دوا جاریش ڕۆژی (27- 03- 1991) بوو، کاک (کەریم) بۆ (کوردستان) دەگەڕایەوە، ئێمەش لە فڕگەی (ئەرلەندە) ی شاری (ستۆکهۆڵم) بەڕێمانئەکرد. لەبەردەمی خۆمدا بە (بێستوون) ی گوتەوە، هەرچەندە ئەو گوتی: باشە بەسەرچاو دەگەڕێم و بۆی دەهێنم، بەڵام هەر ئەو بەسەرچاوە بوو، ئیدی تا ئێستە هیچی بۆ نەهێناوم! کەمێ دواتر نازانم، کاک (موحەممەدی عەزیز) چۆن دەسیکەوتبوو، لە (ئەڵمان) ەوە بۆی ناردم.

دواتریش پەنام بۆ ڕەوانشاد (شێرکۆ بێکەس) برد، تا سەبارەت بە هێندێ لە بیر و چالاکییەکانی (کاژیک) پارمەتیمبدا، ئەوەبوو، چەن لاپەڕەیەکی کەمم نووسی و بۆم نارد، تا ڕای خۆی لەسەر دەربڕێ. ئەویش بە نامەیەک وەڵامیدامەوە و گەلێ تێبینی پڕ بایەخی بۆ نووسیبووم. منیش جارێکی دیکە بەسەرلەبەری بابەتەکەدا چوومەوە، شێوەی نووسین و داڕشتنی زمانەکەیم چاککرد. سەرروو کۆپیشم بۆ بەڕێزان (موحەممەدی عەزیز) و (کوردۆ عەلی) نارد. هەرچەندە تا ئێستەش دەستی یارمەتییان بۆ درێژ نەکردووم، بەڵام داوایان لێ کردم، جارێ بڵاوی نەکەمەوە و چاوەڕێ بکەم. دوای ڕاپەڕین لە (کوردستان)، چاوم بە هاوبیر (عیرفان عەبدوڵڵا) کەوت، کە هاوبیر و هاوڕێیەکی نزیکی (ئازاد مستەفا) بوو، داوام لێ کرد، یارمەتیمبدا، ئەویش ئامادەیی خۆی

دەریری، هەموو بەرهەم و بڵاوکراوەکانی ( پاسۆک )م بۆ بێنێ، بەڵام چەن جارێ دیمەوە و بیرمخستەوە، هەر دەیگوت: دەبێ، بۆیان بگەڕێم و بیاندۆزمەوە، زۆر لە ئەوە دەچێ، تا ئەوڕۆش هەر بۆی بگەڕێ، بۆیە هیچم لێ هەڵ نەکران!

هەڵبەتە گەر هەر کەسێ بیەوێ، کارێکی گرنگ بکا، یا کەسیش نەبێ، یا نەیەوێ، دەستی یارمەتی بۆ درێژکا، ئیدی نابێ، پەکی کارەکەی خۆی بخا و وازی لێ بێنێ، بەڵکوو دەبێ، سەرەتا لە خۆیەوە دەستپێبکا، دواییش کێ شانی دەداتەبەر و هەڵەکانی بۆ ڕاستدەکاتەوە، یا تەواویدەکا، ئەوا ماڵی ئاوابێ!

لە ڕاستیدا، سەرەتا دەمویست، باسێکی دووروودرێژ لەسەر ( کاژیک ) و ( پاسۆک ) بنووسم، لەبەر ڕۆشنایی نووسین و بڵاوکراوەکانیاندا، لە ڕووی تیۆریی و پراکتیکەوە هەڵیانسەنگێنم. بەڵام دوایی بە بڕیارەکەی خۆمدا چوومەوە و کردم بە دوو بەشەوە، بەشی یەکەم: تەنیا باسی ئەو زانیارییانە بکەم، کە خۆم لە نێوان ساڵەکانی ( 1970–1981 )دا، ئاگام لێیان بووە و لەگەڵ بیرەوەرییەکانی ژیانی تایبەتی خۆمدا تێکەڵیانکەم، چونکە لە یەکدی جیاناکرێنەوە. پاشان گەر توانام هەبوو، سەرقاڵییەکانی ژیان و مەرگ مەودایاندام، ئەوا بەشی دووەمیشیان تۆماردەکەم.

ئەوەی ئەوڕۆ لە هەموو کاتێک و لە هەموو شتێ پتر هانیدام، دەس بە نووسینەوەی ئەم بیرەوەرییانە بکەم، ئەوەیە یەکەم: داواکارییەکەی کاک ( ئازاد ) جێبەجێکەم، چونکە بەڵێنم داوەتێ، ئەو کارەبکەم. دووەم: کاتێ پەرتووکی (*دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد*)م خوێندەوە، سەرنجی بۆ چەن دێڕێ ڕاکێشام، کە ( *عەبدولخالق مەلایی* ) لە پێشەکییەکەیدا نووسیوویەتی: ( *خۆزیا* هەموو شاعیر و نووسەر و ئەدیبێکی ناوداری کورد سەربووردە و مێژووی ژیانی تایبەتی خۆی وەک (دڵدار) بۆ ئەوەی دواڕۆژ نووسیبا، بۆ ئەوەی ئاگادارییەکی ڕاست و تەواویان لەبارەی بەسەرهات و هەست و ئەست و ئاوات و ئارەزوویان هەبووایە .... بەڵام بەداخەوە زۆربەیان لەم بارەیەوە کەمتەرخەمیانکردووە ... ) ( ل10 ).

لێرەدا دەمەوێ، سەبارەت بە بیرەوەرییەکانم، هێندێ زانیاری ڕوونکەمەوە، یەکەمین جار لە نێوان ساڵانی ( 1996-1997 )دا، زۆر شتم بە دووروودرێژی نووسی، تا خوێنەری بەڕێز بە باشی، لە ڕێچکەی هەموو ڕووداوەکان ئاگاداربێ، کەچی ئەو سیدییەی لەسەرم تۆمارکردبوو، خراپ تێکچوو، هەر نەکرایەوە و نەکرایەوە. بەڵام باشبوو، هەموو نووسینەکەم ڕاکێشابوو، لەسەر کاغەز هەمبوو، لەبەرئەوە ناچاربووم، جارێکی دیکە بینووسمەوە، لە لەنێوچوون ڕزگاریکەم. ئاوبەئاویش، هەر بۆنەیە هەبووبێ، هێندێ یاداشتم تێهەڵکێشی بابەتەکان کردووە و تۆمارمکردوون.

بۆ نموونە: لە پەرتووکی ( شێرکۆ بێکەس، یاد و بیرەوەری، چاپی 1، 2013 ) و لە هێندێ گۆتاری دیکەی مێژووییشدا، ئەو کارەم کردووە و لە کاتی خۆشیدا ئاماژەیان پێدەکەم.

ئەم بیرەوەرییە، لە کۆمەڵێ بابەتی جیاوازی تێکەڵاوی نەتەوەیی، ڕامیاری، کۆمەڵایەتی و کەلتووری پێکهاتووە، بەپێی قۆناغەکانی تەمەن تۆمارمکردوون و دابەشمکردوون، چونکە هەر قۆناغێ لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆ، بیرەوەری تایبەتی خۆی هەیە و هیچیشیان لە هیچیان ناچن! هەروەها، هەموو قۆناغەکانی ژیانیش، تەنگوچەڵەمەی تایبەتی خۆیان هەیە، ئەو گرفتانەش لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنی مرۆدا گەورەدەبن و زیادەکەن، بۆیە، هەرچەندە تەمەنم بەرەو هەوراز هەڵکشابێ، ڕووداو و بەسەرهاتەکانی ژیانیشم، وردەوردە لەگەڵیاندا گەورەبوون و پێگەیشتوون، کە هەر یەکێ لە ئەو ڕووداوانەش، لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی ژیانمدا، ئاوێتەی یەکدی بوون و لێك جیاناکرێنەوە!

ئاخر، گەر تەنیا هەر بیرەوەری ڕامیاریم بنووسیایەتەوە، بە ئەم شێوەیە تێکەڵاوم نەکردایە، بیرەوەرییەکی زۆر ووشك و ڕەقوەتەقی لێ دەردەچوو، چونکە کاری ڕامیاری، ژیان ووشکدەکاتەوە، ڕەونەق و جوانی و بۆنوبەرامەی ناهێڵێ، وەك گوڵێکی نایلۆنی لێدێ! لەبەرئەوە حەزمکرد، چەپکێ گوڵی ڕازاوەی هەمەچەشنە، لە باخی ژیانی تایبەتی خۆم بچنم و پەرتووکخانەی کوردی پێ برازێنمەوە، تا ڕۆڵەکانی نەتەوەکەم، کەڵك لە هەر باسێکی جیاواز وەرگرن و چێژی لێ ببینن!

هەموو کاتێکیش پێم وابووە، هاوڕێیەکی باش دە خزمی خراپ دێنێ. لەبەرئەوە لە هەموو قۆناغەکانی ژیانمدا، بایەخێکی زۆرم بە هاوڕێکانم داوە، ناوەکانیانم تۆمارکردووە و یادم کردوونەتەوە. چونکە گەر خزمێ خراپبوو، وەك گوتی قۆڕ وایە، دەیبڕی، هەر وەی، نایبڕی، هەر وەی، هیچ چارێکی نییە و ناگۆڕدرێ! بەڵام گەر هاوڕێیەك خراپبوو، ئەوا مرۆ دەتوانێ، وازی لێ بێنێ و بە یەکێکی دیکەی باشتر، شوێنەکەی پڕکاتەوە، ڕەنگە هەموو یەکێکیشمان، لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانماندا، بە دەیان هاوڕێمان ترۆکردبێ، بە دەیانی دیکەشمان ناسیبێ و هەرگیز شوێنەکانیشیان چۆڵ نەبووبێ!

ئەم ژینەوەرییە، تەنیا هەر گێڕانەوەی ڕووت نییە، بەڵکوو هەوڵێکی زۆرم داوە، ڕووداوەکان شیکەمەوە و هۆکانی دەسنیشانکەم. بایەخێکی زۆریشم، بە باری کۆمەڵایەتی و دابونەریتی ئەو سەردەمانە داوە، کە لە قۆناغە جیاوازەکانی تەمەنمدا باوبوون. باسێکی وردی جوگرافیای ئەو شوێنانەم کردووە، کە لێی ژیاوم. هەروەها لە بابەتەکانی ڕەوشی ڕامیاری، باری ئابووری، ژیانی ڕۆژانەی کۆمەڵانی خەڵك، چۆنێتی ژیانی شار و لادێ، ڕووداوە گرنگەکانی ڕۆژانەی نەتەوەیی و ڕامیاری (کوردستان) دواوم، مێژوویەکی کورتی بزووتنەوەی کوردایەتی هەردوو شۆڕشی (11. 09. 1961) و (1976)ی نوێی گەلەکەمانم تۆمارکردووە، باسی ڕەوشی دووبەرەکی و جەنگی چەپەڵی نێوخۆی نێوان هەردوو باڵەکەی (جەلالیی) و (مەلایی)، چالاکییەکانی کورد لە (ئەورووپا)،

کۆبوونەوە، کۆنفرانس، کۆنگرەی نەتەوەیی و کارەساتە نەتەوەییەکانم کردووە. ڕووداوە سرووشتی و ناسرووشتییەکان، ئاستی زانست و زانیاری، خوێندن و خوێندەواری، شێوەی تەلارسازی خانووبەرە و نەخشەی نێو شارەکان، کشتوکاڵ، پیشەسازی نێوخۆ، ترادیسیۆنە ئایینییەکانم ڕوونکردووەتەوە. بە کوردییەکەی، وەک ئینسکلۆپیدیایەکی ئەو سەردەمانەی شاری (سولەیمانی) بە تایبەتی و پارێزگەکە بە گشتی وایە، تا خوێنەرانی بەڕێز بزانن، ئەو سەردەمانە چۆن بوون و کەسایەتی ئێمە چۆن دروستبووە!

هەروەها، زۆر بەدیزی و بەوردی، خەسڵەتە تایبەتییەکانی ئەندامانی بنەماڵەکەم و زۆر شتی وردی ژیانی خۆشم باسکردووە. ئێمەی بە ئەو شێوەیە، باسەکان و ڕووداوەکان، وردەوردە گەورە و فراوانبوون، سەراپای ساڵەکانی ژیانی تایبەتییمان گرتووەتەوە، هەموو شتێکیش هەر وا دروست دەبێ، وەک چۆن زەریاکان لە ئاوی کانیاو و چەم و ڕووبارەکان دروستدەبن، ژیانی مرۆش هەر وایە، لە کۆمەڵێ بابەتی بچووکی جیاجیاوە دەستپێدەکا و تابلۆی هەموو ساڵەکانی ژیانی دەرازێنێتەوە!

جگە لە ئەوەی لە ئەم بەرگەدا، لە ماوەی ئەم (21) ساڵەی تەمەن و بیرەوەری ژیانمدا، هەر کەس و بنەماڵەیەکم ناسیبێ و پێوەندیم لەگەڵیان هەبووبێ، یا هەر ڕووداوێکی گرنگم دیبێ و ئاگام لێی بووبێ، یازم بەسەردا ئەداون و تۆمارمکردوون! هەروەها، ئەو شتانەی بیرمبوون، زۆر بەوردی و دەسپاکییەوە نووسیوومن، لە لەنێوچوون و بیرچوونەوە قوتارمکردوون. جا بۆئەوەی هەڵەکانی خۆمان چاك بزانین و ئەوەکانی داهاتووشمان کەڵکی لێ وەرگرن، ڕووداوەکان چۆن بوون، هەر دەبێ، بە ئەو شێوەیە بنووسرێنەوە. چونکە ئەوە مێژووە و مێژووش دەبێ، بەڕاستی و بێ ڕووتووشکردن تۆمارکرێ، هیچ جۆرە حسابێکیش بۆ کەس نەکرێ!

گەر لە ئەم یاداشتەدا، ناوی هێندێ کەسم هێنابێ و بە ئەو ناوهێنانەش زوویربن، هەرگیز مەبەستم ئەوە نەبووە، بە خراپە باسی کەس بکەم و پێشەکی داوای لێبووردنیان لێ دەکەم، چونکە هیچ چارەیەکی دیکەم نەبووە و دەبووایە، هەر ناوم بێنابایە. لە هەمان کاتیشدا، گەر هێندێ شتیشم باس نەکردبێ، یا ناوی چەن کەسێکم نەهێنابێ، ئەوا دیارە بایەخم پێ نەداون!

هیوادارم، خوێنەرانی هێژای نەتەوەکەم، تاموچێژێکی تایبەتی، لە خوێندنەوەی بیرەوەرییەکانم وەرگرن و کەڵکیشیان بۆ ئەوەکانی داهاتوو هەبێ. لە هەمان کاتیشدا، سەرەتای هەوڵدانێ بێ، تا نووسەرە نەتەوەییەکانی دیکە، ئەوەی من نەمزانیوە و نەمنووسیوە، ئەوەی ئەوان دەیزانن و بیریانە، تۆماریکەن و لەگەڵ خۆیان گۆڕی نەکەن! چونکە ئەز لە ئەو باوەڕەدام، ئەو کوردەی شتێکی باش بزانێ و هاونیشتمانەکانی خۆی فێرنەکا، یا زانیارییەکی بەکەڵکی مێژوویی لابێ و

نەیەوێ، بینووسێتەوە. یا هێندێ لە گرێکوێرەی نهێنییەکان نەکاتەوە و نەیەوێ، تەلیسمەکان بشکێنێ، مرۆڤێکی ترسنۆکە و خاتروخۆتر تێدەخوێنێتەوە، یا نایەوێ، ڕازی نەتەوەکەی خۆی بکا. کە لە هەموو بارێکدا، بە چاک ناونابرێن! چونکە دوو جۆر خەڵك بیرەوەرییەکانی خۆیان نانووسنەوە، گەر بیرەوەرییان هەبێ! یەکەمیان: ئەوانەی هیچ باوەڕێکیان بە ژیان نییە و تووشی ڕەشبینی دەبن. دووەمیشیان: ئەوانەی سەریان لە کاروبارەکانی ژیان دەرناچێ و بایەخی پێ نادەن!

هەر ئەوە ماوە، بڵێم: کاتێ ئەم بیرەوەرییانەم تۆمارکردووە، لە هێندێ شوێندا، پڕ بە دڵ پێکەنیوم. لە هێندێ شوێنی دیکەشدا، دڵم پڕبووە و تنۆکتنۆکە فرمێسك، بە چاوانمدا هاتوونەتە خوارەوە. لە یادی هەر بیرەوەرییەکی خۆشیشدا، سەرچۆپی شادیم گرتووە، لە کەندەڵانی هەر دێڕێکی دیکەی ناخۆشیشدا، جۆگەی فرمێسکم هەڵبەستووە. بەڵام، تازە هەموویان بە خۆش و ناخۆشەوە، بە تاڵ و شیرینەوە ڕۆیشتن. ژیان ئەوەیە کە دیومانە و ئەوڕۆ هەیە، میلی کاتژمێری تەمەنیش، هەرگیز بۆ دواوە ناگەڕێتەوە و درەنگ یا زوو بێ، خۆشمان دەڕۆین! گرنگ ئەوەیە، مرۆ ناپاکی لە ڕۆڵەکانی نەتەوە و خاکی نیشتمانەکەی خۆی نەکا، بەگوێرەی توانا، ئەرکە نەتەوەیی و نیشتمانییەکانی سەرشانی خۆی، وەك پێویست و بە باشی جێبەجێکا، لاپەڕەکانی دەفتەری ژیانی خاوێن و ویژدانیشی ئاسوودە بێ!

ئاشکرایە، لە ناخی هەموو مرۆڤێکیشدا، سندووقێکی ڕەش تێدا هەیە، هەموو نهێنییەکانی ژیانی خۆی تێدا کۆکردووەتەوە. جا گەر یەکێ بیەوێ، کەسایەتی هەر مرۆڤێ بزانێ، گرنگ ئەوەیە، دەستی بە ئەو سندووقە بگا و بیکاتەوە، تا نهێنییەکانی بزانێ. بەڵام باشتر وایە، هەموو کەسێ، پێش ئەوەی ماڵاوایی لە ژیان بکا، خۆی سەری سندووقەکە هەڵداتەوە و نهێنییەکانی ژیانی خۆی، بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ئاشکراکا!

لە کۆتاییشدا دەڵێم: ئەز ئەوەندەی هەم، لە ژیانی ڕامیاری خۆمدا، نە پێویستم بە ئەوەبووە، درۆ بۆ کەس بکەم، نە لە کەسیش ترساوم. لەبەرئەوە، ئەوەندەی لە ساڵی (1981)ەوە، وڵاتەکەمم بەجێهێشتووە و تا ساڵی (2005)، بە یەکجاری گەڕاومەتەوە، ئەندامی هیچ پارتێکی کوردی و (کوردستانیی) نەبووم و ئێستەش ئەندام نیم. لەبەرئەوەی خۆم لە ئەوە بە کوردتر و دڵسۆزتر دەزانم، ئەوڕۆ ئەندامی پارتێکی ڕامیاری دیاریکراو بم! خۆم لە ئەوە بە خاوێنتر و گەورەتر دادەنێم، لەگەڵ ناپاکەکانی کوردا، لە ڕیزەکانی پارتێکی (کوردستانیی)دا کاربکەم! چونکە تا ئێستە، هیچ پەڵەیەکی خراپی دەسپیسی، تاڵانکردن، ناودیوکردن، پێهەڵوێستی، مەراییکردن بۆ سەرکردە و پارتەکان، ئازاردانی خەڵك، پیاوکوشتن، بەشداربوون لە جەنگی چەپەڵی نێوخۆدا،

تەوێڵی ڕەش نەکردووم، وەک قوڕوچڵپاوی زستانیش، چۆن دەرلنگی شرواڵی هەموو کەسێ پیس دەکا، دەرلنگی منی پیس نەکردووە! لەبەرئەوە باکم بە هیچ کەس و لایەنێ نییە، چی دەڵێن، با بڵێن، ئەوەندەی هەشم، دەسم لە کەس پان نەکردووەتەوە!

بۆیە، نە خۆم لە هیچ کوردێکی خاوێن و نیشتمانپەروەر بە بچووکتر دەزانم، نە خۆشم لە هیچ کوردێکی دڵسۆز و بە ئەمەک بۆ خاک و نەتەوەکەی، بە گەورەتر دادەنێم، هەرچەندە ئەو کوردە مەردەش گەورەبێ، پلەوپایەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا دیاربێ، دەسەڵاتی لەنێو پارت و میریی هەرێمیشدا بەرزبێ! چونکە لە هەر شوێنێ بووبم، ئەوەی تا ئێستە پێم کرابێ، دریغیم نەکردووە!

هەر لەبەرئەوەش، هەمیشە دروشمی سەرەکیم ئەوەبووە، دەترسی، مەنووسە، دەنووسی، مەترسە! گەر دەتەوێ، سەرکەوتووبی، دڵی هەموو کەسێ ڕامەگرە! گەر وابی، مرۆڤێکی ترسنۆک و هەلپەرست دەبی! لەبەرئەوە، باوەڕم بە هەر شتێ بووبێ، زۆر بە کوڵودڵەوە کارم بۆ کردووە و نووسیووسمە، گوێشم لە سرتەوبۆڵەی هیچ کەس و لایەنێ نەگرتووە، چونکە نەتەوەکەم، لە هەموو ئەوانە بە گەورەتر زانیوە، بەرژەوەندی باڵای بزووتنەوەی کوردایەتیشم، لەسەروو هەموو شتێکی دیکەوە داناوە، هەڵوێست و کار و کردەوەکانم، نووسین و گوتە و چاوپێکەوتنەکانیشم، گەواهی ئەوەم بۆ دەدەن، تا چەند خۆم بە کورد و (کوردستانیی) زانیوە!

لێرەدا هەر ئەوە ماوە، زۆر سوپاسی بەڕێز مامۆستا (شێخ عومەر شێخ مارف بەرزنجی) هاوڕێم بکەم، کە دەستی یارمەتی بۆ درێژکردم، هێندێ زانیاری و دیکۆمێنتی دامێ، هیوادارم، سەرکەوتوو و تەمەن درێژ بێ!

دوکتۆر حوسێن موحەممەد عەزیز

سولەیمانی

2018 .09 .11

تێبینی

لە ئەم چاپە نوێیەدا، بە سەرلەبەری بەرهەمەکەدا چوومەتەوە، هەموو هەڵەکانی ڕێنووس و زمانەوانیم چاککردووە، هێندێ بابەتی کورتی نوێ و وێنەی دیکەشم بۆ زیادکردووە.

**کورتە باسێکی گوندی (باراو) و (باراوی) یەکان**

هەر لە کۆنەوە، (باراوی) یەکان لە گوندی (باراو)ی نێوچەی (شارباژێڕ) نیشتەجێبوون. شێخانی (باراو)، لە نەوەی (پیرخدری شاهۆ)ن. (شێخ مارف نۆدێیی: 1752– 1838 ز.)، نزیکەی (200) ساڵ لەمەوبەر، درەختی بنەماڵەی (باراوی) یەکانی مۆرکردووە و مۆڵەتی بە (4) شێخ داوە، ڕێنمایی موسوڵمانان بکەن و لەسەر دەستی ئەوانیشدا (تۆبە)بکەن. (نالی: 1797–1855) هۆنەر، سەبارەت بە شێخانی (باراو) فەرموویەتی:

*کە جێگەت بۆ عیبادەت بێ، چ قەوقاسی، چ تەحتانی*

*کە جووت بۆ عیبادەت بێ، چ (بەرزنجیی)، چ (باراویی)*

*مەگە دەعوای پاکیی نەسەب، بۆ جیفەیی دونیایی*

*کە مەنیلە بێ، چ (بەرزنجیی)، چ (پیریایی)، چ (باراویی)*

گوندی (باراو)، هەمووی نیوکاژێر لە شاری (سولەیمانی)ەوە دوورە، لە نێوان گوندی (چنگیان) و شارۆکەی (بەرزنجە) دایە. لە گوندەکانی (وەنەرێنە، شوکێ و حاجی مامەند)ەوە نزیکە. لە نێوچەیەکی سەختدا هەڵکەوتووە، بە زنجیرە چیاکانی (پانتاو، بازگە، قەڵای سالم، کورەکاژاو و کورەکەچەڵ) دەورەدراوە، دیمەنێکی گەلێ جوانی پێ بەخشیوە. زستانانی سارد و هاوینانیشی فێنکە. زستانان هێندە بەفربەبارێ، هێندێ جار ڕێ دەگیرێ و هاتوچۆی ترومبیلیش نامێنێ!

سەبارەت بە ناوی (باراو)، دوو بۆچوون هەیە، هەردووکیشیان پێوەندییان بە ئاوەوە هەیە و لە یەکدیشەوە نزیکن. یەکەمیان: لە (بەهارەئاو)ەوە هاتووە، چونکە لە بەهاراندا، ئاوی کانییەکان دەتەقنەوە، لەگەڵ بەفراوی چیاکاندا تێکەڵدەبن، ئاوێکی زۆر سازگار و ساردی هەیە. ئیدی وردەوردە گۆڕاوە و بووە بە (بەهاراو) پاشان (باراو).

دووەمیشیان: لە هاوینانـدا ئاوی کەمبووە، بە بار ئاویان هێناوە. سەرەتا (بارەئاو) بووە، پاشان گۆڕاوە و بووە بە (باراو). بەڵام یەکەمین بۆچوون، پتر بە دڵەوە دەنووسێ!

(باراو)، زەوی کشتوکاڵی زۆر نییە و زۆربەشیان دێمن، لەبەرئەوە باخی بەرداریان زۆرە. خەڵکی ئاوایی، سەرەڕێ و قەدپاڵی شاخەکانیان، بە ڕەز و باخ ڕازاندووەتەوە. ساڵانە میوەیەکی زۆری وەک (ترێ، هەرمێ، هەڵووژە و قەیسی)یان هەیە. سەوزەیان کەمە، چونکە ئاویان نییە. لە کۆندا (نیسک، نۆک، گەنم و جۆ)شیان چاندووە، بەڵام ئێستە

ئاپچێتن. هێندێ خێزانیش هەن، ئاژەڵ بەخێودەکەن و بەشی پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دەکا. هەروەها، چیاکانیش بە دارستانی سرووشتی داپۆشراون، دیمەنێکی دڵفرێنیان هەیە. (دارچواڵە، بەڕوو، دارەبەند و گوێزێکی زۆریشی لێ دەڕوێ، بە تایبەتی گوێزیان هێندە زۆرە، بەشی ئاژەڵەکانیشیان دەکا!

گوندی (باراو)، دوو جار ڕوخێنراوە. بەڵام ساڵی (1987)، بە تەواوی چۆڵکراوە. پێش ئەوەی گوندەکە وێرانکرێ، ژمارەی دانیشتووانی نزیکەی (70) خێزان دەبوو. دوای ڕاپەڕینیش، وردەوردە خەڵکی ئاوایی گەڕاونەتەوە، ئێستە دەوروبەری (30) خێزانێکی لێ دەژی. هاوینانیش، هێندێکی دیکە دەگەڕێنەوە، ڕەزای باخ و ڕەزەکانیان دەکەن. ئەوڕۆ (باراوی) یەکان، بە هێندێ ناوچەی جیهاندا بڵاوبوونەتەوە، زۆربەیان لە شارەکان و دەرەوەی وڵات دەژین. تێکڕا ژمارەی (باراوی) یەکان، لە (3) هەزار کەس پترەبن.

ئێستە گوندەکە ئاوەدانبووەتەوە. هەر لە (سولەیمانی)یەوە تا نێو (باراو)، ڕێگەکەی قیرتاوکراوە. پرۆژەیەکی ئاوی تێدا هەیە. کارەبای بۆ ڕاکێشراوە. قوتابخانەیەکی شەشپۆلی سەرەتایی و نەخۆشخانەیەکی چکۆلانەشی تێدا کراوەتەوە. بە کۆمەکی خێرخوازان و لێپرسراوانی پارتەکانیش، ساڵی (2012–2013)، مزگەوتێکی نوێی دوونهۆمی لێ دروستکراوە، مەگەر هەر لە نێو شارە گەورەکانی (کوردستان)، مزگەوتی وا خۆش هەبێ. (باراوی)یەکانی شاریش، چەن خانوویەکی نوێیان لێ دروستکردووە، هێندێ جار دەچن و لە ئەوێ دەحەوێنەوە.

شێخانی (باراو)، خەڵکێکی بەڕێز، بێ وەیی و خواناسن. لە هەموو سەردەمەکانی بزووتنەوەی کوردایەتی و شۆڕشەکانی کورددا، بەشدارییانکردووە و قوربانییانداوە. زۆربەی هەرە زۆریان نیشتمانپەروەر و کوردپەروەرن. بەدەگمەن ناپاکێکیان تێدا هەڵکەوتووە. لە شۆڕشەکانی (شێخ مەحموودی حەفید، 11. 09. 1961 و 1976)ی گەلەکەشماندا بەشدارییانکردووە. لەبەرئەوە، گوندەکەیان چەن جارێ چۆڵ و وێران کراوە.

هەر لە کۆنەوە تا ئەوڕۆ، بە دەیان کەسایەتی کۆمەڵایەتی ناسراو، نووسەر، هونەرمەند، ڕامیار، مامۆستای سەرەتایی، ئامادەیی و زانکۆ، پزیشک و کادیری ئەکادیمییان تێدا هەڵکەوتووە. خەڵکی گوندەکە، وەک دانیشتووانی زۆربەی گوندەکانی دیکەی (کوردستان) ڕووخۆش، میواندۆست و ئاشتیخوازن. بەڵام (باراوی)یەکانی نێوشارەکان، ئەو خەسڵەتە چاکەیان وونکردووە و کەمێ ڕژدن!

**باپیره**

بنەماڵەکەمان، بە یەکێ لە بنەماڵە ناسراوە نیشتمانپەروەرە ئاییندارە دیارەکانی شاری (سولەیمانی) دەژمێردرێ. باپیرم ناوی (حاجی شێخ عەزیزی کوڕی شێخ ساڵحی کوڕی شێخ حوسێنی کوڕی شێخ بابین) بوو. ساڵی (1884ز.) لە گەڕەکی (حاجیحان)ی شاری (سولەیمانی) لەدایکبووە و ساڵی (1986ز.)یش کۆچیدواییکردووە، واتە پتر لە یەك سەدە ژیاوە. هێشتا منداڵبووە، باوکی مردووە و دایکی شوویکردووەتەوە. لەبەرئەوە لە ماڵی پورە (یەمەن) و خاڵە (شێخ موحەممەدی باراوی)، بە هەتیوی گەورەبووە!





(1986 – 1884)

باپیرم زۆر بێکەسبوو، خوشکی نەبوو و تەنیا برایەکی لە دایکی هەبوو، ناوی (عارف) بوو. سەرەتا لە گەڕەکی (مەڵکەندی) ژیاوە و لە دوای ساڵەکانی بیستی سەدەی ڕابوردووشەوە، لە گەڕەکی (کانیسکان) خانوویەکی کۆنی لە (ڕەفیقی گلە) کڕیوە و دەستێکی پێدا هێناوە، ئیدی هەر لە ئەو ماڵەدا نیشتەجێبووە و ژیاوە.

خانووەکە، لە کۆڵانەکەی پشت ماڵی (شێخ لەتیفی حەفید) و بەرانبەر ماڵی (شێخ موحەممەدی حاجی سەیید حەسەنی حەفید) بوو. کۆمەڵێ خزمی (باراوی) باپیرم، وەك (شێخ موحەممەدی گوڵانی، شێخ مەحموودی دارتاش، شێخ مەحموودە شەلەی بەرگدروو، شێخ جەلالی بەرگدروو، سەییدکەریم...)، لە ئەوێ کۆبووبوونەتەوە و گەڕەکەکەیان ئاوەدانکردووەتەوە.

باپیرم بە (شێخ عەزیزە کەچەڵە) و (شێخ عەزیزی عەلاف)یش بەناوبانگبوو. ئێمە خۆمان منالانی بنەماڵەکە، هەر بە (بابەعەزیز) بانگماندەکرد. هەر لە کۆنەوە، لەبەر شارەوانییە کۆنەکە و لە نێو چەقی بازاڕەکەدا، دووکانی عەلافی و پاشان عەتاری هەبوو. دواتریش ئەو ناوە هەمووی تێکدرا و خێڵی (ساڵحی ڕەشە)، بازاڕی (سەلاحەددین)ی ئێستەیان، لە شوێنەکەی دروستکرد. ئەویش هەر لە ئەوێ، دووکانەکەی خۆی وەرگرتەوە، تا دوا هەناسەی ژیانیشی، هەر لە ئەو دووکانەدا، بە ئاپەیداکردنەوە خەریکبوو.

باپیرم زۆر هاوڕێی خوالێخۆشبوو (نوری حەمەسوور) بوو، هەر دراوسێی دووکانیش بوون. هەروەها، هێندێ هاوڕێی دیکەشی هەبوو، وەک (شێخ غەریب)ی باوکی بەڕێوەبەری پۆلیسی (سولەیمانی) خوالێخۆشبوو (کەمالی شێخ غەریب)، جووتەیرا (حەمە و ڕەشەی شێخ خەلی، مەمەی سالەسوور)، زۆر جار سەریان لێ دەدا و لە دووکان لای دادەنیشتن. بەڵام یەکێ لە هاوڕێ خۆشەویستەکانی (مەلائەحمەدی دیلان)ی باوکی هونەرمەندی ناسراو (ساڵح دیلان) بوو، هێندێ جار باسی دەنگە خۆشەکەی بۆ دەکردین. دۆستێکی نزیکی (شێخ مەحموودی حەفید)یش بوو، (شێخ)ی ئەمریش، هەر بە خاڵە (شێخ عەزیز) بانگیکردووە، لە کاتی شۆڕشەکەشیدا، چەک و فیشەکی لە (ئێران) بۆ کڕیوە و بۆی هێناوە.

باپیرم تا بڵێی موسوڵمانێکی ڕاستەقینەبوو، سەری چووبێ، هەرگیز نوێژی نەچووە، جگە لە نوێژی نیوەڕۆ و دوای نیوەڕوان، لە مزگەوتی (مەلاجەکان) کردوویەتی، هەموو نوێژەکانی دیکەی، هەر لە مزگەوتی (گەورە) یا مزگەوتی (قامیشان) کردووە، چونکە ماڵەکەی لە نێوان ئەو دوو مزگەوتەدا بوو. هەرچی چۆنێ بووبێ، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانی گرتووە و بە قەرزی نەداوە. هەموو ساڵێکیش دەمەوهاوین، سەردانی گوندی (قادرکەرەم) و مەزارگەکەی (شێخ حەسەنی قەرەچێوار)ی کردووە. بڕوایەکی تەواوی بە (کاکە ئەحمەدی شێخ) هەبوو. لە ژیانی خۆشیدا، خراپەی بۆ کەس نەبووە و چاوی لە ماڵی کەس نەبڕیوە. هەمیشە دەستێکی بە هەژارانەوە بووە و یارمەتیداون. بەڵام، زۆر حەزی لە میوان، تێکەڵبوون، هاتووچۆی کەسوکار و خەڵکی نەدەکرد. هێندەی بیرمبێ، تا لە ژیاندابوو، هەمووی سێ جار، سەردانی ماڵی ئێمەی کردووە، ئەویش کاتێ باوکم لە (حەج) گەڕاوەتەوە، یا نەخۆشبووە! بۆ پرسەی کەس و جێژنە پیرۆزە نەدەچوو. باوکم و مامە (یەکر)م لەبری ئەو دەچوون. هێندێ خەسڵەتی هەبوو، زۆر پێوەی دیاربوو، تا بڵێی پیاوێکی کەمدوو و تووڕەبوو، ڕقی لە درێژدادڕی بوو، هێندێ جاریش ڕووشکێن بوو.

قسەلەڕوویبوو، هیچ قسەیەکی خواروخێچی، لە هیچ کەسێ قەبووڵ نەدەکرد. بەیانیان دوای نانخواردن، بەرەو بازاڕ ملیدەنا و دوای نوێژی ئێوارەش، بۆ نێو ماڵ و منداڵی خۆی دەگەڕایەوە. دوای ئەوەی نانی ئێوارەشی دەخوارد، دەچووەوە بۆ مزگەوت، نوێژی خەوتنانی دەکرد و ئینجا دەگەڕایەوە. پاشان ماوەیە دادەنیشت، شەوانە کوڕ و نەوەکانی، لە دەوری کۆدەبوونەوە و هەمیشە کۆڕی گەرمبوو، گەر تاقەتیشی هەبووایە، هێندێ لە فەرموودەکانی پەیامبەری بۆ باسدەکردین، جارجاریش هێندێ پەند، سەرگوزشتە و چیرۆکی خۆشی بۆ دەگێڕاینەوە و ئامۆژگاری دەکردین. تا لە ژیاندابوو، زۆر حەزی بە سەرکەوتنی کورد دەکرد، تا ساڵی (1964)یش، هەموو ساڵێ زەکاتی سەرووەت و سامانەکەی بۆ شۆڕش دادەنا.

لە بارەی کوردەوە دەیگوت: ئێوە گەل و نیشتمانی خۆتان خۆشبوێ و ناپاکی مەکەن، یارمەتی شۆڕشەکە بدەن، بەڵام کاتێ کورد دەوڵەتی دامەزراند، بڕۆن و لێرە مەمێنن، چونکە کورد ئەو کارانە نازانێ! زۆر جار، باسی سەردەمی دەسەڵاتی (شێخ مەحموود)ی بۆ دەکردین، هەناسەیەکی ساردی هەڵدەکێشا. (شێخ)ی زۆر خۆشدەویست، بەڵام دەورەوبەرەکەی خۆش نەدەویست!

لەگەڵ ئەوەشدا، موسوڵمانێکی لە خواترس و ڕێکوپێک بوو، لە (سەلاموعەلەیک) و (مەرحەبا)، نوێژکردن و ویردخوێندن زیاتر، یەک وشەی دیکەی عەرەبی نەدەزانی، زۆریشی ڕق لە عەرەب بوو، تەنانەت شتیشی پێ نەدەفرۆشتن. کاتێ پۆلیسێ یا سەربازێکی عەرەب لەچوون و پرسیاری شتێکیان لێ دەکرد، ئەو هەر بە کوردی وەڵامی دەدانەوە و دەیگوت: خوا بتاندانێ. کە دەشیانگوت: (فیماماڵا)، لەبری ئەوەی بڵێ: بە خواتان دەسپێرم، دەیگوت: بە خواتان دەپسێنم!

زمانی فارسی دەزانی و هێندێ لە هۆنراوەکانی (حافزی شیرازی) لەبەربوو، گەلێ سەرگوزشتە و چیرۆکی بەسەرهاتی گەورە پیاوانی ئیسلام و کورد و نێوچەکەی دەزانی، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر کەمدوو بوو، زۆر کەمیش تێکەڵی خەڵک دەبوو، کەچی ئەوانەی دەیانناسی، زووزوو سەریاندەدا، زۆر شەرمیان لێ دەکرد و ڕێزیان دەگرت.

باپیرم کەسایەتییەکی زۆر بە هێزی هەبوو، شەرمی لە کەس نەدەکرد و قسەی لێ نەدەخواردەوە. هەرگیز ئەوەم بیرناچێتەوە، کۆتایی ساڵی (1958) بوو، مامە (بەکر)م لە جادەی (کانیسکان) شەڕیبووبوو، خەنجەرێکیان لە ڕانی دابوو. (شێخ لەتیفی حەفید) پێ ئەوەی وەڵام بنێرێ، سەرلەئێوارە خۆی و چەند پیاوێ هاتن، بۆئەوەی تکا لە باپیرم بکا، لە

تاوانبارەکە خۆشبێ و ئاشتبینەوە. ئێمە هەموو بە پەلە لەبەری هەستاین، بەڵام باپیرم لە حەرشە، لەسەر سەکۆکە دانیشتبوو، چای دەخواردەوە، خۆی تێك نەدا و لە شوێنی خۆی نەجوڵا. ئەو پیاوە دەتگوت، قسە لەگەڵ کوڕێکی خۆی دەکا، هەر بە (لەتیف) بانگیدەکرد، ئەویش هەر بە خاڵە (شێخ عەزیز) ناویدەهێنا و باپیرم گوتی: لەبەر خاتری خۆت نا، لەبەر خاتری گۆڕەکەی باوك، تکاکەت قەبووڵ دەکەم!

**هێندێ لە قسە خۆشەکانی بابەگەورە**

هەرچەندە باپیرم زۆر تووڕەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، قسەی زۆر خۆشبوو، نوکتەی زۆر لەبەربوو، لە شوێنی خۆیدا و زۆر وەستایانە، قسەی نەستەق و خۆشی بۆ دەهات، گێڕانەوەکەشی، هەر لە خۆی دەهات. بۆ نموونە:

ئێوارەیەك لە ماڵەوە، لەبەردەم مقەڵییەك ئاگر دانیشتبوو، کوڕێکی مامە (بەکر)م بە پەلە خۆی کرد بە ژووردا و گوتی: (بابەحاجی) پوورە (نەجیبە)، بە سکێ دوو منداڵی بوو. ئەویش یەکسەر گوتی: بۆ حەبی کرمی خواردووە!

(حەسەن)ی برام زۆر دەسڕەنگینبوو، لە ژیانی خۆیدا، گەلێ کاری جیاوازی کردووە، هەر کارێکی کردووە، زۆر جوان کردوویەتی و تێیدا سەرکەوتووبووە، بە تایبەتی لە کاری تەلارسازی و کرێکاریدا، لە هەموو کارەکانی دیکە باشتربوو. بەڵام تەنیا خەوش و کەموکوڕییەکەی ئەوەبوو، هەر هێندێ پارەی دەسکەوتایە، ئیدی زوو تاقەتی لە ئیشکردن دەچوو، تا ئەو پارانەشی خەرج نەکردایە، هیچ ئیشێکی دیکەی نەدەکرد. سەبارەت بە ئەو خووڕەوشتەی (حەسەن)، باپیرم دەیگوت: ئەم هەتیوە بۆیە هیچی بە هیچ نابێ، هەر کەمێ پارەی دەسکەوت، خۆی دەگۆڕێ و لە کۆڵانێکی تەنگەبەردا دەوەستێ، تەماشایەکی ئەم سەر و ئەو سەری کۆڵانەکە دەکا، کاتێ کەسی لێ دیارنەبوو، پارەکە فڕێدەدا و رادەکا!

(عارق مام کەریم) بەرانبەر دووکانی باپیرم، میوەی دەفرۆشت، تا بڵێی، پیاوێکی ماندوو و کاسب بوو. بەڵام خەوشێکی گەورەی هەبوو، هەر ئێوارەی لێ دەهات، هێندەی دەخواردەوە، ئاگای لە هیچ شتێ نەدەما. لەبەرئەوە گەلێ جار، تووشی گرفت دەبوو، پارەشی بە دەسەوە نەدەما، جگە لە ئەوەی، هەر زوو هاوسەرەکەشی بەجێیهێشت. باپیرم دەیگوت: ئەم پیاوە زۆر کاسبە و خۆی زۆر ماندوودەکا. بەڵام وەك ئەو پیاوە وایە، کە هەر سێ ڕۆژەی ڕەمەزان بەڕۆژووەبێ، کەچی ئێوارە، بەربانگ بە گوو دەکاتەوە! لە ئەنجامیشدا هەر عەرەق کوشتی!

ڕۆژێ دەچێ بۆ لادێ، بە تەنیشت گۆڕستانێکدا دەڕوا، ئاوڕیان لێ دەداتەوە و دەڵێ: بە تەمانەبن، (فاتیحە)تان بۆ دانەم، مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، چ قوڕوەساغێ بوون!

مامە (عومەر)م و هاوڕێکانی، کیسکێکیان کڕیبوو، لە تەنیشت دووکانەکەی باپیرمەوە بەستبوویانەوە، تا ئێوارە سەریبڕن، بیبەن بۆ (سارچنار) و بیبرژێنن. پەتی ملی کیسکەکە درێژبووە، لە ناوە دەچێ، برسی یا تینووی بووبێ، خۆی ڕاپسکاندووە، لە باپیرم نزیکبووەتەوە و هەر باڕەیهاتووە، ئەویش دەریکردووە و گوتوویەتی: لاچۆ قوڕەساغ، ئەم باڕەباڕەت لە چییە، وا ئەزانی، سەرتدەبڕن و گۆشتەکەت دەکەن بە خێر، ئێوارە دەتبەن و گۆشتەکەت بە گووەوە دەخۆن! مەبەستی لە عارەق بووە!

لە ئەو دواییانەدا، زۆر جار دەستێ جلی سەوزی لەبەردەکرد و لەبەر دووکانەکەیدا دادەنیشت. ڕۆژێکیان (حاجی مەکی) لە ئەوێوە دەڕوا، تەماشای باپیرم دەکا و پێدەکەنێ، دەڵێ: (حاجی) وریای خۆت بە، گا و مانگا ئەتخۆن، وا بزانن، تونکەڵەشووتیت! ئەویش دەڵێ: وەحە گاجووت!

## داپیرە

باپیرم دوو ژنی هێنابوو، یەکەمیان ناوی (شیرین) بوو، هەر زوو جیابووبوونەتەوە و منالیشیان نەبوو. دووەمیشیان ناوی (حەمدیە) بوو، دایکی هەموو منالْ و نەنکی هەموو نەوەکانی بنەماڵەکە بوو، ئێمەی دەستەی دووەمی نەوەی (حاجی شێخ عەزیز)یش، هەروا فێربووبووین، بە (دایەحەمدێ) یا (دایەخان) بانگمانئەکرد، ئەویش ئەو دوو ناوەی زۆر پێ خۆشبوو!

نەنکم تا بڵێی، ژنێکی پەچوولەناسا و لە خواترسێکی بێ وێنەبوو. بڕواناکەم، لە هەموو ژیانیدا، دڵی کەسی یەشاندبێ. بە پێچەوانەی باپیرمەوە، زۆر ڕووی خۆشبوو، هەمیشە دەم بە پێکەنینبوو، زۆربەی کات، ویردی دەخوێند و تەزبیحاتیدەکرد. بەیانیان زوو لە خەوهەڵدەسا، ئەری لە ئەو ماڵەدا دەژیا، لە دەنگی تەقەتەقی قاپقاپ و خورەی ئاوی دەستنوێژی داپیرە و باپیرە، خەبەریاندەبووەوە!

نەنە، هەمیشە دەسی بە هەژاران و دراوسێکانییەوە بوو، بۆیە ژنانی گەڕەک، زۆریان خۆشدەویست و هەر بە (پوورەحەمدێ) بانگیاندەکرد و دەیانگوت: (پوورەحەمدێ) ژنی ئەم سەردەمە نییە، تا خوا حەزکا، ژنێکی پیرۆزە!

ڕۆژ نەبوو، سەر لە گۆڕەکەی (شێخ مستەفا) نەدا، (فاتیحە)ی بۆ نەخوێنێ و بەرد بە کێلەکەیەوە نەنێ، کە هەمووی (15- 20) مەترێ لە ماڵی باپیرمەوە دووربوو. ڕێی دووری مزگەوتی گەورە بوو، هەمیشە سەری لە مەزارەکەکەی (کاک ئەحمەدی شێخ) دەدا. بە تەواوی شارەزای هیچ شوێنێ نەبوو، گەر بیویستایە، سەر لە کەسێ یا نەخۆشێ بدا، دەبووایە، منداڵێکی وەك چاوساغ لەگەڵ خۆی ببردایە. پرسەی گەڕەك و دەوروبەر نەبوو، نەچێ و دڵنەوایی کەسوکاری خاوەن مردووەکە نەکا، جا گرنگ نەبوو، بیناسیایە یا نەیناسیایە، ئەو هەر دەچوو، دەیگوت: خێرە!

خوێندەوار نەبوو. لە زمانی کوردی زیاتر، هیچ زمانێکی دیکەی نەدەزانی. تەنانەت وشە عەرەبییە باوەکانیشی بۆ نەدەهات، سەروگوێی هەموویانی شکاندبوو. بۆ نموونە: بە (مسەلەحە، ئەڕنەفین، جومعە، ڕوبع، طفل، وەلەد ...)ی دەگوت: (مسەحەلە، جەرنەفیل، جوعمە، ڕوعب، توفل، وەلەك ...)، بەڵام زۆر بەگوڕ و گورجوگۆڵ بوو، هەمیشە لە نێو ماڵەکەدا دەهات و دەچوو، کاریدەکرد و بە دەم کارکردنیشەوە، بە دەنگەخۆشەکەی خۆی، سڵاواتی لە دیداری پەیامبەر دەدا.





(دایەحەمەدی) سێ برای هەبوو، ناویان (ئەحمەد، عەلی و عارف) بوو. دوو خوشکیشی هەبوو، یەکێکیان ناوی (خەجێ) بوو، ئەمیش دوو کچی هەبوو، (خانم) و (عەتێ). پورە (خانم) لە شارۆچکەی (قەڵادزێ)، شووی بە (عومەرعەینەك) کردبوو. مێردەکەی مردبوو، چوار کوڕ (نوری، عوسمان، حەمە، ڕەزا) و کچێکیشی (نەجیبە) لێ بەجێمابوو. بە بێوەژنی و

به هەتیوی گەورەیکردبوون، کورەکان هەموویان ماون و کچەکەشی لە مێژە مردووە. لەبیرم دێ، جارێ پوورە (خانم)، بۆ سەردانی ئەنکم هاتبوو، خۆی و منداڵەکانی لەژێر دارتووەکەی حەوشەدا دانیشتبوون، ئێوارە باپیرم هاتەوە و چاوی بە ئەو هەموو خەڵکە کەوت، بەساردییەکەوە بەخێرهاتنیکردن!

پورە (عەتێ)ش خێزانی وەستا (وەهاب) ناوێ بوو، چەن کوڕێکی هەبوو، (حەمە، عەزیز، مەجید، کەریم و خالید)، تەنیا کچێکیشی هەبوو. خوشکەکەی دیکەشی ناوی (شەمسە) بوو، لە باوکەوە خوشکی ئەنکم بوو. هەر لە منداڵییەوە، ئەنکم بە شیری مەمکەکانی خۆی گۆشیکردبوو. ژنێکی زۆر جوان و ژیر بوو، ئێمە زۆرمان خۆشدەویست، هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە پێیان دەگوت: (دادە)، چونکە شیری ئەنکمی خواردبوو. واتە لە یەک کاتدا، هەم خوشك و کچی ئەنکم بوو، هەم پور و خوشکی باوکیشم بوو!

(دادە)، ساڵی (1920) لەدایکبووە. زۆر بە پچووکی شووی بە (مەلائەمین) کردووە و مێردەکەشی ساڵی (1953) کۆچیدواییکردووە. ئەو داماوە، هەر زوو بە گەنجێتی لێی قەوماوە، پێنج منداڵی لێ بووە، هیچ سەرچاوەیەکی ژیانیان نەبوو، دەسیان زۆر کورتبوو، هەر باشبوو، خانوویەکی چکۆلانەیان هەبوو، بە یارمەتی خزم و کەسوکار دەژیان. ژنەکە هێندە مەرد و ئازابوو، بە ئەو گەنجی و جوانییە شووی نەکردەوە، بە دیار منداڵەکانییەوە دانیشت. (جەلال)ی کوڕی پێش مردنی باوکی مرد. دوا کوڕیشی (سەلام)، بە هەتیوی لەدایکبوو، ئەویش ساڵی (1954) مرد. بەڵام هەر سێ منداڵەکەی دیکەی، زۆر بە جوانی و رێکوپێکی گەورەکرد، G ساڵی (1993) بە یەکجاری ماڵاوایی لێ کردین.

کوڕە گەورەکەی مامۆستا (جەمال ئەمین)، کۆلێژی زانستی لە زانکۆی (بەغدا) تەواوکرد و باشترین مامۆستای بیرکاری لێ دەرچوو. بەڵام بە داخەوە، ڕۆژی (30. 11. 2014) کۆچی دواییکرد. کوڕی دووەمیشی دوکتۆر (لەتیف ئەمین)، کۆلێژی پزیشکی زانکۆی (موسڵ)ی تەواوکرد، تا پلەی بەڕێوەبەری فەرمانگەی تەندروستی پارێزگەی (سولەیمانی)ش ڕۆی. کچە چکۆلانەکەشی خاتوو (لوتفیە)، لە خانەی مامۆستایانی (سولەیمانی) دەرچوو و مامۆستای سەرەتایی بوو. ئێستە دوکتۆر (لەتیف) و مامۆستا (لەتفیە) ماون و باری ژیانیان زۆر باشە. منداڵەکانی (دادە)، نەوەیەکی زۆریان خستووەتەوە، هەموویان خوێندنی بەرزیان تەواوکردووە، لە فەرمانگەکانی هەرێمدا کاردەکەن و بە خۆشیی دەژین.

دابونەریتی بنەماڵەکە و پێوەندی نێوان داپیرە و باپیرە

خانووەکەی ماڵی باپیرم زۆر کۆن و پەڕپووت بوو، دەروازەیەکی چکۆلانەی تەختەی هەبوو، لە دیوی دەرەوە، بە ئەڵقەرێزێکی دووڵایی و لە دیوی ناوەوەش، بە کلۆم دادەخرا. حەوشەیەکی زۆر گەورە و دڵگیری هەبوو، توویەکی زۆر گەورە و بەرزی تێدا ڕوابوو، هاوینان لەبەر گەرما، لەبەر سێبەری تووەکە دادەنیشتین، لە پاڵ دیوارەکەشدا سەکۆیەکی گەورە و فراوانی لێ دروستکرابوو، ئێواران باپیرم و مامەکانم لێی دادەنیشتن، نانیان دەخوارد و تا درەنگانێکیش، هەر لە ئەوێ دەمانەوە. لەسەرێشەوە کەڵەکی و پشتەیوان و گەنجینەیەک بوو. گەنجینەکە بە حساب ژووری نازووقەبوو، بەڵام هەموو شتێکی تێدابوو، هەمیشە کلیلەکەی بە نەنکم بوو، کاتێ دەشیکردەوە، تا شتێ دەربێنێ، ئەیدەهێشت، کەس لە ئەو ماڵەدا سەری پێدابکا. تەنانەت کلۆمەکەشی سووتابوو، ئەیدەگۆڕی، ئێمە ناومانابوو (موختەبەر)ەکەی (دایەحەمەدی).

تراديسیۆنی ماڵی باپیرم وابوو، پیاوان بە جیا لە کەڵەکی، ژنان و منداڵانیش لە پشتەیوان دادەنیشتن. تا باپیرم لە مزگەوت و لە نوێژی ئێوارە نەگەڕایەتەوە، چێشت تێ نەدەکرا، تا پیاوانیش نانیان نەخواردایە، ژن و منداڵ نانیان بۆ تێ نەدەکرا. پاشان کاتێ پیاوان لە نانخواردن دەبوونەوە و سینی دەهاتەدەرەوە، هەرچی لە مەنجەڵە مسەکان و سەر سینییەکە بمایایەتەوە، بۆ ژن و منداڵەکانیان دادەنا. خێزانەکە هێندە گەورەبوو، زۆر جار، پڕ بە سکی خۆمان نانمان نەدەخوارد!

لەگەڵ ئەوەشدا، نەنکم پەپوولەیەک بوو بۆ خۆی و زیانی بۆ کەس نەبوو، کەچی لەگەڵ باپیرمدا زۆر دڵنوویان نەدەکوڵا، هەمووشی هەر خەتای ئەو بوو. چونکە وەک گوتم: زۆر تووڕەبوو، حەزی بە دانیشتن و تێکەڵبوونی ژنان نەدەکرد. لەبەرئەوە، کاتێ نەنە قسەی دەکرد، پەلاماری دەمی دەدا، قسەکەی پێ دەبڕی و بێدەنگیدەکرد. ئەویش وەڵامی نەدەدایەوە و هەر بێدەنگدەکەتی. زۆریش بکەیشتایەتە تینی و تووڕەبووایە، دەیگوت: لە ئەو دونیا، خوا هەقی منت لێ دەسێنێ!

نەنکم، زۆر باوەڕی بە خەو هەبوو، خەویشی زۆر دەبینی و زۆر حەزیشی لە گێڕانەوەی دەکرد. باوەگەورەشم، بە ئەو گێڕانەوانە پەستدەبوو و لێی تووڕەدەبوو. ئێوارەیەکیان هەموومان دانیشتبووین، نەنە هات و بە باوکمی گوت: (حەمە)، خوا بە خێری بگێڕێ، ئەم شەو لە خەوما، یەکسەر باپیرم قسەکەی پێ بڕی و گوتی: تا ئەو دەرگەیە بکەمەوە، یا ئەو قسە پڕوپووچانە بچنەدەرەوە!

ئەویش هەر پێدەکەنی و گوتی: من قسە بۆ تۆ ناکەم، خەوەکە بۆ (حەمە) دەگێڕمەوە. ئینجا گوتی: پیاوێکی سەرتاپاسپی جوانی نورانی، نامەیەکی دایە دەستم. باپیرم لە ئەوە پتر خۆی بۆ نەگیرا، خێرا هەڵیدایە و گوتی: کوڕە (حەمە) نامەکەی لێ وەرگرە، بە خوا ئێستە لە نێو گۆزە و دیزەی ژووری گەنجینەکەدا دەیشارێتەوە، بە ساڵێ بۆمان نادۆزرێتەوە! ئیدی بوو بە پێکەنین و دایەخانیش تووڕەبوو، بە ناتومێدی دەرگەی قلیشاندەوە و ڕۆی، خەوەکەشی تەواو نەکرد!

داپیرە و باپیرە، جگە لە ئەو منداڵانەی بوویان و مردوون، چوار کوڕ و چوار کچی دیکەیان بووە. پارەگەڕەم کوڕەکانی بە خۆشی و پیرۆزی، سەرکردەکانی ئایینی ئیسلامەوە ناوناوە، (موحەممەد، بەکر، عومەر و ساڵح). کچەکانیشی بەپێی تەمەن ئەمانە بوون: (سەبیحە، مەلیحە، فاتمە و نەسرین). لە کوڕەکانی سەرەتا تەنیا باوکم ژنی هێنابوو، بەجیا دەژیا. لە کچەکانیشی تەنیا پورە (سەبیح) شوویکردبوو، ماڵیان لە شارۆچکەی (ڕانی) بوو. ئیدی ئەوانی دیکە هەموویان، لە ئەو ژوورەدا تێکئاخنجابوون!

زۆر جار (بابەعەزیز)م دادەنیشت و بە تەزبیحە (101) دەنکییەکەی، کوڕ و کوڕەزا، کچ و کچەزاکانی دەژمارد، تا خۆی مابوو، لە (80) کەس تێپەڕیکردبوو، بەڵام ئێستە لە (150)یش زیاترە. ساڵی (1986) هەردووکیان کۆچیدواییانکرد، سەرەتا نەنکم و دوای چەند مانگێکیش باپیرم مردن، بە داخەوە، ئەو کاتە من لە ئەوێ نەبووم، لە (یەکێتی سۆڤێت) دەمخوێند!

## وێنەی کوڕ و کچەکانی ( حاجی شێخ عەزیز )



باوکم (1919- 2008 )



مامەبەکر (1934-2010)



مامەعومەر (1938-2016)



مامەساڵح (1942-2011)



پورە مەبیج (1927- )



پورە مەلیح (1929-2011)



پورە خاتم (1940-2017)



پورە نەسرین (1949- )

## دایە و بابە

لە نێو منداڵەکانی (شێخ عەزیز)دا، باوکم لە هەموویان گەورەتربوو. ناوی (موحەممەد) بوو، ساڵی (1919) لە شاری (سولەیمانی) لەدایکبووە، بەڵام لە تەسکەرەدا، بە (1924) نووسرابوو. لە نێو خەڵکدا، بە (حەمەی شێخ عەزیز) ناسرابوو. وەك باپیرم بۆی گێڕامەوە، دەیگوت: بە منداڵی و بە هەرزەکاری، زۆر سەرەڕۆ و سەرچڵ بوو، لە ژیانی خۆیدا، گەلێ جار، تووشی گێچەڵ و گرفتی کردووم!

باوکم زۆر حەزی لە خوێندن نەکردووە. سەرەتا لەگەڵ هونەرمەندی ناسراو (کەریم کابان)، پێکەوە پۆلیس بوون. پاشان بە هەژار شەرمشەق و ناوی عەلی، بڕوانامەی شەشی سەرەتایی ئەو سەردەمەی پچڕیوە و لە نەخۆشخانەی شاری (سولەیمانی)، بە برینپێچ دامەزراوە.

لەبەرئەوەی فەرمانبەری میریی بوو، هەر ڕۆژەی لە شوێنێ کاریکردووە، لە ئەم گوندە بۆ ئەو گوند، لە ئەم شارۆکە بۆ ئەو شارۆکە و لە ئەم شارۆچکە بۆ ئەو شارۆچکەی سەر بە پارێزگەی (سولەیمانی) گوێزراوەتەوە. چ بەهۆی باپیرمەوە بووبێ؛ چ بەهۆی خۆی و کارەکەیەوە بووبێ؛ خەڵکێکی زۆری ناسیوە، کەم کەسی دیار و ناسراو هەبوو، لە نێو شاری (سولەیمانی) و دەوروبەریدا نەیناسیبێ.

باوکم تا بڵێی، پیاوێکی دڵپاك، ساکار، ساویلکە، بێ فێز و بێ زیان بوو. هەر بۆیە باوەڕی بە هەموو کەسێ دەکرد، قسەی لە کەس نەدەشاردەوە و هیچ لە دەمیدا نەدەوەستا. لە کارەکەی خۆیدا زۆر شارەزابوو، دەتوانم بڵێم: هێندەی پزیشکێ شارەزایی هەبوو. لەبەرئەوە، خەڵك باوەڕێکی زۆریان پێی هەبوو. بەڵام هەرگیز ئارەزووی خوێندن و خوێندنەوەی نەدەکرد، پلەی خوێندەواری و ڕووناکبیریشی، لە خوار پەنجاوە بوو. بە ڕێنووسێکی کۆنی سەردەمی (عوسمانی)، بە کوردییەکی تێکەڵاو بە وشەی عەرەبی دەینووسی.

لە ڕووی دیمەن و خەسڵەتی کۆمەڵایەتیشەوە، هەمیشە پۆشتە و پەرداخ بوو، لاوێکی باریك و کەڵەگەت، قیت و قۆز بوو، تا بڵێی دڵی تەڕبوو، زۆر مێباز بوو. سەرەڕای ئەوەش، هەمیشە ڕووخۆش و دەم بە پێکەنین بوو، زمانی شیرین و قسە خۆش بوو، زۆر حەزی لە گاڵتەوگەپ دەکرد. بەدەگمەن نەبێ، دڵی کەسی نەدەڕەنجاند. لەبەرئەوە خەڵکی زۆریان خۆشدەویست، بە تایبەتی کچان و ژنان، پتر خۆشیاندەویست! هەر بۆیە بە ئاشکرا، پێنج ژنی هێناوە، جیا بە نهێنی چەندی دیکەی هێناوە و لە پەنارە مارەیکردوون، هەرمیان

مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بیزانێ! کاتێ هەر ژنێکیشی هێناوە، پرسی بە کەس نەکردووە و کەسیش بۆی داوانەکردووە، بەڵکوو هەر خۆی هەموو شتێکی ڕێکخستووە و داوای کردووە. بۆیە باپیریشم لە ئەو ڕووەوە پشکوێی خستووە!

باوکم، یەکەمین ژنی ساڵی (1947) هێناوە، ناوی (شەفیقە) و خوشکی (عەلی) خانی ژنی (حەمەی شێخەلی) بوو. ماوەیەکی کەم پێکەوە ژیاون، منداڵیان نەبووە و پاشان جیابوونەتەوە.

دووەمین ژنی ساڵی (1948) خواستووە، ناوی (ئەسمەر) و خەڵکی شاری (هەولێر) بوو. کوڕێکی لێی بووە، ناوی (حەسەن)ە، براگەورەی هەموومانە و بە (شێخ حەسەن) ناسراوە. زۆر لەگەڵ ئەویشدا نەماوەتەوە و جیابوونەتەوە.

سێیەمین ژنییشی دایکی منە، ساڵی (1949) گواستوویەتییەوە و ناوی (ڕەحمە)یە. دایکم ساڵی (1935)، لە گوندی (دەشتی تلی)ی نزیک شارۆکەی (ماوەت) لەدایکبووە. لە بنەماڵەیەکی ناسراوی شێخانی (ئامادین)ە و کچی (شێخ حەسەنی شێخ عەبدولڕەحمانی ئامادینی)یە. چوار برا و خوشکێکی بووە، خاڵەکانم ناویان (قادر، ڕەحمان، ڕەحیم و ئەحمەد) بوو، ئێستەش تەنیا خاڵە (ئەحمەد)م ماوە. پووریشم ناوی (خونچە) بوو، ساڵی (2012) مردووە. نەنکم ناوی (پیرۆز) بوو، نزیکەی (100) ساڵ ژیاوە و ساڵی (1988)، لە (پێنجی) مردووە و هەر لە ئەوێش نێژراوە. وەک ڕەوشتێکی کۆنی کوردەواری، باپیرە (شێخ حەسەن)م، زۆر بە منداڵی کچی بەشوودەوە. بنەماڵەی دایکیشم، زۆر گەورەیە و ئەومیەکی زۆریشیان خستووەتەوە.

دوای ئەوەی باوکم دایکمی گواستووەتەوە و تێکەڵ بە بنەماڵەی (شێخ عەزیز) بووە، هەم بە دەس باوکمەوە و هەم بەدەس کەسەکانییەوە، تووشی گەلێ چەرمەسەری و ناخۆشی بووە، دەردێکی زۆریان داوەتێ و ئازارێکی زۆریشیان، بە گەروویدا کردووە. هەر باوکم خۆی، دوو جار ژنی بەسەرهێناوە، ساڵی (1958) کچێکی (هەورامانیی) جوانی خواستووە، ناوی (فەزیلە) بوو. ساڵی (1963)یش، بێوەژنێکی خزمی خۆی هێناوە، ناوی (سەبری) بوو. کچێکی لێی بوو، ناوی (ئاشتی) بوو، هەر زۆر بە منداڵی مرد. بەڵام زۆر لەگەڵیان نەژیاوە و زوو لێیان جیابووەتەوە.

لە بنەماڵەی (شێخ عەزیز)دا، تەنیا هەر (دایەحەمدی) نەبێ، ئیدی کەسوکاری باوکم، لەگەڵ دایکم زۆر خراپبوون. جگە لە من، دایکم پێنج کوڕ و دوو کچی دیکەی بووە، ناوەکانیان بەپێی تەمەن: (شەونم، سەلاح، بارزان، کاوان، سۆزان، کامەران و شنە)، تا ئەوڕۆ هەموومان ماوین. کوڕێک و کچێکی دیکەشی بووە، بەڵام ئەوان هەر زوو مردوون.

تا سەرەتای شۆڕشی مەزنی (11/سێپتێمبەری 1961)ی گەلەکەمان، زۆربەی ناوی منداڵانی کورد بە گشتی و بنەماڵەکەی ئێمە بە تایبەتی، عەرەبی و ئیسلامی بوون، چونکە باپیرم ناوی‌دەنان. بەڵام لە دوای ئەو مێژووەوە، هەموو ناوەکان گۆڕان و کوردین.
لەسەر ئەو ناوانانە، نوکتەیەکی خۆشی باپیرم هەیە، ئەوانەی ئاگایان لێی بووە، زۆر جار گێڕاویانەتەوە، با منیش لێرەدا باسیکەم. ساڵی (1948)، باوکم لە شارۆچکەی (چوارتا) برینپێچ بووە، لە دووەمین ژنی (ئەسمەر)، خوا منداڵێکی پێ بەخشیوە. باوکیشم هەر لە (چوارتا)وە، تێلیفۆنی بۆ دووکانی خوالێخۆشبوو (حاجی عەلی بەگ)ی باوکی هونەرمەندی کۆچکردوو (حەمەجەزا) کردووە، چونکە هەم دراوسێ دووکان بوون و هەم ماوەیەکیش، هەر پێکەوە کاریانکردووە، بەڵام دوایی جیابوونەتەوە. بۆئەوەی باپیرمی بۆ بانگکەن، تا مژدەیباتێ و ناوێ بۆ منداڵەکەی بدۆزێتەوە. ئەویش دێ و قسە لەگەڵ باوکم دەکا، دوای هەواڵپرسین، پێی دەڵێ: بابە کوڕمان بووە، ناوی بنێین چی؟ باپیریشم لەبری ئەوەی پیرۆزبای لێ بکا، گوتوویەتی: وەڵڵا لە حەڵاڵزادەکە زۆر تێرمانخوارد، ئۆرەی حەرامزادەکەیە. گوایە باوکم حەڵاڵزادەیە و (حەسەن)ی براشم حەرامزادەیە!

لەدایکبوون و سەردەمی منداڵی ( 1950-1957 )
زۆربەی هەرە زۆری ئەو منداڵە کوردانەی، لە پەنجاکان و بەرەوخوارتری سەدەی بیستەمدا لەدایکبوون، نەک هەر ڕۆژ و مانگی لەدایکبوونی خۆیان، بە تەواوی نازانن، بەڵکوو هێندێ کەسیش هەن، ساڵەکەش بە باشی نازانن، جا ئیدی ڕۆژ و مانگ لە کوێ بزانن؟! من نەک هەر ڕۆژ و مانگی یەکەمین هەناسەدان و گریانی سەر زەویم دیار نییە، بەڵکوو لە چاتسی کەچی مندا، تەنانەت دایە و بابەش بە تەواوی، ساڵی لەدایکبوونمیان بۆ ساغ نەبووەتەوە!
هەرچی چۆنێ بێ، بەهۆی ڕووداوەکانی (کوردستان)، کارەساتە سروشتییەکان، ژنهێنانی باوکم و گواستنەوەی لە ئەم نێوچەوە بۆ ئەو نێوچەی پارێزگەی (سولەیمانی)، هێندە دەزانم، ساڵی (1950) لە شارۆچکەی (پێنجوێن) لەدایکبووم و (01، 07)یشیان، بە زۆر بە ڕۆژی لەدایکبوونم بەسەردا ساغکردووەتەوە! چونکە باوکم لە ئەو ساڵەدا، لە (پێنجوێن) برینپێچبووە و لە نەخۆشخانە کاریکردووە. دوای ئەوەی لەدایکیشبووم، هەمووی نزیکەی دوو ساڵێکی زیاتر نەخایاندووە، باوکم بۆ شارۆکەی (عەربەت) گواسراوەتەوە. لە ئەو سەردەمەشدا، هیچ شتێکی ئەوتۆ نەبووە، تا شایانی ئەوە بێ، باسیکەم و هیچ شتێکیشم بیرنایە، چونکە زۆر منداڵبووم!

**شارۆکەی ( عەربەت )**

پاشان باوکم ساڵی (1952)، لە شارۆچکەی (پێنجوێن)ەوە بۆ شارۆکەی (عەربەت) گوازراوەتەوە. بە منداڵی زۆر هاروهاج و بزێوبووم، چونکە تاقانەی دایە و بابەش بووم، لەبەرئەوە نازێکی زۆریان دابوومێ.

بە حاڵ لە بیرمدێ: کاتێ لە (عەربەت) بووین، لە خانوویەکی خنجیلانەی قووڕیندا بووین، هی ئەحۆشخانەکە بوو. دیوارەکانیمان بە کاغەزی هێندێ لە ڕۆژنامە کۆنەکانی ئەو سەردەمە شاردبووەوە، تا کەمێ خاوێنتبێتەوە. بەیانییەکیان زوو هەستابووم، شقارتەیەکم لە کاغەزی ڕۆژنامەکە دابوو، دیوارەکە گڕی تێ بەربووبوو. بەڵام باشبوو، باوکم زوو فریاکەوت و کوژاندییەوە، منیش لێدانێکی باشم خوارد!

(عەربەت) یەکێ لە ئەو شوێنانەیە، دووپشکێکی زۆری هەیە. تەنانەت (پیرەمێرد)ی بلیمەتیش، بە دێڕە هۆنراوەیەک گوتوویەتی:

***کاولەکەی وەتــــەن، هێندە شیرینە***

***ژانی دووپشکی ( عەربەت ) هەنگوینە***

من لە نێوان دایکم و باوکمدا دەنووستم. هەرچەندە بنمیچی ژووری نووستنەکەشمان، هەر بە کاغەز گرتبوو، کەچی بەیانییەک، دووپشکێکی گەورە کەوتەخوارەوە و لەسەر لێفەکەم دەجوڵایەوە. منیش لە ترساندا هاوارم لێ هەستا و قیژاندم. دایە و بابە ڕاچڵەکین و گوتیان چییە؟ بە دەس دووپشکەکەم پیشاندان و باوکم بە پەلە، دووپشکەکەی بە لێفەکەوە پێچایەوە، لە حەوشەکە هەڵێشت و بە تاکەنەعل کوشتی.

لە هەموو ژیانی خۆمدا، هەر لە منداڵییەوە، لە هەموو خواردنێ زیاتر، حەزم لە قوبووڵی و گۆشت و فاسۆلیای وشک بووە، ئێستەش هەر حەزی لێ دەکەم. دایکم بۆی گێڕامەوە و گوتی: بە قوبووڵیت دەگوت: (سووبوولی) و بە گۆشتیشت دەگوت: (کاکەبوولی). بۆیە گەر ڕۆژێ لێمان نەنایە، دەگریایت، داوای سووبوولی و کاکەبوولیت دەکرد. هەر کاتێکیش شەڕەشەقتبکردایە، بە ئەوە دەمترساندی و دەمگوت: گەر بە عاقڵوساڵی دانەنیشی، سووبوولی و کاکەبوولیت بۆ لێنانێم، ئیدی بە ئەو شێوەیە دادەمرکایتەوە! ماوەی ساڵێ لە (عەربەت) ماینەوە، پاشان لە (ماوەت) گیرساینەوە، ئەو کاتە تەمەنم (3) ساڵان بوو.

**شارۆکەی ( ماوەت )**

زستانی ساڵی (1953) لە (ماوەت) بووین، (شەونم)ی خوشکم لەدایکبوو. ئیدی وردە وردە، پێکەوە گەورەبووین و خوا هاوڕێیەکی بۆ ناردم، لە ماڵەوە یاری لەگەڵ بکەم.

هەرچەندە زۆر ئیرەیم پێ دەبرد و ڕقم لێی بوو، هەر هەڵێکم بۆ هەڵکەوتایە، تێم دەسرەوان و زیڕەم لێ هەڵدەسان، چونکە وا هەستمدەکرد، دایکم و باوکم، ئەویان لە من خۆشتر دەوێ!

(ماوەت) شارۆکەیەکی چکۆلانە بوو، چەن فەرمانگە و دووکانێکی لێ بوو، بەڵام زۆر خۆش و دڵگیربوو، یەکێ لە ئەو دووکانانە، هی (کاکەمین ئاغا) بوو، پیاوێکی زۆر ژیر و قسەخۆش بوو، دەس و دڵی خاوێن و فراوان بوو، کەم فەرمانبەر هەیە، لە (ماوەت) کاری کردبێ، ئەم پیاوەی نەناسیبێ و ڕازەی نەکردبێ! هەموو ڕۆژێ من و باوکم، سەرمان لێ دەدا. ئەویش قسەی خۆشی بۆ دەکردین و نوقوڵی دەداینێ؛ منالیش زۆر حەز لە شیرینی دەکا! ئێستەش بیرمە، کاتێ باسی ئافرەتی دەکرد، دەیگوت: (ژن ناقیسول عەقڵە).

ساڵی (1972)یش، دوکتۆر (لەتیف) لە نەخۆشخانەکەی (ماوەت) کاریدەکرد، منیش سەرێکم لێدا، تا ئەو کاتەش هێشتا (کاکەمین ئاغا) مابوو، بۆ دوا جار دیم، چوومە لای و خۆم پێ ناساند، گەلێکی پێ خۆشبوو، زۆر هەواڵی باوکمی پرسی. ئیدی نازانم، دوای ئەوە کەی ماڵاوایی لە ژیان و زێدەکەی کردووە؟!

## (سولەیمانی)

زۆر لە (ماوەت) نەماینەوە، هەمووی دەورووبەری ساڵێ بوو، ساڵی (1954) بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە و لە گەڕەکی (کانیسکان)، لە ماڵی باپیرم بووین، بەڵام ناکۆکی لە نێوانماندا دروستبوو، لەبەرئەوە لە ئەو گەڕەکە گواستمانەوە، لە پشتی ماڵی (شێخ قادری حەفید) و لە ماڵی (عەلی باپیر) گیرساینەوە، ئەو کاتە تەمەنم (4) ساڵان بوو.

خانووەکە زۆر گەورە نەبوو، هەمووی دوو ژوور و کەنجینەیەک و هەیوانێ بوو، حەوشەیەکی چکۆلانەشی هەبوو، دارهەنار و مێوی‌یان تێدا ڕواندبوو، دڵی مرۆی دەکردەوە. ئێمە ژوور و کەنجینەکەمان گرت، ئەوانیش هەموویان لە یەک ژووردا دەژیان. دیارە گەر هەژاری و دەسکورتی نەبوایە، نە ئەوان ئەو ژوورەیان بەکرێدەدا، نە ئێمەش لە ژوورێکی وا پچووکدا جێماندەبوومەوە!

بە کورتییەکەی، لە ئەو خانووە چکۆلە خنجیلانەیەدا، بە هەردوو خێزانەکە، (10) کەسی تێدا دەژیا. ئاخر چی بکەن؟ چار چییە؟ خەڵک هەژاربوو، بۆ ئەوەی هێندێ پارەیان دەسکەوێ، خۆشی و حەوانەوەی خۆیان لا گرنگ نەبوو. بەڵام ئەمان وەک خاوەن خانووەکەی پێشوومان، منالی هاوتەمەنی خۆمیان نەبوو، تا یارییان لەگەڵ بکەم، بەڵکوو دوو کوڕ و دوو کچی گەورەیان هەبوو، ناوەکانیان (عومەر، جەمال، گێلاس و گەلاوێژ) بوون. ئەوان گەورە و ئێمەش چکۆلە بووین.

باجی (عاسم) و خوشکە (گێلاس) و کاکە (جەمال)، منیان زۆر خۆشدەویست. باجی (عاسم) ژنێکی زۆر باش و سەروزمان شیرین بوو. لە بیرمە، پەلیدەگرتم و دەیبردمە ژوورەکەی خۆیان، هەنگوین و گوێزی دەرخواردەدەدام. وا بزانم، ئەو کاتە خوشکە (گێلاس) بێوەژن بوو، زۆر جوانیش بوو، منیش پێم دەگوت: تۆ دەزگیرانی خۆمی! ئەویش پێدەکەنی و توقوڵی دەدامێ، لە باوەشی دەگرتم و قسەی خۆشی بۆ دەکردم. کاکە (جەمال)یش هێندێ جار، لە حەوشە و هەیوانە هاوبەشەکەماندا، فێری مەڵماتێنی دەکردم، بەلانقەست پێی دەدۆڕاندم، منیش پێم دەگوت: ئاوا قیچتدەکەم! ئەو وشەیەی زۆر لا خۆشبوو، پێدەکەنی و دەیگوت: تۆ ئەمە لە کوێ فێربووی؟! بەڵام (عومەر)ی برا گەورەیان، هەمیشە دەموچاوی ترشابوو، زۆر گرژ و مۆن بوو، لچی بەیەکدا دابوو، هەر مۆڕدەبووەوە، هەرگیز ڕوویەکی خۆشمان لێ نەدی، زۆر کەم قسەی لەگەڵ دەکردین. منیش کاتێ ئەو دەردەکەوت، ڕامدەکرد و لە پەنجەرە چکۆلانەکەی ژوورەکەمانەوە، لچم لێ خوارەکردەوە و گاڵتەم پێ دەکرد. ئەویش تووڕەدەبوو. تەنانەت جارێکیان کردی بە هەرا و خەریکبوو، لەگەڵ باوکمدا شەڕێکی گەورە بکا و دەیگوت: دەبێ لە ئەم ماڵە بڕۆن! تا باجی (عاسم) هەڵیدایە و گوتی: ئەوان ماڵی خۆیانە، گەر بە دڵت نییە، فەرموو تۆ برۆ و ملت بشکێنە، منداڵی وا چییە، دەم دەخەیتە دەمییەوە؟ کاکە (جەمال)یش بە ئەو بەزمە پێکەنینی دەهات، باوکیشم هەموو جارێ دارکارییدەکرم و زیرەی لێ هەڵدەسانم، باجی (عاسم)یش بە هاناشەوە دەهات و لۆمەی باوکمی دەکرد. ئیدی تا لە ئەوێ بووین، ئەم بەزمە لەگەڵ (عومەر) هەر بەردەوامبوو. (گەلاوێژ) خوشکە چکۆلەیان بوو، لە من زۆر گەورەتربوو، بەڵام یەکدیمان خۆش نەدەویست، منیش هەموو ڕۆژێ تووڕەمدەکرد و پێم دەگوت: گەلاوێژە بەرەتوێژە، گەر مردم، تۆ بمتێژە! ئەویش لە داخاندا دەیگوت: خوا دەکا، تۆ دەمری، یەکێ هەر دەبێ، بتنێژێ!

هەر لە ئەو خانووەدا بوو، بۆ یەکەمین جار، باوکم ڕادیۆیەکی گەورەی کڕی، لە سەربان تێلاّیەکیان بۆ داچەقاندبوو، وایەری هەوایی ڕادیۆکەیان پێوە بەستبوو، تا خشەخش نەکا و بە باشی وەربگرێ. زۆر جار لەسەر ئەوەی وایەرەکەم ڕادەکێشا و پیرەرادیۆ نوزەی لێ دەبڕا، تێهەڵدانم دەخوارد. هەر لە ئەو خانووەشدا بووین، (سوورێژە)م دەردا، لە یادمە، باجی (عاسم) لە دایکم پتر بۆم بە پەرۆشبوو!

بە داخێکی زۆرەوە، ئەو خێزانە بەرێز و باشە، تووشی گەلێ گرفت و چەرمەسەری بوون. کاکە (جەمال) ڕۆژی (20. 08. 1981)، لە (سێکاتیان) شەهیدکرا. (عومەر) و باوکی کوژران، باجی (عاسم) بە دەم پەژارە و داخەوە، بە هەناسەساردی سەرینایەوە،

کچەکانیش شوویانکرد، ئیدی لە یەکدی دابڕاین. بەڵام دوای نزیکەی (50) ساڵ، خوشکە (گێلاس)م دۆزییەوە، شووی بە کاک (زیرۆی عەبەڕێوی) کردبوو، زۆرم حەزدەکرد، بیبینمەوە. بۆیە ئێوارەی ڕۆژی (16. 11. 2014) سەرم لێدان، بە دەم گێڕانەوەی یادگارەکانەوە، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد.

هەر لە گەڕەکی (شێخان) و لە ماڵی (عەلی باپیر)دا بووین، لە خوار ماڵی ئێمەوە و لەسەر جادەکە، ماڵێکی گەورە هەبوو، چەند درەختێکی بەرداری تێدابوو، ماڵی (شێخ قادری حەفید)ی برای (شێخ مەحموودی حەفید)ی شای (کوردستان) بوو. لە ئەوبەر ماڵی (شێخ)یشەوە، قوتابخانەی ناوەندیی کچان بوو. کورسییەکیان بۆ (شێخ) دادەنا و لەبەردەرگەکەی ماڵی خۆیان دادەنیشت، کاتێ قوتابییەکان لە خوێندن دەبوونەوە و دەهاتنەدەرەوە، (شێخ) تەماشای دەکردن و چێژی لە ئەو تەماشاکردنە دەبینی. ئاخر هەموو شێخێ؛ بە ئەوە ناسراون، کە دڵیان تەڕە! ئێمەی منداڵانی گەڕەکیش چکۆلانە بووین، لە ئەو ناوە هاروهاجییماندەکرد، پیاوەکانیشی ڕاویاندەناین. ئەو کاتە ئەمان نەزانی، ئەم پیاوەی ئێستە بێ ئاز دانیشتووە و پیربووە، سوپاسالاری دەوڵەتەکەی خوارووی (کوردستان) بووە، ئاخر ڕاستیان فەرمووە: شێر کە پیربوو، دەبێتە گاڵتەجاڕی سەگ!

پاشان لە ئەو گەڕەکە گواستمانەوە و لە گەڕەکی (شێخان)، لە ماڵی (کەریمی سوبحان) و نزیك گۆڕەپانی دارەسووتاوەکەی ئێستە جێگیربووین، دوو ژوور و هەیوانێکمان بە کرێ گرت. ئیدی باوکم تا ساڵی (1955)، هەر لە نەخۆشخانەیەکی (سولەیمانی) مایەوە.

لە بیرمە، باوکم لە ژوورەکەماندا، وێنەیەکی گەورەی شا (فەیسەڵ)ی هەڵواسیبوو، زۆر منداڵ و جوان بوو، ڕەنگەکەشی ئاڵبوو، منیش زۆرم خۆشدەویست و نەمدەزانی، ناوی چییە، کە لێشیان دەپرسیم: ئەوە کێیە؟! دەمگوت: ئەوە حوکمەتە ئاڵەکەیە، هی خۆمە و نایدەم بە کەس!

بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا، لە ئەو گەڕەکە، تێکەڵاوی منداڵانی بەردەرگە و کۆڵان بووم. (جەباری کەریمی سوبحان، سەمەی بلەسووری عەرەبانچی و ڕەووف زێنەبە ڕەش)، لە هاوڕێ خۆشەویست و نزیکەکانم بوون. ماڵەکانمان لەسەر دەشت بوو، دەشتەکەش هەمووی بە گەنم و جۆ چێنرابوو، ئاشێکی چکۆلانەشی لێ بوو، هەمیشە لە ئەو دەوروبەرە، پێکەوە یاریماندەکرد و جارجاریش شەڕماندەبوو، بەڵام زۆر زوو ئاشت دەبووینەوە!

ئەو سەردەمە، هێشتا شاری (سولەیمانی)، هێندە گەورە نەبوو. دەوڵەمەندی کەم تێدا بوو. بە شێوەیەکی گشتی، زۆربەی خەڵک هەژاربوون. جگە لە چەن بنەماڵەیەکی دیاریکراو و دەسڕۆشتووی دەوڵەمەندی شار، خاوەنی خانووی خۆیان و زەوی تایبەتی بوون، ئیدی کەم کەس هەبوو، خانووی خۆی هەبێ.

دوور نییە، لە ئەو سەردەمانەدا، باری ئابووری باوکم، لە گەلێ کەسی دیکە باشتربووبێ! چونکە لە لایەکەوە: مووچەخۆری دەوڵەت بوو. لە لایەکی دیکەشەوە: خۆشی دەرزی لێدەدا، لەبەرئەوە پارەی دەستدەکەوت. خێزانەکەشمان، زۆر گەورە نەبوو، تا خەرجییەکی زۆری بوێ، بەڵکوو تەنیا هەر چوار کەس بووین. هەر لە ئەو ماوەیەدا بوو، باوکمیان بۆ شارۆکەی (قەرەداغ) نارد، بەڵام ماڵمان نەگواستەوە، بەڵکوو بە سەردان چووین و ماوەی دوو مانگێ ماینەوە، دوایی گەڕاینەوە.

**شارۆکەی ( سەییدسادق )**

ساڵی (1955)، باوکمیان بۆ (سەییدسادق) نارد و ئێمەش لەگەڵی چووین. شارۆکەیەکی زۆر خنجیلانەبوو، دوو بەشبوو، بە پردێکی چکۆلانە پێکەوە بەسرابوون. جادەیەکیش دڵی شارۆکەکەی دوولەتکردبوو، لەسەر ڕێی (هەڵەبجە - پێنجوێن) هەڵکەوتبوو. هەمووی چەن دووکان، کەبابخانەیەک و خواردنگەیەکی تێدابوو، لە قەراغ پردەکەش چاخانەیەک هەبوو، خەڵکی لێی دادەنیشتن و دۆمینەیانئەکرد، ئیدی ئاو بێنە و دەس بشۆ!

ئەوە یەکەمین جاربوو، باوکم خانوویەکی گەورە لە دەوڵەت وەرگرێ. خانووەکە چوار ژوور بوو، ژوورێکیان نەخۆشخانەبوو، ئەوانی دیکەشیان، خۆمانی تێدا دەژیاین. کەلوپەلی نێوماڵمان کەمبوو، ژوورەکانیش زۆربوون، بۆمان پڕنەدەکرانەوە و بە ئاسانی جێمان دەبووەوە.

لە پشتەوە، حەوشەیەکی گەورەی هەبوو، بیرێکی قووڵیشی تێدابوو، بە سەتڵ ئاومان لێ دەردەهێنا. بەردەمی خانووەکەش، باخێکی خنجیلانەی جوانبوو، هەر چواردەوریشمان چۆڵبوو. پشتمان شاخبوو، مەزارگەی (سەییدسادق)ی لێ بوو. لای ڕاستمان بە نووسەد مەترێ، سەرای پۆلیس بوو. ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (عوسمانی مەلا) بەرپرسیاربوو، خەڵکی (سولەیمانی) و هاوڕێی باوکم بوو. لای چەپیشمانەوە قوتابخانەیەکی سەرەتایی بوو، ڕەوانشاد مامۆستا (عەبدوڵڵا ئەژدەر) بەڕێوەبەربوو، پیاوێکی وریا و زیرەک بوو، کاتی خۆی (پیرەمێرد)ی هۆنەر، نازنازی (ئەژدەر)ی بۆ داناوە، واتە ئەژدیهای دووسەر! یەک دوو مامۆستای دیکەشی لێ بوو، قوتابخانەکەیان بەڕێوەدەبرد.

دوای ماوەیە، مامە (بەکر)م هات بۆ (سەییدسادق). لە ئەوێ لەگەڵ وەستا (موحەممەد) ئاوێکدا، نانەوخانەیەکیان دانا. هەرچەندە مامم، حەزی لە گاڵتەوگەپ دەکرد، منیشی خۆشدەویست، زۆر جار لەگەڵیدا دەچوومەدەرەوە، بەڵام زوو هەڵدەچوو.

شەوێکی زستانی باراناوی بوو، باوکم لە ماڵ نەبوو، کارەباشمان نەبوو، ئێمەش هەموومان لە یەک ژووردا کۆبووبووینەوە. من قسەم لەگەڵ مامم دەکرد و یاریم لەگەڵ دەکرد. ئەویش هیچ وەڵامی نەدەدامەوە. پەرتووکێکی بەدەستەوەبوو، دەیخوێندەوە. منیش بەری چراکەم لێ گرت و تاریکبوو. یەک دوو جار گوتی: بەری ئەو چرایە بەردە. بەقسەم نەکرد. من دەمویست، تووڕەیبکەم و کەمێ پێیبکەنم. ئەویش ماندووی کارکردن بوو، ئیدی لە داخاندا بە تەواوی تووڕەبوو، پەرتووکەکەی تێگرتم، بەسەرماندا نەڕاندی و بە دایکمی گوت: ئێوە فێراتانکردووە، وا بکا، بۆ ئەوەی من لە ئەم ماڵە بڕۆم. هەرچەندە دایکم لە من تۆڕەبوو، دڵنەوایی مامی کرد، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو، بە ئەو شەوە ساردە خۆی پێچایەوە و لێیدا ڕۆی!

کاتێ باوکم لە ماڵێ گەڕایەوە، بە ئەو بەزمەی زانی، ئێری گوتم. ئیدی مامم زویربوو، ڕۆیشت و هەر نەگەڕایەوە، لەگەڵ برادەرەکەیدا، لە نانەوخانەکە دەنووستن. من زۆرم پێ ناخۆشبوو، دوای چەن ڕۆژێ باوکم گوتی: وەرە با بچین بە دوایدا بیهێنینەوە. پێکەوە چووین و کاتێ چاوی بە من کەوت، پێکەنی و کولێرەیەکی گەرمی دامێ. منیش گوتم: بیرتدەکەم و دەبێ بێیتەوە. گوتی: باشە، بەڵام جارێکی دیکە لاساری نەکەی!

لەبیرمدێ، (قانع)ی هۆنەر نەخۆشبوو، بۆ چارەسەر هاتبوو بۆ نەخۆشخانەکەی (سەیید سادق)، لەگەڵ باوکمدا ئاشنایی پەیداکردبوو، هێندێ جار سەری لێ دەدا، زۆر دەستی کورتبوو، باوکیشم یارمەتیدەدا. ڕۆژێکیان بۆ نانی نیوەڕۆ هێنایەوە و پێکەوە نانیان خوارد، باوکم هێندێ کراس و پێڵاوی خۆشی دایە. پیاوێکی زۆر هەژار دیاربوو، کەوا و سەڵتەیەکی درێژی لەبەردابوو، جووتێ کەوشی سووری گەورەی دڕاوی لە پێدابوو، لە بەلەمێکی چکۆلانە دەچوون! ئێستەش وێنەی ئەو پیاوە هەژارە گەورەیە، هەر لەبەرچاومە!

ڕۆژێکیشیان (شێخ لەتیفی حەفید) لە (پێنجوێن)ەوە گەڕایەوە، بۆ نانخواردن و پشوودان، لە ماڵی ئێمە لایدا. شەو تا درەنگانێ، لە ژووری میوان دانیشتبوون، چەن کەسایەتی و فەرمانبەرێکیش، بۆ خۆشهاتنی هاتبوون و قسەیاندەکرد.

(شێخ لەتیف)، پیاوێکی زۆر ڕووخۆش و زمان شیرین بوو، تا بڵێی مرۆڤێکی بێ فیز و خاکی بوو، زۆر حەزی لە گاڵتە و پێکەنین دەکرد. منداڵیشی خۆشدەویست. منی لە تەنیشت خۆیەوە دانابوو، گاڵتەی لەگەڵ دەکردم. زووزووش باوکم لێم مۆڕدەبووەوە و

دەیگوت: بڕۆ ئەو دیو، (شێخ) بێزارمەکە. ئەویش دەیگوت: وازی لێ بێنە، با لای منەوە دانیشێ. باوکم هەر لە منالییەوە، هاوڕێی (شێخ لەتیف) بووە و لە یەک گەڕەکیشدا بوون.

**پەیوەندی نێوان هەردوو بنەماڵی شێخانی ( باراو ) و ( نۆدێ )**

مێژووی پەیوەندی نێوان شێخانی (باراو) و بنەماڵەی شێخانی (حەفید)، مێژوویەکی کۆنی هەیە. جگە لە ئەوەی لە سەردەمی (شێخ مارفی نۆدێیی) و (کاک ئەحمەدی شێخ)ەوە، جۆرە پەیوەندییەکی تایبەتییان هەبووە، لەسەردەمی (شێخ سەعیدی حەفید)یشەوە، جۆرە پەیوەندییەکی کۆمەلایەتی و خزمایەتیش، بە هۆی ژنوژنخوازەوە دروستبووە. چونکە کاتێ ساڵی (1784)، شاری (سولەیمانی) دروستکراوە، هێندێ لە بنەماڵەکانی شێخانی (باراو)، لەگەڵ بنەماڵەی شێخانی (نۆدێ)دا، لە نێوچەی (شارباژێڕ)ەوە کۆچیانکردووە، لە شاری (سولەیمانی) جێگیربوون و زۆربەشیان، هەر لە گەڕەکی (کانیسکان - شێخان) ژیاون. بۆ نموونە: ماڵی (شێخ سەعیدی حەفید)، لە گەڕەکی (شێخان) بوو، لەگەڵ ماڵی (سەیید کەریمی شێخ مارفی باراوی) و (شێخ مستەفای شێخ ئەلیاسی باراوی)دا دراوسێبوون. (شێخ مەحموود حەفید)، شیری (حەبیبەخان)ی خێزانی (شێخ مارف) و کچی (شێخ مستەفا)ی خواردووە. ئەفانەت دەگێڕنەوە، (شێخ عەبدولڕەحمانی باراوی)، خاڵی مامۆستا (سەیید نەجیبی باراوی)، هاوتەمەنی (شێخ مەحموود) و هاوڕێی منالی بووە، بە منالیش شەڕیانبووە و سەری شکاندووە!

هەروەها، کاتێ (شێخ مەحموود) لە گوندی (داریکەلی) ژیاوە، هەموو ساڵێ ڕۆژانی جێژن، هێندێ لە شێخانی (باراو)، وەک (سەیید کەریمی شێخ مارف، حاجی شێخ عەزیزی شێخ سالح ـ باپیرم، شێخ مەحموودی شێخ حەسەن، شێخ ڕەزای گولانی) کۆبوونەتەوە و سەریان لێ داوە. (شێخ)ی ئەمریش ئەوەی بیرکەوتووەتەوە و بە پێکەنینەوە، گوتوویەتی: خزماتی (باراو) گەلەکۆمەکێیم لێ دەکەن و هاتوونەتەسەرم! جگە لە ئەوەی (شێخ مەحموود)، خوشکێکی تایبەتیشی هەبووە، ناوی خاتوو (ئەلێ) بووە، خێزانی (شێخ مرحەممەدی خاڵۆی باراوی) بوو، کە خاڵی باپیرم بوو.



(شێخ مەحموودی حەفید، حاجی شێخ موحەممەدی شێخ عەزیزی باراوی (باوکم)، حەمەی ساڵەسوور، شێخ حوسێن بەردەزەردی پیاوی شێخ، حەمەی مەلاتۆفیقی تەزبیحفرۆش، کەریم چاوڕەشی پیاوی شێخ)، ئەو پیاوەی لە نێوان (شێخ) و باوکیشمدا، لە دواوە وەستاوە و تەنیا سەری دیارە، (ئەحەخورشە)ی شۆفێری تایبەتی (شێخ) بووە

ئەم وێنەیە کاتێ گیراوە، (عەبدولئیلا ــ وەصی)ی خاڵی شا (فەیسەڵ)ی دووەمی (عێراق)، ساڵی (1945) ویستوویەتی، سەردانی شاری (سولەیمانی) بکا. لە ڕێ لایداوە و لە گوندی (داریکەلی)، سەری لە (شێخ)ی ئەمر داوە. داوای لێ کردووە، یارمەتیی بێ و پێکەوە سەردانی شار بکەن. هەرچەندە (شێخ)، حەزی بە ئەو سەردانە نەکردووە، بەڵام هەرچی چۆنێ بووە، قایلیکردووە و پێکەوە گەیشتوونەتەجێ. جەماوەرێکی زۆری شارەکە، پێشوازیان لە (شێخ) کردووە و ترومبێلەکەیان بەرزکردووەتەوە، ئیدی (وەصی)یان هەر بیرچووەتەوە!

هەڵبەتە، گەر ئەو پێوەندییە گەرموگوڕ و تێکەڵاوییە، لە نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەدا هەبووبێ، شتێکی ئاساییە، گەر هێندێ لە کوڕەئازاکانی شێخانی (باراو)، لە زنجیرە شۆڕشەکانی (شێخ مەحموود)دا، بەشدارییانکردبێ. بۆ نموونە: (شێخ حەمەعەلی شێخ عەزیزی باراوی)، سەرلەشکری (شێخ) بوو، پیاوێکی زۆر ئازابوو، تەنانەت قسەی لە (شێخ)یش

قبوولّ نەکردووە! ساڵی (1918)، لە شەڕی (ئاوپارێز)دا شەهیدبووە، هەر لە ئەوێش نێژراوە. (شێخ سەعید)ی براشی، کە (ئەحمەدخواجە) لە (چیم دی)دا باسیکردووە، زۆر ئازابووە و لە شۆڕشەکانی (شێخ)دا، ڕۆڵێکی گەورەی دیوە.
جگە لە ئەوەی، شێخانی (بارام) بە سەر و ماڵ، یارمەتی شۆڕشەکانی (شێخ)ی نەمریان داوە، لە جەنگی (دەربەندی بازیان)ی ساڵی (1919)شدا، چەندین بریندار و شەهیدیان هەبووە. هەر لەگەڵ (شێخ)ی نەمریشدا، (شێخ مەحموودی شێخ حەسەنی شێخ مارف باراوی: 1904 – 1990) دەستگیرکراوە و بەدیلگیراوە.
جگە لە ئەو شەهیدانەش، لە هەردوو شۆڕشی (11. 09. 1961) و شۆڕشی (1976)ی نوێی گەلەکەماندا، بە دەیان پێشمەرگە و لێپرسراوی ڕامیاری و سەربازییمان هەبووە. چەندین کەسیش بریندار و شەهیدبوون، هەر یەکێکیشیان، سەر بە پارتێکی جیاواز بوون.
بۆ نموونە: ملازم عەبدوڵلای شێخ مەحموود ناسراو بە عەبەڕەش، ساڵی 1963 لە کەلری، لەگەڵ 28 پێشمەرگە، شێخ مەحموودی شێخ فەرەج سەرپەلبوو، ساڵی 1964 لە سەرتەکی یەمۆ شەهیدبوون (پ.د.ک.). ساڵی (1974) گوندی (باراو) بۆردوومان کراوە، (7) کەس شەهیدبوون. {حەمەئەمینی شێخ ڕەووف ناسراو بە شەهید پۆڵا، ساڵی 1977 لە نێوچەی قەراخ (ی.ن.ک.)، شادمانی شێخ عوسمانی شێخ مستەفا، ساڵی 1980 لە دەوروبەری کەرکووک (ی.ن.ک.)، مامۆستا غەفووری شێخ جەلالی بەرگدروو، ساڵی 1983 لە شاربازێڕ (پ.د.ک.)، ئاسۆی شێخ بەکری شێخ عەزیز، ساڵی 1985 لە گوندی حەسەن تەپە لە داستانی دابان هەلاج (ی.ن.ک.) و شێخ موحەممەدی شێخ سەعید ساڵی 1984 لە دەوروبەری عەربەت (کۆمۆنیست)} شەهیدکراون. هەروەها (ڕەفیقی شێخ تۆفیق)، ساڵی (1992) لە (نەیوغرێب) لە سێدارەدراوە و سەر بە (سۆسیالیست) بوو.

## قوتابخانەی سەرەتایی

زۆر حەزم لە خوێندن دەکرد، چونکە بەیانیان زوو دەمبینی، منداڵەوردەکەی شارۆکەکە خۆیان گۆڕیوە و یەکی تووربەکەیەکیان لە مل دایە، دەفتەر و پێداویستییەکانی قوتابخانەیان تێدا هەڵگرتووە و بەرەو قوتابخانە دەڕۆن. منیش زۆر حەزمدەکرد، وەک ئەوان بخوێنم. بەڵام ئەو کاتە، هێشتا شەش ساڵم پڕنەکردبوووەوە، وەریان نەدەگرتم.
مامۆستا (عەبدولڕەحمەن) هاوڕێی باوکم بوو، هاتوچۆشیەدەکردین، گوتی: من لەگەڵ خۆم دەیبەم، تاقیدەکەینەوە، تا بزانین چۆنە. گەر شت تێگەیی و زیرەکبوو، ئەوا وەریدەگرین.
بەیانی چووم بۆ قوتابخانە، بانگیانکردم بۆ ژووری مامۆستاکان. مامۆستا (عەبدوڵا) لێی پرسیم: حەزدەکەی بخوێنی؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: بۆ؟ گوتم: بۆئەوەی گەورەبم. من وام دەزانی، هەرچی بخوێنێ، زوو گەورەدەبێ!

پاشان لێی پرسیم: باوکە خۆشدەوێ؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: بەقەدەر چەن؟ گوتم: بەقەدەر سەگێ. ئیدی هەموو مامۆستاکان دەسیانکرد بە پێکەنین و گوتیان: بۆ بەقەدەر سەگێ؟ گوتم: چونکە سەگم زۆر خۆشدەوێ.

دوایی، ناردیان بە دوای باوکمدا، ئەویش هات و بۆیان گێڕایەوە، باوکیشم پێکەنی. پێیان گوت: ناتوانین، وەریبگرین، بەڵام با وەك گوێگر لە پۆلدا دانیشێ و شتێ فێربێ، تا تەمەنەکەی دەگونجێ، ئەو کاتە وەریدەگرین. ئیدی زۆرم پێ خۆشبوو، چونکە من تێ نەدەگەیشتم، گوێگر چییە؟ وەرگیراوم، یا وەرنەگیراوم، گرنگ نەبوو، گرنگ ئەوەبوو، وەك ئەو هەموو قوتابییانە، بەیانیان زوو هەڵدەستام و نانمدەخوارد، خۆم دەگۆڕی، دەفتەرەکان و پێنووسەکەم کۆدەکردەوە و ملی ڕێی قوتابخانەم دەگرت! بە ڕاستی، زۆر کەڵکم لە ماوەی ئەو گوێگرتنە وەرگرت، چونکە کاتێ چوومە قوتابخانە، زۆر شتم دەزانی.

هەر لە (سەییدسادق) بووین، چلەی هاوینی ساڵی (1956) بوو، خوا کوڕێکی دیکەی دایێ، دیسان باوکم تێلیفۆنی بۆ باپیرم کردەوە، تا بزانێ، چی ناوبنێ، ئەویش بە ناوی (سەلاحەددینی ئەیووبی)یەوە، ناوی نا (سەلاح).

لە (سەییدسادق)، کۆمەڵێ فەرمانبەری خەڵکی (سولەیمانی) لێ بوو، شەوانە لە ماڵێ کۆدەبوونەوە، دەیانخواردەوە و گۆرانییان دەگوت، یا، یاری کاغەزیان دەکرد. لە ئەوانە: (سەلاحی سەعید بەگ) بەڕێوەبەری شارۆچکەکە بوو، (عوسمانی مەلا) ئەو کاتە قۆمیسەر بوو، هێندێ مامۆستاشی لێ بوو. بۆیە زۆربەی شەو باوکم بەجێیدەهێشتین و درەنگانێ دەهاتەوە. هەرچەندە ئەو نە یارییدەکرد و نە دەشیخواردەوە، بەڵام هەمیشە حەزی لە کۆڕ و دانیشتن بوو، دەنگیشی خۆشبوو و گۆرانی دەگوت.

(فایەقی مۆتێ)

تەنیا ماڵێ ئێمە هاتوچۆماندەکرد، ماڵی وەستا (عەبدوڵی کەبابچی) بوو. نێوانمان زۆر خۆشبوو. کچێکی چکۆڵانەی هەبوو، ناوی (بەووناك) بوو، زۆر ڕێکبووین و پێکەوە یارییماندەکرد. دایکیشی (شەمسە) خان، ژنێکی زۆر دەس و دڵ فراوان بوو.

شەوێکیان بانگیانکردین و گوتیان: (فایەقی مۆتێ) لە (سولەیمانی)ەوە هاتووە، ئەم شەو لە ماڵی ئێمە میوانە و جادوومان بۆ دەکا. ئێمەش چووین. ماڵەکە لەبەر میوان جمەی دەهات، هەموو ئەو خەڵکەش لە جادووباز کۆببوونەوە.

دوای نانخواردن، کاکەی جادووباز تورەکەیەکی دەرهێنا و تۆزێ ئاردی تێکرد، دەزوویەکی سپی ئەستووری کلاشچنینیشی هێنا، سەرێکی دەزوومکەی خستە نێو تورەکەکەوە، سەرەکەی دیکەشی، بردە هەیوانەکە و بە شتێکەوە قایمیکرد. منیش هەر بە دوایەوە بووم. بە کورتییەکەی، وەک تەناق ئەمریەمنی لێهات! ئینجا هاتەوە ژوورەوە و گوتی: منالینە! حەز لە چی دەکەن؟ هەموو گوتمان: حەز لە حەڵاو و گەزۆ دەکەین.
دیسانەوە، جارێکی دیکە چووەوەدەرەوە، ئێمەش هەموومان، لە پەنجەرەکەوە سەیرمان دەکرد، تا بزانین، چی دەکا. ئەویش دەستی بە دەزووەکەوە گرتبوو، پێیدا دەهات و لەبەر خۆیەوە، هەر بۆڵەیدەهات، چەن قسەیەکی دەکرد، لە کوردی نەدەچوو، بۆیە کەسمان لێی تێ نەدەگەیشتین. تا هاتەژوورێشەوە، دەستی هەر بە پەتەکەوە بوو. ئینجا لە تورەکەکە نزیکبووەوە و دەستی بە دەزووەکەوە خستە نێوی. یەک دوو جار لەنێو تورەکەکەدا، دەستی ڕاوەشان و لەبەر خۆشییەوە، هەر شتی دەخوێند. پاشان، دەستی بە چنگێ حەڵوا و گەزۆوە دەرهێنا و گوتی: فەرموون، بخۆن! ئێمەش بە گەورە و بچووکمانەوە، سەرمان سووڕمابوو، ئەمە چی بوو؟ تۆ بڵێی خەوبێ، وا ئێمە حەڵوا و گەزۆی شیرین و بە تامی، بەری جادووەکەی خاڵە (قایەق) دەخۆین؟!
ئیدی خەومان بیرچووەوە، هەرچەند لێیان پرسی، باشە ئەمە چۆن و لە کوێ فێربووی؟ ئەویش هەر دەیگوت: کەس ئەو جۆرە پرسیارانەم لێ ناکا. حەڵوا و گەزۆی خۆتان بخۆن و هەقی هیچی دیکەتان نەبێ. وا بزانم، دوایی ئیسلامییەکان کوشتیان!
ماڵی (تالیب ڕەشید)ی برای مامۆستا (خالید ڕەشید)، لە شارۆچکەی (هەڵەبجە) بوو، لە ئەوێ فەرمانبەری میریی بوو، لە کۆنەوە ئاسیاوی و ئێکەلاویمان هەبوو، ئەو ئێکەلاوییە بە شێوەیە بوو، ماڵی ئێمە بۆ ئەوان سەرەڕێی (سولەیمانی) بوو، زۆرزوو لایاندەدا، ئەوان دەهاتن و ئێمەش دەچووین. من (هەڵەبجە)م زۆر لە (سەییدسادق) پێ خۆشتربوو. لەگەڵ (نوخشە)ی کچیشیدا شیرم خواردبوو.
جارێکیان چووین بۆ لایان و (هەڵەبجە)شمان بینی. شەوێ دانیشتبووین، لەگەڵ (نوخشە)دا لێمان بوو بە شەڕ. باوکم کردبوویە بارەشی و منیش وڕکم گرتبوو، دەمگوت: باوکی خۆمە، دەبێ لاچی. ئەویش ڕقی منی هەڵدەساند و دەیگوت: باوکی خۆمە و لاناچم، زمانیشی لێ دەردەهێنام. ئیدی بیرکردنەوەی منالی وایە! هەر هێندەیان زانی، زرمەم لێ هەستان، ئەویش دەستیکرد بە گریان و منیشیان ڕاونا!

خۆش ئەوەیە، ساڵی (1988) لە شاری (هانۆڤەر ـ ئەڵمان)، سەرێکی مامۆستا (خالید)م دا، (نوخشە)ی برازاشی لە ئەوێ بوو. پێم گوت: من و تۆ خوشك و برای شیرین. ئەویش گوتی: من بیرم نایە، شیرم لەگەڵ تۆ خواردبێ. ئاخر کێ بیری دێ، شیری لەگەڵ کێ خواردووە، گەر دایك و باوکی لایەکیان پێیان نەڵێن!

(سولەیمانی)

هەموو ساڵێك و چەن مانگێ لە (سەیدسادق) بووین، پاشان لە نێوەڕاستی ساڵی (1956)دا بوو، بۆ شەکرە شارەکەی (سولەیمانی) گەڕاینەوە، لە گەڕەکی (کانیسکان) لە ئەوبەر جادەی بازاڕە بچکۆلەوە، خانوویەکمان لە کۆڵانەکەی پشت دووکانەکانی سەرجادەکەوە گرت، خانووی (مامەخولە)یان پێ دەگوت و ئێستەش هەر ماوە!

خانووەکە زۆر چکۆلانەبوو، دوو ژوور و هەیوانێ بوو، حەوشەیەکی زۆر تەسکوترووسکی هەبوو، بەڵام دوو نهۆمبوو، ژوورێکیان لە خوارەوە بوو، خاوەنماڵەکەی تێدا دەژیا. حەوشەکەی ئێندە چکۆلانە و قووڵ بوو، هەر لە بیرەچوو! ژوورەکەی دیکەشیان، لەگەڵ هەیوانێکی چکۆلەدا لە سەرەوە بوو، بە پێپلیکانە بۆی سەردەکەوتین، ئێمە بەکرێ گرتبوومان، هەورەبانێکی قووچیشی هەبوو، لە ئەوێشەوە، بە پەیژە بۆ سەربان سەردەکەوتین.

لە ئەم خانووەدا ئەوەی گرنگبێ، وەك ئێستە لەبەرچاوم بێ و هەرگیز لە یادم ناچێ، ئەوە بوو، تەقە و هەرا و گریان دەستیپێکرد. ئێمە لە ماڵی باپیرم بووین، هەر کە گوێمان لە ئەم تەقە و هەرایە بوو، دایکم پەلی گرتین و بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە. ویستمان، لە جادەکەی بازاڕەچکۆلەوە بپەڕینەوە، تەقەیەکی زۆر لە خۆپیشاندەران کرا. ئێمەش ناچاربووین، لەسەر سووچی کۆڵانەکە بوەستین و لە پاڵ دیوارەکەی قوتابخانەی (کانیسکان)دا، خۆمان ماتکەین. دوای ماوەیە تەقە نەما و دونیا کشومات بوو. خەڵکی لە هەموو لایەکەوە، لە سەرجادەکە کۆبوونەوە و هێندێکیشیان، بەرەو مزگەوتی گەورە دەڕۆیشتن، دەگریان و دژی میریی قسەیاندەکرد.

ئێمە دوایی زانیمان، تەرمەکەی (شێخ)یان لە (بەغدا)وە هێناوەتەوە و دەیانەوێ، لە مزگەوتی گەورە بینێژن. خەڵکەکەش هەموو، لە دەوری تەرمەکەی کۆبووبوونەوە، هێندێ دەگریان، هێندێکی دیکەش دژی ڕژێم قسەیاندەکرد. چەکدارەکانی میرییش نەیاندەویست، پلاوە بە خەڵکەکە بکەن، بۆیە دەسڕێژیان لێ کردن، چەن کەسێ بریندار و شەهید بوون.

مامۆستا (ڕەفیق حیلمی) سەبارەت بە کۆچیدوایی (شێخ)، لە یاداشتەکانیدا نووسیویەتی: ڕۆژی سێشەممەی ڕێککەوتی (09. 10. 1956) کۆچیدواییکردووە. دیارە ئەو ڕووداوەش، هەر ئەو ڕۆژە بووە، یا ڕۆژی دوایی بووە!

(خاوێ)

باوکم هەر ساڵی (1956) بوو، ماوەیە لە نەخۆشخانەی گوندی (خاوێ)ی سەر بە شارۆکەی (قەرەداغ) کاریدەکرد، ئێمەش ماوەی مانگێ لە ئەوێ بووین، پاشان گەڕاینەوە. ئەم گوندە زۆر جوانبوو، هەمووی باخی میوە بوو، بارکیشم زۆر ئەمایەوە و زوو گەڕایەوە.

دیسان شاری (سولەیمانی)

کە باوکم لە (خاوێ) گەڕایەوە، لە ماڵی (بابەخولە) گواستمانەوە و ئەم جارەش، هەر لە گەڕەکی (کانیسکان) لە پشت ماڵی باپیرمەوە، لە ماڵی (مەلاسابیر) و لەسەر دالانەکەی دەرگەی دەرەوە، ژوورێکمان بەکرێگرت. ئەم ماڵە زۆر گەورەبوو، حەوشەیەکی گەورەشی هەبوو، لە نێوەڕاستدا حەوزوفوارەیەکی گەورەی تێدا بوو، دوو دارمێوییان لە دەوری ناشتبوو، بەرزبووبوونەوە و سەری کەپرەکەیان، بە پەلکەکەڵا گرتبوو، بە شێوەیەکی زۆر جوان ڕازاندبوویانەوە. لە ئەو بەری حەوشەکەشەوە، خانوویەکی دوو نهۆم بە حەوادا چووبوو. خوارەوەی کەسی تێدا نەدەژیا و کەلوپەلی خۆیانی تێدابوو، خۆشیان لە سەرەوە دەژیان.

خاوەن ماڵەکە پیاویان نەبوو، خێزانەکەیان لە ژنێک، دوو کچ و کوڕێکی گەورە پێکهات بوو. ژنەکە ناوی (نەعیمە)خان بوو، کچەکان ناویان (گوزیدە) و (وەزیرە) و کوڕەکەشیان ناوی (فازیل) بوو، لە هەموویان گەورەتربوو. منداڵەکان هەموویان، زۆر لە من گەورەتر بوون. لەگەڵ کچەکاندا دۆستایەتیمان زۆر خۆش نەبوو. خەتای من بوو، چونکە گاڵتەم پێ دەکردن و ئەوانیش لێیاندەدام. بەڵام (فازیل)، هەمیشە ئاوبژێدەکردین و ئامۆژگاری منی دەکرد، قسەیان پێ نەڵێم. دوای چەن ساڵێ، بۆ خوێندن چوو بۆ (یەکێتی سۆڤێت)، پاشان بوو بە پزیشك و گەڕایەوە.

لە بیرمدێ، لە ژێرخانە تاریکەکەی ماڵی خۆیاندا، دکتۆر (فازیل) ئامێرێکی سینەمایی ڕەشوسپی هەبوو، هێندێ فیلمی کورتی بێدەنگی پیشاندەدا، منداڵانی گەڕەك، یەکی بە دوو و سێ فلس دەچووین و سەیرماندەکرد. لەبەرئەوەی لە یەك حەوشەدا بووین، هێندێ جار پارەی لە من وەرنەدەگرت. فیلمی وا هەبوو، هێندەم سەیرکردبوو، تامی تێدا نەمابوو!

ئەنكیشیان ناوی (نەجیبە)خان بوو، هەر لەگەڵ خۆیاندا دەژیا. پیرێژنێکی سەیری بەتەمەنبوو، چاوی کزبوو، چاویلکەیەکی زەرەبینی لە چاودابوو، کۆچانێکی جوانیشی بەدەستەوەبوو. لە هاویناندا، هەمیشە لە گوێ حەوزوفوارەکە دادەنیشت و هەر بۆڵەی دەهات. کوردی باش نەدەزانی، لە ئەوە دەچوو، لە بنەڕەتدا لە تورکمانەکانی (کەرکووک) بووبێ. بە کوردییەکی شەقوشڕ قسەیدەکرد، قسەکانی بە لای منەوە، زۆر ئەنتیکەبوون، چونکە ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ژیانمدا گوێم لە ئەو جۆرە زمانە بێ! جارێ قسەی بۆ دایکم دەکرد، منیش لە لایانەوە وەستابووم، زۆر باش گوێم بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو، لە پڕ لەبری ئەوەی بڵێ: جاجم، گوتی: جیجم. ئیدی من خوا بۆی دام، دامە قاقای پێکەنین و لێم کرد بە هەرا. ئەویش زۆر لێم تووڕەبوو، بەڵام من مێش میوانم نەبوو، وەك لەگەڵ منیشی نەبووبێ! وابوو! بە ناو حەوشە گەورەیەدا ڕامدەکرد و هاوارمدەکرد: جیجم، جیجم، جیجم. دایکیشم ڕاوینام، گرتمی و مستێکی باشی تێسرەواندم. ئیدی تا کرنجیشیان بووین، هەر بە جیجم ناومدەبرد!

ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ئەو ماڵەدا کەسێکی دایکم ببینم و سەردانمان بکا. ئەویش خوالێخۆشبوو خاڵە (ڕەحیم)م بوو، هەرچی چۆنێ بوو، ئێمەی دۆزیبووەوە و سەری لێ داین. من زۆرم پێ خۆشبوو، کە بینیم، چونکە دایکم هەر بۆی باسدەکردم، کە چوار برا و خوشکێکی هەیە و منیش کەسیانم نەدیبوو. تا ماوەیەکیش بە دیارییەوە وەستابووم، هەر سەیرمدەکرد و حەپەسابووم، پاشان لەگەڵیدا ڕاهاتم و زۆرم خۆشویست. جا نازانم، وەك دەڵێن: لەبەرئەوەبوو، خاڵ لە مام خۆشەویستترە، یا لە ئەوە پێشتر کەسی دایکمم نەدیبوو، تازە دیبووم، بۆیە وا واقم وڕمابوو؟!

ماڵی (حاجی عومەر سدیق) دراوسێمان بوو، دوو کوڕی هەبوو، کەمێ لە خۆم گەورەتر بوون، گەورەکەیان ناوی (حەمەتاهیر) و بچووکەکەشیان ناوی (فارووق) بوو. لەگەڵ (فارووق)دا، هاتوچۆی ماڵی یەکدیمان دەکرد و پێکیشەوە یارییماندەکرد. ئەوە لە ئەو گەڕەکەدا، یەکەمین هاوڕێی ژیانم بوو، کە دوای ماوەیەکی دووروودرێژ لە زانکۆی (سولەیمانی) بەیەکگەیشتینەوە. ئەو کاتە ئەو دوکتۆرای لە (یەکێتی سۆڤێت) تەواوکرد بوو، لە کۆلێژی ویژە دامەزرابوو.

وەك ئێستە لە بیرمە، جێژنی قوربانبوو، وەرزی هاوینبوو، هەموو منداڵانی گەڕەك خۆمان گۆڕیبوو، ئەو دوو برایەش هاتن بە دوای مندا و پێکەوە چووین بۆ گەڕان. باوکم جلی جێژنی بۆ کردبووم، کراسێکی قۆڵکورت و پانتۆڵێکی تازەی مەیلەوسپیم لەبەردابوو. ئەو کاتە ئەو منداڵانەی پێکەوە دەگەڕان، یەکسەر بەرەو سەرجادەی بازاڕەچکۆلە دەڕۆیشتن، لە دووکانەکەی (ئەحمەکەچەل)، قەزوانی سوێر و چەقاڵەیان دەکڕی، یا زلوبیایان دەخوارد،

پاشان، بەرەو مزگەوتی گەورە تلدەبوونەوە. لە نێوێ عەرەبانەی یەکئەسپی وەستابوو، منالان زۆر حەزیان لە سواری عەرەبانە دەکرد. هەر منالێ بە عانەیەک سواردەبوو، کە چوار فلسی دەکرد. کاتێ عەرەبانەکە پڕدەبوو، کابرای عەرەبانچی پارەکەی کۆدەکردەوە و لەبەر بەرزی عەرەبانەکەش، یەکەیەکە سواریدەکردین. هێواش هەبوو، حەزی نەدەکرد، عەرەبانچییەکە یارمەتییدا؛ بەڵکوو خۆی بە تایەکانیدا هەڵدەواسی و هەرچی چۆنێبێ بە تەقەتەق سواردەبوو. ئینجا عەرەبانچییەکە، دەرگە چکۆلانەکەی پشتەوەی دادەخست، لە پێشەوە سواردەبوو، ناوی خوای لێ دەهێنا و بەڕێدەکەوت. ئەسپە بەسزمانەکەی بە قامچی دادەگرتەوە، بە هەچەهەچە و دەنگەدەنگ بەڕێدەکەوتین. هێندێ منالی راش هەبوون، دەترسان و دادەنیشتن، هەشبوون، چاویان قایمبوو، بەپێوە دەوەستان. ئیدی منالان گۆرانی شیرینێ لەیلانێ و لەیلانێیان دەسپێدەکرد، بە هەموو جادەکانی بازاڕە چکۆلەدا، بە سواری عەرەبانەکە دەڕۆیشتین و گۆرانیمان دەگوت. تا دەگەیشتینە سەرچاوەی ئاوەکەی (کانیسکان)، کە ئێستە لە ئەو شوێنەدا، مزگەوتێکی لێ درووست کراوە و ئاوەکەش لەنێو مزگەوتەکە دایە. لە ئەوێ دادەبەزین و کەمێ دەوەستاین، ئاوی ساردمان دەخواردەوە و پشوویەکمانئەدا. ئینجا گەر منالی دیکە هەبووایە و جێ هەبووایە، عەرەبانچییەکە هەڵیدەگرت و بە گۆرانیگوتن دەگەڕاینەوە؛ لە کوێ سواربووین، هەر لە ئەوێش دادەبەزین.

ئەو جارە، کاتێ لەگەڵ (فارووق) دابەزین، بینیم، پانتۆڵەکەم هەمووی قیراوییبووە، ئیدی بە پەلە خۆم گەیاندەوە ماڵەوە، پانتۆڵەکەم بۆ دایکم دانا و گوتم: ئامەوێ، قیراوییە. باوکیشم وەک پیشەی خۆی، لەبری نانی نیوەڕۆی جێژن، ژەمەلێدانێکی باشی دەرخواردام!



(شێخ کاوەی شێخ لەتیفی حەفید)

تا لە ئەو گەڕەکە بووین، جاروبار (شێخ کاوە) لەگەڵ (بەکری سدیقی ئامەدریژ)ی شوفێری باوکی، یا لەگەڵ مام (حەسەن)ی پیاویاندا، بۆ یاریکردن بۆ ماڵی ئێمە دەهات. هێندێ جار منیش لەگەڵ دایکم، یا باوکمدا سەردانمانئەکردن، لە ئەو حەوشە گەورەیەدا پێکەوە یاریمانئەکرد. من و (کاوە) لە یەک ساڵدا لەدایکبووبووین، بەڵام دایکم دەیگوت: (کاوە) چەن مانگێ لە تۆ گەورەترە.

دیارە ئەو کوڕی (شێخ لەتیفی حەفید) بوو، تەنیا هەر ئەو تاکە کوڕەشیان هەبوو، زۆریان خۆشدەویست و دەوڵەمەندیشبوون، لەبەرئەوە، چەندین جۆر یاری منداڵانەی جوان و ڕێکوپێکی تازەی هەبوو، وەک ئەسپ، سەگی تەنەکە، پاسکیل، قاز، مراوی و کۆتری نایلۆن، تفەنگی ساچمە، دەمانچەی لاستیک و گەلێ شتی دیکەشی هەبوو. ئەک هەر من، بەڵکوو زۆربەی هەرە زۆری منداڵانی کوردیش، لە ئەو سەردەمانەدا، لە ئەو جۆرە یارییانە بێبەشبوون! لەبەرئەوە هەر کە دەچوومە ئەوێ، خێرا پەلاماری یارییەکانیم دەدا، سواری ئەسپ و پاسکیلەکەی دەبووم، پاشان شەڕەناومانئەکرد، بە یاریکردن و پێکەنینەوە، کاتێکی خۆشمان بەسەردەبرد.

زۆر جار یاریمانئەکرد و لەنێو چیمەنەکەیاندا زۆرانمانئەگرت، هەموو جارێ پشتیم لەگەڵ زەویدا جووتئەکرد. ئەویش هاواری لێ هەڵدەستا و هەڵدەسایەوە، بە شەق و بۆکس تێیدەکەوت، ئەیکرد بە شەڕی ڕاستەقینە. منیش دەسم نەدەکردەوە، بەڵکوو تەنیا داکۆکیم لە خۆم دەکرد، پاڵێکم پێوەدەنا و لە خۆمم دووردەخستەوە. ئاخر لە ئەوە زیاتر چیم بکردایە؟! چونکە دوو پیاوی سمێڵبابڕ بە دیارییەوە وەستابوون، چاوەڕێی فەرمانێ بوون و لەسەرییکەنەوە! خۆ ئەشئەکرا، وەڵامی کوڕەزای شای (کوردستان) بدەمەوە، تێی بسرەوێنم و هەقی خۆمی لێ بکەمەوە!

جاری واش هەبوو، زۆرانمانئەگرت و ژێردەکەوت، یەکێ لە پیاوەکانیان پاڵێکی بە منەوە دەنا و ئەویش سواری سەرم دەبوو. منیش هەر هێندەم پێ دەکرا، لە ناچاریدا خۆم لە دەسی ڕزگارکەم و هەستمەوە. پیاوەکانیشیان بە دیارمانەوە دەوەستان و بە پێکەنینەوە، چەپڵەیان بۆ (کاوە) لێدەدا، منیش لە دلخانەدا دەسم بە زووڕەزووڕ دەکرد، داخی دڵی خۆم بە دایکم دەڕشت و دەمگوت: هەمووی خەتای تۆیە، من بۆ ئێرە هێناوە و دەبێ بڕۆینەوە. هێندێ جاریش، لێمان دەبوو بە شەڕ و بە زویری لێک جیادەبووینەوە. بەڵام دوای ماوەیەکی کورت، هەر هێندەم دەزانی، (کاوە) لەگەڵ یەکێ لە پیاوەکانیاندا، خۆی دەکرد بە ماڵ، ئیدی وەک هەر هیچ ڕووی نەدابێ و لە یەکدیش زویر نەبووبین، وابوو، کەسیشمان گلەییمان لە ئەوی دیکەمان نەدەکرد و دەسمان دەکردەوە بە یاری!

ئێوارەیەکیان لەگەڵ پیاوێکیاندا هات، باوکم لە ماڵەوەبوو، (کاوە) گوتی: ئەم جارە چاوشارکێ دەکەین. باوکم منی ئاربەدەرەوە و ئەویشی شاردەوە. دوای بانگیکردم و گوتی: دەی گەر زیرەکی بیدۆزەرەوە، بزانە لە کوێ خۆی شاردووەتەوە؟! منیش زۆر بە پەرۆشەوە، هەموو کونوقوژبنی ئەو ژوورە چکۆلانەیە گەڕام و بۆم نەدۆزرایەوە.
سەیر ئەوەبوو، هەر ئەو ژوورەمان هەبوو، ئەویشمان بە سندووقێکی درێژی ئەشتەرخان دابەشکردبوو، لە بەشی پشتەوەی زەخیرەمان دانابوو، لە پێشیشەوە لێی دادەنیشتین و لێی دەنووستین. لەسەر سندووقەکەش، نوێنەکانمان هەڵچنیبوو. تەنانەت پشت سندووقەکە و نێو سندووقەکەش گەڕام، کەچی هەر نەمدۆزییەوە. ئینجا (کاوە) لە ئەوە پتر خۆی بۆ نەگیرا، بانگیکردم و جاروبارێش لە قاقای پێکەنینی دەدا. منیش گوێم لە دەنگی بوو، بەڵام نەمدەزانی، ئەو دەنگە لە کوێوە دێ. تا دوا جار بەرزبووە و هاواریکرد: تەواو من بردمەوە و تۆ دۆڕای. ئیدی باوکم لەسەر نوێنەکان دایەگرت!
(شێخ کاوە) زۆر دەستی ڕاستبوو، زۆر جار لە حەوشەکەی ماڵی خۆیان، ئیشانەی لە چۆلەکەی سەر درەختەکان دەگرتەوە، مەگەر بەدەگمەن لێیان قووتاربووایە، ئەگینا زۆربەی هەرە زۆری جارەکان، ئەو چۆلەکە بەسزمانانەی تەپاوتل بەربەدایەوە. جارێکیان منیش ویستم، چانسی خۆم تاقیکەمەوە، هەر باشبوو، لە قەدی درەختەکەشم دا!

(حەسەن)ی برام

لەگەڵ (حەسەن)دا، میانەمان زۆر خراپبوو. لە هەر شوێنێ منی بدیایە، لێیدەدام. لە ڕاستیدا، هەم برای گەورەم بوو، نەمدەکرا، هیچی پێ بڵێم و لێی هەڵگەڕێمەوە. هەم زۆر دڕ و ئازا بوو، نەک هەر من، بەڵکوو منداڵانی گەڕەکیش، دەرەقەتی نەدەهاتن. هەم زۆریشی لێ دەترسام، تا لە ئەو ماڵەشدا بووین، بە دەستییەوە وێرانبووم. چونکە لە یەک گەڕەکدا بووین و ماڵەکەشمان لە ماڵی باپیرمەوە زۆر نزیکبوو. هەمیشە لە کۆڵان، لووتم بە لووتیدا دەتەقییەوە. خوا هەڵناگرێ، جاری واش هەبوو، هێمنتەبووە و لێم تووڕە نەدەبوو، لەگەڵ خۆی دەیگێڕام و دەیبردم بۆ سینەما.
من هەرگیز ڕقم لێی نەبووە، مەگەر ئەو کاتانەی بە خۆڕای و بێ تاوان لێی بدامایە، ڕقم هەڵدەستا و دەسەڵاتم هەبووایە، تێرم دەکوتا. ئەگینا هەمیشە هەقم گوتووە، ڕێزمگرتووە و بەزەییشم پێدا هاتووەتەوە، بەڵام هەرگیز خۆشم نەویستووە. چونکە ئەو نەک ئێمە، بەڵکوو کەسی خۆش نەدەویست و ئێستەش هەر وایە، هێندە بێ ئەمەک و سپڵەشە، هەموو دەست بکەی بە هەنگوین و بیکەی بە قوڕگیدا، هێشتا هەر دەڵێ: تاڵە!

هۆی ئەم ناکۆکی و پەرتەوازەییەش ئەوەبوو، کاتێ باوکم لە دایکی جیابووەتەوە، (حەسەن) منداڵێکی چکۆلانەبوو، دایکی بەجێیهێشتووە و نەیویستووە، گەڕاوەتەوە بۆ (هەولێر) و لە ئەوێ شوویکردووەتەوە، ئیدی لە ئەم منداڵەی نەپرسیوەتەوە!
کاتێ دایکیشم هاتووە، (حەسەن) دوو ساڵانبووە. هەر لە سەرەتاوە داوایکردووە، خۆی بەخێویکا، تا هەر لە منداڵییەوە، هەم لەگەڵ خۆی، هەم لەگەڵ خوشك و براکانی پاشەڕۆژیشیدا، پێکەوە گەورەبین، ڕابێن و هەست بە هیچ جۆرە جیاوازییەك نەکا. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو کاتە، هەموو بنەماڵەکە، تەنیا ئەو تاکە منداڵەیان هەبووە، ئەنکم دڵی نەهاتووە، لەبەر دەستی باوەژندا دابنێ. بە ئەو داوایەی دایکم قایل نەبووە و گوتوویەتی:
من چۆن ئەو منداڵە بێ دایکە، لای باوەژن دادەنێم، خۆم بەخێویدەکەم!
(حەسەن)، لەگەڵ پوورە (نەسرین)مدا، نزیکەی هاوتەمەنن، لەبەرئەوە ئەنکم بە شیری خۆی بەخێویکردوون، گەورە و پەروەردەیکردوون. بۆیە لە لایەکەوە: کوڕی باوکم بوو، لەلایەکی دیکەشەوە: شیربرای بوو! لەبەرئەوە، (حەسەن) لە زمانی مام و پوورەکانییەوە، تەنیا هەر ئەنکمی بە دایکی خۆی دەزانی و بە دایە بانگیدەکرد. هەروەها، چونکە باوکم برا گەورە بوو، هەموو خوشك و براکانی پێیان دەگوت: کاکە، ئەویش هەر بە کاکە ناویدەبرد!
جا لەبەرئەوەی دایکم بەسەر دایکی هاتبوو، ئێمەش لە ئەو باشتر دەژیاین، ئەویش لەگەڵ ئێمەدا نەژیابوو، لە نێو ئێمەشدا گەورە نەبووبوو، بە چاوێکی پڕ لە قینەوە تەماشای دەکردین و هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردین. هێندە بیرتەسك و نەزان بوو، وای دەزانی، هەرچی بەسەرهاتووە، خەتای من و (شەونم)ی خوشکمە، بۆیە ئێمەی بە یەکەمین دوژمنی خۆی دادەنا. تەنانەت وای لێهاتبوو، بەرانبەر بە ئێمە، تووشی هێندێ گرێی دەروونییش بووبوو!
لە ڕاستیدا، من لۆمەی ناکرم، چونکە لەبری ئەو، هەر کەسێکی دیکەش بووایە، دوور نییە، خراپتری لێ بەسەربهاتایە و بە چاوێکی خراپتریش، سەیری ئێمەی بکردایە. هەرچەندە ئێمە، هیچ جۆرە گوناهێکمان نەبووە، دەستمان لە دیاریکردنی چارەنووسی ئەودا نەبووە، لە ئەو ڕووەشەوە، نەك هەر ئەو، بەڵکوو هەر کەسێکی دیکەش بێ، هەرچی ڕەخنە و گلەییەکیشی هەبێ، تەنیا هەر شانی دایك و باوکی خۆی دەگرێتەوە. دیارە باوکیشم زۆر گوێی نەداوەتێ و بەرانبەری کەمتەرخەمبووە، دایکیشی بەجێیهێشتووە، بە دەگمەن لێی پرسیوەتەوە، وەك کوردیش گوتوویەتی: منداڵ بە دایك هەتیوەدەبێ!

لە ماڵی باپیریشمدا، لە نێو کوڕ و کچەکانیدا، جگە لە مامە (ساڵح)م، کەسی دیکە نە خوێندەوارییەتی و نە پێشکەیشتووە. جگە لە ئەوەی، پیاوانی کوردیش، لەو سەردەمە، زۆر بایەخیان بە خوێندن نەداوە. بۆیە (حەسەن) بە نەخوێندەواری گەورەبوو، ئەوەش غەدرێکی گەورە بوو، لێی کرا!

(حەسەن) هەر لە منداڵییەوە، بەرەڵای کۆڵانان و نێوبازاڕ بووە، لە دروکان لای باپیرم پەروەسمیکردبووە. زۆر دڕ و هار و شەڕانی بوو، کەم ڕۆژ هەبوو، چ لە ماڵەوە و چ لە دەرەوە، یەکێ لای باپیرم شکاتی لێ نەکا، ئەویش زۆر لێی تووڕەدەبوو، لێیدەدا و دەری دەکرد. هەر بۆیە خەڵکی ناویاننابوو، (حەسەن فەرتەنە). باوەڕناکەم، لەو داماوە لە ژیانی خۆیدا، نانێکی بێ گرفتی خواردبێ. هەرچەندە هەموو جارێ، باپیرم بە باوکمی دەگوت: من کوڕم بۆ بەخێوکردەوویی!

جوجرە

ساڵی (1956) لە حوجرەی مەلا(عەبدوڵڵا) دەمخوێند، کە لە کۆڵانە تەنگەبەرەکەی ئەم دیوی مزگەوتی گەورەدا بوو، کۆمەڵێ منداڵی گەڕەکی لێ بوو، مەلا فێری خوێندن و نووسینی دەکردین، دوایش جزمی عەممای پێ دەخوێندین. ئەوە یەکەمین تاقیکردنەوەی دەسپێکردنی ژیانی خوێندنم بوو. مەلا (عەبدوڵڵا) باوکی مامۆستا (سەلام) بوو، ماڵەکەیان هەر لە ئەوبەر جادەکەی بازاڕەچکۆڵەوە بوو. پیاوێکی کەڵەگەتی بارێکی ڕێکوپێکی سووروسپی قۆز بوو، زیرەک و شارەزا بوو، بەڵام تووڕەبوو. زووزوو لێی دەداین و بە دار فەلاقەیدەکردین. بە داخەوە من زۆری لێ نەمامەوە و زۆر شت فێر نەبووم، چونکە لە ئەو گەڕەکە گواستمانەوە، وا بزانم، ئەویش دوای ماوەیە بە نەخۆشی مرد.

مامە (بەکر) و ڕێوشوێنی ژنهێنان

ساڵی (1956) بوو، باپیرم ویستی، مامە (بەکر)م لە زۆر شت دووربخاتەوە، چونکە زۆر سەرەڕۆ و سەربەگێچەڵ بوو، هەروا بە ئاسانی دانەدەمەزرا، ئەویش پێی خۆشبوو. لەبەرئەوە خوالێخۆشبوو خاتوو (ڕەحمە)ی کچی (حاجی عەبدوڵڵا)ی لە گوندی (کەڵەکن) بۆ داواکرد. ئەو پیاوە (8) کوڕ و ئەو تاقە کچەی هەبوو، زۆر دۆستی باپیرم بوو، لە قسەی دەرنەدەچوو، لەبەرئەوە بێ گرفت دایە.

گوندی (کەڵەکن)؛ لە شاری (سولەیمانی)یەوە زۆر دوور نەبوو. گوندێکی زۆر چکۆلانە بوو، هەمووی سێ چوار ماڵێ دەبوو، ئێستە لەگەڵ گەڕەکەکانی شاردا تێکەڵاوبووە. بەڵام دڵگیربوو، هەنجیرێکی زۆر و خۆشی هەبوو.

ئەو کاتەی بڕیاردرا، بووک بگوێزرێتەوە، بە چەن ترومبێلێ بەرەو گوندی (کەڵەکن) بەڕێکەوتین. گوندەکە نزیک جادەبوو، بەڵام جادەکە قیرتاو نەبوو، بۆ نێو گوندەکەش، ڕێی ترۆمبیل نەبوو، لەبەرئەوە ترومبیلەکان، لەسەرجادەکە وەستان و ئێمەش هەموومان بەپێ ڕۆیشتین.

گەیشتینە نێو دێ، کەمێ چاوەڕێمانکرد، بووک ئامادەبوو و لە ماڵ دەرکەوت، دوو ژن ئەم دیو و ئەو دیویان گرتبوو، هەلهەلەکێشان دەستپێکرد و بوو بە هەرا. بووکەکە ژنێکی شۆخوشەنگی سپیکەڵەی باڵابەرز بوو، بە جلی بووکێنیی و خشڵ ڕازابووەوە، تارایەکی سووری درێژی بەسەرەوەبوو، لە شەرماندا چاوی لە ئەرزەکە هەڵ نەدەبڕی.

ئەو کاتەش وا باوبوو، بووک بە هێواشی دەڕۆی و یەکێکیش ئاوێنەی بۆ دەگرت. لەبەرئەوە، (حەسەن)ی برام پێشیکەتبوو، پشتاوپشت دەڕۆی و ئاوێنەکەی بۆ گرتبوو، بۆئەوەی بووکێ خۆی ببینێ و سەیری خۆی بکا. هەموومان زۆر لەسەرخۆ و بە وردی دەڕۆیشتین، تا بە هەورازی گوندەکەدا سەرکەوتین و گەیشتینە لای ترومبیلەکان. ئیدی سواربووین و گەڕاینەوە، بووکمان بۆ مامە (بەکر) دابەزاند!



نموونەی بووکبردنی لادێی ئەو سەردەمانە

هەرچەندە ئەو سەردەمانە وا باوبوو، ئاهەنگ و شایی دەگێڕا، لۆتی بانگدەکرا، لەسەر ئاوازی بەجۆشوخرۆشی بەسۆزی دەهۆڵ و زوڕنای کوردی، گۆرانی خۆشیان دەچڕی، ئامادەبووانیش هەڵدەپەڕین، ڕۆژێ یا چەن ڕۆژێکی خۆشیان بەسەردەبرد. بەڵام باپیرم، لەگەڵ باوکی بووکێ ڕێککەوتبوو، شایی بۆ ئەکا و بێ دەنگ بووکمان کرد بە ماڵدا!

گەڕەکی ( سابوونکەران )

ئەم جارەیان، لە گەڕەکی (سابونکەران) لە تەنیشت گەرماوی (موفتی)یەوە گیرسایینەوە و خانوویەکمان بە کرێگرت. خانووەکە هی (حاجی شێخ مستەفای شێخ بایزی باراوی) ئامۆزای باپیرم و باوکی شێخ (عوسمان باراوی) مێردی پورە (مەلیح)م بوو. (شێخ مستەفا) دوو ژنیهێنابوو، لە ژنی یەکەم (3) کوڕ و (2) کچی هەبوو. ئەم خانووە لە کۆڵانێکدا بوو، دەرنەدەچوو. لە دووبەر و دوونهۆمی گەورە پێکهاتوو، بەرێکیان گەرمار، گەنجینە و داڵانێ بوو. خاوەن ماڵ خۆی و ژنی دووەمی خاتوو (رۆقی)، دوو کچەکەی (نەجیبە) و (ناجی)، کوڕە چکۆلانەکەی (رەزا)، لە نهۆمی خوارەوە دەژیان. ئێمەش سەرەوەمان بەکرێ گرتبوو، دوو ژوور و هەیوانێ بوو.

ئەم ماڵەم زۆر لا خۆشبوو، چونکە یەکەم: جەنجاڵبوو، منداڵی زۆر تێدا بوو. دووەم: لەسەر جادەبوو، هەمیشە لەسەربانەوە یا لە کۆڵانەوە، سەیری جادەکەم دەکرد. سێیەم: کچەکان نزیکەی هاوتەمەنی خۆم بوون و هەمیشە، پێکەوە یاریمانئەکرد. پێوەندیمان زۆر خۆشبوو، بە شێوەیە لە ئەو ماوەیەدا، لە ئەو ماڵەدا بووین، یەک شەڕ چییە، لە نێوانماندا ڕووی نەدا!

لە بیرمدێ، جارێکیان جێژنی قوربان بوو، کات هاوین بوو، ئەوان لە سەربانەکەی ئەوبەر نووستبوون. منیش بەیانیان زوو هەڵدەستام، دایکم بۆ نانکڕین خەبەری دەکردمەوە. وا ڕاهاتبووم، گەر نانیشمان پێویست نەبووایە، هەر لە ئەو کاتەدا خەبەرمدەبووەوە. ئەو بەیانییە بە پەیژەکەدا سەرکەوتم، هەردووکیانم خەبەرکردەوە و گوتم: هەستن جێژنە، نانەکەتان بخۆن، پێکەوە دەبڕۆین و دەگەڕێین. جووتە خوشکە بەری دەسیان لە خەنە گرتبوو، پیشانیاندام و زۆر دڵیان پێی خۆشبوو، زۆر جوانیشیان لێ دەهات. دوای ئەوەی نانی جێژنمان خوارد، دەسیانگرتم و ڕۆیشتین. زۆر گەڕاین و دۆندرمەمانخوارد، پاشان گەڕاینەوە.

## قوتابخانەی کەشتی نوح

قوتابخانەکەی مامۆستا (نەجمەدین مەلا)، لە ئەو بەرمانەوە لەسەر جادەکە بوو، هەمووی (20- 30) مەترێ لێمانەوە دووربوو، کە ئێستە خواردنگەی (نەجمەدین مەلا) یە! لە ئەو ماوەیەدا، تا لە قوتابخانە وەرگیرام، لە ئەوێ دەمخوێند و ماوەی (2-3) مانگێ لە ئەوێش مامەوە، تا دەرگەی قوتابخانەکان کرانەوە و سالی نوێی خوێندن دەسپێکرد.

مامۆستا تا بڵێی، پیاوێکی زیرەکبوو، هەموو شتێکی فێردەکردین. بەڵام داخم ناچێ، گەلێ جار لەبەر مەستی، ئاگای لە خۆی نەبوو، زۆر بۆنی عەرەقی لێ دەهات. من خۆم هەرگیز نەمدیوە، بە ڕۆژ بخواتەوە، بەڵام دەیانگوت: هەر ئێوارەی لێدێ، دەسپێدەکا. ئەنجامەکەشی ئەوەبوو، ڕۆژی (23. 4. 1962)، لە قوتابخانەکەی خۆیدا مرد، مامە (بەکر)م و دوو هاوڕێی دیکەی، کە زۆر جار سەریان لێ دەدا، دوای سێ ڕۆژ دۆزیانەوە، بۆنیکردبوو، وەک دەیانگێڕایەوە، پشیلەکانی لە برساندا سەری لووت و گوێچکەکانیان خواردبوو. ڕاسپاردەنامەیەکیشی نووسیبوو، کە لە چیای (ئەزمڕ) بینێژن، بەڵام ئەو کاتە، میری ڕێی نەدا، داواکارییەکەی جێبەجێکەن، بۆیە بە شێوەیەکی کاتی ناشتیان و دوای ئەوەی ڕێککەوتننامەی (11. 3. 1970) خوێنرایەوە، جەماوەرێکی زۆر کۆبوونەوە، ڕۆژی (4. 5. 1970)، بە دەهۆڵ و زوڕناوە، تەرمەکەیان بۆ چیای (ئەزمڕ) گواستەوە.





دەستەچەپ (حەمەی حاجی تاییر)، ناوەڕاست مامۆستا (نەجمەدین مەلا) و دەستەڕاستیش (فایەقی خەلەفەمەعروف) و (ئەنوەر تۆفیق)، ئەوانی دیکە نەناسراون.



ڕێوشوێنی گواستنەوە و ناشتنی تەرمی مامۆستا ( نەجمەدین مەلا ) لە چیای ( ئەزمڕ )

**قوتابخانەی ( فەیسەڵییە )**

( 1957 .09.01)، لە قوتابخانەی (فەیسەڵییە)ی سەرەتایی، لە پۆلی یەک وەرگیرام، ئەوە یەکێ لە ڕۆژە خۆشەکانی ژیانی منداڵیم بوو، هەر لە خوار ماڵی خۆمانەوە و لەسەر جادەکە، ماڵی (کیفام)ی فەلە بوو، لەگەڵ کوڕەکەیاندا (سڵێوە)، لە یەک پۆل بووین، ئێمە پێمان دەگوت (سێوە). هەموو بەیانییەک لە دەرگەم دەدا، خاتوو (ئەلیس)ی دایکی دەیکردەوە و پەرداخێ شیری بۆ دەهێنام. پاشان لەگەڵ (سێوە)دا، بەرەو قوتابخانە خڵ دەبووینەوە. کوڕێکی زۆر باش و هێمن بوو، بە داخەوە، هەر لە پۆلی یەک و دوو پێکەوە بووین، ئیدی تا ئێستە نەمدیوەتەوە و نازانم، ئەو خێزانە چیان بەسەرهات!

ئەو کاتە باوکم، لە نەخۆشخانەی نێوەڕاست کاریدەکرد، لە خوار قوتابخانەکەی خۆمانەوە بوو، ئێستە (تەلاری کاوە) و گەراجێ لە شوێنەکەی دروستکراوە، هێندێ جار کە تەواو دەبووم، هەر بە جانتاکەمەوە سەرملێدەدا.

قوتابخانەکەمان، لە بەردەرکی سەرا بوو، هەمووی چەن خولەکێ لە ماڵی خۆمانەوە دوور بوو. شوێنێکی زۆر گرنگی هەبوو، لەسەر سوچی هەردوو شەقامی (کاوە) و (مەولەوی) هەڵکەوتبوو. ئەم شوێنە، زوو قوتابخانەی زانستی بوو، کە ئێستە بازاڕی (عەسری) پێ دەڵێن. قوتابخانەکەمان زۆر گەورەبوو، لە دوو نهۆم پێکهاتبوو، ڕاڕەوێکی درێژی هەبوو، ژوورەکان بەسەر هەردووبەری ڕاڕەوەکەدا دابەشبووبوون. حەوشەیەکی زۆر گەورەشی هەبوو، هەمیشە یاریمان تێدا دەکرد. ئەودیویشمان قوتابخانەی سەرەتایی (گوێزە)ی

کوڕان بوو، هێندێ جار بە دیوارەکەدا سەردەکەوتین و شەڕەبەردمان لەگەڵ دەکردن.
کۆمەڵێ مامۆستای بەڕێز و دڵسۆزمان هەبوو، زۆر بە پەرۆشبوون، بۆئەوەی بابەتەکان بە باشی فێربین و پاشەڕۆژێکی باشمان هەبێ.



قوتابخانەی (فەیسەلییە)



مامۆستا بەڕێزەکانی قوتابخانەی (فەیسەلییە)

## لاقاو

ڕۆژێکی پاشنیوەڕۆ بوو، لای (دایەحەمدی) بووم، لە پڕ ڕەنگ و دەنگی ئاسمان گۆڕا، ناڵە و گرمەی هەور و دەنگی هەورەتریشقە، دونیای دەلەرانەوە. سەرەتا بە تەرزە دەستپێیکرد، دەنکەکانی زۆر گەورەبوون و پاشان دایکردە باران، زۆر بەخۆڕدەباری، وردەوردەش تا دەهات، بارانەکە تاوینەسەند، ماوەی یەک کاژێر لەسەریەک باری، وای لێهات، حەوشەکەی پڕکرد لە ئاو.

ئەنکم لە هەیوانەکە هەر دەهات و دەچوو، تەزبیحە درێژەکەی بەدەستەوەبوو، ویردی دەخوێند و بە دەنگەخۆشەکەی خۆی، هەر سڵاواتی لە دیاری پەیامبەر دەدا و هاواری دەکرد: خوایە ڕەحمەمان پێ بکەی، بێ ئافات! منیش ویستم، بڕۆمەوە، بەڵام نەیهێشت. خۆم ماتدا، تا سەری قاڵبوو، ئیدی ڕۆیشتم. بە کۆڵانەکاندا ڕامکرد، تا گەیشتمە بەردەم مزگەوتی گەورە، هێندێ کەس وەستابوون و تاماشایاندەکرد، هێندێکی دیکەش بە عەرەبانە دەپەڕینەوە، منیشیان پەڕاندەوە. بەڵام لەبەردەرکی سەرا، ئاوەکەی لە ئەوەدا نەبوو، نزیکەی نیو مەتر بەرزبووبووەوە، عەرەبانەش کەڵکی نەبوو، بەڵکوو ڕاوەستاین، تا کەمیکرد، پاشان پەڕینەوە.

ئیدی هەرچی چۆنێ بوو، خێرا بە جادەی (سابوونکەران)دا سەرکەوتم و گەیشتمەوە ماڵەوە. دایکم چاوەڕێیدەکردم و زۆر بێ ئارامبوو. لاقاوەکە ڕۆژی (18. 10. 1957) بوو، زیانێکی زۆری بە خەڵکی شار گەیاند، وەک سەرچاوەکان باسیدەکەن: (12) منداڵ، (5) پیاو و (8) ژن خنکان، یەک میلیۆن دیناریش زیانیدا. هەر بە ئەو بۆنەیەشەوە، (وەصی - عەبولئیلا) سەردانی (سولەیمانی) کرد.



وێنەی بەردەرکی سەرا و فەرمانگەی پۆستی (سولەیمانی)

مالی (جەلال کابان)

ماوەیە بوو، باوکم لەگەڵماندا زۆر خراپبوو، هەمیشە لێمان تووڕەدەبوو و لێیدەداین، زۆر جار لە دایکیشمی دەدا. من و (شەوتم)ی خوشکیشم، هیچ دەسەڵاتێکمان نەبوو، لە تاوا دەگریاین و ئەویش لە داخی دڵی خۆی، ئێمەشی دادەپاچی. نەماندەزانی، بۆچی گۆڕاوە و چی ڕوویداوە؟ (حاجی شێخ مستەفا)ش لە خوارەوە هاواریدەکرد و لێی تووڕەدەبوو. هێندێ جاریش لە تاو لێدانی باوکم، ڕامدەکردەخوارەوە و پەنام بۆ (شێخ مستەفا) دەبرد. نەمانزانی، هۆی چی بوو، هەمووی ساڵێ لە ئەو ماڵەدا نەبووین، گواستمانەوە. جارێکی دیکەش لە گەڕەکی (شێخان)، لە ماڵی (جەلال کابان) دامەزراین و بە کۆنە کۆڵانەکەی خۆمان شادبوومەوە، هەمووی چەن مەترێ لە ماڵی (عەلی باپیر)ەوە دووربوو، جاروبار سەرێم لە باجی (عاسم) دەدا، هەر بە شێوەی کۆن، لەگەڵ (گێلاس) دۆست بووم و لەگەڵ (گەلاوێژ)یش، داتوومان پێکەوە ئەدەکرد!

ئەم خانووە لە دوودەستە پێکهاتبوو، لای دەرگەی حەوشەوە، خۆیانی لێ دەژیان و گەورەبوو. نازانم، چەن ژووربوو، بەڵام خێزانێکی زۆریان هەبوو، کوڕەکان (کەریم، بەهائین، قادر و جەمال کابان)، سێ کچیشیان (بەدریە، ئەختەر و شوکریە) هەبوو، بەڵام منداڵیان نەبوو. تا لە ئەوێدا بووین، بە ڕێککەوت نەبێ، هاتوچۆمان نەبوو، زۆر داخراو بوون. هەرچەندە (کەریم کابان)، زۆر هاوڕێی باوکم بوو، کاتی خۆشی پێکەوە پۆلیس بوون، جار و باریش گۆرانی بۆ دەگوتین!

دەستەی دووەمیشی، دوو ژوور و هەیوانێکی بەرفراوانبوو، ئێمەی تێدا دەژیاین، حەوشەیەکی گەورە و دووروودرێژ لە ئەوانی دابڕیبووین و بە تەواوی سەربەخۆبوو!

ئەم گەڕەکەم زۆر پێ خۆشبوو، چونکە هەر ماڵێ، لە سێ چوار منداڵ کەمتری نەبوو. کۆڵانێکی زۆر جەنجاڵ و خۆشبوو، هەمیشە بەردەرگە جەمەیدەهات. هەر هەڵدەبەزینەوە و یاریماندەکرد، تاوێ مووشێن و تاوێکیش تۆپتۆپێنمان دەکرد، خەڵکی گەڕەکمان هەراسانکردبوو، بە تایبەتی کاتێ بە سەربانەکاندا ڕاماندەکرد، لە ئەم بانەوە بۆ ئەو بان خۆمان هەڵدەدا. دراوسێکانی بەرانبەرمان ماڵی (مەلائەحمەد) بوو، (سەمەد)ی کوڕی نزیکە تەمەنی من بوو. تەنیشتمان ماڵی (سەیید مەجید) بوو، (ئەکرەم ـ دلێر)، لە ئێمە گەورەتربوو، بەڵام هەر تێکەڵمان دەبوو. (ئەدهەم)ی براشی، لە تەمەنی خۆماندا بوو، هەمیشە پێکەوە بووین. لای تەنیشتی سەرووشمان، ماڵی (عیززەت کابان) بوو، (فەرەیدوون)ی کوڕی گەورەتربوو، (فەرهاد) کوڕە چکۆلەی بوو، زۆر خۆش و بزێوبوو، بە

داخەوە زۆر کۆچیدواییکرد. ئیدی ئەم کۆمەڵە منداڵە، ئەوانەشی لە ماڵەکانی خوار و سەرووی ماڵی ئێمەشەوە بوون، هەر لای ئێمە کۆدەبوونەوە و پێکەوە یاریماندەکرد. ئەو کاتە من لە پۆلی دووی قوتابخانەی (فەیسەلیە) بووم.

## چوارەمین ژن

بەڵام زۆر بە داخەوە، ئەم خۆشی و بەزمی منداڵییە، زۆری نەخایاند، ڕووداوێکی زۆر ناخۆش، لە نێو خێزانەکەماندا ڕوویدا، هەموو ئەو خۆشییەی دیبووم، لێم بوو بە ژاری مار، چونکە ساڵی (1958) بوو، باوکم ژنی چوارەمی هێنا، ئیدی ژیانمان لێ تێکچوو.
ڕۆژێ لە قوتابخانە هاتمەوە، تەماشادەکەم، دەنگەدەنگێکی زۆر دێ، بە پەلە خۆم کرد بە ژووردا، پورەکانم (مەلیح) و (فاتم)، دادە (شەمسە) و مامە (عومەر)م لە ئەوێ بوون. باوکم نەهاتبووەوە، ئەوانی ناردبوو، نێوماڵەکەی بۆ کۆکەنەوە، دایکیشم بە دوو منداڵی گچکەوە (شەونم) و (سەلاح) دانیشتبوون و دەگریان، خەڵکی گەڕەکیشمان لێ کۆبووبووە، هەموویان سەرزەنشتی باوکمیان دەکرد، بە ئەو کەسوکارە بێ ویژدانەی باوکیشم بووایە، نەبووایە، بەپێی پەتی و سەری قووتی بڕۆین و هیچ بۆ ئێمە نەهێڵنەوە، بە تایبەتی مامە (عومەر)م، قسەی زۆر ناشیرینی دەکرد و جنێوی بە دایکم دەدا. ئەوە لەبری ئەوەی، سەرزەنشتی براکەی بکا، کە ژنێکی بێکەس و سێ منداڵی زەردوسووری چکۆلانەی بەرەڵاکردووە، کەچی ئەوە هەموو هەڵوێستەکەی بوو!
هەر یەکێکیان ژوورێکیان ژووربەژوور دەگەڕان، دۆڵاب و جانتاکانیان دەکردەوە، هەر خەریکی شت کۆکردنەوە و شاردنەوە بوون، مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێ چی برا و چی دیار نەما، دەتگوت، لە جەنگدا سەرکەوتوون و لە نێو خۆیاندا دەسکەوتەکان دابەشدەکەن!
من هەر هێندە تێگەیشتم، دیسانەوە باوکم فەرماندوویەتی و ژنی تازەی هێناوە، بە دزییەوە خانووشی بۆ گرتووە، ئێستە ئەوانی ناردووە، ماڵەکەی بۆ بگوێزنەوە! پاشان بۆمان دەرکەوت، ئەو هەموو شەوانەی درەنگ دەهاتەوە، لە کوێ بووە! ئەو هەموو تووڕەبوون و شەڕفرۆشتنە، هۆکەی چی بوو! دوایی زانیمان، لە مێژبوو، ئەو ژنەی مارە کردبوو.
ماڵە نوێکەی باوەژن و باوکم، بەرانبەر ماڵی باپیرم بوو. یەک ژوور و هەیوانێکی چکۆلانە بوو، حەوشەیەکی قنەجنۆکەی هەبوو، تەوالێتێکی زۆر پچووکی تێدا بوو، مرۆ بە ئاسانی، بە دەرگەکەیدا نەدەچوو و جێشی نەدەبووە!

هێندێ شتی نێوماڵەکەیان گواستبووەوە، هێندێکیشیان هەر حەپلووشکردبوو، هەلی بوو، بۆیان هەڵکەوتبوو، کەس ئاگای لە هیچ نەبوو، خوا دەزانێ، کێ چی بەرکەوتبوو!
هەرچی چۆنێ بوو، دایکە خێرنەدیوەکەم ژوورێکی لە گەڕەکی قەسابەکان و پشت کۆڵانی سوپەرگەرخانەکەی (ئەحمەی گوڵە)وە بەکرێگرت. (شەوبۆ) و (سەلاح) منداڵبوون، دایکم لەگەڵ خۆی بردنی. بەڵام باوکم نەیهێشت، من بڕۆم. ئیدی بە تەواوی، لانەکەمان لێ تێکچوو. لە ئەو ماوەیەدا، هەرچی خۆشییەکمان ئۆشکردبوو، باوکم هەمووی پێ هەڵهێنایەوە!

## هەڵسوکەوتی باوەژن

باوەژنەکەم ناوی (فەزیلە) بوو، تا بڵێی کچێکی گەنج، جوان و شۆخ بوو. ئاخر باوکم کەی ژنی ناشیرینی هێناوە؟! وا بزانم، (هەورامیی) بوو. باوکم بەهۆی تەخۆشخانەوە ناسیبووی، حەزیان لە یەکدی کردبوو، بە دزییەوە خواستبووی. لە ئەوە دەچوو، باوکمی زۆر خۆشویستبێ! بەڵام خۆشەویستی لای باوکم چی بوو، وەک پەڵەهەورێکی ڕەشی چڵکنی بەهار وابوو، ئاوێکی پێ بوو، لێژمە و بارانێکی کەم دایدەکرد و زوو خۆشی دەکردەوە، وەک هەر بارانیش نەباریبێ، وابوو! لەبەرئەوە، هێندەی ژنهێنانەکەی مەبەست بوو، هێندە خۆشەویستی مەبەست نەبوو!
بە ڕاستی خۆشی نەیدەزانی، چی دەکا و چی دەوێ؟! کەسیش تێی نەدەگەیشت و بە قسەی کەسیشی نەدەکرد. هەر دوای ماوەیەکیش، ئەو ژنە گەنجە هەژارە، بە دەسییەوە گیرۆدەبووبوو، چونکە هەر زوو پەشیمانبووەوە!
سەرەتا خاتوو (فەزیلە)، وا خۆی پیشاندەدا، مەی زۆر خۆشدەوێ و ڕووی خۆشبوو. لەبەرئەوەی ماڵەکمان تەنیا ژوورێ بوو، زۆربەی کات لە ماڵی باپیرم بووم و هەر لە ئەوێش دەنووستم. هەموو جارێ لە دڵی خۆمدا، بیرم لە ئەوە دەکردەوە، لێکمدەدایەوە و دەمگوت: بەسەرهاتەکەی (حەسەن)ی برام دووبارەبووەوە و منیش هێندێ لە تاڵاوی ئەو ئازارەم چێشت. بەڵام جیاوازییەکمان ئەوەبوو، ئەو لای نەنکم دەژیا و من لای باوەژن بووم!
زۆر بیری دایکم و منداڵەکانم دەکرد. بە دزی باوکمەوە، زووزوو سەرمدەدان، دایکیشم تێرتێر بەسەرمدا دەگریا. هەر تەنیا ئەو کاتانە دەحەوامەوە، کە دەمبینین. ئەوان لە ژوورێکی چکۆلانەدا دەژیان، هێندێ پێویستیی نێومال، نوێن و کەلوپەلیان هەبوو، ئیدی

ژوورێکی رووتوقووتبوو! هەر کاتێ دەچووم، دایکم بۆنیدەکردم و هەستیدەکرد، چڵکنم، لە تەشتدا دەیشتم و خاوێنی دەکردمەوە. ئینجا لە ئەو خواردنە خۆشانەی، هەر لە منداڵییەوە لەگەڵی ڕاهاتبووم و حەزم لێ دەکرد، تێرم دەخوارد.

هەرچەندە دادگە پارەی بۆ دایکم و منداڵەکان بڕیبووەوە، بەڵام پارەکە کەمبوو و بەشی نەدەکردن. لەبەرئەوە دایکم ناچاربوو، جل بۆ ماڵان بشوا. تا خۆراکی ڕۆژانەی خۆی و منداڵەکانی دابینکا. سەیر ئەوەبوو، (حەسەن)ی براشم بۆ ماوەیەکی کاتی، لەگەڵمدا گۆڕا، ئیدی وەک جاران لێی نەدەدام و هێندێ جاریش پێکەوە دەگەڕاین!

لە ئەو ماوەیەدا، خۆشترین شتێ چێژم لێ دەبینی، ئەوەبوو، بە تەواوی ئازادبووم و کەس لێی نەدەپرسیمەوە، چی دەکەم و چی ناکەم، لە کوێ بووم و لە کوێ نەبووم. چونکە باوکم ڕۆژانە، لە نەخۆشخانە کاریدەکرد، بە شەویش لەبەر خانمەکەی، سەرِ من نەدەپەرژا. ماڵی باپیریشم هێندە جەنجاڵبوو، بە تەنگ پەروەردەکردنی منداڵەوە نەبوون. هەلێکی باشم بۆ هەڵکەوتبوو، وەک هەموو منداڵێ، چۆن حەز لە بەرەڵایی و یاریکردن دەکا، منیش هەر لەگەڵ لە قوتابخانە دەهاتمەوە، نانمدەخوارد، جانتاکەم دادەنا، یەکسەر دەچوومە کۆڵان و لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا یاریماندەکرد. جا چونکە پێشتر، ماڵی خۆمان هەر لە ئەو گەڕەکە بوو، ماڵی باپیریشم هەر لە ئەوێ بوو، هەموو منداڵەکانم دەناسی.

بەرانبەر مزگەوتی گەورە و لە شوێنی بازاڕی (کاسەمژڵ)ی ئێستە، پەرتووکخانەی گشتی (سولەیمانی) بوو. شانۆیەکی گەورەشی تێدا بوو، دواتریش بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە و زانست بوو. لە تەنیشت ئەویشەوە، باخچەی ساوایان بوو، پاشان نەخۆشخانەی پەروەردە بوو. زۆر حەزم لە باخچەی ساویان دەکرد، چونکە هەموو جۆرە یارییەکی تێدا بوو. جگە لە ئەوەی، چەن ئاژەڵێکی ئێسکسووکی خنجیلانەی وەک کەروێشک، ئاسک و چەن مەل و باڵندەیەکی جوانی وەک کەو، کۆتر و مریشکیشی لێ بوو. بەڵام دەرلەوانەکە نەیدەهێشت، هەموو کەسێ بچێتەژوورەوە. لەبەرئەوە زۆر جار، لەبەردەم دەرگەکەیدا ڕادەوەستام، لە شیشەکانەوە سەیرمدەکرد و هەناسەم هەڵدەکێشا!

ڕۆژێکیان لە دەرەوە وەستابووم، هەر تەماشای باخەکەم دەکرد، خوا کردی (شێخ کاوە) لەگەڵ مام (حەسەن)دا هاتن، منیشی لەگەڵ خۆی بردەژوورەوە. ئەو ڕۆژە زۆرمان یاری کرد، بە دوای ئاژەڵەکاندا ڕامانەدەکرد. وا بزانم، ئەوە یەکەمین جار و دوایەمین جاربوو، ئەو باخە ببینم!

ئێوارانیش دوای نانخواردن، لەگەڵ (حەسەن)ی برامدا، زوو دەچووینە دەرەوە، منداڵە وردەکەی گەڕەک کۆدەبوونەوە، شتێکی سەیربوو، دەتگوت موویان بۆ هەڵدەکڕووزێنی، هەموویان بە جارێ دەهاتنەدەرەوە و کۆدەبووینەوە. وەک شتێکمان لێ ونبووبێ، بە نێو کۆڵانەکاندا دەگەڕاین، لە خۆپیشاندان دەچوو، یەکێ پێشدەکەوت و بە هەموو هێزی خۆی دەیقیڕاند: منداڵی گەڕەک، سەربنەخەڕەک، وەرنەدەرێ، ئێمەش هەموومان وەڵاممان دەدایەوە و دەمانگوت: (عیسا) کوژرا بە خەنجەرێ. یا ئەم شەو شەوی تاریکە، (هەمزە) لە گوو خەریکە. ئەم شەو شەوی چرایە، (هەمزە) لەبەردەرگایە!

گەر هەر کەسێ نەهاتایەدەرەوە، هەڕەشەمان لێ دەکرد و دەمانگوت: هەرچی نایە بۆ یاری، دایکی دەبەین بە دیاری، بۆ شێخەکەی (جەباری). گەر هەر ئەوەش کەڵکی نەبووایە، منداڵەوردەکە زۆر کۆنەبوونایەتەوە، لە دەرگەمان دەدا، خۆمان ماتدەکرد، تا دەیانکردەوە، گەر هاوڕێکانمان بوونایە، ئەوا خۆمان لێ ئاشکرادەکردن و بانگمان دەکردن. گەر دایک یا باوکیان بوونایە، خۆمان دەشاردەوە و بێدەنگ دەبووین، تا دەرگەکەیان دادەخست و پاشان دەڕۆیشتین.

ئیدی بە ئەو شێوەیە، ئێواران تا درەنگانێ، لە کۆڵان خڕدەبووینەوە. هێندێ یاری هەبوو، لە ئەو سەردەمەدا باوبوو، خۆمان پێوە خەریکدەکرد. بەڵام (حەسەن)ی برام، سەرگەورەی منداڵانی گەڕەک بوو، ئەو بڕیاریدەدا، چ جۆرە یارییەک بکەین!

## یارییەکانی منداڵی

کاتێ منداڵبووین، لە ماڵەوە ڕیزدەبووین و یارییمانەدەکرد. قاچمان درێژدەکرد و (هطوور بلوور تەکامە، زەرد و سوور و شەمامە)مان دەکرد. لە پڕ (حەسەن)ی برام، یا (نەسرین)ی پورم، بە قایم بە قاچیاندا دەکێشام و دەیانگوت: مەرگەتە و مەرگەتە، خوا فەرموویەتی: هەر ئەمەتە، دەسم دانا و هەڵبەزی، تیکەی ڕاستم ئەمەی گەزی! منیش لە تاو ئازار هاوارم لێ هەڵدەسا!

یا پەنجەکانی دەسیان ڕیزدەکرد و لە هەرە پچووکەکەیانەوە دەسیان پێ دەکرد، ناویان لە هەر یەکێکیان دەنا و دەیانگوت: ئەمە تووتەیە، ئەوی تەنیشتی برای تووتەیە، سێیەمیان باڵابەرزەیە، چوارەمیان دۆشاومژەیە، کورتیلەکەشیان ئەسپێ کوژەیە!

یا منداڵان لە کۆڵان هەر بە پەنجەکانی دەس، دەمەتەقێی نێوان چەن کەسێکیان دەگێڕایەوە و دەیانگوت: تووتە دەڵێ: با بچین بۆ دزی. برای تووتە دەپرسێ: بۆ کوێ بچین؟ باڵابەرزە وەڵامیدەدایەوە و دەیگوت: بۆ ماڵی خوا! دۆشاومژە (پەنجەی شایەتمان بوو) دەیگوت: ئاخر گوناحە! ئەسپێ کوژەش دەیگوت: بە کێرمەوە!

ئای چەن سەردەمێکی سەیربوو، ئای ژیانی منداڵی، چەن تەمەنێکی بە تام و خۆش بووی؟! ئێستە و لە ئەم تەمەنەدا دەبێ، هەموومان بە دوای تەمەنی جوانی و منداڵی خۆماندا بگەڕێین، تۆ بڵێی، جارێکی دیکە منداڵبینەوە، ئەو سەردەمە زێڕینانە ببینینەوە و ئەو یارییە خۆشانە دووبارەکەینەوە، یەی لە هیچ شتێ نەکەینەوە و هەر یێبکەنین؟! نەخێر، تازە ئەوەی ڕۆی، ڕۆی و (بە خوا هەرگیز ناگەڕێتەوە، ناگەڕێتەوە!)

## یارییەکانی کۆڵان

سەردەمی منداڵی ئێمە و پێشتریش، واتە (70–80) ساڵ لەمەوبەر، وەک ئێستە نەبوو، هێندە جێژن زۆربێ، لێی بێزاربین، بەڵکوو بە پەرۆشەوە، چاوەڕێی جێژنمان دەکرد، خۆمان بۆ ئامادەدەکرد و پێشوازیمان لێ دەکرد.
جێژنە ئایینییەکان (ڕەمەزان، قوربان، لەدایکبوونی پەیامبەر و شەوی بەرات) بوون، هەر یەکێکیان تایبەتمەندی و خۆشی خۆیان هەبوو. جێژنی نەتەوەییش تەنیا هەر (نەورۆز) بوو، وەک ئاقانە وابوو، زۆرمان خۆشدەویست و ڕێزمان لێ دەگرت، نەک وەک ئێستە هێندێ بازرگانی ڕامیاری پەیدابوون، بە ناوی ئایینی ئیسلامەوە قەدەغەیدەکەن و سرووتەکانی بە گوناح دەزانن!
هەموو ئەو یارییانەی بە منداڵی باوبوون، بەشی هەرە زۆری لەبەردەرگە و لە کۆڵان، لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا پێکەوە دەمانکرد. لە هێندێ یاریشدا، بە تایبەتی لە ماڵەوە، کچانی گەڕەکیش بەشدارییاندەکرد. یارییەکانیش ئەمانەبوون: (بووکەبەبارانێ، ماڵەباجێنە، هەلووریلوور، فڕیفڕی قەلفڕی، مەنگەمەلێ، چاوشارکێ، چاوشاردنەوە، ئاشەبەتەندوورە، بووژانەوە، جۆیەجۆیە، قەلاقەلایە، خەتخەتێن، پەتپەتێن، موورامێن، چاڵچاڵێن، هەلماتێن، واغێن، هەلوکێن، تولتولێن، تۆپتۆپێن، سێرسکێن، دامە، هەلماقۆ، هەڵگێڕانەوە، حیکایەتی مێش، پێشڕکێ و ڕاکردن...) من حیکایەتی مێشم، لە هەموو شتێ پێ ناخۆشتر بوو، چونکە هەر تەواو نەدەبوو، وام دەزانی، گاڵتەم پێ دەکەن! یارییەکانی ڕۆژ بە ڕۆژی (تۆپتۆپێن، هەلماتێن، واغێن، چاڵچاڵێن، توولتوولێن و هەلووکێن) بوون.
هێندێ جاریش، هاوینان دنیا گەرمدەبوو، ترومبێلی ئاوڕشێنەکە دەهات، جادە و شەقامەکانی شاری فێنکدەکردەوە، ئێمەش بە دوایدا ڕاماندەکرد و خۆمان دەدایە بەر پڕیشکی ئاوەکەی. یا ترومبێلی دوکەڵی مێشەکە دەگەڕا، کاتێ لە هاویندا مێشومەگەز زۆردەبوو، ئێمەش لەبری ئەوەی لێی دووربکەوینەوە، خۆمان بە نێو ئەو دووکەڵە بۆگەنە پیسە شینباوەدا دەکرد و زۆریشمان پێ خۆشبوو!

هێندێ جاری دیکەش، عەرەبانەی دوونەسپی تێدەپەڕی، ئێمەش خۆمان بە پشتەکەیدا هەڵدەواسی، هەر هێندەت دەزانی، یەکێ هاواریدەکرد: قامچییە بۆ دواوە، عەرەبانچییش هێندە بێ ویژدانبوو، یەک دوو قامچی دەوەشاند و زیڕەی لێ هەڵدەستاین! یا گاڵتەمان بە عەرەبانچییەکان دەکرد و دەمانگوت: عەرەبانچی دەستەوقامچی، قولقول عانە، بۆ چاخانە، قامچییە بۆ دواوە! یەک دوو قامچی دەهاویشت، لە دواشەوە کەس سوار نەبووبوو!

ڕۆژانی جێژنی ڕەمەزان و قوربانیش، لە مزگەوتی گەورەوە (مەلا موحەممەدی دەنگ گەورە)، بە ئەو دەنگە بەرزە بەسۆزەی خۆی (الله اكبر، الله اكبر، لا اله الا الله و لله الحمد)ی دەخوێند، منداڵانیش لەبری ئەوە دەیانگوت: پڵاو و بنکڕ، پڵاو و بنکڕ، چێشتی شلە، ڕۆنی حلە، بۆمان لێنێ، خاڵە بلە!

لە گۆڕەپانەکانی گەڕەکی (کانیسکان)یش، لای مەزارگەکەی (شێخەوڵا) و گەڕەکی (مەڵکەندی)ش، یاری کوورسی کورسی و چەلەکوفەلەک هەبوو، هێندە جەنجاڵبوو، منداڵان نۆرەیان بۆ دەگرت! بە ڕاستی ڕۆژانی جێژن، بە ئەو یارییە فۆلکلۆرییانەی منداڵییەوە جوانبوو، خۆشی دەبەخشی و شارەکەشی دەڕازاندەوە، کاتێ منداڵان لە هەموو لایەکەوە، لێی کۆدەبوونەوە و کوڕە گەورەکانیش لگاوریاندەکرد!



چەلەکوفەلەک



هێندێ جار کۆدەبووینەوە و بەرەو کۆڵانێکی دیکە دەڕۆیشتین، گیرفانمان پڕدەکرد لە خڕەبەرد و چەن دانەیەکیشمان بەدەستەوە دەگرت، شەڕەبەردمان دەکرد. هێندێ جاری دیکەش سەروپۆتەڵاکی یەکدیمان دەشکاند و بەدەم زووڕەزووڕەی گریانەوە دەگەڕاینەوە.

لە هاوینانیشدا، هەموو تەنەکەی خۆڵی بەردەرگەی ماڵانمان دەپشکنی، هەرچی تونکڵە شووتی تێدابووایە، کۆماندەکردەوە و شەڕمان پێ دەکرد. شەوانیش، دوای ئەوەی گەشتەکەمان، بە هاوارهاوار و گۆرانیگوتن تەواودەبوو، زۆربەی کات، یاری (ئاشبەتەنوورە، چاوشارکێ، بووژانەوە، قەڵاقەڵا و کەنەگەنمان) دەکرد.

جاروبارێش زۆرانبازێیماندەکرد و یەکەمین ئازای ئەو شەڕەمان هەڵدەبژارد. (حەسەن) هەموو جارێ ئامۆژگاریدەکردم و دەیگوت: مەترسە، هەرچی قسەیکرد، نێوەمیم بۆ سوێرکە. گەر ئەرمەتی نەماتی، هەقت نەبێ، خۆم بە لەقە دەیتۆپێنم!

یا چەن منداڵێکی باش کۆدەبووینەوە و لەبەردەرگە دادەنیشتین، بە دەم قرولیشاڵەوە، بە باڵی ئەندێشە دەفڕین، جیهانێکی پڕ لە سەیروسەمەرەمان، بۆ خۆمان دەڕازاندەوە، هەمووشمان بێدەنگ دەبووین و زۆر بە جوانی گوێماندەگرت. یەکێ لە ئەو برادەرانە (بابەعەلی شێخ مەحموود) بوو، زۆر زۆرزانبوو، زۆربەی شەو هەر ئەو قسەیدەکرد، شتی وای دەگێڕایەوە، خۆشی پێکەنینی بە درۆکانی خۆی دەهات!

**ماڵی (شێخ موحەممەدی حاجی سەیید حەسەنی حەفید)**

لای دەسەڕاستی ماڵی باپیرمەوە، گۆڕەپانێکی گەورە هەبوو، بە هەر چواردەوری گۆڕەپانەکەدا، ماڵ ڕیزیبووبوون. گۆڕەپانەکەش بە کۆڵان و ڕێیەکی تەسک کۆتایی‌دەهات. ماڵی (شێخ موحەممەدی حاجی سەییدحەسەنی حەفید)، یەکێ لە ماڵە هەرە گەورە و دیارەکانی گۆڕەپانەکە بوو.

ماڵی (حەفید) سێ کوڕ و دوو کچیان هەبوو. ناوی کوڕەکان (سەلاح، فارووق، سالار) و ناوی کچەکانیش (پاکیزە) و (نەسرین) بوون. هێندێکیان شیری (دایەحەمەدی)میان خواردبوو. شێخ (سالار) لە هەموویان پچووکتربوو، بەڵام لە ئێمە گەورەتربوو، هەرگیز نەدەهاتە نێو ئێمەوە. شێخ (فارووق)یشیان هاوڕێی مامە (ساڵح)م بوو.

خانووەکەیان تا بڵێی، گەورەبوو، لە پێشەوە دوو نهۆمبوو، خۆیان و ئیشکەرەکانیانی تێدا دەژیان. حەوشەکەشی تا چاوبڕکا، دووروودرێژ بوو، کارێزێکیشی تێدا بوو. لە ئەو حەوشە گەورەیەدا شوێن هەبوو، دەوروبەرەکەی بە داروبرەخت و گوڵ ڕازابووەوە. لە ئەو سەری حەوشەکەشەوە، ڕیزێ ژووری پچووک هەبوو، هێندێکیان بۆ تەویلەی ئەسپەکانیان تەرخانکرابوون، چونکە چەن ئەسپ و کۆمەڵێ تولە و تانجیشیان هەبوو، (شێخ موحەممەد) بۆ ڕاو ڕایگرتبوون. هێندێ ژووری دیکەشیان، ژووری کوڕەکان بوون، یاری ئاسنیان تێدا دەکرد. جارجار لەگەڵ مامە (ساڵح)م دەچووم، ئەوان یارییاندەکرد و منیش تەماشام دەکردن. یا لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا، خۆمان پێدادەکرد و پیاوەکانیشیان ڕاویاندەناین!

لە ئەو گەڕەکەدا، تەنیا هەر ماڵی ئەوان ترومبێلیان هەبوو، جێبێکی کۆنی چکۆلانە بوو، لە دەرەوە گەراجێکیان بۆ درووستکردبوو. کەم جار دیومە، بیهێننەدەرەوە و یەکسەر ئیشبکا، بەڵکوو دەبوولیە، یەکێ هێندێ پاڵی پێوە بنایە، تا ئیشیدەکرد. خۆشم هێندێ جار یارمەتیمداوە و پاڵم پێوە ناوە. هێندێ جاریش لەگەڵ شێخ (سالار)دا سواربووم.

لە بیرمەدێ، شێخ (سالار) لۆرییەکی گەورەی هەبوو، لە تەل درووستکرابوو. زۆر سەیربوو، سوکانی هەبوو، بە ئاسانی لێی دەخوڕی، گڵۆپیشی پێوەبوو، دایدەگیرساند، لەبری هۆڕنی ترومبێلیش، زەنگێکی پاسکیلی پێوە کرابوو، کە لێی دەخوڕی، جارجارێ زەنگی لێدەدا.

لۆرییەکە زۆر جوانبوو، هەموو منداڵانی گەڕەک، حەزیان لێ کردبوو، بەڵام نە خۆمان بۆمان درووستدەکرا، نە پارەی ئەوەمان هەبوو، بیکڕین و نە بارکیشمان ئەو جۆرە شتانەی بۆ دەکڕین! تەنیا هەر هێندە هەبوو، هێندێ جار شێخ (سالار)، لە دالانەکەی ماڵی خۆیان، لۆرییەکەی دەدایێ و سووڕێکمان لێ دەخوڕی!

**گۆڕانی گەڕەك**

کۆمەڵێ کوڕی گەڕەك هەبوون، هاوتەمەنی خۆم بوون، زۆر جار پێکەوە یاریماندەکرد، وەك (فەرەیدوونی شێخ تەیبی گوڵانی، بابەعەلی شێخ مەحموودی دارتاش، ئەحمەدی مەلا عومەر، شێرکۆی ئاغا، جەمالی کەریمی ئالەباخی ...) کۆمەڵێکی دیکەش هەبوون، لە ئێمە گەورەتربوون، لە قوتابخانەی ناوەندیی و ئامادەیی دەیانخوێند. لە ئەوانە (جەمال ئەمین) و (لەتیف)ی برای، کە پورزای باوکم بوون. مامە (سالح، فوئادی حاجی عەبدوڵڵا، حەمەغەرەجی باجی حەلاو، کەمال ڕەووف، ئەحمەدی شێخ مەحموودی باراوی ...) تیپیان دانابوو، بە زۆری تۆپێتۆپێن و هەڵماتێنیان دەکرد، لە هەموویشیان دەسڕەنگینتر، دوکتۆر (لەتیف) بوو، هەموو منداڵانی گەڕەکی لاتکردبوو، هەر لێی دەبردنەوە، پاشان پێی دەفرۆشتنەوە و دیسانەوە دەیاندۆڕاندەوە، بە ئەو شێوەیە، ڕۆژانە پارەیەکی باشی دەسدەکەوت!

گۆڕەکەی (شێخ مستەفا)، لەبەردەمماڵی (حاجی عارفە زیزان)دا بوو، وەك بارەگای لێهاتبوو، هەمیشە جمەیدەهات. هەر لە ئەوێ (لەتیف)، سۆنەوسیفۆنی دانابوو، زیاتر بە یاری سۆنەدەرکردن، بەسەر منداڵەندا ساغیدەکردەوە. هەروەها فەریکەنۆك، ترۆزی، کالیار، مەعلەبی، شرووب و گوڵەبەڕۆژەشیان لێ دەفرۆشت، بە کورتییەکەی سووکە بازاڕێ بوو بۆ خۆی، بەڵام بازاڕی منداڵانە نەك پیاوانە، واتە وەك بازاڕێکی چکۆلانەی منداڵانی گەڕەك وابوو.

**بازبازێن و ڕاکردنی سەربانەکان**

بە منداڵی، زۆرجەزم لە سەربان و خۆهەڵدان و بازبازێن دەکرد، ڕۆژانە لەگەڵ چەن منداڵێکدا، زۆربەی کات بە سەربانانەوە بووین، ڕامانەدەکرد و لە ئەم سەربانەوە بۆ ئەو سەربان خۆمان هەڵدەدا. زۆربەی هەرە زۆری خانووەکانی گەڕەکیش، هەر لە قوڕ و بەرد دروستکرابوون، بە داری چنار، قامیش، زەل و حەسیر سەربانگیرابوو، لەبەرئەوە کاتێ ڕامانەدەکرد، خۆڵێکی زۆر لە بنمیچی ژوورەکانیانەوە بەردەبووە، کاسە و کەوچکیان پڕ لە خۆڵ و ماڵەکانیشیان تۆزاوی دەکرد. ژنانی گەڕەکیش، هاواریان لێ هەڵدەستا، لێمان تووڕەدەبوون، جنێویان پێ دەدایین و لێمان بێزاربووبوون، چونکە تەپەتەپماندەکرد و هەراسانمانکردبوون. هێندێ جاریش پەیژەیان دادەنا و ڕاویان دەناین، یا گەر چاریان نەبووایە، لای کەسوکارمان دەردی دڵی خۆیان هەڵدەڕشت و بە لێدانیاندەداین!

**بەر شارەوانییە کۆنەکەی (سولە یمانی)**

ڕۆژێکیان لەگەڵ (حەسەن)ی برامدا، چووین بۆ ئێوبازاڕ، سەرێکمان لە دووکانی باپیرم دا. لە تەنیشت دووکانەکەوە، گەراجێکی گەورەی لێ بوو، کە ئێستە بەشێکی قەیسەری (سەلاحەدین) پێکدێنێ. هەردووکمان چووین بۆ گەراجەکە، میزێکەین، تەماشامکرد، ئیودینار لەژێر لۆرییەکدا کەوتووە. دیارە هی یەکێ لە ڤیتەرەکان بوو. ویستوویەتی، شتێ چاککا و لێی کەوتبوو. ئاخر ئیودیناری ساڵی (1958) زۆرزۆربوو! منیش یەکسەر (حەسەن)م بانگکرد و پارەکەم پیشاندا. ئەویش خۆی کرد بە ژێر لۆرییەکەدا و دەریهێنا، گوتی: لای (بابەعەزیز) قسەبکەی، هەموو ددمودانت دەشکێنم. پاشان پارەکەی هەڵگرت و ڕۆیشتین. گوتی: وەرە، با بڕۆین، شت بۆ بکڕم. پێش هەموو شتێ دوو تۆپی هەوریمان کڕی. بە زەوییماندا دەکێشا، بەرزدەبووە بۆ هەوا و دەهاتەوەخوارەوە. زۆرمان لا سەیر بوو، چونکە پێشتر هەرگیز تۆپی وامان بە خۆمانەوە نەدیبوو!

لەبەر شارەوانییە کۆنەکە، لای دووکانی گۆشتفرۆش و سەوزەفرۆشەکانەوە، ئێواران هەموو جۆرە خواردنێکیان دادەنا و بە نرخێکی هەرزان دەیانفرۆشت. بازاڕەکە بە (تەڕەتۆڵەکە، یاپراخ، کەباب، گۆشتی برژاو، شفتە، هێلکەی کوڵاو، ماستا و دۆی سارد، ئاوساجی و شیرینی) دەڕازایەوە. یەکێ هاواریدەکرد: ئاوەکەی خەستە تۆڵەکە. یەکێکی دیکە دەیگوت: ئاوساجی ناو ئاوەی کوردی. یەکێکی دیکەش دەیشیراند: دەڵەمە دەرمانە، سوێرخوێ و بەلەزەتە گولەبەڕۆژە، کالیاری شارەزوورت بەەمێ ... ئیدی هەر یەکەی بە جۆرێ دەیتەڕاند، سەرنجی خەڵکیان ڕادەکێشا و خواردنەکانیان بەسەردا ساغدەکردەوە. ئێمەش دەمانگوت: لە دەم گوورگ بەربووین، هەر دەمانتاشییەوە. چونکە هەرگیز هێندە پارەمان پێ نەبوو، پشتیشمان پێوەی نەدەیەشا، وەک خەنجەر لە کا بەین، وابوو، لە ترسانیشدا نەمانەزانی، پارەکە چی لێ بکەین، لەبەرئەوە لە هەموو خواردنەکانمان دەخوارد.

بە لای منەوە، هەموو خواردنەکان زۆر بەتام و خۆشبوون، نزیکەی سەد فلسمان لێ خەرجکرد و ئەوی ماشەوە، (حەسەن) شاردییەوە. ئێمە هەر خەریکی چڵپەی دەم بووین و ورگمان پڕدەکرد، هێندەمان خواردبوو، هانکەهانکمان پێ کەوتبوو. ئاگامان لە هیچ نەمابوو، نەماندەزانی، یەکێ چاوی لێمانبووە، ئەم هەواڵی دەسبڵاوی و باخەڵ ئاوەڵەییەی ئێمەی، بۆ باپیرم باسکردووە و ئەویش چاوەڕێمانەدەکا!

کاتێ ئێوارە چووینەوە بۆ ماڵەوە، دەنکم خواردنی بۆ داناین، بەڵام ئێمە هیچمان بۆ نەخورا. ئیدی بوو بە هەرا و گوتیان: چۆن برسیتان نییە؟ لە کوێ نانتانخواردووە؟ باپیرم

له ژووره‌كه‌ی خۆی دانیشتبوو، بانگیكردین و گوتی: ئه‌و پارانه‌تان له كوێ بوو؟ ئێوه وا ده‌زانن، من ئاگام لێتان نییه، چی ده‌كه‌ن و چی ناكه‌ن! ڕووی له من كرد و گوتی: وه‌ره پێشه‌وه، سه‌گم به‌ست به په‌لی باوكته‌وه، پێم بڵێ، با بزانم، له كوێ نانتانخواردووه؟ ئه‌گینا شه‌رابم كردبێته گۆڕی باوكمه‌وه، داركاریتانده‌كه‌م، ئه‌وه‌ش سوێندێكی زۆر گه‌وره‌ی ئه‌و بوو! منیش له‌به‌رخۆمه‌وه گوتم: من نازانم، هیچ پاره‌م پێ نییه، ڕووی ده‌میشم له (حه‌سه‌ن) كردبوو، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و ڕاستی بڵێ و ڕزگارمكا. چونكه ده‌مزانی، گه‌ر ڕاستی بڵێم، نه‌ك هه‌ر باپیره‌م لێمده‌دا، به‌ڵكوو (حه‌سه‌ن)یش، دوایی چینێكی باشم ده‌كوتێ، له‌به‌رئه‌وه نه‌مده‌وێرا، ڕاستی بڵێم.
پاشان ڕووی له (حه‌سه‌ن) كرد و گوتی: ئا وه‌ره، تووتكه‌سه‌گی حه‌رامزاده، ده‌زانم، هه‌مووی له‌ژێر سه‌ری تۆ دایه، ئاده‌ی پێم بڵێ، تا بزانم، ئه‌و پاره‌یه‌تان له كوێ بوو؟! باش بوو، زۆری نه‌خایاند، (حه‌سه‌ن) به پێكه‌نینه‌وه، هه‌موو شتێكی بۆ گێڕایه‌وه، وه‌ك كارێكی زۆر باشی كردبێ، وایده‌زانی، ئێسته باپیرم هیچ ناكا، ده‌ڵێ: ئه‌ی ئافه‌رم كوڕم، بۆ خۆت و ئازایه‌تیت، یا خوا نۆشی گیانتان بێ! ئیدی من وامزانی، به ئه‌وه ڕزگامانبووه، كه‌چی باپیرم هاواریكرد: ئه‌و مقه‌ڵی و مقاشه‌م بۆ بێنن. هه‌ر كه گوێم له ئه‌وه‌بوو، له‌رزم لێهات و زۆر ترسام، سوور زانیم، بۆ ئێمه‌ی گه‌رمده‌كا و داخماننده‌كا. هه‌رچه‌نده ننه به‌سۆزه‌كه‌مان لێی پاڕایه‌وه و گوتی: جارێكی دیكه شتی وا ناكه‌ن، هیچ كه‌ڵكی نه‌بوو. مامه (یه‌كر)م یه‌كیه‌كه گرتینی و باپیریشم، به ده‌ستی پیرۆزی خۆی، سه‌ر‌وو مۆری ئاگرینی به شلكه‌ی لاقمانه‌وه نا، له ناو ئازار خه‌ریكبوو، هه‌ردوو چاومان كوێربێ، هاوارهاوار و زریكه‌زریك، ماڵه‌كه‌ی پڕكردبوو. باپیریشم ده‌یگوت: ئا ئا قه‌یناكه، هیچ نییه، ئه‌و شتانه‌ش ڕوودەدا، سزای پاره‌ی حه‌رام به ئازاره، گرنگ ئه‌وه‌یه، ژیربن و په‌ندی لێ وه‌رگرن، جارێكی دیكه بیرتان نه‌چێ، گه‌ر شتێكی دیكه‌ی له ئه‌و بابه‌ته‌تان دۆزییه‌وه، یه‌كسه‌ر ئاگادارمكه‌نه‌وه، ده‌سكاری ماڵی كه‌س نه‌كه‌ن. دوایش باپیرم، ئه‌و بڕه پاره‌یه‌ی مابوو، له (حه‌سه‌ن)ی سه‌ند و ئیدی نازانم، چی لێ كرد! ئاخر كێ ده‌یوێرا، له ئاستی باپیرما بڵێ: له‌ل، خێرا له‌لی ده‌بڕی!
پاشان ننه گیان به بۆڵه‌بۆڵ هات، شه‌كراوی بۆ گرتینه‌وه، له شوێنه داخكراوه‌كه‌ی دا و وره‌ووره، ئازاره‌كه‌ی شكا. بۆ به‌یانی هه‌ر وه‌ك ئێمه‌ش نه‌بووبین، وابوو، هه‌ر زوو بیرمان چووه‌وه، ده‌سمان به یاریكردن و به‌زمی خۆمان كرده‌وه! ڕاسته منداڵ منداڵه و جیهانێكی تایبه‌تی خۆی هه‌یه، گوێ له گه‌وره ده‌گرێ، به‌ڵام زۆر شتی به مێشكدا ناچێ، به تایبه‌تی گه‌ر به هه‌ڕه‌شه‌كردن، تۆقاندن و لێدان بێ، ئه‌وا خۆی چی بوێ، هه‌ر ئه‌وه ده‌كا!

## کەساسی و بێنازی

لە ئەو ماوەیەدا، باوکم هیچ بایەخێکی بە من نەدەدا. بەرانبەر بە من و منداڵەکانی دیکە، زۆر خەمسارد و کەمتەرخەم بوو. تازە بەسەر خۆشی خۆیدا کەوتبوو، ئیدی چۆن ئێمەی لەبیردەبێ؟! ماڵی باپیریشم خوا نەکا، یەکێکیان سەرەتشتی کورە نازدارە گەورەکەیان کردبێ! وا دیاربوو، پێیان خۆشبوو، باوکم بە دەسی خۆی، ماڵی لە خۆی تێکدا و هەموو لایەکیشمان پەرەوازەبووین. ئەگینا گەر ئەوان دژبوونایە و سەرزەنشتیانبکردایە، دیارە ئەوە سەری نەدەگرت، یا وای نەدەکرد، لە ئەوە دەچوو، کەس لە گوێ کاڵتری پێ نەگوتبێ!

ئاخر گەر وا نەبووایە، (فەزیلە) هەموو ڕۆژێ لە ماڵی باپیرم نەدەبوو، ڕوویان نەدەدایە. یا لە ئەو ماوەیەدا، تەنانەت جارێ دایکم و منداڵەکانیان بەسەردەکردەوە! ئیدی منیش ڕۆژ بە ڕۆژ هۆشم بەبەرخۆمدا دەهاتەوە، هەستم بە ئەو غەدرە گەورەیە دەکرد، زۆر لە ئەو بارە نالەبارە بێزاربووم، بە تەواوی لە نازی دایك بێ بەشبووبووم، ماڵی باپیریشم لەگەڵمدا خراپبوون، بە تایبەتی (فاتم)ی پورم، هەر پێیدا دەکێشام و دەسی بەسەر هەموو ماڵەکەدا گرتبوو، هەمووش لە دەمی دەترسان. (فەزیلە)ش زۆر یارمەتی منی نەدەدا و خواردنیشی بۆ ئامادەنەدەکردم.

ڕۆژێ لە قوتابخانە گەڕامەوە، زۆرم برسیبوو، نان و چای بۆ دانام. منیش گوتم: بەیانی و نیوەڕۆ، هەر نان و چا، ئاخر حەزی لێ ناکەم، ئەمە چۆن وا دەبێ؟! گوتی: هەر ئەوەیە دەیخۆی، بیخۆ، نایخۆی، ئارەزووی خۆتە. منیش تا توانیم، شەقێکم لە قۆری و پیاڵەکان هەڵدا، لە ترسی باوکیشم، جانتاکەم هەڵگرت و ڕامکرد، خۆم گەیاندە لای دایکم. هەمووی دوو کاژێری پێ نەچوو، باوکم بە قۆری و پیاڵە شکاوەکانەوە هات، دەسیکرد بە قڕەقڕ و هەراهەرا، بە دایکمی گوت: هەمووی تۆ هانیدەدەی، هەرا و ئاژاوە بنێتەوە. دایکی قووڕبەسەریش ئاگای لە هیچ شتێ نەبوو، هەر هێندەی گوت: خوا هەقی ئەو منداڵانەت لێ بسێنێ. ئیدی دوای دەمبۆڵەیەکی کەم، پەلی منی گرت و بۆ ماڵەوە گەڕاینەوە. بەڵام ئەم جارەیان لێی نەدام و هەر تەنیا ئامۆژگاریکردم.

## خراپترین شت

شتێ هەیە، تا ئەو ڕۆژەی گیانم دەردەچێ، هەرگیز بیرم ناچێ. ئەویش ئەوەیە، ڕۆژێکیان پێڵاوەکانم دڕابوو، هەر داوامدەکرد، پێڵاوم بۆ بکڕن، کەس گوێی لێ نەدەگرتم. منیش پێڵاوەکانم بە تەواوی دڕاند و بەپێی پەتی چووم بۆ قوتابخانە. هەموو ڕۆژێ پێش ئەوەی

بچینە پۆلەوە، زەنگی قوتابخانە لێیدەدا، لە حەوشە گەورەکەی قوتابخانە کۆیان دەکردینەوە، تەماشای دەست و نینۆک، خاوێنی جل و دەموچاویان دەکردین. مامۆستای پشکنەر هات و بینی، پێم پەتییە و پێڵاوم لە پێدا نییە. گوتی: لە ڕیزەکە وەرە دەرەوە و بچۆ بۆ لای بەڕێوەبەر. بەڕێوەبەر ناوی (جەلال)ە فەندی بوو، کە زانی، لەسەرچی ناردوویانم بۆ لای، یەکسەر گوتی: بڕۆرەوە، تا پێڵاو لە پێ نەکەی، نەگەڕێیتەوە.
منیش بە دەم هەنسکی گریانەوە ڕۆیشتم، لەبەر دەرگەی قوتابخانەکەماندا دانیشتم. بە ڕێککەوت پورە (مەلیح)م لە ئەوێوە تێپەڕی، دانەوییەوە و گوتی: ئەوە بۆ دەگری؟ منیش گوتم: پێڵاوم لە پێدا نییە و لە قوتابخانە دەریانکردووم. ئەویش خێرا دەستیگرتم و بردمی بۆ لای باوکم بۆ نەخۆشخانەکە، هەمووی چەن هەنگاوێ لە قوتابخانەکەمانەوە دووربوو. خوا هەڵناگرێ، پورم ئەوەی بە دەمیدا هات، پێیکرد. ئیدی باوکم خێرا هەستا و بردمی بۆ بازاڕ، جووتێ پێڵاوی هەرزانی بۆ کڕیم!

## گەڕەکی چوارباخ

دواتر دایکم لە ئەو ماڵە گواستییەوە و لە گەڕەکی (چوارباخ)، لە ماڵی (ئەحمەی حەمە عەلی کوردە)، ژوورێکی گەورەی گرت. ئەم خانووە نزیک مەیدانی ماستفرۆشەکان بوو، هەر کە لە دەرگەی دەرەوە ڕەتدەبووین، تا دەگەیشتینە نێو ژوورەکەی خۆمان، سەد مەترێ پتر دووربوو!
لە نێوەڕاستی خانووەکەدا، حەوشەیەکی یەکجار گەورەی هەبوو، ماڵی دووکۆڵی یا غارغارێنی لەسەر بوو. لە هەر سێ لای حەوشەکەشەوە، ژوور ڕیزببوو، هەر ژوورەی خێزانێکی هەژار بەکرێ گرتبووی و تێیدا دەژیا. دایکیشم لەگەڵ منداڵەکاندا، لە یەکێ لە ئەو ژوورانەدا، سەری خۆیان کزکردبوو، بە کولەمەرگی دەژیان.
خاوەن ماڵەکە چایچی بوو، هاوڕێی باوکم بوو، پیاوێکی زۆر باشبوو، باوکی دوکتۆر (ئەمیر)ی تیشک بوو، کوڕێکی دیکەشی هەبوو، ناوی (مەحموود) بوو. لە ئەو خانووەدا، هەمووی دوو جار، فریای سەردانی دایکم کەوتم، ئیدی دوای ئەوە، بارودۆخەکە بە تەواوی گۆڕا!

## خۆشییەکی چاوەڕواننەکراو

زۆری نەبرد، باوکم وەک هەموو شتەکانی ژیانی خۆی، لە (قەزیلە)ش بێزاربوو. لە لایەکی دیکەشەوە، دۆست و خزمان زۆر سەرزەنشتیاندەکرد. خۆشی وردەوردە، هۆشی بەبەردا

هاتبووەوە و دەیزانی، چ هەڵەیەکی گەورەی کردووە و سێ منالی بەرەڵاکردووە. هەڵبەتە دەبێ، حسابێکی بۆ پاشەڕۆژیان کردبێ، بە تایبەتی ئەوە یەکەمین جار نییە، ئەوەی بەسەردادێ، چونکە تاقیکردنەوەی (حەسەن)ی برامی لەبەردەمدابوو. جگە لە ئەوەی لەگەڵ (فەزیلە)شدا، گرفتی تایبەتی خۆی هەبوو، بۆیە لە پڕ وازی لێ هێنا و بۆ لای دایکم گەڕایەوە. هەرچی چۆنێ بوو، هەموو لایەک ئاشتبوونەوە، ئەم ئەزموونە سەخت و تاڵەشمان بڕی، بە سەرکەوتوویی لێی دەرچووین و ڕزگارمانبوو.

دوای ئەوەی باوکم لە (فەزیلە) جیابووەوە و خێزانەکە یەکیگرتەوە، هەردوو خانووەکە چۆڵکرا و هەر لە هەمان گەڕەك، لە مەیدانی کافرۆشەکان و لە تەنیشت ماڵی (قالەی کامەلا)وە، خانوویەکمان گرت. خانووەکە هی (حەمەعەلی وەستا مەجید) بوو، لە دوو دەستە پێکهاتبوو. دەستەی یەکەم دوو نهۆمبوو، نهۆمی یەکەم دووکانی (مام ڕەش)ی کافرۆش بوو، باوکی شەهید (قوربانی) بوو. نهۆمی دووەمیش، ژوور و هەیوانێکی زۆر گەورەبوو، ئێمەی تێدا دەژیاین. لەسەر داڵانەکەش، ژوورێکی چوارگۆشەی خنجیلانەی لێ بوو، سەرەتا باوکم بۆ دەرزیلێدان تەرخانیکردبوو، دوایی ژن و مێردێکی هەژاری خەڵکی (سەقز)، بە کرێ لێیان گرتین. ئەو دوو بەسەزمانە، لە دەس هەژاری و چەوساندنەوە ڕایانکردبوو، لە (سولەیمانی)ش بە شەڕەشەق دەژیان. پیاوەکە زۆر بەخۆ و سەیربوو، پینەچی بوو. ژنەکەشی زۆر چکۆلانەبوو، هەمیشە جلی کوردی لەبەردابوو، کڵاو و فێستی کوردی لەسەردابوو، پشتێنێکی زلیشی دەبەست. من زۆرم لا سەیربوو، ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ژیانی خۆمدا خەڵکی وا ببینم، زۆرم خۆشدەویستن و زووزوو سەرم لێ دەدان.

زۆر سەیربوو، شەو و ڕۆژ کتری و قۆرییان لەسەر ئاگربوو، هەر چای تاڵیان دەخواردەوە و منیشیان فێری دژەمە خواردنەوە کرد، بە تایبەتی زۆر حەزم لە شەکری کوڵاو بوو. بەڵام ئێستەش نازانم، ناویان چی بوو، پیاوەکەم بە مام سۆفی و ژنەکەشیم هەر بە پوورێ بانگ دەکردن.

لەژێر ژوورەکەی ئەوانیشدا، ژێرزەمینێکی قووڵ هەبوو، بە چەن پێپلیکانەیەك دەچووە خوارێ، کارێزێکی زۆر باشی تێدا بوو، ئاوێکی سازگاری هەبوو، خاوەن ماڵەکە لە نێوەڕاستدا، حەوزێکی گەورەی بۆ کردبوو، چواردەورەکەشی چیمەنتۆبوو، زۆر جوان و ڕێکوپێك دروستکرابوو. کاتێ ڕۆژانی هاوین زۆر گەرمدەبوو، ئەوێ ساردبوو، لێی دەحەوایینەوە. لە بەهارانیشدا کارێزەکە دەتەقییەوە و ژوورەکەی پڕدەکرد لە ئاو، جاری واش هەبوو، سەردەکەوت و حەوشەکەشی تەڕدەکرد. ئاودەست و گەرماویش هەر لە خوارەوەبوون، لەسەرەوە هیچی لێ نەبوو!

دەستەی دووەمی خانووەکەش، پیاوێکی زۆر باش و کوردپەروەری تێدابوو، ناوی (ئەحمەد سامی) بوو، خەڵکی (سولەیمانی) نەبوو، وا بزانم، خەڵکی (ڕەواندووز) بوو. بە دەرگەیەك لە دەستەی یەکەم جیاکرابووەوە، هەردوو دەستەکە زۆر سەربەخۆبوون، بەڵام یەك دەرگەی دەرەوەیان هەبوو. داڵانێکی درێژی هەبوو، بە حەوشەیەکی گەورە کۆتایی دەهات، لە ئەوبەری حەوشەکەشەوە، خانوویەکی گەورەی دوو نهۆمبوو، ئەوانی تێدا بوون. ئەم ماڵە ئێمەیان زۆر خۆشدەویست، زووزوو من و منداڵەکانی دیکەیان بانگدەکرد و نوقوڵیان دەدایێ.

پیرەم، زۆر حەزیان لە کنگر دەکرد، زۆربەی کات بە کوڵاوی و سوورەوکراوی دەیانخوارد، بەشی منیشیان دەدا. خۆیان منداڵی وردیان نەبوو، ژن و مێردێکی جوان بوون، سێ کوڕ و دوو کچی گەورەیان هەبوو.

لە ئەم گەڕەکە ئاسیاومان زۆربوو. بە تایبەتی ماڵی (کەریم چاوڕەش)، هەر زۆر لە کۆنەوە دەمانناسین و تێکەڵاویمان هەبوو. زووزوو هاتوچۆی یەکدیمان دەکرد. ژنەکەی ناوی خاتوو (فەیم) بوو، ئەو کاتە سێ کچ (رووناك، مەعسووم و سوعاد)، کوڕێکیشیان (ماجید) هەبوو، من لەگەڵ (مەعسە)دا زۆر شۆرتبووم، هەرچەندە ئەو دوای (رووناك) هاتبوو، لە منیش گەورەتربوو، هەر کاتێ دەچووین بۆ ئەوێ، هاریمدەکرد، کاك (کەریم) دەیگوت: سەگباب هەستە بڕۆرەوە. منیش دەمگوت: تا نان نەخۆین، ناڕۆینەوە، ئێمەش پەشمان پێوەیەتی! ئەوانیش پێدەکەنین. سەیر ئەوەبوو، ئەوان بە گاڵتەی تێدەگەیشتن، کەچی من بە ڕاستمبوو! تا ئێستەش ئەو پێوەندییەی نێوان ئەم دوو خێزانە هەر بەردەوامە، لە جاران چاکتربووە، خراپتر نەبووە، هەرچەندە کاك (کەریم) و دایە (فەیم)یش نەماون!

هەر لە ئەم گەڕەکە نوێیەدا، گەلێ هاوڕێی نوێم پەیداکرد، لە هەموویشیان نزیکتر، (حەمە شوان رەسوول) بوو، ماڵەکەیان بەرانبەر ماڵی خۆمان بوو. ئەو کاتە هەر ئەو تاکە کوڕەیان هەبوو، بەڵام چەن خوشکێکی هەبوو، گەورەکەیان دوکتۆر (شوکریە) بوو. دووکانی کاك (ڕەشیدی کوڵەشین)یش، لەژێر خانووەکەماندا بوو، (لایەق) و (فایەق)ی کوڕی، لە دووکان یارمەتی باوکیان دەدا، هەر زوو بووین بە هاوڕێ. بەڵام لەگەڵ (لایەق)دا پێوەندیم پتربوو. هەروەها کوڕانی (حاجی تۆفیقی کورگەوان و مچەی کورگەوان؛ بەکر، عومەر و بورهان)، لە هاوڕێ نزیکەکانم بوون.

**باوکم و کەسوکارەکەی**

لە ئەم ماڵە نوێیەماندا، ژیانێکی زۆر خۆش و بێ گرفتمان بەسەردەبرد. چونکە لە ماڵی باپیرمەوە دووربووین، گرفتیان بۆ درووست نەدەکردین. دۆست و ئاسیاوێکی زۆرمان هەبوو، هەمیشە هاتوچۆی یەکدیمان دەکرد. باری ئابووریمان باشبوو، باوکم پارەیەکی باشی دەستدەکەوت، ریستی، خانوویکڕی، بەڵام باپیرم داوای لێ کرد، پارمەتییدا، خانووە کۆنە چکۆلانەکەی خۆی پێ نۆژەنکاتەوە. ئەویش خانووەکەی بۆ نێمە ئەکڕی، هەرچی هەبوو، هەمووی دایە!

باوکم کەسوکاری خۆی زۆر خۆشدەویست، هەرگیز لە قسەی باوکی دەرنەدەچوو، چەن جارێ دیومە، بەری پێی دایکی ماچکردووە، ئەویش هەر پێدەکەنی! بەڵام ئەوان بۆ ئەو وا نەبوون و زۆریان خۆش نەدەویست، بە تایبەتی براکانی، چونکە کوڕی گەورەبوو، موچەخۆر و بووە بوو، بە تەنگ خەڵکەوە بوو، لە نێو خەڵکیشدا ناسراو و خۆشەویست بوو، لەبەرئەوە ئیرەییان پێ دەبرد! بۆیە هەموو چاویان لێی بوو، بە هەمووشیان هەر لێیان دەکێشایەوە و خۆشیان هیچ نەبوون!

باوکم پاسێکی کڕیبوو، بەدەس شێخ (عوسمان)ی زاوامانەوە بوو، هاتوچۆی (پێنجوێن) پێ دەکرد، پاس وەرگەڕا و شکا، بارکیشم یەک فلسی قەڵبی دەس نەکەوتەوە!

باوکم لەگەڵ کەسەکانی خۆیدا، زۆر باشبوو، دەس و دڵی کراوەبوو، هەرچیان بویستایە، بۆی دەکردن. ئەوانیش نەبووەبوون، هەر دایان دەدۆشی. بەڵام لەگەڵ کەسەکانی دایکمدا وا نەبوو، خۆشی نەدەویستن و حەزی نەدەکرد، هاتوچۆمانبکەن!

ئەو کاتە، نیوەڕاستی ساڵی (1958) بوو. لە پۆلی دووبووم، هەر کاتێ لێدەبوومەوە، سەرم لە باوکم دەدا. لە ئەو ماوەیەدا، باوکم مامە (بەکر)یشمی هەر لە نەخۆشخانەی خوارەوە دامەزراندبوو، بۆی نەخۆشی ئاوڵە و کولێرا خەڵکی دەکوتا. بەڵام باوکم هەر لەسەر بەزم و کوڕێتی خۆی بوو!

شەوانە لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا یاریماندەکرد و گۆرانیماندەگوت. هەمیشە خەریکی ڕاکردن و هاروهاجی بووین. منداڵەکان زۆر باشبوون، کەسی شەڕانی تێدا نەبوو، هێندێ شەویش، لە سەربانی گەرماوی (قشڵە)وە، سەیری فیلمی سینەمامان دەکرد، چونکە سینەمای (گۆیژە)، سینەمایەکی هاوینە بوو، سەری نەگیرابوو.

منیش بەرەبەرە چاوم کرابوووەوە، خەریکبوو، ڕاست و چەپی خۆم، بە باشی دەناسی، شت فێردەبووم، زۆر حەزم لە گۆرانییەکانی (عەلی مەردان) دەکرد. (شیرین بەهارە)کەی

(تایەر تۆفیق)یشم هەمووی لەبەربوو، هەمیشە لە کۆڵانان دەمانگوتەوە. لە ڕاستیدا، ئەگەر ژیانێکی ناخۆش نەبوو، بەڵکوو وا بزانم، خۆشترین تەمەنی منداڵیم، لە ئەو سەردەمەدا بووا ڕۆژانەش بە پۆل دەگەڕاین، سەری بازاڕمان دەدا و دەسووڕاینەوە.

## ڕووداوێکی گرنگ

ڕۆژێکیان بەیانی زوویبوو، هەراهەرا پەیدابوو. باوکم بە پەلە هاتەوە و گوتی: (مەلیك)یان کوشت و لە (بەغدا) شەڕە. منیش زۆرم پێ ناخۆشبوو، تێر گریام، چونکە هەر زۆر لە کۆنەوە خۆشمدەویست.

کاتێکم زانی، لە هەموو شاردا بوو بە هەرا و خەڵکی لەسەر شەقامەکان کۆبوونەوە. منیش لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا، بەرەو خواربووینەوە، تا گەیشتینە سەرچاوە سەرەکییەکەی گەڕەکی (سەرشەقام)، لە ئەوێ تێکەڵاوی جەنجاڵەکە بووین. نازانم، ئەو هەموو خەڵکە، چۆن و لە کوێوە کۆببووبوونەوە؟! هەموویان بە ڕیز بە جادەکاندا دەڕۆیشتن، هێندێکیان درووشمی سوور و هێندێکی دیکەشیان هی سپیان بەرزکردبووەوە. گوێم لێ بوو، هەموویان هاواریانەکرد: بمرێ (مەلیك)، بمرێ (وەسی)، بمرێ (نووری سەعید)، بمرێ ئیستیعمار، بژی شۆڕش، بژی (عەبدولکەریم قاسم)، بژی (یەکێتی سۆڤێت).

ئیدی خەڵکەکە لە ئەوەدا نەبوو، تا دەهاتیش، پترەدەبوو. هەرا و ئاژاوە و ژاوەژاوێ بوو، کەس ئاگای لە کەس نەبوو، وەك دەڵێن: سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسییەوە! ئێمەش تێکەڵاوی نێو شەپۆلی خەڵکەکە بووین، بەرەو (بەرخانەقا) ڕۆیشتین و بە جادەی (کاوە)دا سەرکەوتین، بەرەو (بەرەدەرکی سەرا) ملماننا. پاشان خەڵکەکە لە شوێنی خۆیان وەستان. سەربانی قوتابخانەی (فەیسەڵیە) و ڕیزە دووکانەکانی ئەو بەر، سەر سینەمای (ڕەشید) و فەرمانگەی پۆست پڕپڕبووبوون لە خەڵك. تەنانەت سەر ئوتێلەکەی (نوری عەلی)یش، یەکێکی دیکەی نەدەگرت و هێندێ کەسیش، خۆیان بە عەموودەکاندا هەڵواسیبوو، هەموشیان هەر ئەو درووشمانەیان دووبارەدەکردەوە، تاوبەتاوێکیش گۆرانییانەگوت و هەڵدەپەڕین. ئەوە بە لای منەوە، شتێکی نوێبوو، زۆر سەیربوو، شار بە تەواوی خرۆشا بوو، زۆر کەیفم پێی دەهات. لە لایەکی دیکەشەوە، دڵم هەر لای (مەلیك)ە چکۆلە بوو، وێنە ڕەنگینە ئاڵەکەی، هەر لەبەر چاوەبوو!

بەڵام ئەو کاتە، فرەم بەسەر کێشە و باسی ڕامیارییەوە نەبوو، هەر گوێم لێ نەبووبوو، شتەکانم لە یەکدی جیانەدەکردەوە. لەگەڵ ئەوشدا کەس نەیدەزانی، چ ڕۆژێکی ڕەش،

چاوەڕێی کەلەکەمان دەکا، ئەو ڕووداوە گرنگە، لە مێژووی گەلانی (عێراق)دا، بە شۆڕشی (14ی گەلاوێژی 1958) ناسراوە و هێندێکی دیکەش تا ئێستە، بە شۆڕشی نازانن و هەر بە کۆدەتایەکی ڕەشی سەربازی دادەنێن!

منیش ئێستە بیری لێ دەکەمەوە و دەڵێم: بریا ئەو کۆدەتا خوێناوییە، هەر ڕووی نەدایە، چونکە هەر سەردەمی پاشایەتی باشتربوو، کێشەی کورد بە ئەم ڕۆژە ڕەش و گرفتە گەورەیە نەدەگەی، پارتێکی ڕەگەزپەرستی فاشی وەک (بەعس)، دەسەڵاتی وەرنەدەگرت، بە هەزاران کوردپەروەر نەدەگیران و شەهید نەدەکران، کیمیباران و ئەنفالمان نەدەدی، چوار هەزار گوندمان وێران نەدەبوو، ڕەوشتی کۆمەڵایەتیمان نەدەگۆڕا، پارتی ئیسلامی درووست نەدەبوو، ئاخوندەکانی (شیعە)، دەسەڵاتیان وەرنەدەگرت و وڵاتەکەیان بە دەیان ساڵ بەرەو دواوە نەدەگەڕاندەوە، ساڵ بە ساڵیش، ئاواتمان بە پار نەدەخواست!

لە هەموو شتێکیش خراپتر، ئەم جەنگە ماڵوێرانکەرانە کورد قڕکەرەییە، کە (داعش) لە (کوردستان) هەڵیگیرساندووە و دەیەوێ، وڵاتەکەمان داگیرکا، سەربەخۆیی و سەربەستی نەتەوەییمان لێ زەوتکا!

* * *

### وەرچەرخانێکی مێژوویی

دوای ئەوەی سیستەمی پاشایەتی ئەما و سیستەمی کۆماری جێیگرتەوە، گەلێ ڕووداوی گرنگ، خۆی بەسەر باری نەتەوەیی، ڕامیاری، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کەلتووری گەلانی نێو چوارچێوەی دەوڵەتی (عێراق)دا سەپاند.

لە ڕاستیدا، ئەم ڕووداوە چاوەڕواننەکراوە، وەرچەرخانێکی مێژوویی گرنگ و گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی بوو، بەڵام بە شێوەیەکی باش کەڵکی لێ وەرنەگیرا. چونکە هەر گرووپ و پارتێکی ڕامیاری، بە گەز و جاری خۆی کێشەکانیان دەپێوا، شتێ نەبوو، ناوی بەرژەوەندی باڵای گەلان و دەوڵەتی تازەی کۆماری (عێراق) بێ. ڕەنگە گەر بڵێم: ئەوەتەی ئەو دەوڵەتە زۆڵەکە هەڵتۆقیوە و ئیمپریالیزمی (بریتانیا) دایمەزراندووە، هەرگیز ئاسایش و هێمنی بە خۆیەوە نەدیوە، بەرژەوەندی گشتیش ڕەچاونەکراوە، هیچ لە ڕاستی لام نەداوە، لەبەرئەوەی لە کۆمەڵێ گرووپی ئیتنیک، دوو وڵات، ئایین و ئایینزای جیاواز پێکهاتووە، ئەم پێکهاتانە، چ لە نێوەوە و چ لە دەرەوەی دەوڵەتەکە، بە یەک دەنگ و بە یەک ڕەنگ، هەرگیز بۆ کێشە سەرەکییەکانی وڵاتەکە، خەباتیان نەکردووە و هەوڵیان نەداوە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و ئاشتیخوازانە، گرفتەکان لە ڕەگوڕیشەوە هەڵکێشن و چارەسەرێکی بنەبڕی بۆ بدۆزنەوە، بەڵکوو هەر لایەنێ، لە کلاوڕۆژنەی بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە، لە هەموو شتەکانی ڕوانیوە. لە هەمان کاتیشدا، هیچیان سەریان بۆ ئەوانی دیکە دانەنەواندووە و هەمیشە هەر ویستوویانە، یەکدی بسڕنەوە! بۆیە ڕۆژبەڕۆژ تا هاتووە، کێشەی نەتەوەیی و ئایینزایی زیادیکردووە، هەروا بێ چارەسەرکردن ماوەتەوە.

### پەتای بیری بیانیپەرستی

دوای ئەو ڕووداوە، وەک چۆن ئاگر لە پووشێکی وشک بەربەبێ و زۆر بە زوویی دەتەنێتەوە، هەر بە ئەو شێوەیەش، بیری کۆمۆنیزم و ڕێکخستنەکانی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)، لە نێو گەلانی ئەم دەوڵەتەدا بڵاوبووەوە. زۆربەی زۆری خەڵکی (کوردستان)یش، گەر لە ڕیزەکانی ئەو پارتەشدا، کاریان نەکردبێ، ئەوا هەر خۆیان بە مارکسی یا کۆمۆنیست دەزانی. تەنانەت هێندێ لە ئەو ئەندامانەی، لە ڕیزەکانی (پارتی دیمۆکراتی کوردستان)یشدا کاریاندەکرد، زۆربەیان هەر بە ئەو شێوەیە بیریاندەکردەوە، لە پێڕەو و پرۆگرامەکەشیاندا نووسیبوویان، کەڵک لە پرینسیپەکانی (مارکسیزم ـ لینینیزم) وەردەگرین!

ئیدی کاریؒ هاتە پێشەوە، هەر لە منال، ژن، پیر و پەککەوتەوە، تا بە خوێندکار، مامۆستا، پزیشک، کرێکار، جووتیار و خاوەن پیشە جیاجیاکانی دیکەش دەگا، تەنانەت مەلا و فەقێ و قورئانخوێنە کوێرەکانیش، خۆیان بە کۆمۆنیست دادەنا، بێ ئەوەی بە تەواوی، شتێ لە فەلسەفە، ئایدۆلۆژیا و پرینسیپە سەرەکییەکانی، ئەو بیروباوەڕە بزانن، یا شتێکی لێ تێگەیشتبن!

کۆمۆنیستەکان، زۆر خەیاڵپڵاوانە بیریاندەکردەوە و کاریاندەکرد، هەموو خەڵکی (کوردستان) و (عێراق)یشیان، خستبووە سەر کەڵکەڵەی ئەوەی گوایە، (عێراق) بەرەو سۆسیالیزم هەنگاودەنێ، لە سایەی ئەو سیستەمەشدا، دەوڵەمەند و هەژار، شار و گوند، لە ماوەیەکی کەمدا، هیچ جۆرە جیاوازییەکیان، لە نێواندا نامێنێ، دادپەروەری و یاسا، جێی هەموو جۆرە ناکۆکی، زۆرداری و جیاوازییەکی کۆمەڵایەتی دەگرێتەوە، گورگ و مەڕ پێکەوە، بە ئاشتی و هێمنی ئاودەخۆنەوە، بە دەستێکی پۆڵایینیش، لە سەرمایەدار و دەرەبەگەکان دەدەن، کارگەکان بۆ کرێکار و زەویش بۆ جووتیار دابیندەکەن! تەنانەت لاسایی هاوڕێ (ستالین) و سیستەمی کۆنی سۆسیالیزمی (یەکێتی سۆڤیێت)یان دەکردەوە و دەیانویست، هەموو دەرەبەگ و خاوەن موڵکەکان لەنێوبەرن، زەوی بە گوریس بەسەر جووتیارەکاندا دابەشکەن. هەر کەسێکیش دژی ئەم دید و بۆچوونانە بووایە، بە ئەو پەڕی توانایانەوە دژایەتییاندەکرد، بە نۆکەر، چڵکاوخۆر، بەکرێگیراوی بیانی و ئیمپریالیزم تاوانباریاندەکرد!

ئەوان ئەو خەونە خۆشانەیان دەبینی، ئەو هەموو بەڵێنانەیان بە چینی ڕەشوڕووتی کۆمەڵانی خەڵک دەدا، بێ ئەوەی ئەنجامەکانی لەبەرچاوبگرن و دواڕۆژی ئەو کارانەیان لێکبدەنەوە. بۆیە هەر زوو، هێندێ دەرەبەگ و خاوەن موڵک و پارەدار، کەوتنە خۆیان و دژایەتی ئەو سیستەمە نوێیەیان کرد. تەنانەت چەن کەسێکی وەک (شێخ جەلالی حەفید) و (داودبەگی جاف) ڕایانکرد و پەنایان بۆ (ئێران) برد، بە هەموو تواناشیانەوە، دژی یاسای چارەسەرکردنی زەوی وەستانەوە!

ماوەیە کاروبارەکان بە ئەو شێوەیە ڕۆیشت و ژیانمان بەسەربرد، باری وڵاتەکە زۆر خۆشبوو، زۆربەی کات بۆنەیەکیان دەدۆزییەوە، بۆ ئەوەی خۆپیشاندان سازکەن، ئاهەنگیان دەگێڕا، گۆرانییان دەگوت و هەڵدەپەڕین. هەر پارتێکی ڕامیاری لە (کوردستان)، ڕێکخراوی دیموکراسی تایبەتی خۆی دامەزراندبوو و بارەگاشیان بۆ کردبووەوە، ڕێکخراوە دیموکراسی و پیشەییە جیاجیاکانیان، لە یەکدی جیاکردبووە و یەکێتییەکانی

(قوتابییان، لاوان، مامۆستایان، ژنان) سەر بە (پ. د. ک.) بوون. لە بەرانبەریشدا (پارتی کۆمۆنیست)، چەن ڕێکخراوێکی دیکەی وەک (کرێکاران، جووتیاران، گەنجان و مافی ئافرەتان)یان قووتکردبووەوە. ئیدی بە ئەو شێوەیە، کۆمەڵی کوردەوارییان، بە تەواوی لە یەکدی ترازاندبوو. هەموو خاوەن پیشەکانیش، سەندیکای تایبەتی خۆیان هەبوو، بێ ئەوەی هیچ دەسکەوتێکی گرنگیان، بۆ ئەندامەکانیان هەبێ!

بە کورتی و بە کوردی، یەک ڕێکخراو و سەندیکای یەکگرتوو نەبوو، هەموو چین و توێژاڵە کۆمەڵایەتییەکان، لە چوارچێوەی سنووری خۆیدا کۆکراتەوە و ئاراستەیانکا، تا مافە سرووشتی و ڕەواکانی خۆیان بەدەسبێنن. بەڵکوو ئەو ڕێکخراوانە، لە ڕوانگەی ئایدۆلۆژیا و بەرژەوەندی تەسکی پارتایەتییەوە دامەزرابوون! سەردەمێکی زۆر سەیر بوو، بەهۆی بۆنە جیاوازەکانەوە، هەر پارتێ بە جیا خۆی ئاهەنگی تایبەتی دەگێڕا. بۆ نموونە: سەرکردایەتی (پ. د. ک.)، بە جیا یادی ڕۆژی دامەزراندنی پارتەکەی خۆی، ڕۆژی ڕەشی (06. 09. 1930) و جێژنی (نەورۆز)یان دەکردەوە. کۆمۆنیستەکانیش هەر بە ئەو شێوەیە، بە جیا یادی هەموو شتێکی ناکوردانەیان دەکردەوە، وەک ڕۆژی لەدایکبوونی (لینین)، شۆڕشی ئەکتۆبەر، دامەزراندنی سوپای (عێراق) و پارتی کۆمۆنیستی (عێراق). زۆر بایەخیان بە بۆنە و جێژنە نەتەوەییەکانی کورد نەدەدا، گەر یادیشیانبکردایەتەوە، ئەوا بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆیان دەیانکرد. لە ئەو سەردەمەشدا، پێشبڕکێ و ناکۆکییەکی سەیر، لە نێوان (پارتی) و (کۆمۆنیست)دا دروستببوو، هەردوولایان زۆر ڕکەبەرایەتی یەکدیان دەکرد و دژی یەکدی بوون، ڕکەبەرایەتییەکەش، پتر لە نێو ڕیزەکانی خوارەوەی پارتەکان و ڕۆڵەکانی گەلدا تاریسەندبوو، بە شێوەیە بوو، هێندێ جار هێندێ کەس پەلاماری یەکدییان دەدا و ناو بە ناویش، ناووناتۆرەی ناشیرینیان دوا یەکدی دەخست!

(پارتی) بەرانبەر مەترسی فراوانبوونی دەسەڵاتی (پارتی کۆمۆنیست) لە (کوردستان)دا، پتر هەوڵی بوژاندنەوەی، هەستی نەتەوەیی ڕۆڵەکانی کوردی دەدا، زمان، وێژە، هونەر و کەلتووری کوردی پێشدەخست. دەیویست، منداڵانی کورد بە زمانی دایە بخوێنن، ئەندامەکانیان، زۆر بایەخیان بە مێژووی کورد و جوگرافیای (کوردستان) دەدا، بە کوردییەکی پەتی و ڕەوان دەیاننووسی و دەیەیڤین.

کۆمۆنیستەکانیش، هەستیان بە مەترسی ئەو پەروەردە نەتەوەییە کردبوو، زۆر بە توندی دژبوون، چونکە ئەو جۆرە شتانەیان بەلاوە گرنگ نەبوو، بەڵکوو تەنیا هەر گرنگ ئەوە

بوو، ڕیزەکانی گەلانی (عێراق) ڕێکخەن، بەرەو بەهەشتی سۆسیالیزم و کۆمۆنیستییان بەرن! لەبەرئەوە، زۆر جار گاڵتەیان بە هەموو شتێکی کوردی دەکرد. بۆ نموونە: ئەندامانی (پارتی) ڕۆژباش و شەوباشیان لە یەکدی و خەڵکی دەکرد، کۆمۆنیستەکانیش هەڵیاندەگێڕایەوە و دەیانگوت: تاکەکڵاش، عەنتەرباش! یا سووکایەتییان پێ دەکردن و دەیانگوت: تاقمێ داماتوون لە کەوش و کڵاش، سەلامی خوایان لێ بووە بە عەنتەرباش!
کۆمۆنیستەکان، ڕقیان لە هەموو شتێکی نەتەوەیی بوو، کاتێ (پارتی)، هەوڵی بۆ دابینکردنی مافە ڕەواکانی گەلی کورد دەدا، ئەوان زۆر دژایەتیاندەکرد و زۆر پەرگیربوون، (عێراقچێتی)یەکی زۆر خەست و بێ تامیان دەکرد، بە شێوەیە، تا سەر مۆخ و ئێسکیان ڕۆچووبوو. باسی مێژووی کورد و پیاوە ناودارەکانیان نەدەکرد، تەنانەت گۆرانییان بەسەر یەکێکی وەک (عەبدولکەریم قاسم) و (مەهداوی)دا هەڵدەدا، پلاریان لە (پارتی)ەکان دەگرت و پێیان دەگوتن: ئەوا هەموو بە کۆچان دەڕۆن، بەرەو مزگەوتی گەورە، بە پشتیوانی فەقێ و مەلایەکی دەنگ گەورە!
کۆمۆنیستەکان بە ئێوەشەوە ئەدەوەستان، لەسەرجادە و شەقامەکانی (سولەیمانی)، بە عەرەبی دەیانقیڕان و دەیانگوت: (عاش الشعب السوري عاش، بقيادة خالد بكداش) بژی گەلی سووریا بژی، بە سەرۆکایەتی (خالید بەکداش)!
تەنانەت کاتێ (یەکێتی مامۆستایانی کوردستان)، داوای (معاریفی کوردستان)یان دەکرد، کە ئەوە کورد لە ساڵەکانی سەدەی بیستەوە داوایدەکا، ئەوان زۆر بێ شەرمانە، هەست و هۆشی نیشتمانپەروەرانی کوردیان بریندارئەکرد و دەیانگوت: (معاریفی قلیاسان). کار لە ئەوەش تێپەڕیبووبوو، هێندێ جار، هەڕەشەیان لە کوردپەروەران دەکرد و قسەیان دوادەخستن! بە ڕاستی ئەزموونێکی خراپ و ژێرکەوتووبوو، بۆیە بە هیچ نەبوون!
ئەو کاتە، تەمەنم لە هەشت ساڵ پتربوو، وەک هەموو منداڵێ، حەزم لە هەراوبەزم و جەنجاڵی دەکرد. لە ماوەی ئەو هەشت ساڵەی ژیانمدا، هیچ جۆرە خۆپیشاندان، نامەتکە ئازادی، خۆشی و جەنجاڵستانێکی لە ئەو شێوەیەم نەدیبوو، بۆیە هەمیشە، لەگەڵ منداڵانی گەڕەکدا، لەسەرجادەکان فڕکەمانئەدەهات.
ڕۆژێکیان لە جادەی (سەرشەقام)ەوە بە ڕاکردن، بەرەو ماڵەوە گەڕامەوە، بە پەلەپرووزێ خۆم بە ژووردا کرد و بە دایکم گوت: دایە، شوکور درۆیە، (شێخ مەحموود) ئەمردووە! ئەویش پێکەنی و گوتی: کوڕم چۆن وا دەڵێی، چەن ساڵە مردووە؟! منیش تووڕەبووم، سوێندم بۆ خوارد و گوتم: بە گوێی خۆم گوێم لێ بوو، پیاوێ بەسەر پیکابێکەوە بوو،

میکرەفۆنێکی بەدەستەوەبوو، هاواریدەکرد: (شێخ مەحموود)ی نەمر نەمردووە، هەر زیندووە، بۆ باوەڕم پێ ناکەی، گوایە من درۆدەکەم؟! لە ئەو کاتەدا باوکم هاتەوە، بۆ ئەویشم گێڕایەوە. ئەویش پێکەنی و گوتی: کوڕم مەبەستیان ئەوەیە، بە جەستە مردووە، بەڵام ناو و کردەوەکانی هەر زیندوون و لە دڵی کورددا دەژین. ئینجا تێگەیشتم و زۆرم پێ ناخۆشبوو، وام دەزانی، تازە مردووە!

### ئیشاوی کۆمۆنیست و گرفتی نێوخۆی خێزانەکان

لە ئەو گێژەمە و کێشەیەی نێوان (پارتی) و (کۆمۆنیست)ەکاندا، ناکۆکییەکی یەکجار گەورە، لە نێو ئەندامانی یەک خێزان، لە نێوان زۆربەی خێزانەکانی (سولەیمانی) و لە نێو کۆمەڵدا پەیدابووبوو. کەم ماڵ هەبوو، بە هۆی گرفتی ئیشاوی کۆمۆنیستەکانەوە، گرفتی ناکۆکیی نێوان (پارتی) و (کۆمۆنیست)، لە نێویاندا ڕەنگی نەدابێتەوە.
ئەو کاتە، هەموو مامەکانم و دوو پوورم، لە ماڵی باپیرم دەژیان. هەرچەندە ئێمە، هەر لە سەرەتاوە، ماڵمان جیابوو، بەڵام زۆربەی کات من و باوکیشم، هەر لە ئەوێ بووین. بە تایبەتی من ئەوێم زۆر پێ خۆشبوو، چونکە هەمیشە جەنجاڵبوو. لە نێو بنەماڵەکەماندا، جگە لە باپیرم، باوکم و هەر سێ مامەکەم، لە ڕیزەکانی پارتی (کۆمۆنیست)، ڕێکخراوەکانی قوتابییانی گشتی و گەنجاندا کاریانئەکرد. تەنانەت دایکیشم، دوای (حەلاوە) خانی ژنی (شێخ لەتیفی حەفید) کەوتبوو، لە ماق ئافرەتاندا ئەندامبوو!
لە ئەو ڕۆژانەدا، لە ماڵی باپیرم، هەموو ئێوارەیە لەسەر نانخواردن، دەمەتەقێ و هەرا دروستدەبوو. باپیرم وەک پیاوێکی موسوڵمانی لەخواترسی خاوەن ئەزموونێکی زۆر و دنیادیدە، زۆر دژی بیری کۆمۆنیزم بوو. بە تێکدەری خێزان، سەرلێشێواو و گاوور تاوانباریدەکردن. هەمیشەش، سەرزەنشتی کوڕەکانی دەکرد. کوڕەکانیشی لەبری ئەوەی، باری دەروونی، باوەڕی ئایینی و تەمەنەکەی لەبەرچاوبگرن، وەڵامیاندەدایەوە و دڵیان دەڕەجاند، هێندێ جار لە یەکتیش زویردەبوون. باپیریشم هێندە تووڕەدەبوو، دەیگوت: هەر کەسێ کۆمۆنیستە، با لە ئەم ماڵە بڕوا و ملی خۆی بشکێنێ!
بەڵێ، نا لە ئەو ڕۆژانەدا، ئەوە گرفتی زۆربەی ئەو بنەماڵە موسوڵمانانە بوو، کە هێندێ لە منداڵەکانیان (کۆمۆنیست، پارتی و موسوڵمان) بوون. ئەوان ڕێزی هەست و هۆشی باپیریان نەدەگرت، خوا پارووبە نانی نەرم و گەرمی دابوو، نەیاندەزانی، بێ دەنگ دانیشن و بە خشکەیی بیخۆن، چونکە کاریان نەدەکرد و نانیشیاندەخوارد!

ئەوان وایان دەزانی، تێکۆشان و بیروباوەڕ، تەنیا هەر ئەوەیە، مرۆ بە گژ هەموو کەسێك، هەموو شتێکی دژە باوەڕەکەی خۆی و پیرۆزدا بچێتەوە، هەر کاتێ ناوی کۆمۆنیست، بە خراپە هات، ئیدی وەك قیشەکەشێتە بتەقتەوە و بەحەوادا بچن!

## لە نێوان دوو پەڕگیری کۆمۆنیستیی و (پارتی)دا

مامە (بەکر)م، سەرەتا کۆمۆنیست بوو، جارێ لەگەڵ باپیرمدا، لەسەر پارتی کۆمۆنیست لێیان بوو بە شەڕ، ماوەیە ماڵی بەجێهێشت و لە ماڵی ئێمە بوو. کەچی دوای ماوەیەکی کورت، ڕاستی بۆ دەرکەوت و لە پێش هەموویاندا، وازی لەو پارت و بیرە هێنا و بوو بە (پارتی)، بەڵام ئەم جارەیان، پارتییەکی پەڕگیربوو، وەك لە ئەو سەردەمەدا دەیانگوت: پارتییەکی تۆخبوو! تەنانەت دوایی وای لێهات، نەك هەر دژی بیری کۆمۆنیزم بوو، بەڵکوو بە هەموو شێوەیەك و بە هەموو تواناییەوە، دژایەتی پارتی کۆمۆنیستی دەکرد، بە دوژمنێکی سەرسەختی کوردی دادەنا؛ تا مردیش، هەر لەسەر ئەو باوەڕە بوو، بە موو لای نەدا!

مامە (بەکر)م، کۆمەڵێ هاوڕێی هەبوو، (حەمەعەلی عەینە، فەرەجی شیرین، عوسمانی عارق فیتلە، عەبەلالەی کانیسکان، کەریمە ڕەش و ئەحمەدی دەروێش حەسەن ...)، هەموویان پیاوی ناسراو، بەجەرگ، ئازا و بوێر، چاونەترس و نەسوەشێن بوون، زۆر ڕقیان لە کۆمۆنیستەکان بوو، هەموشیان (پارتی) بوون. باوەڕناکەم، (پارتی) فێری کردبن، جنێو بە کۆمۆنیستەکان بدەن و سووکایەتییان پێ بکەن؛ بەڵکوو هەر خۆیان، لە هەر شوێنێ کۆمۆنیستێکیان بدیایە، تێریان دەکوتا و دەبووایە، وازیبێنایە. هەموو جارێ مامم دەیگوت: زۆربەی پیاوانی گەڕەکی (کانیسکان) کۆمۆنیست بوون، (پارتی) ئەندامی زۆر کەمبوو، ئێمە هەڕەشەمان لێ دەکردن و سەرەڕێمان لێ دەگرتن، تا زۆربەیان وازیانهێنا و بوون بە (پارتی).

لە بیرمدێ، (پارتی) لە سەر شەقامی (مەولەوی) و بەرانبەر تەلارەکەی (تۆفیق قەزاز)، لە نێوان ساڵانی (1958–1961)دا، نامەخانەی (خەبات)ی کردبووەوە، ڕۆژنامەی (خەبات) و هێندێ پەرتووکی تێدا دەفرۆشرا؛ مامە (بەکر)م بەڕێوەیدەبرد. منیش زۆر جار، سەرم لێ دەدا، ئێواران ڕۆژنامەی دەدامێ و دەیگوت: لەبەردەرکی سەرا بیگێڕە و بیفرۆشە.

هەروەها، خوالێخۆشبوو (شێخ مستەفای شێخ موحەممەدی گوڵانی)ش، لە خوار سینەما (سیروان)ەوە، لە نێوان ساڵانی (1959–1962)دا، نووسراوخانەی چرێژەی (بێکەس)ی کردبووەوە. ئەم دوو دەزگەیە، کارێکی زۆریان لە بڵاوکردنەوەی بیری نەتەوەیی و

ڕۆشنبیریی کوردی کرد، ڕۆژانە خەڵکێکی زۆر، ڕوویان تێ دەکردن و هەمیشە لەبەر کوردپەروەران جمەیانئەهات، پەرتووک و بڵاوکراوەکانیان دەکڕی و دەمەتەقێیاندەکرد.
ڕۆژێکیان یادی لەدایکبوونی (لینین) بوو، یا یادی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بوو، ژمارەیەکی (خەبات) دەرچووبوو، وێنەیەکی (لینین)ی بڵاوکردبووەوە؛ ئیدی ئەو ڕۆژە، لەبەر کۆمۆنیست نامەخانەکە بەرنەدەکەوت و هەر کۆمۆنیست بوو، خۆی پێدادەکرد، ڕۆژنامەی (خەبات)ی دەکڕی و هەر زووش نەما. مامیشم لە ئەوە زۆر تووڕەبووبوو، بە یەکێکیانی گوت: ئەوە بۆچی ڕۆژانی دیکە نایەن و ڕۆژنامەی (خەبات) ناکڕن؟! دیارە ئەمڕۆ هەر لەبەرئەوە هاتوون، چونکە وێنەی ئەم کەچەڵەی بڵاوکردووەتەوە. یەکسەر ڕۆژنامەکەی فڕێدابووە سەر زەوی و لە داخاندا، دوو پێلەقەی بە سەری (لینین)دا کێشابوو! هاوڕێ کۆمۆنیستەکەش بە تەواوی زویربووبوو، لەگەڵ مامدا هیچی پێ نەکرابوو، بە بۆڵەبۆڵ ڕۆیشتبوو.
پاشان لەڕێی ڕێکخستنی خۆیانەوە، لای لێپرسراوانی (پارتی)، شکاتیان لە مامم کرد بوو. لەسەر ئەوە مامیان لابرد و شەش مانگیش لە کارکردن دووریانخستەوە. ئەویش لە جاران پتر، لە کۆمۆنیستەکانی گەڕەکی خۆمانی هەڵپێچابوو و زۆربەی ڕۆژ، لەگەڵ هاوڕێکانیدا، یەک دووانێکیان دارکارییەکرد!
دوای ئەو ڕووداوانە، ڕۆژبەڕۆژ جەماوەری گەل، پتر چاویانەکرایەوە و بەرپێی خۆیان ئەبینی. ئیدی وردەوردە، بەڵێنە درۆکانی کۆمۆنیستەکان، پتر ئاشکرابوو، ڕاستی و ناڕاستی بەڵێن و بۆچوونەکانیان و دەوڵەتی (عێراق)یان بۆ دەرکەوت. لەبەرئەوە تا دەهات، بزووتنەوەی کوردایەتی لە باشووری (کوردستان) بە گشتی و لە شاری (سولەیمانی) بە تایبەتی پەرەیسەند و پتر گەشەیکرد، (پارتی)ش دۆست و ئەندام و دەسەڵاتی زیادیکرد، سەنگ و قورسایی خۆی هەبوو، هەموو لایەنەکان حسابیان بۆ دەکرد!

چوار براکە
(حەمەی شێخ عەزیز)ی باوکم لەسەر کۆمۆنیست، سەری هەرتەحەوتی دەبڕی، تەنانەت لە هێزی (مقاومەی شەعبی) واتە (بەرگری میللی)شدا بوو. دەسێ جلی خاکی تایبەتی و کاسکێتێکی وەرگرتبوو، هەموو هەفتەیەک لە (سەربازگەی سولەیمانی)، چەن جارێ

مەشقیان پێ دەکردن. بەڵام لە ڕاستیدا، کۆمۆنیستێ بوو، فڕی بەسەرییەوە نەبوو، هیچی لێ نەدەزانی، بەڵکوو ئەویش، وەک ئەو هەزاران کوردە سەرلێشێواوەی دیکە، دوای پەتاکە کەوتبوو!

مامە (بەکر)ـم زۆر کوردپەروەربوو، پیاوێکی ئازا و قسە لە ڕووبوو، دەتگوت، خوا هەر بۆ کوردایەتی دروستیکردبووە! لە ژیانیدا، سەری بۆ هیچ لێپرسراوێکی کوردی و دەسەلاتێکی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) دانەنەواندووە. لە ئەو ڕۆژەوە، لە ڕیزەکانی (پارتی)دا وەرگیرابوو، هەر لەگەڵ باڵەکەی جەلالیدا بوو، تا دوا هەناسەی ژیانیشی، هەر ئەندامی (ی. ن. ک.) بوو، لە ڕێکخراوی کاسبکاران کاریدەکرد. بەڵام ئاستی ڕووناکبیری بەرز نەبوو، بەڵکوو یەکێ لە کادیرە هەرە باشەکانی ڕێکخستنیان بوو. دووکانەکەی وەک بنکەیەکی ڕامیاری وابوو، بە شێوەیە مامە (عومەر)ـم، ناوی نابوو (مەلبەند). ڕۆژانە هەرچی شتێکی بە باش بزانیایە، گەر ڕاستیش نەبووایە، لە نێو بازاڕدا بڵاویدەکردەوە، پێی وابوو، بە ئەو شێوەیە دەتوانێ وورەی خەڵک بەرزکاتەوە، ڕاژەی گەل و ڕێکخراوەکەی خۆی بکا! لەبەرئەوە خەڵکێکی زۆر ڕوویانتێدەکرد، بۆئەوەی بزانن، دەنگوباس چییە، چونکە وەک کونەپڕوپاگەندە وابوو، هەرچی دەنگۆی ڕامیاری و دەنگوباسی (ی. ن. ک.) هەیە، ڕۆژانە لە نێو بازاڕدا بڵاودەبووەوە، هەر لە ئەوێوە دەردەچوو!

ئاخر هەموو پارت و شۆڕشێکیش، پێویستی بە چەن کادیرێکی وا هەیە، تێکەڵاوی جەماوەر بێ، پڕوپاگەندەیان بۆ بکا و وورەی کۆمەڵانی خەڵک بەرزکاتەوە! تەنانەت (ئاسۆ)ی کوڕی پێشمەرگەی (ی. ن. ک.) بوو، ڕۆژی (15. 02. 1985)، لە شەڕی (داپان)دا شەهیدبوو، وەک ئەوانەی لە ناشتنەکەی و لە گۆڕستان بەشداربوون، دەڵێن: لە ئەو ڕۆژە سەخت و ترسناکەدا، کە (بەعس) گوێی گونداری دەردەهێنا، چەن قسەیەکی گرنگی کوردپەروەرانەی کرد، هەموو لەرزمان لێهاتبوو!

لەگەڵ ئەوەشدا، لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا ناسراوبوو، دۆست و ئاسیاوێکی زۆری هەبوو، پیاوێکی موسوڵمان و خواپەرستبوو، منداڵەکانیشی وەک خۆی نیشتمانپەروەر و ئاییندارن، بەڵام کەمێ تووڕە و دەستووقاوبوو، گیانی ئیرەیی بەرچاوی گرتبوو!

مامە (عومەر)ـم، لە سەندیکای کاسبکارانی سەر بە کۆمۆنیستەکاندا ئەندامبوو، لە هێزی (بەرگری میللی)شدا کاریدەکرد. بەڵام ئەمیش، هەر دوای لێشاوەکە کەوتبوو، هیچی لە بیری کۆمۆنیزم و سۆسیالیزم نەدەزانی، جگە لە ئەوەی خوێندەوار نەبوو، دنیاشی هێندە بە گرنگ نەگرتبوو، هەر خەریکی گاڵتە و ڕابواردنی خۆی بوو، هەر زووش، وازی لە هەموو شتێ هێنا و خەریکی نانپەیداکردنی خۆی بوو!

مامە (ساڵح)یشم، بە ڕۆژ لەگەڵ باپیرمدا، لە دووکان ئیشیدەکرد و بە شەویش دەیخوێند. لە (یەکێتی قوتابیانی گشتی)دا کاریدەکرد، بەڵام نە زۆر چالاکبوو، نە هێندەش بە قوورسی گرتبووی، بەڵکوو زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان نەمدیوە، لەسەر کاری ڕامیاری، دڵی یەکێ بیەشێنێ، یا دەمەتەقێیەکی توندوتیژبکا!

**کارتێکردنی ئەوان لە من**

منیش وەك منداڵێکی تەمەن (8 – 9) ساڵان، لە نێوان (پارتی) و کۆمۆنیستەکانی کەسوکارمدا گیرمخواردبوو. زۆر جار، باوکم لەگەڵ خۆی بۆ بارەگای کۆمۆنیستەکان دەیبردم، ئەو کاتە لە پشت بارەگای لقی چواری (پ. د. ك.)ی ئێستەوە بوو. ئێستەش بیرمە، خانوویەکی گەورەی زۆر خۆشبوو، باخێکی گەورەی ڕازاوەی تێدابوو، لە نێوەڕاستیشدا، حەوزێکی گەورەی مەلەکردن دروستکرابوو، بە هەر چواردەوریدا، کورسی نایلۆنی ڕەنگاوڕەنگ ڕیزکرابوو، چەن کەسێ دانیشتبوون، چایانەدەخواردەوە و دەمەتەقێیانەدەکرد.

هێندێ جاریش، باوکم لەگەڵ خۆی بۆ یاد و بۆنەکان دەیبردم، کۆمۆنیستەکان بەجیا یادیانەدەکردەوە. من لەگەڵ باوکم بووم، لەبەردەرکی سەراوە بەرەو بارەگەی کۆمۆنیستەکان دەگەڕاینەوە. لەبەر باخی گشتیدا، خۆپیشاندەرانی (پارتی)، بە پێچەوانەی ئێمەوە دەهاتن و بارەگاکەیان بەرانبەر مزگەوتی گەورە بوو. کاتێ بە یەك گەیشتین، دەنگی هەراهەرا و قیژەقیژ بەرزبووەوە، هەر لایەکیان بە بژی بژی، سەرکردە و وڵاتێکیان دەژیاند و بە بمرێ بمرێش، یەکێکی دیکە و وڵاتێکی دیکەیان دەمراند. وایان دەزانی، بە ئەو هەراهەرایە، قەڵای ئیمپریالیزمی جیهانی دەڕوخێ و یەك دەوڵەتی کۆمۆنیستیی پێشکەوتووی یەکگرتووش دادەمەزرێ! ئیدی ئەو خەڵکە بێ ئیشە، بە تەواوی گەرم بووبوون، هێندەی نەمابوو، پەلاماری یەکدی بدەن. باوکم بە ئارەزووی دڵی خۆی، دەنگی لێ هەڵبڕیبوو، دەیقیژاند و بە کۆمەڵێکی دەگوت: هێندەتان نەماوە، ئێوەش وەك بەفرەکەی پار بتوێنەوە. کەچی بە پێچەوانەوە دەرچوو!

هێندێ جاریش، لەگەڵ مامە (ساڵح)دا دەچووم بۆ قوتابییان و گەنجان، کە هەر لە ئەو ناوەبوو. ئەوان یاری تێنسیان داناببوو، بەڵام ئەوێم زۆر پێ خۆش نەبوو. جار و بار لەگەڵ مامە (بەکر)یشمدا، سەرم لە بارەگای (پارتی) دەدا. ئەو کاتە لە خوار ماڵی (شێخ قادری حەفید)ەوە بوو، خانوویەکی تا بڵێی گەورەبوو، لە نێوەوە دوو نهۆمبوو، حەوشێکی زۆر

گەورەشی هەبوو. جارجارە لەگەڵ (حەسەن)ی براشمدا، خۆمان پێدا ئەکرد. من پتر حەزم لە بەرەگەی (پارتی) ئەکرد، چونکە یەکەم لە ماڵی باپیرمەوە زۆر نزیکبوو. دووەم سروودی نیشتمانی زۆر خۆشیان لێدەدا. مامە (بەکر)یشم، لە خۆپیشاندان و بۆنە تایبەتییەکاندا ئەیبردم. جارێکیان ساڵی (1959) بوو، یادی جێژنی (نەورۆز) کرایەوە، (پارتی) سروودی کوردییان دەگوت، کە هێندێکیانم هەر لەبەربوو، وەک (ئەی ڕەقیب، نەورۆز، چەن شیرینە لام، بە نەربەدەری، گوڵی سەربەستی) و گەلێکی دیکەش بوون، زۆرم لا شیرینبوون!

(شێخ لەتیفی حەفید)

هەر ساڵی (1958) و دوای کودەتاکەی (عەبدولکەریم قاسم) بوو، وەک ئێستە لە یادمە، (شێخ لەتیف) بەربوو، خەڵکێکی یەکجار زۆر، بەپیرییەوە چوون و هاتەوە ماڵەوە. لە ماڵی (شێخ)، ماوەی یەک هەفتە جەنجاڵێ بوو، ئەو سەری دیارنەبوو، وەک دەڵێن: تفت هەڵدایە، بەر عەرز نەدەکەوت! خەڵکی (سولەیمانی)، بە هەموو دەستە و چین و ڕێکخراوەکانەوە، تەنانەت سەرکردەکانی (پارتی) و (کۆمۆنیست) پێکەوە دەهاتن، خۆشهاتنەوەیان لێ دەکرد. جگە لە ئەوەی، لە گوند و شارۆچکە و شارەکانی دیکەی (کوردستان)یشەوە، ڕەشمەڵەک و ئاسیاو و پیاوەکانی خۆیان، سەرۆک تیرە و هۆزەکان سەردانیانئەکرد و ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت!

ئێمەش ئەو چەن ڕۆژە، هەر لە ئەوێ بووین. لەنێو حەوشە گەورەکەیاندا، ژنان مەنجەڵی گەورەیان پێزکردەبوو، لە نێو چیمەن و هەیوان و ژوورەکاندا، خوان ڕاخرابوو، سێ ژەمە خواردن دروستدەکرا، خەڵکی پلاو و گۆشتیان دەخوارد. (شێخ)یش لەگەڵ خەڵکەکەدا، زۆر ڕووی خۆشبوو، زەردەخەنە شیرینەکەی، لە لێوەکانی جیانەدەبووەوە.

کاتێ جمکوتەکە کەمبووەوە، شەوێ بە میوانی چووین و لە نزیکەوە (شێخ)مان بینی. دەسێ ڕانکوچۆغەی شاڵی مەیلەو خاکی لەبەردابوو، بۆینباخیشی بەستبوو، زۆر جوانی لێدەهات. ئەو شەوە جگە لە ئێمە، میوانی دیکەیان نەبوو، لە دیوەخانەکە دانیشتبووین و گوێمان لە (شێخ) گرتبوو، گاڵتەی لەگەڵ باوکم دەکرد و دەیگوت: (حەمە) چەن ژن هێناوە؟ تۆ خوا نیازت نییە، ژنێکی دیکەش بێنی؟! باوکیشم پێدەکەنی و دەیگوت: شەڕم بۆ مەنێرەوە!

پاشان (شێخ) کامێرەیەکی سینەمایی هێنا و فیلمێکی پیشاندایین، فیلمەکە سەبارەت سەردانەکەی خۆی بوو بۆ (قاهیرە). هەرچەندە فیلمەکە ڕەشوسپی بوو، بەڵام ئێمە زۆرمان لا خۆشبوو، بە تایبەتی باخی ئاژەڵی تێدابوو، هەموو جۆرە ئاژەڵێکی جوانی پیشاندایین، کە پێشتر نەمان دیبوو. (شێخ)یش هەمووی بۆ باسکردین، چونکە فیلمەکە بێدەنگبوو، دەنگی خڕەخڕی مەکینەکەش ناخۆشیکردبوو.


سالی (1956)، لە گرتووخانەی سەرەوەی شاری (سولەیمانی) گیراوە.

(مەلامستەفای بارزانی)

ڕۆژی (28. 10. 1958)، بە جارێ شار خرۆشا، خەڵکەکە هەموو لەبەردەرگی سەرا کۆبوونەوە، ئێمەش بیستمان، سەرۆک (بارزانی) هاتووە. هەڵبەتە لەڕێی کەسوکار و (پارتی)یەوە، ناومان بیستبوو، بە دەیان وێنەشیمان دیبوو. لەبەرئەوە زۆر حەزمدەکرد، ئەو سەرۆکە قارەمانە، لە نزیکەوە ببینم.
لەگەڵ هاوڕێکانمدا، بەرەو بەردەرگی سەرا چووین. کاتێ گەیشتین، زۆر جەنجاڵبوو، خەڵکەکە، هەموو بە جارێ هاواریاندەکرد: (بارزان بارزان بارزانی، بە ڕاستی پاڵەوانی)، ئیدی بە دەیان جار، سڵاویان بۆ دەنارد و دەیانگوت: بژی سەرۆکی کورد (بارزانی)! پاشان داوایانکرد، (بارزانی) خۆی پیشانی جەماوەر بدا و گوتارێکیان بۆ بدا.

ئەو کاتە (بارزانی)، لە ئوتێلەکەی (نوری عەلی) دابەزیبوو. هێندەی پێ نەچوو، بە زۆر (بارزانی) قایلکرا، بێتەدەرەوە و لە تارمەی ئوتێلەکەوە، خۆی پیشانی خەڵك بدا و چەن قسەیەکیان بۆ بکا. هەر کە هاتەدەرەوە، وەك ڕۆژی حەشری لێهات، دەنگی هاوارهاوار و هوتافکێشان بەرزبووەوە و لەگەڵ هاڕەی چەپڵەدا تێکەڵبوو. ئیدی تا خەڵکەکەیان کەمێ هێواشکردەوە، زۆری ویست. کەچی (بارزانی) وێنەکەی خۆی دڕاند و بە عەرەبی گوتی: (أنا لست زعیما ولا قهرمانا، بل جندي و خادم الشعب و زعیمه الاوحد عبدالكریم قاسم). واتە: من نە سەرۆکم و نەقارەمانم، بەڵکوو سەرباز و خزمەتکاری گەل و سەرۆکە تاقانەکەی (عەبدولکەریم قاسم)م. ئیدی خۆی تووڕەکرد و چووەوەژوورەوە. خەڵکەکەش وردووردە بڵاوەیان لێ کرد.

هەرچەندە ئەو کاتە، تەمەنم نزیکەی نۆ ساڵێ دەبوو، عەرەبیم نەدەزانی، بەڵام ئەو چەن وشەیەی ئەو گوتی، هێندە لەنێو خەڵکدا گوترابوونەوە و باسکرابوو، بە تایبەتی نەیارەکانی ڕەخنەیان لێ دەگرت، نەك هەر لەبەرمکردبوو، بەڵکوو تا ماویشم، لە بیرم ناچێتەوە و زۆر جاریش، کە باسی (بارزانی) دەکرێ، یا وێنەکەی دەبینم، ئەو چەن وشەیەی ئەوم بیردەکەوێتەوە، کە لە ئەو ڕۆژانەدا خەڵکی (سولەیمانی)، ئەو قسانەی ئەویان زۆر پێ ناخۆشبوو. چونکە هیوایەکی زۆر گەورەیان پێی هەبوو، ئەویش دەیگوت: من قارەمان نیم، نۆکەری گەل و (عەبدولکەریم)م، ئیدی ئەوە یەکەمین جار و دوایەمین جاربوو، (بارزانی) ببینم!

هەڵبەتە، وەك دوایی تێیگەیشتم و بۆ خەڵکیش ڕوونبووەوە، (بارزانی) خۆی دەیزانی، چی دەڵێ و بۆ وا دەڵێ، چونکە عەرەبە شۆڤێنییەکان، خۆشیان نەدەویست و ڕەقیان لێی بوو. هەروەها (عەبدولکەریم) جگە لە خۆی، کەسی دیکەی بە سەرۆکی کورد و عەرەب و (عێراق) نەدەزانی، ئەویش تازە لە (یەکێتی سۆڤێت) گەڕابووەوە، نەیدەویست، لەسەر ئەو ناوە، گرفتێکی گەورە لە نێوان خۆی و (عەبدولکەریم)دا دروستکا!



**هەوڵی کوشتنی (عەبدولکەریم قاسم)**

لە ئەو ماوەیەدا، شتێکی زۆر ناخۆش ڕوویدا، هەرگیز بیرم ناچێتەوە. هێندێ کەسی سەر بە پارتی (بەعس)، لە ئەوانە (عەبدولوەهاب غرێری، سەددام حوسێن ...) ڕۆژی (07. 10. 1959)، لە شەقامی (ڕەشید) لە (بەغدا)، تەقەیان لە (عەبدولکەریم) کرد. ئیدی بە جارێ، شاری (سولەیمانی) خرۆشا، کۆمەڵانی خەڵک، وەک کۆستێکی گەورەیان کەوتبێ، وابوو! چونکە ئەو سەردەمە، کاکە (کەریم) زۆر خۆشەویستبوو!

کاتێکیش ڕۆژی (16. 10. 1959)، هەواڵی سەلامەتی بڵاوکرایەوە، ئیدی لە هەموو کۆڵان و سەرجادەیەکی شارەکە، هەڵپەڕکێ و گۆرانیگوتن دەستپێکرد. خۆشی و شادی، جێی ناخۆشی و نیگەرانی گرتەوە. تەنانەت ئەو ڕۆژە، زۆربەی خواردنگە و چاخانەکان، خواردن و خواردنەوەیان، بە خۆڕای بەسەر خەڵکدا دابەشدەکرد، سینەماش هەر بە خۆڕای بوو، چونکە بەلاشبوو، هیچ شوێنێ بەرنەدەکەوت!

هەڵبەتە، کەس وەک منداڵەوردکەی شارەکە، کەڵکی لە ئەو ڕووداوە وەرنەگرت و هیچ شوێنێ بەرنەدەکەوت. هاوڕێیانی گەڕەک کۆدەبوونەوە، بە کۆمەڵ دەگەڕان، لەسەر حسابی کاکە (کەریم)، دەستی خۆیان دەوەشاند، خۆیان لە هیچ جۆرە خواردن و خواردنەوەیەک بێبەش نەدەکرد. سینەماش ئەوە هەر هیچ، بۆ هەردوو سینەماکە دەچوون!

ئەو یەک دوو ڕۆژە، کوڕانی گەڕەک بە کۆمەڵ دەگەڕاین و شوێن نەبوو، سەری پێدا نەکەین و شت نەبوو، تاقی نەکەینەوە. ئاخر ئەو سەردەمە، (سولەیمانی) هێندە گەورە نەبوو، هەمووی چەن گەڕەک و شەقامێ بوو! ڕۆژێکی هێندە خۆش، پڕ لە بەزم و پێکەنین بوو، زۆربەی خەڵک لەسەر جادەکان، تا درەنگانێ دەگەڕان، لە لایەکەوە خۆپیشاندان، موزیک و هەڵپەڕکێ بوو، لە لایەکی دیکەشەوە، بە سەدان سەر مەڕ و بزن و مانگای بەسەرزمانیان سەربڕیبوو، گۆشتەکەیان بە خۆڕای، بەسەر خەڵکیدا دابەشدەکرد، ئەو ڕۆژەشیان ناونا: (جێژنی سەلامەتی و گەشکە!)



**نۆژەنکردنەوە**

ساڵی (1959)، باپیرم دەستەی خوارەوەی خانووەکەی ڕوخاند و هەر لە ئەو شوێنەشدا، سێ ژوور، گەرمار و ئاودەستی لێ دروستکرد. دالأنێکی درێژی هەبوو، زۆر فێنکبوو، نیوەڕوانی گەرمای هاوین لێی دادەنیشتین و نانمان لێ دەخوارد. مامەکانم هەریەکەیان، ژوورێکیان بەرکەوت. بەڵام دڵخم ناچێ، تووە گەورەکەی حەوشەیان بڕییەوە، تەنیا بنەکەی مابووەوە، وەک کورسی لێهاتبوو، هەرچی فریاکەوتایە، لەسەری دادەنیشت! سەکۆکەشیان تەختکرد، ئیدی جگە لە سێ چوار مەترێ نەبێ، حەوشەکەیان هەموو کۆنکرێت کرد و ماڵەکەش زۆر گەرمبووبوو. بەڵام دەستەی دووەمی خانووەکە، هەر وەک خۆی مابووەوە و دەسکارییان نەکرد. پێش هەیوانەکەشیان، بە جامخانەیەکی گەورەی شووشە گرت و ژوورەکانیش، هێندەی دیکە گەرم و تاریکبوون.

**(تەوێڵە)**

هەر لە گەڕەکی (چوارباخ) بووین، باوکمیان بۆ ماوەیەکی کاتی، بۆ (تەوێڵە) نارد، نزیکەی سێ مانگێ لە ئەوێ بوو، بەڵام ئێمە نەچووین و لە شوێنی خۆمان نەجووڵاین. ڕۆژێکی بەهاری دەمەو هاوین بوو، لەگەڵ ماڵی (کەریم چاوڕەش) بڕیارماندا، سەر لە باوکم بدەین، هەم سەردان و هەم سەیران بوو. دوو قەمەرەمان گرت، پاشنیوەڕۆ دەرچووین و دەمەو ئێوارە گەیشتین.

هەر کە ترومبێلەکان لە جادە سەرەکییەکە لایاندا، بەرەو (خورماڵ) و (بیارە) ڕۆیشتین، ئیدی بە ئاستەم، تیشکی خۆرمان دەبینی. چونکە ئەم بەر و ئەو بەری ئەو ڕێیە، بە دار و درەخت تەنرابوو، لە زۆر شوێنیشدا تێکەڵاوبووبوون، دەس لە ملانی یەکدی بوون، سەریشیان لە یەکدی گیرکردبوو. ئاسمان بە دەرەوە نەبوو، جاروبار تیشکی خۆر، لە نێوان پەلی درەختەکانەوە، چاوشارکێی لەگەڵ سرووشتی جوانی ئێوچەکە دەکرد. هەوایەکی هێندە خاوێن و سازگاری هەبوو، تا ئەو دەمە لە هیچ شوێنێکی (سولەیمانی)، هەڵم نەمژیبوو. مەلە خۆشئاوازەکانیش، گۆرانی ئازادییان دەچڕی، بە جوکەجوك و جریوەجریوی خۆیان، دڵی مرۆیان دەکردەوە.

جاروباریش، لەسەر ڕێگەکان تووشی چەن کەنیشکێکی ئەشمیلانەی سووروسپی دەبووین، کۆڵیان بە کۆڵەوەبوو، لە ئەم بەر و ئەو بەری جادەکەوە دەوەستان، تا ئێمە تێپەڕدەبووین، بە زەردەخەنەیەکی شیرینیش پێشوازییان لێ دەکردین. شۆفێرەکەش

دەستی بۆ دەردەهێنان و سڵاوی لێ دەکردین، هێندێ جاریش هۆڕنی بۆ لێدەدان. ئیدی بەو شێوەیە، گەیشتینە (تەوێڵە)، بەڵام چیمان بینی، گوندێکی هێندە خاوێن و خۆش بوو، لە ژیانمدا شوێنی وام نەدیبوو!
دوای ئەوەی گەیشتین، یەکسەر دابەزین و باوکم لەسەرجادەکە چاوەڕێیدەکردین، بەرەو پیرمان هات و ماچیکردین. پاشان بە هەورازێکی کورتدا سەرکەوتین، تا لە لووتکەی بەرزاییەک نزیکبووینەوە، باوکم گوتی: ئەمە خانووەکەمە. پاشان چووینەژوورەوە و کەمێ پشووماندا، تا ماندوێتی دانیشتین، هەر قسەمانئەکرد و شتمان دەگێڕایەوە، ئیدی لە ماندووبوونی ڕێگەش حەوایەنەوە.
بەیانی زوو لە خەوهەستام و دەرپەڕیمەدەرەوە. لەبەردەرگەکەوە و لە ئەو بەرزاییەوە، تەماشای نێو (تەوێڵە)م دەکرد، دەتگوت یاری منداڵانە، خانووەکان بە دەس ڕیزکراون و یەک لەسەر یەک دانراون! لە دووریشەوە، سەیری ڕێگەوبان، چەم و باخەکانم دەکرد، دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو، بە تایبەتی، کاتێ خۆرهەڵات و تیشکەکەی، بەسەر ئەو نێوەدا پەخشکرد، لەنێو ئەو دار و باخانەی دەدا، ئاوی چەمەکان لە دوورەوە دەبریسکانەوە، دیمەنێکی هێندە دڵڕفێنی هەبوو، چاو لێی تێر نەدەبوو، دڵ و دەروونی دەکردەوە. باوەڕناکەم، هیچ هونەرمەندێ بتوانێ، وێنەیەکی وەک ئەو نیگارە سرووشتییە خۆرسکە خواکردە بکێشێ!
خەڵکی ئاوایییەکە، زۆر ڕێزیان لێ گرتین و ئەو ھەفتەیە لە ئەوێ بووین، ھەر ڕۆژەی لە ماڵی یەکێکەوە بانگدەکراین، خواردنی زۆر بە تامی کوردەوارییان بۆ لێدەناین. زۆربەی نێو باخەکان گەڕاین و گەلێ سەیرانی خۆشیشمان کرد، پاشان گەڕاینەوە.
ئەو چەن ڕۆژە لە ئەوێ بووین، وام دەزانی، بە چەن کاژێرێ لێم ڕۆیشتووە، چونکە هێندە خۆشبوو، دەتگوت یەزدانی مەزن، بەهەشتەکەی خۆی لە ئەو نێوچە جوانە دڵگیرە درووستکردووە! بەڵام دوای ئەو تەمەنە، چەندین جاری دیکە، سەردانی ئەو نێوچەیەم کردووە، هەر باری سەرنجی یەکەمین سەردان و سەیران، بەسەر بیر و هۆشمدا زاڵبووە، چونکە تامی ئەو جارەی نەداوە!

**خۆشترین کاتی سەردەمی منداڵی**

لە ئەو بڕوایەدام، خۆشترین سەردەمی منداڵیی منداڵانی باشووری (کوردستان)، لە ماوەی ئەو دە ساڵەی نێوان (1950-1960)دا بوو. چونکە سەردەمێکی زۆر ئارام و پڕ لە خۆشی بوو، بەڵام لە دوای ئەو ساڵانەوە، لە لایەکەوە بەھۆی شۆڕشی (کوردستان) و لە

لایەکی دیکەشەوە، لەبەر کردار و ڕەفتاری دڕندانەی دەسەڵاتە داگیرکەرە یەک لە دوا یەکەکانی دەوڵەتی (عێراق)، باوەڕناکەم، منداڵانی کورد خۆشییان، بە چاوی خۆیان دیبێ، سا یا دەربەدەربوون، یا برایەکیان یا باوکیان، پێشمەرگە بووە و لێیانەوە دووربوون، یا یەکێکیان لێ گیراوە، یا کوژراوە.

جگە لە تەقەی دەنگی گوللە و بۆردوومانکردن، قەدەغەکردنی هاتوچۆ و ڕەشبگیر، ڕاونان و گرتن، کوشتنوبڕین، سووتاندن و کاولکردنی گوندەکان، دوورخستنەوەی کەسوکار و دەستبەسەرکردنیان، سەرماوسۆڵەی زستان و گەرماوگڕەی هاوین، هەژاری و نەبوونی، برسێتی و تینوێتی، نەخۆشی و بێنازی، هێندێ شتی دیکەش هەن، گێڕانەوەیان هەر بە دەم خۆشە، بەرۆکی منداڵانی کوردی گرتووە، ژیانی لێ تاڵکردوون و ڕۆژی ڕووناکی لێ کردوون بە شەوەزەنگ!

## جێژن و بۆنە گشتییەکان

ئەو بۆنە و جێژنانەی لەسەردەمی منداڵیدا یادەکرانەوە، تام و چێژێکی تایبەتییان هەبوو، هەرگیز ئەو ڕۆژانە دووبارەنابنەوە. هەموو ساڵێ لە مزگەوتی گەورە، یادی لەدایکبوونی پەیامبەری مەزنی ئیسلامیان دەکردەوە، کە لە (08. 01. 570)ی زایینیدا لەدایکبووە. ئێمەی منداڵانی گەڕەک، هەر گوێمان لە دەنگە خۆشەکەی (مەلاحەسەنی فەتاح هەرمێ) یا (مەلامحەمەدی دەنگ گەورە) دەبوو، خێرا خۆمان پێدا دەکرد و تا درەنگانێ، زۆر بە پەرۆشەوە گوێمانلێدەگرت.

کاتێ ناووهەراش خۆشدەبوو، زۆربەی کوردە موسوڵمانە پارەدارەکان، (مەولود)یان دەکرد، چێشت و نانێکی زۆریان ئامادەدەکرد، دەرگەی ماڵەکانیان بۆ هەمووان ئاواڵە بوو، دوای نانخواردنیش لە سەربان جێ دادەخرا، خەڵکی لەسەر دۆشەک و کۆمەڵێ مەلای دەنگخۆشیش، لەسەر کورسی دادەنیشتن و لە دەوری مێزێ خڕدەبوونەوە، بە تەپڵ و دەف، بە دەنگێکی بەرز و خۆش، (مەولودنامە)یان دەخوێندەوە.

سەرەتا بە زمانی عەرەبی و پاشان بە کوردی، هۆنراوەی ئایینی و ستایشەکانی (مەحوی، حەمدی، بێخود ...)یان، بە دەنگێکی خۆش دەچڕی. لە ئەو سەربانە و بە ئەو شەوە فێنک و خۆشە، لە ئەو هەوا سازگارەدا، تا درەنگانێ دەمانەوە، دەنگیان بە نێو ماڵانی گەڕەکدا بڵاودەبووە و چریکەیان پەرەی گوێی دەسمی، ژنان و منداڵانی دراوسێی گەڕەکیش، ئەوانەی لەبەر هەر هۆیەک بێ، ئامادەنەبوون، لە سەربانەکان ڕیزیاندەبەست، لە دوورەوە تەماشایاندەکرد و گوێیان دەگرت.

لەژێر مێزەکەی بەردەمی مەلاکانیشدا، چەن تووڕەکەیەکی گەورەی پڕ لە کاکڵەگوێز، مێوژە ڕەشکە و سوورکە، خورما و نوقوڵیان دانابوو، تا مەلاکان سرووتەکانیان تەواو نەکردایە و نزایان بەسەردا نەخوێندایە، دابەشیان نەدەکرد. لە کۆتاییشدا وەک خواردنێکی پیرۆز، سەروو چنگیان بەسەر خەڵکەکەدا دابەشدەکرد و هەر یەکە تۆزێکیان بەدانێ. ئێمەی منداڵانی گەڕەکیش، خۆمان بۆ نەدەگیرا و چاوەڕێمان نەدەکرد، هەر زوو بە نووکی بزماری، ورگی هەلاوەماوی یەکێ لە تووڕەکەکانمان دەدڕی، گوێزەبانە هاڕمێدەکرد و دەمانتەخواری. ئیدی وردەوردە بە دزییەوە، گیرفانمان لێ پڕدەکرد و لێیان دوور دەکەوتینەوە. پێش هەموو خەڵکەکە ورگمان لێ پڕدەکرد، دوایش وەک خەڵکانی دیکە، ژەمێکی دیکەمان وەردەگرت. بەڵام هیچی تامی ئەو ژەمەی نەدەدا، کە دزیبوومان!

شایی

لە سەردەمی ئێمەدا، تا سەرەتای حەفتاکانیش، هەر ماڵێ کوڕەکەی ژنیبهێنایە، یا کچەکەی شوویبکردایە، وەک ئێستە زاوا پەلی بووکی نەدەگرت، بێ دەنگوسەنگ پێکەوە بچن بۆ شارێکی دیکە، مانگی هەنگوینی بوکوزاوایی، دوور لە چاوی کەسوکار و گەڕەکەکەی خۆیان بەسەربەرن. بەڵکوو لە نێو زۆربەی خێزانەکانی شاری (سولەیمانی)دا وا باوبوو، ئەو ڕۆژە لە گەڕەکدا شاییاندەگێڕا، خەڵکی لەبەر دەنگی تەقەی دەهۆڵ، زرمەی تەپڵ و ئاوازی بەجۆشی زوڕنا، دەنگی بەسۆزی گۆرانیبێژەکان، لە ماڵەوە خۆیان بۆ نەدەگیرا و ئەوانەی بانگیش نەکرابوونایە، لە سەربانەوە یا لە دوورەوە تەماشایاندەکرد. ژنان و پیاوان دەسیاندەگرت، شایی ڕەشبەڵەکیان دەکرد و هەڵدەپەڕین، ئەوانەی شاییەکەشیان گەرمدەکرد، پێیان دەگوتن: لۆتی. خوا هەڵناگرێ، لۆتییەکان رایان گەرم دەکرد، بە تەواوی ئارەزووی بەشداربووانیان دەجووڵاند، جۆشیاندەدان و بۆ هەڵپەڕکێ پەلکێشیاندەکردن. چاروباریش، بە دەم گۆرانیگوتنەوە، بەسەر یەکێکیاندا هەڵدەدا و داوای شاباشیان لێ دەکرد. ئەویش دەبووایە، هێندێ پارەی بدانایەتێ. پاشان، خواردنێکی زۆر دروستدەکرا، خەڵکی بە نۆرە نانی شاییان دەخوارد.
هەرچەندە دەگێڕنەوە، لە کۆندا سێ شەو و سێ ڕۆژ دەنگی دەهۆڵ و زووڕنای شایی هاتووە، بەڵام لە سەردەمی ئێمەدا، شایی هەر ڕۆژێ بوو. دوای ئەوە، بووک و زاوا دەچوونەژوورەوە، لە پەردەی هاوسەرگیری دەکران و پێکدەگەیشتن، کاتێ هەموو شت تەواودەبوو، بەربووک دەهاتەدەرەوە و بە هەلهەلەیەک، مژدەی بە کەسوکاری هەردوولا

دەدا، پەڕۆیەکی سپی خوێناوی پیشانی خەڵکەکە دەدا، ئەمە گوایە، نیشانەی کچێتی بووکەکەی دەردەخست! ئیدی بە ئەو شێوەیە، شاییەکە تەواودەبوو. بەڵام ماڵی وا هەبوو، بە تواناپوون، یا هەر تاکەکوڕێ یا کچێکیان هەبوو، درێژەیان بە شاییەکە دەدا.
وا بزانم، ئێمەی منداڵانی گەڕەک، هەرگیز درێغیمان نەکردووە و دڵی هیچ خاوەن شاییەکی گەڕەکمان زویرنەکردووە، هەر گوێمان لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا بووایە، بانگ کرابینایە یا نەکرابینایە، هەر بەسەرماندەکردەوە! بە ڕاستی شایی، یەکێ لە کەلتوورە جوانەکانی کوردبوو، بە داخەوە هەر زۆر کزبووە، تروورسکایی ئەو خۆر و کەلتوورە جوانەش کوژایەوە!

## شەوارە

گەر ماڵێکیش منداڵیان ببووایە، ئەوا شەوارەیان بۆ دەگرت، کۆمەڵێ خەڵکیان بانگدەکرد، دوا ئەوەی نانەدخورا، گۆرانی و قسەی خۆش دەسپێدەکرد، یاری کلاوکلاوێنە دەکرا، تا بەرەبەیان دادەنیشتن و ئێشکی کۆرپە ساواکەیان دەگرت، ئەبا جنۆکە دەستی لێ بووەشێنێ! ئەمەش بەپێی توانای خاوەن شەوارەکە دەگۆڕا، ماڵی وا هەبوو، سێ یا حەوت شەو ئاهەنگیاندەگێڕا و شەوارەیان بۆ دەگرت.

## خەتەنەکردن

تەنانەت، خەتەنەی منداڵانیش لە نەخۆشخانەکان نەدەکرا، هەر ماڵەی بەپێی توانای خۆی، سەرتاشێکی بانگدەکرد، بەپێی دابونەریتی ئایینی ئیسلام، لە ماڵەوە بە چەقۆیەکی تیژ، ئەو پارچە گۆشتە زیادەیەی دەوری چووکیان دەبڕی. بە ئەو شێوەیە منداڵەکانیان خەتەنە دەکرد و دەیانگوت: سووننەتکراوە! ناوبەناویش، سووکە ئاهەنگێکیان بۆ دەگێڕان. وا باوبوو، لە ئەو بۆنەیەدا پاپراخی گەڵامێوویان لێدەنا، دەبوو بە گۆرانی و هەڵپەڕکێ، بە ئەمەشیان دەگوت: خەتەنەسووران! لە ئەو سەردەمانەدا، کچیشیان خەتەنەدەکرد، بەڵام ئێستە زۆر کزبووە!
جاری واش هەبوو، هەر زۆر بە پچووکی، منداڵیان خەتەنەدەکرد، بە پێچەوانەشەوە خێزانی وا هەبوون، کەمتەرخەمبوون، درەنگ ئەو کارەیاندەرکرد. بۆ نموونە: من و (باڕزان)ی برام، ساڵی (1961) لە نەخۆشخانەی سەرەوە، پێکەوە خەتەنەکراین، لە کاتێکدا من (10) ساڵ لە ئەو گەورەتربووم!

**مەولود**

کاتێ خۆی کە حاجی لە حەج دەگەڕایەوە، منداڵانی گەڕەك کۆدەبوونەوە، تا لای مزگەوتەکەی (وەیس)، بەپیر حاجییەوە دەچوون. کە لە پشت کارگەی جگەرەوە بوو. کۆمەڵێکی تایبەتی هەبوون، بەیاخی سەوزیان هەڵدەگرت، پێش خەڵکەکە دەکەوتن، کۆمەڵێکی دیکەش تەپڵ و دەفیان لێدەدا، سڵاواتیان لە دیداری پەیامبەر دەدا. هەموویان بەپیر حاجییەوە دەچوون، کە حاجی دەگەییە بەرەوە، دادەبەزی و سڵاوی لە خەڵکەکە دەکرد، خەڵکیش بەخێرهاتنەوەیاندەکرد، بە نۆرە دەستیانماچدەکرد و دەیانگوت: پیرۆزە، چونکە دەستی بەر دیوارەکانی پیرۆزگە، بەردەرەشەکە و قەفەزی گۆڕەکەی پەیامبەر کەوتووە!

پاشان لەگەڵ حاجی بەرەو ماڵ دەگەڕانەوە. لە ماڵیشەوە خواردن دروستدەکرا، دوو ژەم نیوەڕوان و ئێواران، خوان دەڕاژێنرایەوە، سینی دەگێڕرا، پلاو و چەن جۆرە شلەیەکیان لێدەنا. حاجی وا هەبوو، تەنیا ڕۆژێ ئانیدەدا، هی واش هەبوو، بە توانابوو، دوو یا سێ ڕۆژ لەسەریەك، خواردنی دروستدەکرد. کاتێ دەوری حاجیش چۆڵ دەبوو، ئیدی باوەڵ و جانتا دەکرایەوە، دیاری دەردەهێنرا، بەسەر کەسوکار و دەوروداوسێ و ئاسیاوەکاندا دابەشدەکرا.

**شەوی بەرات**

لە ژیانی منداڵی خۆمدا، هیچ بۆنە و جێژنێکم، هێندەی شەوی بەرات پێ خۆش نەبووە. هەر ئێوارەمان لێدەهات و ئانماندەخوارد، سەروو توورەکەیەکی ژلمان هەڵ دەگرت، لەگەڵ کۆمەڵێ منداڵی گەڕەکدا، دەرگەی ماڵانمان دەکوتا و بەراتمان کۆدەکردەوە. زۆربەی ماڵەکانیش، خورمایان دەبەخشییەوە، هێندێکیان نوقوڵ و کەمێکیشیان پارەیان دەدا.

ئیدی هەر لە ئێوارەوە، هەموو گەڕەکەکانی شار، وەك شارەزەردەواڵە دەوروژان، دەنگەدەنگ و قاووقیژی بەراتیکە، وێنەی نەبوو. هەر ماڵێکیش دەرگەی داخستایە و بە گوێرەبیانەی شەوی بەراتەوە، لەبەردەرگە ئامادە نەبووتایە، بە هەموو هێزی خۆمان، لە دەرگەمان دەدا و هاوارماندەکرد: ئەم شەو شەوی بەراتە، شەوی خۆشی و خەڵاتە، بەراتیکەن! یا دەمانگوت: شەوی شەوی بەراتێ، خوا کوڕێك و کچێکتان بداتێ، دەس لە کوپە وەرگێڕن، بەشی منداڵان بنێرن!

ئیدی کە توورەکەکەش پڕدەبوو، بە پەلە دەگەڕاینەوە، ڕۆماندەکرد، بە برا و خوشکەکانی دیکەمان دەگوت: تا دێمەوە، کەس دەستکاری نەکا، ئەمە بەراتی منە. پاشان خێرا

توورەکە بەتاڵەکانمان هەڵدەگرتەوە و بەڕێدەکەوتینەوە، بە هاوارهاوار و بەرات کۆکردنەوەوە، کاتمان دەرەنگدەکرد. جاری واش هەبوو، هەر بە گەڕەکەکەی خۆمانەوە نەدەوەستاین، بەڵکوو بە کۆمەڵ ڕووەو گەڕەکێکی نزیکی دیکەش دەڕۆیشتین، لەوێش بەراتمان کۆدەکردەوە. هەرماڵێکیش پارە یا نوقوڵی بدایناینێ، یەکسەر جاڕمان لێدەدا و بە هاوڕێکانی بەراتمان دەگوت: بچن بۆ ئەو ماڵە، پارە و نوقوڵ دەدا، مەچن بۆ ئەوی دیکەیان، هەر خورما دەدا!

دوایی کاتێ بە تەواوی لە بەراتکردن دەبووینەوە، لە ماڵەوە دادەنیشتین، هەموویمان لە یەکدی جیادەکردەوە، خورما بە جیا، بەشی هەرە زۆری بەراتەکەی پێکدەهێنا. پاشان مێوژ، گوێز و نوقوڵ دەهات، ئینجا پارەکانیشمان دەبژارد. دواییش لە خوشک و براکانمان دەپرسی: ئێوە چیتان کردووە و چەندتان دەستکەوتووە؟!

جاری واش هەبوو، لەسەر ئەوەی یەکێکیان زیاتری کۆکردووەتەوە، ئێمان دەبوو بە هەرا و دەمەقاڵێ. بە کورتی: با بڵێین: هەموو ماڵێ هێندە خورمایان کۆدەکردەوە، بەشی چەن مانگێکی خورما و ڕۆنی دەکردا لە ئاوا زۆربەی زۆریان، خورماکەیان بە لادێییەکان دەفرۆشتەوە، یا بە هێلکە و گەنم و شتی دیکە دەیانگۆڕییەوە.

جێژنی شەوی بەرات دەڵێی، خوای گەورە بە تایبەتی و تەنیا هەر، بۆ دڵخۆشکردن و ڕابواردنی منداڵانی داناوە، هەرگیز هیچ کاتێ منداڵان، هێندەی شەوی بەرات، تام و چێژیان وەرنەدەگرت، هیچ شەوێکی دیکەش هێندە خۆش نەبوو! ئاخۆ ئەو دۆست و برادەرە ئازیزانەی، شەوی بەرات پێکەوە دەگەڕاین، ئێستە لە کوێ بن؟! کوا ئەو شەو و ڕۆژە خۆشانە؟! هەموویان ڕۆیشتن و تامیان نەما!

جێژنی ڕەمەزان و قوربان

لە ژیانی بنەماڵەکەماندا، جێژنی ڕەمەزان و قوربان، هەر یەکەیان بایەخ و چێژێکی تایبەتی و کۆمەڵایەتی تایبەتی خۆیان هەبوو. موسوڵمانان لە ئەم دوو جێژنەدا، سەردانی یەکدی دەکەن، گەر زویربووبن، ئاشتدەبنەوە و داوای گەردن ئازای لە یەکدی دەکەن، هەرچەندە ئێستە، ئەو سەردانانە کزبوون!

هەموو ساڵێ، ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان جێگیر نەبوون و وەک یەک نەبوون، لەبەرئەوەی جێژنی ڕەمەزان، پێوەندی بە بینینی مانگەوە هەیە، جاری وابوو، زووتر یا درەنگتر مانگیان دەدی، لەبەرئەوە ڕۆژێکی لێ دەخورا. چونکە جێژنی ڕەمەزان، وەک جێژنی قوربان نییە، دیاریێ و پێوەندی بە (حەج)ەوە هەبێ. بەڵام ڕۆژەکانی مانگی ڕەمەزان،

هەروا بە خۆڕای نەدەڕۆی، چونکە جێژنی ڕەمەزان، داوی ئەوەی (30) ڕۆژ لەسەریەك و هێندێ جاریش (29) ڕۆژ بەڕۆژووبووبووین، سکی خۆمان هەڵدەگوشی و ماندووبووبووین، برسێتی و تینوێتیمان دەچێشت، (30) یا (29) شەویش لە نیوەشەو و لە شیرین خەودا هەڵدەستاین، پارشێومانئەکرد، دوای بانگی ئێوارە نانمانئەخوارد و دوای بانگی خەوتنانیش، نوێژی (تەراویح)مان دەکرد، ئینجا خۆمان بۆ ڕۆژێکی دیکە ئامادە دەکردەوە، تا ئەو ئەرکە پیرۆزەی خوای گەورە جێبەجێکەین. هەرچەندە زۆر ماندوو دەبووین، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، هێشتا هەر پێمان خۆشبوو، مەگەر گرفتێکی تایبەتمان هەبووایە، ئەگینا کۆڵمان نەدەدا و تاکە یەك ڕۆژ چییە، لێمان نەدەخوارد!

جێژنەکە بە گشتی و مانگی ڕەمەزان بە تایبەتی، هەر ساڵەی لە کات و کەشێکی جیاوازدا دەگەڕانەوە. گەر بەر وەرزێکی فێنك بکەوتنایە، ئەوا ئەرکی سەرشانمان کەمتر دەبوو و کەمتریش ماندوودەبووین، بە پێچەوانەشەوە، گەر لە گڕە و گەرمای وشکی هاوینیشدا بهاتایە، پتر ماندوودەبووین. جیاوازیش لە ژمارەی ڕۆژەکانی جێژندا هەیە، جێژنی ڕەمەزان (3) ڕۆژ و قوربانیش (4) ڕۆژن!

ئاخر هەموو شتێ پێوەندی بە پەروەردەکردنەوە هەیە. ئێمە لە بنەماڵەیەکی ئایینی شێخانی (باراو)ین و پەروەردەی دەستی باپیرە خواناسەکەمان (حاجی شێخ عەزیز) بووین، هەر لە منداڵییەوە، هەموو کوڕ و کچ، کوڕەزا و کچەزاکانی خۆی، فێری نوێژ و ڕۆژوو دەکرد. لەبەرئەوە بنچینەیەکی پتەو و قایمان، بۆ خواناسی، ڕۆژووگرتن و نوێژکردن هەبوو. گەر بەردەوامیش، نوێژمان نەکردایە، ئەوا هەرگیز لە ڕەمەزانیشمان نەدەخوارد، بە شێوەیەکی ڕێکوپێکیش، ڕۆژووی خۆمان دەگرت.

یەکەمین بەیانی جێژنی ڕەمەزان، خۆشترین ڕۆژی ڕۆژووان و موسوڵمانان بوو، چونکە جگە لە ئەوەی، بەرانبەر خوای گەورە، قەرزاربار و نیگەران نەبوون، ئەو بەیانییەش زوو، لە بڵندگۆی مزگەوتی گەورەوە، مەلاکان بە دەنگێکی خۆش، (الله اکبر)یان دەکرد.

هەروەها ئەو بەیانییە، تام و چێژێکی تایبەتی خۆی هەبوو، خوان بە خواردنی گەرم و نەرم، چێشتی بە تام و خۆش، شلەی قەیسی و جیاواز. کوتەگۆشتی چەور و گەورە، سنگ و ڕان و دووگی قەلی خڕت، زەڵاتە و ماستاو دەڕازایەوە، هەموو ماندوویێتی و برسێتی، ئەو ڕۆژانەی بیردەبردینەوە.

جێژنی قوربانیش، جگە لە ئەرکە ئایینییەکەی، کە موسوڵمانان ڕوویان لە یەکەمین وڵات و پێگەی ئایینەکە دەکرد، تا (حەج) بکەن، لەگەڵ ئەوەشدا، ئێمەی منداڵ چێژمان لە گەڕانەوەی حاجیان دەبینی و وەك فیستیڤاڵێکی ئایینی ئەو خێزانەی لێدەهات، بە هەمان شێوەی

جێژنی ڕەمەزان، خوان دەڕازایەوە، خێر و خۆشیشی هەبوو. جێژنی قوربان (3) مانگ دوای جێژنی ڕەمەزان دەهات، هەمدیسان خۆشی تێدەخستین، جووڵەیەکی کۆمەڵایەتی و ئایینیشی، لەگەڵ خۆی دەهێنا.

گەرچی هێندێ جار، جێژنی قوربان، لە کەژێکی ناخۆشی ساردوسەرمادا پەیدادەبوو، هێندێ جاری دیکەش، لە کەژێکی وای ساڵدا دەردەکەوت، لەگەڵ جوکەوچریکەی مەلەکان، هاڕەوباعەی ئاژەڵەکان، باقوبریقی ئاسمانی ڕوون، جریوەی ئەستێرەکان، بریسکە و چریسکەی مرواری نێو کانیی ڕوون و چەمە ئەنگەکانی (کوردستان)دا تێکەڵدەبوو، بەڵام لە هەر وەرزێکدا بهاتایە، ئێمەی منداڵ هەر پێمان خۆشبوو، بە تاسەوە چاوەڕێمانئەکرد، خۆمان بۆ ئامادەدەکرد و زۆر بە گەرمیش، پێشوازیمان لێ دەکرد.

بەیانیان دوای ئەوەی، دەستی دایە و بابەمان ماچدەکرد، نانمانئەخوارد. ئینجا خۆمان دەڕازاندەوە، جێژنانەمان وەردەگرت و لەگەڵ هاوڕێکانماندا دەچووینەدەرەوە، تا ماندوو دەبووین، بە ئارەزووی دڵی خۆمان دەگەڕاین، بە دوای چڵپەی ئەوس و ورگیڕکردندا، چاومانئەگێڕا و دریغیمان نەدەکرد.

زۆربەی کات دەچووین بۆ بەردەرکی سەرا و پۆستەوتێلەگرافەکەی (عەبەی سەییدزادە)، لە بڵندگۆی سینەماکانەوە، پەردەی گوێمانی دەلەراندەوە، تەماشایەکی فیلمەکانمان دەکرد، گەر بە دڵمانبووایە و بلیت دەستکەوتایە، دەچووین. ئیدی بە ئەو شێوەیە، کاتێ بانگی نیوەڕۆی دەدا، بەرەو ماڵ دەگەڕاینەوە و هەموو ڕۆژەکانی دیکەش، هەر هەمان شت دووبارەدەبوونەوە، گەرچی ڕۆژەکانی دیکە، تامی یەکەمین ڕۆژی جێژنی نەدەدا و ورتەورتە، کزولاوازدەبوو!

جێژنی نەورۆز

جگە لە جێژنەکانی عەرەب و ئیسلام، دەوڵەتی (عێراق) و پارتە ڕامیارییەکان، لەنێو هەموو ئەو جێژنانەدا، تاکە جێژنێ پێوەندی بە نەتەوەی کوردەوە هەبێ، جێژنی نەورۆزە. بۆیە لە هیچ جێژنێکی دیکە ناچێ، مۆرکێکی نەتەوەیی هەیە و خەسڵەتێکی تایبەتی کوردانەی پێوە دیارە. چونکە لە هیچ جێژنێکدا، جەماوەری کورد هێندە ناخرۆشێن و لە دەوری کۆنابێنەوە، ئاگرناکرێتەوە، خۆپیشاندان سازناکرێ، ئاهەنگ ناگێڕرێ، گوتار ناخوێنرێتەوە و خەڵکی (کوردستان)، هێندە سروودیان بۆ جێژنەکانی دیکە دانەناوە و لە ئەو ڕۆژە پیرۆزەدا نایڵێنەوە. هێندەش بۆ خەبات و سەربەخۆیی هانیان نادا. ئاخر بێ ئەوەی بە تەواوی بزانین، نەورۆز چییە، زۆر لامان خۆشەویست و پیرۆز بوو!

هەر سەرلەئێوارەی (20/21- 3)ی هەموو ساڵێ دەهات، خۆمان بۆ یادکردنەوەی ئەم جێژنە ئامادەدەکرد، تایەی ترومبێل و دارمان کۆدەکردەوە، قاپێ ئەوتمان هەڵدەگرت و بەرەو شوێنێکی بەرز دەڕۆیشتین، ئاگرمانئەکردەوە، گڕەکەی بەرزدەبووەوە و لە دوورەوە دیاربوو. ئێمەش، لە هەر چوارلاوە لێی کۆدەبووینەوە، سروودی نەورۆزمان دەخوێند، پاشان گۆرانیمانئەگوت و هەڵدەپەڕین، کاتێکیش گڕی ئاگرەکە، بەرەبەرە کزدەبوو، پشکۆی نێو ئاگردان لە سووریی خۆی دەکەوت و تەنیا خۆڵەمێشەکەی دەمایەوە، ئینجا بە دڵێکی خۆش و ویژدانێکی ئاسوودەوە، بەرەو ماڵ دەگەڕاینەوە.

ئاخر جێژنی (نەورۆز)، تەنیا هەر یادکردنەوە، ئاگرکردنەوە، هەڵپەڕکێ و گۆرانیگوتن نییە، بەڵکوو لە هەمان کاتیشدا، سەرەتای ڕۆژێکی نوێ و وەرزێکی تازەی ساڵە، لە دەس سەرماوسۆڵەی زستان، بەستەڵەکی بەفر و سەهۆڵ، ڕزگارمان دەبێ، وەرزێکی خۆش دەسپێدەکا و ئاووهەوا دەگۆڕێ، شەو و ڕۆژ یەکساندەبن، ڕۆژەکانی ئەو وەرزە، دەشتودەر بە گیا و گوڵەنێرگز دەڕازێنێتەوە، دیمەنێکی هێندە جوانی هەیە، گەشت و سەیران دەسپێدەکا، دڵ و هۆشی مرۆ دەبووژێنێتەوە!


نەورۆزی ساڵی ١٩٥٥ - سلێمانی



نەورۆزی ساڵی ١٩٦٣ – سلێمانی

لە ڕاستیدا، هونەرەکانی کورد بە گشتی، گەلێ هۆنراوە و سروودی جوانیان، بۆ جێژنی (نەورۆز) هۆنیوەتەوە. بەڵام پێم وایە، تەنیا هەر دووانیان، پتر لە نێو دڵ و دەروون و ویژدانی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەماندا دەژین و نامرن، ئەو دوانەش هۆنراوەکەی (پیرەمێرد)ی بلیمەت و (ع. ع. شەوقی)ی کوردپەروەرن، تا ئێستە کۆن نەبوون و نەشبێزراون. ئای کە جوانە، کاتێ (پیرەمێرد) نووسیویەتی:

*ئەم ڕۆژی، ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە*

*جێژنێکی، کۆنی کوردە، بە خۆشیی و بە هاتەوە*

*(نەورۆز) بوو، ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە*

*لاوان، بە عەشق ئەچوون بەبەرەوپیری مەرگەوە*

یا (ع. ع. شەوقی)، بە شێوازێکی دیکە، گۆرانی بۆ (نەورۆز) چڕیوە و گوتوویەتی:

*جێژنە، جێژنی (کوردستان)ە، جێژنی نەورۆزە*

*بە تیشکی ئاگر ئەنووسم، جێژنە پیرۆزە*

*چاوگی ئاگر، هێز و گیانمە*

*یاوەری یەزدی (کوردستان)مە*

*سەیرکەن، سەیرکەن، سەیرکەن*

*شاخ و دەشت و شار و گوندم ئاویسەنەوە*

*گۆڕی مەرگی دوژمنانم، لێ هەڵئەکەنەوە*

*پڕ بە دەم بانگەئەکەم، سەربەستیم ئەوێ*

*(کوردستان)م جێی شێرانە، ئەبێ سەرکەوێ .....*



**جارێکی دیکەش شارۆچکەی ( پێنجوێن )**

ئەم خۆشی و ژیانە نوێیەی خێزانەکەمان، زۆری نەخایاند. ئەوەبوو، باوکمیان بۆ (پێنجوێن) هەڵدا. هیچ چارێکیش نەبوو، دەبووایە، ئێمەش لەگەڵی بچووینایە، چونکە هەم دووربوو، نەیدەتوانی، زووزوو سەرمان لێ بداتەوە. هەم ئێمەش بە تەنیا نەمان دەتوانی، ژیان بەسەربەرین.

ژنێکی ئامۆزای باپیرم، ناوی پورە (رەحمە) بوو، لە ئەوێ شووی بە (عەبەرەمەنەوش) ناوێ کردبوو، تاکەکوڕێکی هەبوو، ناوی (عەلی) بوو، دەموچاوی ئاوڵەیبوو، هەرزەکار و کاتی ژنهێنانیشی بوو. ئەوە یەکەمین جاربوو، ئەو خزمانە ببینم. ڕۆژێ باوکم و (عەلی) لۆرییەکیان هێنا، هەموو شڕوشیتاڵێکمان پێچابووەوە و بارمانکرد. ئیدی بەرەو (پێنجوێن) بەڕێکەوتین. سواری لۆری بووین و لەبەردەمی ماڵی (حاجی عەلی گیکشی)دا دابەزین. پێشتر باوکم سەری لە (پێنجوێن) دابوو، ئەو خانووەی گرتبوو، ڕێککەوت وابوو، لە تەنیشت فەرمانگەی پۆستەکەوەبوو، کە نۆ ساڵ لەوەوبەر، تێیدا لەدایکبووبووم!

خانووەکە دوو نهۆمبوو، نهۆمی یەکەم، نزیک دەرگەی دەرەوە بوو، ژوورێکی گەورە، یەکێکی گچکە و هەیوانێ بوو، ئێمەی تێدا دەژیاین. ژووره گەورەکە زۆر فراوان، ڕووناک و دڵگیر بوو، لە دوولاوە پەنجەرەی هەبوو، بەسەر کۆڵانەکەدا دەیڕوانی. نهۆمی دووەمیش

خاوەن ماڵەکەی تێدابوو. پیاوەکە خەڵکی (پێنجوێن) و ژنەکەشی خەڵکی (سولەیمانی) بوون، ناوی (مینا) بوو. باوکم هەر لە کۆنەوە دەیناسی. کوڕێک (حەمە)، دوو کچیش (رابیعە) و (دڵشاد)یان هەبوو. هیچیان لە تەمەنی مندا نەبوون. حەوشەیەکی خنجیلانەی هەبوو، لە ئەو بەرەوە دوو ژووری تێدابوو، بۆ ئەو کاروانچییانە تەرخانکرابوون، کە لە (خۆرهەڵاتی کوردستان)ەوە کەلوپەلیان بە قاچاغ دەهێنا و لە ئەوێشەوە، کەلوپەلیان بۆ ئەو دیو دەبردەوە. ژوورێکیان تەویلەبوو، بۆ وڵاخەکانیان و ئەوی دیکەشیان، بۆ نووستنی خۆیان داترابوو. جاری وابوو، هەفتەی جارێ دەهاتن. ئەندامانی ئەم خاوەن ماڵە زۆر بەڕێز، باش و خۆشەویست بوون. هەر کەمێشتێن، تا دوو هەفتە ئاگر لە ماڵماندا نەکرایەوە. هەموو دراوسێکان بە نۆرە، بۆ خۆشهاتنمان دەهاتن. داوەتیانەدەکردین و بە سینی خواردنیان بۆ دەناردین.

هەرچەندە شارۆچکەی (پێنجوێن)، بە ژمارەی خانوو و دانیشتووان زۆربوو، بەڵام لەبەرئەوەی لە سێ لاوە، بە زنجیرە کێوی بەرز و چیای گەورە دەورەدرابوو، پچکۆلە دیار بوو. لە چەن گەڕەکێکی سەرەکی پێکهاتبوو، پڕبوون لە کۆڵانی پچووکی تەنگەبەر. تەنیا هەر دوو جادەی سەرەکی تێدابوو، کە لە پیتی (T) ئینگلیزی دەچوو، چونکە ئەوەی لە باری پانی بوو، زۆر کورتبوو، بەڵام ئەوەی لەباری درێژی ڕاکێشرابوو، لە نێو بازاڕەکەوە دەستپێدەکرد، تا لە (پێنجوێن) دەرئەچوو، درێژدەبووەوە. بە چواردەوری ئەو دوو جادەیەشدا دووکان، چاخانە، میوانخانە، مزگەوت و گەرماوەکان دابەشبووبوون. لەبەرئەوە مرۆ دەیتوانی، لە ماوەیەکی کەمدا، زۆر بە ئاسانی، هەموو بازاڕەکە بگەڕێ.

بەهۆی ئەوەوە، (پێنجوێن) لە سنووری (ئێران)ەوە نزیکبوو، هەموو جۆرە کەلوپەل و خواردەمەنییەکی تێدا دەستدەکەوت. نێو (پێنجوێن) و دەوروبەرەکەشی بە سەوزە، میوە، گۆشت و شیرەمەنی، زۆر دەوڵەمەندبوو، لەبەرئەوە پەکمان لە هیچ نەدەکەوت.

(پێنجوێن) لە هەر چوارلاوە، بە هاوینەهەواری جوان، خۆش، دڵفرێن، قەشەنگ و ناوی سازگار دەورەدرابوو، وەک بووک بە باخەکانی (نەلیاسەفرە، قولەڕەش، چوارباخ، بلکیان، بوویان، بەرباخ، سەرچەم، بەرکێو و گۆرستانی حاجی شێخ) ڕازابووەوە. بەڵام کوردە واتەنی، ئەو شوێنە خۆشە، کە دڵ لێی خۆشە! منیش نەک هەر (پێنجوێن)، کە شوێنی لەدایکبوونمە، بەڵکوو گەر لە بەهەشتیشدا بوومایە، دڵە چکۆلانەکەم، هەر بۆ نێو کۆڵان، سەرجادە و بازاڕەکانی (سولەیمانی) لێیدەدا!




(پێنجوێن) زۆر ساردبوو، لە زستانانندا بەفرێکی زۆر و لە بەهارانیشدا بارانێکی بێ وێنەی لێ دەباری. بەڵام هاوینانی بەهەشتێ بوو بۆ خۆی، دەشتودەر هەمووی سەوز دەبوو، بە (گوڵالەسوورە، نێرگز، بەیبوون، هەڵاڵە، گوڵەحاجیلە و برنجۆکە) دەڕازایەوە. خەڵکی نێو (پێنجوێن)یش، زۆر بە کەیفبوون، هەمیشە لە سەیران و گەشتی باخەکان بوون، تەنانەت لە (هەڵەبجە) و (سەییدسادق)ەوە، لە (سولەیمانی) و هێندێ جاریش، لە شارەکانی دیکەی (کوردستان) و (عێراق)یشەوە، دەستەدەستە سەیرانکەر دەهاتن!
بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، سەرەتا زۆر بێ تاقەتبووم، بیری قوتابخانەی (قەیسەڵیە)، هاوپۆل و هاوڕێکانی گەڕەکی خۆمانم دەکرد، زۆر بێکەس و بێ هاوڕێ بووم، لەبەرئەوە سەرەتا هێندێ جار، شەوانە بە دەم هەنسکی گریانەوە خەوم لێ دەکەوت!
ئەو کاتە (شەونم)ی خوشکم، تەمەنی شەش ساڵ و (سەلاح)ی براشم سێ ساڵان بوون. کەڵکی ئەوەیان پێوە نەبوو، یارییان لەگەڵ بکەم. جگە لە ئەوەی لەگەڵ خوشکەکەمدا، دانومان پێکەوە نەدەکوڵا! هیچ شوێنێکیش شارەزانەبووم، بستبەبستی بە من نامۆبوو. هەمیشە یادی ئەو گەڕەکانەم دەکردەوە، کە تێیدا ژیابووم و لە ماوەی ئەو نۆ ساڵەدا، یەکەمین قۆناغی منالیم، تێدا بەسەربردبوو. زۆر بیری هاوڕێکانی گەڕەک و قوتابخانەم دەکرد، بیری هەموو کوڵان، جادە، بەرمزگەوتی گەورە، دەشتەکەی لای شێخەوڵا، شێخ

مستەفا، دەشتەکانی لای ماڵی باپیرمەوە دەکرد. بیری بازارەچکۆلە، مەیدانەکانی دارفرۆش، ماستفرۆش و کافرۆشەکانم دەکرد. زۆر بیری کوڕی گەڕەک و هاوڕێکانی خوێندن بە تایبەتی (قالەسووری عەزیزئاغا)م دەکرد. تەنانەت ڕۆژێکیان، نامەیەکم بۆ نووسی، تا لە حەواڵی خۆم ئاگاداریکەمەوە. بەڵام نەمدەزانی، چۆنی بۆ بنێرم، چونکە ناونیشانیم نەدەزانی و تەنیا هەر ناوی خۆشیم دەزانی. پاشان لەسەر زەرفەکە نووسیم: سولەیمانی، گەڕەکی بەنزینخانە کۆنەکەی پشت حەوشی گەورە، بگات بە دەستی (قالەسوور). دوای ماوەیە لە (سولەیمانی)، خوالێخۆشبوو (قالە)م بینی. بۆم گێڕایەوە، تێر پێکەنین، ئێستەش کاتێ ئەوەم بیردەکەوێتەوە، پێکەنینم بە بیرکردنەوەی منداڵیم دێ و لەبەرخۆمەوە دەڵێم: دیارە نامەکەم، هەر لە سنووری (پێنجوێن) دەرنەچووە، پۆستەچییەکان تێر پێکەنیون و دڕاندوویانە!
ئاشکرایە، گەورەترین و باشترین خەسڵەتێ یەزدانی مەزن، بە بەندەکانی خۆی بەخشیبێ، بیرچوونەوە و ڕاهاتنە. ئەگینا گەر وانەبووایە، کەس نەیدەتوانی، دوای مردنی خۆشەویستێکی خۆی بژی. یا دوای گواستنەوەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە هەڵکا و ڕابێ. بۆیە منیش بە ناچاری، لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا، وردەوردە ڕاهاتم و هەرچی چۆنێبوو، گوزەرانم. بە تایبەتی دوای ماوەیە، دەرگەی قوتابخانەکان کرانەوە و منیش دەسم بە خوێندن کردەوە.
شارۆچکەی (پێنجوێن)، تەنیا دوو قوتابخانەی کوڕان و کچانی سەرەتایی تێدابوو. زۆربەی مامۆستاکانیش خەڵکی (سولەیمانی) بوون. بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان خوالێخۆشبوو مامۆستا (حەسەن ڕەشید یارە) بوو. هەر لە کۆنەوە تێکەڵاوییمان هەبوو، جگە لە ئەوەی، لەگەڵ (دولبەر)ی کچیشیدا، شیرم خواردبوو. ئەو کاتە هەر (دلێر، دارا و دولبەر)ی هەبوو. هێندێ جار پێکەوە یاریماندەکرد.
زۆری پێ نەچوو، بەهۆی خوێندنەوە، وردەوردە ڕاهاتم و هێندێ هاوڕێی نوێم پەیداکرد. دوای ماوەیەکیش لە گەڕەکەکەشماندا سەرمدەرهێنا، هاوڕێی نوێم گرت و وەک جارانی (سولەیمانی)، دەسم بە یاریکردن و گەڕان کردەوە.
چەن ڕۆژێکی بۆ جێژنی ڕەمەزان مابوو، هێندەم زانی، لەپڕ (حەسەن)ی برام پەیدابوو. گەلێکم پێ خۆشبوو، تێرتێر یەکدیمان ماچکرد. وەک گوڵ گەشامەوە، نەک لەبەرئەوەی برامبوو، خۆشمدەویست، بەڵکوو وامدەزانی، یەکێ لە هاوڕێکانی (سولەیمانی)م هاتووە. باپیرم ناردبووی، تا باوکم جلی جێژن و پێڵاوی بۆ بکڕێ، هێندێ پارەشی بداتێ. ماوەیە

لامان مایەوە، هەر ڕۆژەی لەگەڵ هاوڕێکانم و (حەسەن)دا، سەرداتی باخێکی خۆشی دەوروبەری (پێنجوێن)مان دەکرد، بە دارودرەختە بەرز و جوانەکاندا هەڵدەگەڕاین، هێلانەی مەلە باڵڕەنگین و دەنگخۆشەکانمان دەپشکنی، بێچووەکانیمان دەردەهێنا و یاریمان پێ دەکردن. پاشان لە نێو هێلانەکانی خۆیان دامانەنانەوە.

ئەو کاتەی (حەسەن) لامانبوو، هەمیشە لەگەڵ (سیروان) و (بورهان)ی برایدا پێکەوە بووین، کوری (ئەسعەدەگۆج)ی برینپێچ بوون و ئەوانیش هەر خەڵکی گەڕەکی (کانیسکان) بوون، هەر لە (سولەیمانی)ەوە، یەکدیمان دەناسی. کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد، بەڵام داخەکەم، (حەسەن) پێش جێژن گەڕایەوە، (ئەسعەد)یش بۆ (سولەیمانی) گوێزرایەوە و لە هاوڕێیەتی کورەکانی ئەویش، بێ بەشبووم، ئیدی جارێکی دیکەش، بە تەنیا مامەوە و ماتی دایگرتمەوە!

نەخۆشخانەکەی باوکم لە تەنیشت قوتابخانەکەمان و بەرانبەر گۆڕستانی (حاجی شێخ) بوو. نەخۆشخانەیەکی چکۆلانەی خنجیلانەی جوان بوو، دوکتۆری تێدا نەبوو، (عەلی قەفتان) لێپرسراوی یەکەم بوو، لەگەڵ باوکمدا پێکەوە کاریاندەکرد و نەخۆشخانەکەیان بەڕێوەدەبرد.

لەنێو (پێنجوێن) و گوندەکانی دەوروبەریدا، نەخۆشی زۆر بڵاوبوو. نەخۆشخانەکە هەمیشە وەک پوورەی هەنگ جمەیدەهات. باوکم چونکە زووتر لە (پێنجوێن) بوو، خەڵکێکی زۆری دەناسی. لە ماڵیشەوە، ژوورە چکۆلەکەی بۆ کارکردن تەرخانکردبوو، تەنانەت دوای ئەوەی، لە نەخۆشخانە دەگەڕایەوە، ڕۆژانە نەخۆشێکی زۆر سەریاندەدا، بە تایبەتی (عەلی قەفتان)، ئەو کارانەی نەدەکرد. باوکم دەرزیلێدەدا، برینداری تیماردەکرد و دانیشی دەکێشا، منیش یارمەتیمدەدا.

لە هەموویشی سەیرتر ئەوەبوو، نازانم، چۆن و لە کوێ فێری بەنجکردن و دانکێشان بوو بوو؟! چونکە هەرگیز ئەو کارەی لە (سولەیمانی) نەکردبوو، بەڵام زۆر سەرکەوتووانە جێبەجێیدەکرد و نەخۆشەکانیش، باوەڕێکی زۆریان پێی هەبوو. هێندێ جاریش، لە گوندە نزیکەکانی دەوروبەرەوە، بە ترومبێل بە دوایدا دەهاتن و سەردانی نەخۆشی دەکرد. بە تایبەتی ئەو ئاوە، خان و بەگ، ئاغا و شێخ، دەرەبەگێکی زۆری لێ بوو، خۆیان بێزیان نەدەهات، وەک خەڵکە هەژارەکە، هاتوچۆی نەخۆشخانە بکەن، بەڵکوو دەبووایە، کارمەندێکی تەندرووستی بچووایە و نەخۆشەکانی ببینیبایە. بەڵام لە هەمان کاتیشدا، پارەیەکی زۆریان دەدا و زۆر جاریش، پشتی جێبەکەیان لە دیاری پڕدەکرد!

بە کورتییەکەی، باوکم ئیشی زۆر باشبوو، وەک دەڵێن: ئاتی کەوتبووە ڕۆنەوە، (پێنجوێن) دەرگەی پارەوپوول بوو، بە ڕووی ئێمەدا کرابوووەوە. لە ماوەی یەک ساڵدا، پارەیەکی زۆری دەسکەوت!

خوا هەڵناگری، پورە (ڕەحمە) زووزوو سەری لێ دەداین، یارمەتی دایکمی دەدا، ئیشی بۆ دەکرد و منداڵی بۆ ژێردەکرد. ماڵەکەی نزیکبوو، هێندێ جار تا درەنگانێ لامان دەمایەوە، قسەی زۆر خۆشبوو، زۆر حەزی بە گاڵتەکردن دەکرد، ئەفسانە و سەرگوزشتە و چیرۆکی زۆر خۆشی لەبەربوو، شەوانە بۆی دەگێڕاینەوە، بە قسە خۆشەکانی، خەوی لێ دەخستین و پاشان دەڕۆشتەوە. منیش زۆر هۆگریبووبووم، زووزوو سەرم لێ دەدا، زۆریشم خۆشدەویست، هەر بە (حسەین باوکم) بانگیدەکردم!

دوای ئەوەی باری ئابووریمان باشبوو، لە ماڵی (حاجی عەلی) گواستمانەوە، خانوویەکی زۆر گەورەمان، لە (عەلی حاجی ئەمین) بە کرێگرت، زووتر ماڵی (ئەسعەد)ی برینپێچی تێدابوو. ئیدی بە تەواوی، لە ماڵی پوورە (ڕەحمە) نزیکبووینەوە. ئەوە یەکەمین جار بوو، خانوویەکی وا گەورە و دوو نهۆمی سەربەخۆ بگرین. لە داڵانەکەی سەرتەنوور و گەرماوێ بوو، لە پشتی گەرماوەکەشەوە، بیرێکی قووڵیان لێدابوو، ئاودەسێکی چکۆلانە بوو، بەڵام دەرگەی نەبوو، هێشتا لە ژیانمدا، ئاودەسی لە ئەو جۆرەم نەدیبوو! سەرەتا من و منداڵەکان، زۆر دەترساین، سەرئاوبکەین، دەمانگوت: دەکەوینە ئاوی و جنۆکەی تێدا هەیە! پاشان پێی ڕاهاتین. ژوورێکی چوارگۆشەی ختجیلانەش، لای دەسەڕاستی حەوشەکەوە بوو، خێرا باوکم داگیریکرد و کاروباری خۆی تێدا بەڕێوەدەبرد.

حەوشەکەمان زۆر گەورەبوو، بە ئاسانی یاریمان تێدا دەکرد. لە بنەوە هەیوانێک و دوو ژوور بوو، زۆر پێویستمان پێی نەبوو. بە پێپلیکانەیەکی چەن پلەییدا، بۆ نهۆمی دووەم سەردەکەوتین، ئەویش دوو ژووری گەورە، موبەقێک، هەیوانێکی بەرفراوان و خۆش بوو، لێمان سەرووو زیادبوو. گەلێ فەرش و مۆزتەی ئێرانی گەورە و جوانمان ڕاخستبوو، تەنانەت هەموو دیواری ژوورەکانیشمان، بە فەرش داپۆشیبوو. تاقمێ مۆبیلە و مێزێکمان کڕی، کە تا ئەو کاتە نەمانبوو!

لە نێوەڕاستی ژوورە گەورەکەشدا، زۆپایەکی گەورە دانرابوو، بە دار گەرمماندەکرد. لە زستانانیدا، هەمیشە سووردەبووە و لوورەی دەهات. لەبەردەمی زۆپاکەشدا، ئاگردانێکی چکۆلانە دروستکرابوو، هەموو جارێ، پشکۆی گەرمی نێو زۆپاکەمان، بە مقاش دەردەهێنا و چامان لەسەر لێدەنا.

بە کورتی و بە کوردی، باوکم هەرچی پێویستی نێو ماڵ هەیە، بۆی دابینکردبووین و لە هیچمان کەم نەبوو. ژیانێکی زۆر خۆش، پڕ لە هێمنی و بێ دەردیسەریمان بەسەردەبرد.
خانووەکەمان ڕووەو ڕووگە هەڵکەوتبوو، بەرزبوو، زۆر دڵگیر و ڕووناک بوو. هەر لە هەیوانەکەوە بە ئاسانی، دەچوویتە سەربانی ئەو بەری سەر داڵانەکە، تەماشای دەوروبەر و کۆڵانمان دەکرد. دیواری سەربانەکە زۆر بەرز نەبوو، لە نێوان هەر چەن مەترێکدا، کونێکی گەورەی تێدابوو، بۆئەوەی لە زستان و بەهاراندا، ئاوی باران کونەبێتەوە و زیان بە سەربانەکە بگەیەنێ. منداڵەکان گەورەبووبوون، ئیدی بۆ خۆمان پێکەوە و لەگەڵ منداڵانی دراوسێکانمان یاریمانئەکرد. هەر خەریکی ڕاوڕاوێن و شەڕەشەق بووین. زۆر لە هاوڕێکانم هاتوچۆیان دەکردم.
لە ئەو سەردەمەدا، نزیکترین هاوڕێم لە کۆڵانەکەماندا، کوڕانی (حاجی مستەفا: بەکر، عومەر، عوسمان ...} و خوالێخۆشبوو دوکتۆر (حەمەعەتای حاجی قادری شیرین) بوون. (عەتا) دوکتۆرێکی باشی لێ دەرچووبوو، زۆرجار لە (سولەیمانی) دەمبینی، بە داخەوە، ساڵی (2010) نەخۆشی شێرپەنجە کوشتی! لە قوتابخانەش نزیکترین هاوڕێم (کەماڵ جەلال)ی برای (ئەنوەر جەلال)ی گۆرانیبێژ و (عەلی مەلاعارف) بوون، باوکی مەلا و گوتاربێژێکی گەورە و دیاری مزگەوتی (پاشا) بوو.

ژنهێنانی مامە (عومەر)

مامە (عومەر)م، داوای کچێکی کردبوو، تێلیفۆنی بۆ باوکم کرد، تا یارمەتیبدا. ڕۆژێکیان هات و ماوەیە لامان مایەوە. باوکیشم دەستی یارمەتی بۆ درێژکرد، بۆ گواستنەوەکەشی هەموومانی بانگکرد. ئەوە یەکەمین جاربوو، دوای ئەوەی نزیکەی ساڵێ پتربوو، (سولەیمانی)م بەجێهێشتبوو، بە سەردان بچمەوە و چاوم بە بینینی هاوڕێ و خزم و شارە جوانە دڵگیرەکەم ڕۆشنبێتەوە!
ساڵی (1960) بوو، زستانێکی سەخت و زۆر سارد بوو. کاتی کۆڵان و یاریکردن نەبوو، پتر سەرقاڵی خۆئامادەکردنی شایی بووین، هەموو سێ ڕۆژیش ماینەوە، بەڵام ئامێکم پێدا هاتەوە، کەمێ ئاوو هەوای (سولەیمانی)م هەڵمژی، دڵ و دەروونم گەشایەوە، هەلم بۆ هەلکەوت، هێندێ لە کۆڵانەکانی گەڕەک و هاوڕێ کۆنەکانم بەسەرکردەوە، زۆر لام شیرین و خۆشەویست بوون!

**باوکم گۆڕا**

تا ماوەیەکیش باوکم، هەر لەسەر بەڕمەکەی خۆی بوو، لە (پارتی کۆمۆنیست)دا کاری دەکرد. هێندەی بیرم مابێ، تەنیا یەک کۆمۆنیستم لە (پێنجوێن) دەناسی، ئەویش هەموو کەسێ دەیناسی و ناوەکەیم بیرنەماوە، بەڵام (موختار)یان پێ دەگوت. کوڕێکی دەموچاو ناوڵاوی هەبوو، ناوی (عومەر) بوو، پێکەوە دەمانخوێند. زۆر هاروهاج و بزێو بوو، هەمیشە بۆکسی ئاسن و خەنجەرێکی چکۆلانەی لە باخەڵدا بوو، ڕۆژ نەبوو، لە قوتابخانە لەگەڵ یەکێ لە قوتابییەکاندا شەڕنەکا. بەڵام، هەرگیز توخنی من نەدەکەوت، چونکە دەیزانی، کوڕی کێم و لەگەڵ باوکمدا، چەن جارێ سەرمان لە ماڵیان دابوو. هەموو دیواری ژوورەکەیان، بە وێنەی (مارکس، ئێنگلز، لینین و ستالین) ڕازاندبووەوە، کەچی یەک وێنەی مەرکرنە و ڕەوانشادەکانی کوردیان هەڵ نەواسیبوو!

باوکم گەلێ هاوڕێی هێژا و بەڕێزی هەبوو، لە ئەوانە خوالێخۆشبووان (جەمالی میرزا حەمەسەعید، عەبدوڵای حاجی موحەممەدی قوربانی، حەمەی حاجی سەفەر، حەمەی حەمەڕەش، عەبەی مەجی تەنەکەچی، عەلی عەبەوەنەوش، جەمالی حاجی مستەفا ...) زۆریان ڕێز لێ دەگرتین و گەلێ جاریش، داوەتیان بۆ دەکردین، یا لە ماڵی ئێمە دادەنیشتن و کۆدەبوونەوە، دەیانخواردەوە و گۆرانییانەدەگوت. باوکم و (قوربانی) دەنگیان خۆشبوو، منیش بە دیاریانەوە دادەنیشتم و شاییم پێ دەهات. هاوڕێکانی باوکم هەموویان (پارتی) بوون و دەیانویست، باوکیشم بکەن بە (پارتی). زۆری پێ نەچوو، چوونە بنکڵێشەی و لێی نەگەڕان، تا وازی لە (پارتی کۆمۆنیست) هێنا. ئێستەش بیرمە، پەرتووکێکی نوێی (خرۆتشێۆف) دەرچووبوو، وێنەیەکی خۆی تێدابوو، وەک هەرەشەبکا، پەنجەی بەرزکردبووەوە، لەژێر وێنەکەیدا نووسرابوو: (لا تعتمدوا علی الله بل اعتمدوا علی الجیش السوڤیتی الاحمر!) واتە: باوەڕ بە خوا مەکەن، باوەڕ بە لەشکری سووری سۆڤێتی بکەن! ئیدی ئەو کاتە، ئەو قسەیەی (خرۆتشێۆف)، بۆ ئەندامانی (پارتی) بەسبوو، تا خەڵک لە بیری کۆمۆنیستی دووربخەنەوە و ڕیزەکانی خۆیانی پێ قراوانتکەن! چونکە باوەڕی ئاییتی، لە ناخ و دەروونی تاکەکانی کورددا، ڕەگی قووڵی داکوتاوە، هەر بیرێ بە ئەو پەڕتەدا بڕوا و دژبێ، پووچەڵدەبێتە!

(پارتی)، ژمارەیەکی زۆری لە ئەو پەرتووکە کڕیبوو، ماڵەومان دەیانگێڕا و پیشانی کۆمۆنیستە موسوڵمانەکانیان دەدا، پارییان بە هەست و هۆشی، ڕۆڵەکانی گەلی کورد دەکرد و کارێکی زۆریان، لە بیروباوەڕی خەڵکە موسوڵمان و نەخوێندەوارەکان کرد.

باوکیشم یەکێ لە ئەو کەسانەبوو، پێی بە تەڵەی ئەو کەمەییەوە بوو، هەر زوو وازی لە ڕێکخستنی (پارتی کۆمۆنیست) هێنا و بوو بە (پارتی)، دوای ماوەیەکیش، کردیان بە ئەندامی لیژنەی ناوچەی (پێنجوێن).

سەرەتای ساڵی (1960) بوو، لە ئەو ماوەیەدا، باوکم لە ڕیزەکانی (پارتی)دا، زۆر چالاک بوو. ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی بۆ دەهات، هێندێ نامیلکە و پەرتووکی وەك (کوێرەوەری)یەکەی (برایم ئەحمەد) و (چوونی بارزانییەکان بۆ یەکێتی سۆڤێت)ی (عەزیز شەمزینی) و هێندێکی دیکەشمان هەبوو، وردەوردە کاتی بێ ئیشی دەمخوێندنەوە. بە تایبەتی گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)م، زۆر حەز لێ بوو، چونکە هۆنراوە و فۆلکلۆری کوردی بڵاودەکردەوە. دەتوانم بڵێم: ئەوە سەرەتای دەسپێکی ئارەزووی خوێندنەوەم بوو. لە گۆرانییە کوردییەکانیشدا، زۆر حەزم لە دەنگی (ڕەفیق چالاك) دەکرد، بە تایبەتی، کاتێ باوکم و هاوڕێکانی کۆدەبوونەوە و گۆرانییانەدیانگوت؛ منیش بە دڵ گوێم لێ دەگرتن، بۆ ئەوەی ئاواز و هۆنراوەکانی فێربم.

## پۆلی سێی سەرەتایی ( 1959-1960 )

تازە لە پۆلی سێ دەوامدەکرد، بەڕێوەبەری قوتابخانە (حەسەنە فەندی) ڕۆی و بەڕێوەبەری نوێ (مەحموودی حەمەی ئەولێ)، لە جێی دانرا. ئەویش هەر خەڵکی (سولەیمانی) بوو، لەگەڵ باوکمدا دۆستایەتیان هەبوو. قوتابخانەکەمان زۆر گەورەبوو، تا پۆلی شەشی تێدابوو، هەر پۆلێکیش لە چەن لقێ پێکهاتبوو. هێندێ خوێندکار لە گوندە نزیکەکانی دەوروبەری (پێنجوێن)ەوە، بەیانیان زوو بەڕێدەکەوتن و دەهاتن. مامۆستامان زۆر کەمبوو، مامۆستای وا هەبوو، چەن وانەیەکی دەگوتەوە. مامۆستایەکی دیکەی خەڵکی (سولەیمانی)، وانەی سروود و زمانی عەرەبی پێدەگوتین، کوڕی (گۆران)ی هۆنەر بوو، ناوی (ئەڕێ) بوو، ئەویش هەر (پارتی) بوو.

ئەو کاتە نزیکی نیوەڕۆ، لە قوتابخانە شیری کوڵاو، پەنیر، حەبی ڕۆنماسی، پرتەقاڵ و سێوییان دەدایینێ. هێندێ جاریش، هێلکەی کوڵاو و خورماشمان وەردەگرت. وا بزانم، نزیکی نیوەی ساڵ بووبووینەوە، جلیشمان بۆ هات و بەسەرماندا دابەشیانکرد. تا ئەو کاتە، هەر قوتابییەك بە ئارەزووی خۆی، جلی لەبەردەکرد، زۆربە جلی کوردی و کەمێکیش چاکەت و پانتۆڵیان لەبەردەکرد. بەڵام کە جلمان وەرگرت، ئیدی نەیانهێشت، کەس جلێکی دیکە لەبەرکا و دەبووایە، هەر بە ئەو پۆشاکە یەکڕەنگ و یەکگرتووەوە بچووینایە.

یەکەمین ڕۆژیبوو، هەموومان جلمان لەبەرکردبوو، سەیری یەکدیمان دەکرد و پێدەکەنین. کوڕێکی قەڵەوی سەرخڕی تێکسمڕاوی سووروسپی چاوشینمان لەگەڵ بوو، هەسیشە دەتگوت، گیپەی جۆیە و لە ترشوخوێدا سوورکراوەتەوە! گوێپەڕەی ملی دەرپەڕیبوو، دەمارەکانی بەرزبووبوونەوە، خەڵکی یەکێ لە ئەو دوو گوندەی (کێلو) و (مەسێ) بوو، ناوی (حەمەحوسێن) بوو. لە پڕ لە دوورەوە دەرکەوت، هەر لە قوتابی و فەڕاشەکانەوە بیگرە، تا بە مامۆستاکان دەگا، کەس نەبوو، لەبەر پێکەنین خۆی بۆ بگیرێ. ئەو برادەرە، هەر لە سەرەوە تا خوارەوە، هەموو قۆپچەی چاکەتەکەی داخستبوو، پاشان وەک مراخانی کۆیکردبووەوە. خستبوویە نێو پانتۆڵەکەیەوە، پانتۆڵەکەشی بە هەزار شەڕەشەق، بە ورگیدا هاتبووەوە، لەبری قایشیش، توندتوند بە پەتەخوێنەکەی بەستبووی، هێندەی دیکە ورگی دەرپەڕیبوو. جووتێ جزمەی زلی ڕەشیشی لە پێ کردبوو، هەربوو دەرپانگی پانتۆڵەکەی لوولکردبوو، خستبوویە نێو جزمەکانییەوە. ئیدی دیمەنێکی هێندە سەیری هەبوو، کوڕم دەویست، لەبەر پێکەنین خۆی بۆ ڕاگیرێ، وەک دەڵێن: سەریەقووڕی دەهێنایە پێکەنین! ئەویش تووڕەبووبوو، مۆڕدەبووە و لەبەر خۆیەوە جنێویدەدا. پاشان بەڕێوەبەر بانگیکرد و ناردی قایشێکیان بۆ کڕی، فێریکرد، چۆن چاکەت و پانتۆڵ لەبەربەکرێ. دوایی کاتێ خۆشی، ئەو بەزمەی بیردەکەوتەوە، تەماشای ئێمەی دەکرد و پێدەکەنی، وای لێهاتبوو، ڕامانهێنابوو، فێری گاڵتە و قسەی خۆش ببوو، چونکە سەرەتا زۆر مۆن و گۆشەگیربوو، بە دەگمەن قسەیدەکرد و هەر مۆڕدەبووەوە.

### گوندەکانی دەوروبەری ( پێنجوێن )

کاتێ باوکم بۆ دەرزیلێدان، بۆ گوندەکانی دەوروبەری (پێنجوێن) دەچوو، زۆر جار، منیشی لەگەڵ خۆی دەبرد. لەبەرئەوە، هێندێ گوندی وەک (بووبان، نزارە، گۆڵێ، وێنە، دارۆخان، هەرگێنە و بناوەسووتە)م بینی. یا کاتێ داوەتیاندەکردین، چێژێکی زۆرم لە ئەو سەردان و گەشتانە دەبینی، بە تایبەتی ماڵی (شێخ عەبدولکەریمی کرپچنە)، لە (بووبان) بوو، زۆرم لا خۆشبوو. دیمەنێکی جوانی هەبوو، لەبەردەم گەلیی شاخێکدا هەڵکەوتبوو، ئاوێکی زۆری پێدا دەهاتەخوارەوە، ئەو ئاوەی فێنککردبووەوە. (بووبان) هەمووی چەن ماڵێ بوو. کەپرێکی گەورەیان دروستکردبوو، چواردەورەکەی بە دار و درەخت ڕازابووەوە، سەرەکەشیان بە مێو گرتبوو، سێبەرێکی خۆشی هەبوو، حەوزێکی گەورەشیان لەبن کەپرەکەدا دروستکردبوو، ئاوەکەی زۆر سارد و خۆش بوو.

دەروێشێکی زۆری هەردوو بەشەکەی باشوور و خۆرهەڵاتی (کوردستان)یش، لە دەورەی (شێخ) گردبووبوونەوە، هێندێ جار زکر(یان دەکرد و حاڵیان لێ دەهات. جاری واش هەبوو، بە ماڵەوە دەچووین، دایکم و منداڵەکان لای ژنەکان دادەنیشتن، من و باوکیشم لای (شێخ) دەمباینەوە.

(شێخ) تا بڵێی، پیاوێکی جوان و بێدەنگ بوو، (شێخ موحەممەدی) کوڕیشی، زۆر هاوڕێی باوکم بوو، زۆر جار دیاری نایابیان دەدایێ و زۆر ڕێزیان لێ دەگرتین. ئاخر وەنەبێ، ئەو کاتە باوکم موسوڵمانێکی هێندە گرنگبووبێ، نوێژیکردبێ و باوەڕی بە (شێخ) هەبووبێ، بەڵکوو ئەوەی کۆیکردبوونەوە، شێخایەتی، کارەکەی، هاوڕێیەتی (شێخ موحەممەد) و میهرەبانی (شێخ عەبدولکەریم) خۆی بوو!

**تیپی دیدەوانی قوتابیانی (سولەیمانی)**

ڕۆژێ هاوین بوو، تیپێکی دیدەوانی ئامادەیی (سولەیمانی) هاتن بۆ (پێنجوێن) و لە نزیک (بوریان) چادریانهەڵدابوو، سەربازگەیەکی خجیلانەی قوتابیانیان دامەزراندبوو، چەن ڕۆژێ لە ئەوێ مانەوە و بە نێوچەکەدا گەشتیانئەکرد.

شەوێکیان خەڵکی (پێنجوێن)یان بۆ ئاهەنگ و شانۆگەرییەک بانگکرد، منیش لەگەڵ باوکمدا چووم. لە ئەوێ تەنیا هاوڕێی هەلاماتێنەکەی منالی خۆم (جەمالی عەلی بابیر) و مامۆستا (شەوکەت سدیق)ی گەڕەکی ماڵی باپیرم ناسی. گەلێ بەرنامەی خۆشیان پێشکەشکرد و بۆ بەیانی گەڕانەوە. گۆرانی زۆر سەیریان دەگوت، نیوەی عەرەبی و نیوەکەی دیکەشی کوردی بوو، یەکێ لە ئەو گۆرانییانەی بیرماوە، ئەوە بوو، چەن کەسێ ڕیزبووبوون و دەیانگوت: هازا لەمکیە و هازا لەمکیە، شفتەمان خوارد و نۆرەی شووتییە! خەڵکەکەش زۆریان لا خۆشبوو و پێدەکەنین.

**مۆڵەتوەرگرتن**

(پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عێراق / پ. د. ک.)، هەوڵێکی زۆری دا، تا وەک (پارتی کۆمۆنیست)، مۆڵەت لە میری وەرگرێ و بە ئاشکرا، بارەگە بکاتەوە و کاربکا. ئەوەبوو، ڕۆژی (9. 2 1960)، مۆڵەتی کارکردنی لە میری وەرگرت.

هەرچەندە پێشتریش، هەر بە ئاشکرا کاریدەکرد، بارەگەی لە هەموو شار و شارۆچکەکانی (کوردستان) کردبووەوە، بەڵام بەپێی یاسای کارکردنی پارتە ڕامیارییەکانی (عێراق) دەبووایە، مۆڵەتیان لە شالیارگەی نێوخۆ وەرگرتایە. ئیدی (پارتی)، هەلێکی باشی بۆ هەڵکەوت، بە گوێرەی یاسا و بە ئاشکرا کاریدەکرد.

بۆیە ڕۆژبەڕۆژ، پتر خەڵکی لێ کۆدەبووەوە، کێڕڤی ژمارەی ئەندام و هەوادارەکانیشی، لە بەرزبوونەوەیەکی زۆر خێرا و سەیردا بوو. ئەوەبوو، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، ژمارەی ئەندامەکانی، لە ژمارەی ئەندامانی (پارتی کۆمۆنیست) نزیکبوو‌بووەوە! هەر ئەو ڕۆژە لە نێو شاردا، هەرا و دەنگەدەنگ پەیدابوو، (پارتی) لە ڕقی هاوڕێ کۆمۆنیستەکان، چەن ترومبیلیکیان گرت، بە دەهۆڵ و زووڕناوە، بە نێو (پێنجوێن)دا دەگەڕان، هەڵدەپەڕین و گۆرانییاندەگوت، خۆشییەکی زۆر، لە نێو هەوادارانی (پارتی)دا بڵاوبووەوە.

هەر سێ خوالێخۆشبوو (عەبەی مەجی ئەنەکەچی، باوکم، مامە بەکرم) و خۆم لە تەمەنی (10) ساڵیدا، لە بەردەم بارەگەی (پ.د.ک ـ پێنجوێن) بە بۆنەی مۆڵەتوەرگرتنەوە گیراوە.

پاشان دوای ماوەیە، لە بازاڕ و نزیک ماڵی ئێمە، باڵەخانەکەی (حاجی حوسێنی غوڵام)یان بەکرێگرت، بەرەگایان لێ کردەوە، ژێرەکەشی هەمووی ڕیزە دووکان بوو. باڵەخانەکە، لە چەن ژوورێکی گەورە پێکهاتبوو، هەر ژوورەی بۆ کارێکی تایبەتی تەرخانکرابوو، سەرلە ئێواران تا درەنگانێ جمەیدەهات، یەکێ دەهات و یەکێکی دیکە دەڕۆی. زۆر کات باوکم لەگەڵ خۆی دەیبردم. ڕۆژێکیان باوکم داوای لێ کردم، ڕۆژنامەی (خەبات) بەسەر ماڵە فەرمانبەرە بەشداربووەکاندا دابەشکەم. منیش زۆرم پێ خۆشبوو، تا لە (پێنجوێن)یش بووین، هەر من دابەشمدەکرد، بە کوردییەکەی پۆستەچی (خەبات) بووم!

**نیوەی ساڵ**

باوکم تا دەهات، باری ئابووری باشتردەبوو، ئیشی زۆر باش دەڕۆی، لە هیچمان کەم نەبوو، هیچ جۆرە گرفتێکمان نەبوو، سەرووزماتی زۆر شیرین بوو، خەڵکیش زۆریان خۆشدەویست، زۆر دڵیشی بە (پێنجوێن)دا چووبوو، وای لێ هاتبوو، دەیگوت: تازە جارێکی دیکە واز لێرە ناهێنم، بە ئەم زووانەش، دەرمانکەیەکی بچووکیش دەکەمەوە و بە یەکجاری لێی دادەکوتین!

نیوەی ساڵبوو، لیژنەی پشکنینی (پارتی) بە سەرۆکایەتی (نووری ئەحمەدی تەها)، لە (سولەیمانی)ەوە هات. ئێوارە لە ماڵی ئێمە نانیانخوارد و شەویش هەر لە ماڵی ئێمە بوون. دوای ئەوەی کارەکانیان تەواوکرد، بەرەو (سولەیمانی) گەڕانەوە. منیش پشووی نیوەی ساڵم بوو، زۆر بیری شار و کەسوکارم دەکرد، داوام لە باوکم کرد، ڕێمبدا و لەگەڵ ئەوان بڕۆم. باوکیشم دڵی نەشکاندم. ئەوان، جیبێکی کورتی سووری چکۆلەیان پێ بوو، بە شۆفێرەکەوە سێ کەس بوون و منیش چوارەم بووم.

کاک (نوری) زۆر ڕووی خۆشبوو، لە ڕێ دەیدواندم و پرسیاریان لێ دەکردم، لە ئەوە دەچوو، قسەم لێ دەربێنن، منیش وەک منداڵێکی دڵ و دەروون خاوێن و ساکار، هەرچی لە هەگبەی مێشکمدا بوو، بۆم هەڵڕشتن. کاتێ باسی کۆمۆنیستەکانی لێ پرسیم، من گوتم: دەڵێن (خرۆتشێف) لە (ئەمیریکا) بووە، بە شەقامەکاندا گەڕاوە، خەڵکی هێلکەیان بە سەرە کەچەڵەکەیدا کێشاوە. ئەویش پێکەنیوە و گوتوویەتی: وا دیارە، لێرە هێلکە زۆر هەرزانە، لای ئێمە بۆ خواردنیش دەس ناکەوێ! هەموویان دەسیانکرد بە پێکەنین و کاک (نوری)یش گوتی: ئەوە باوکە بۆی گێڕایتەوە؟! منیش گوتم: بەڵێ.

لە (سولەیمانی)، لەبەر گەراجی (ئەسحابەسپی) دایانبەزاندم. منیش لە ئەوێوە بەنێو بازاڕەکەدا، بە ڕاکردن چووم بۆ دووکانی باپیرم. لە دوورەوە هاوارمکرد: (بابەعەزیز)، ئەویش باوەشی پێداکردم، ماچیکردم و چەن دەنکەنوقوڵێکیشی دامێ.

ئێوارە لەگەڵ مامە (سالح)دا ڕۆشتینەوە، ئیدی بە ئەو شێوەیە، بە دیداری (دایەحەمەدی)، مام و پوورەکانم شادبوومەوە. چەن ڕۆژێ لە ئەوێ بووم، زۆر خۆشم ڕابوارد، سەرم لە هەموو هاوڕێکانم دا و دوای ماوەیە، مامم لە گەراجەکەی (پێنجوێن)ەوە، سواری جیبێکی کردم و گەڕامەوە. بەڵام (حەسەن)ی برامم نەدی، چونکە باپیرم لێیدابوو، ئەویش ڕایکردبوو، کەس نەیدەزانی، لە کوێ گیرساوەتەوە، مامە (عومەر)م زۆر بە دوایدا گەڕابوو، کەڵکی نەبوو، کەچی دوای ماوەیە خۆی دەرکەوت و گوتی: لە (هەولێر) لای دایکم بووم!

**خانووکردن**

تا گەڕامەوە، باوکم پارچەیە زەوی لە نێو باخێکی جواندا، لەبەری (ئەلیاسەفڕە) و لە تەنیشت ئاشەکەی (جەمال رەفعەت)ەوە کڕیبوو، بڕیاریدا، بیکا بە خانوو. هەرچەندە دایکم هاواریکرد و لەگەڵیدا خەریکبوو، واز لە ئەو کارە بێنێ، هیچ کەڵکی نەبوو.

ئەو کاتە باوکم، پارەیەکی زۆری پەیداکردبوو، وەڵامی بۆ مامە (بەکر)م نارد، بێ و سەرپەرشتی خانووەکە بکا. ئەویش لە خوای دەویست، چونکە هیچ کارێکی نەبوو. ئەوە بوو، دوای ماوەیە هات و دەستیان بە دروستکردنی خانووەکە کرد، تا تەواو نەبوو، نەگەڕایەوە. لەسەر شێوەی خانووەکانی (سولەیمانی)، نەخشەیەکی زۆر جوانیان بۆ کێشابوو، بناغەیان هەڵدایەوە و دیوارەکانی بەرزبووەوە. پشووی هاوین بوو، خۆشم کارم تێدا دەکرد. لە ژیانمدا ئەوە یەکەمین جاربوو، کاربکەم، کارەکەشم لە ماڵی خۆماندا، بە کرێکاری دەستپێبکا، بەڵام هیچیش وەرنەگری!

خانووەکە تەواوبوو، تا بڵێی خۆشبوو، دڵی دەکردەوە، چونکە لە شوێنێکی بەرزدا بوو، بە چەند پێپلکەیەک سەردەکەوتین. شوێنەکەی زۆر خۆش و جوان بوو، لە سێ لاوە بە داری هەرمێ، سێو و هەڵوژە دەورەدرابوو. بە بەردەمیشیدا، چەمێکی چکۆلانە هاژەی دەکرد، پردێکی تەختەی درێژیش، هەردوو بەری گەڕەکەکە و نێوبازاڕەکەی پێکەوە بەستبوو. بەرانبەرمان فەرمانگەی سەرای (پێنجوێن) بوو، لە ماڵی ئێمەوە دیاربوو. لە تەنیشتیشمانەوە ئاشبوو. کەمێ خوارتر باخی (ئەلیاسەفڕە) دەستپێدەکرد، باخێکی زۆر تژیک و جوان بوو، پڕبوو لە داری بەردار. لە نەخۆشخانەکەی باوکم، قوتابخانەکەی من، یانەی فەرمانبەران و نێوبازاڕیشەوە زۆر نزیکبوو.

خانووەکە دوو دەستەبوو، دەستەی سەرەوە سێ ژوور و هەیوانێکی گەورەبوو. هەیوانەکە بە جامخانەیەکی شووشە گیرابوو. حەوشەیەکی مامناوەندی هەبوو، دوولەتکرابوو، لە نێوەڕاست و بە چواردەوری هەردوو بەشەکەشدا، تولەڕێیەکی کۆنکرێتکراوی باریکبوو، هاتوچمان پێدا دەکرد. نێوەڕاستی هەردوو بەشەکەش، بە چیمەن و قەراغەکانیشی، بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابووەوە. لە سوچێکی لای ڕاستی خانووەکەوە، بیرێکی قووڵ هەڵکەندرابوو، مەکینەیەکی ئاوهەڵکێشانی لەسەربوو، بە جارێ پاوەشێ ئاوی فڕێدەدا. دەستەی ئەو بەریش، لای دەرگەی دەرەوە بوو، لای دەستە چەپەوە گەرماوێکی گەورە و پێشاوێکی خاوێنی سەرگیراوی لێ دروستکرابوو. لای دەستەڕاستیشەوە، ژوورێکی مامناوەندی بوو.

سەیر ئەوەبوو، کاتێ خانووەکە تەواوبوو، ئەو هەموو ئەرکەمان تێدا کێشا، خۆمان نەچووینە ناوی، بەڵکوو دادگەری (پێنجوێن) هاوڕێی باوکم بوو، دای بە کرێ بە ئەو. هەموو جارێ ڕۆژنامەی (خەبات)م بۆ دەبرد، لە دەرگەکەوە لێی وەردەگرتم، منیش هەر ملەقووتێم بوو، بەڵکوو لە درزێکی دەرگەکەوە، نێو حەوشەکە ببینم، چونکە زۆر لام خۆش و جوان بوو. بە داخەوە تا لە (پێنجوێن)یش بووین، فریانەکەوتین، شەوێکی تێدا ڕۆژکەینەوە و تێدا بحەوێینەوە!

**میوان و سەیران**

ئەک هەر چواردەوری شارۆچکەی (پێنجوێن)، سرووشتێکی جوانی هەبوو، بە باخ و دار و درەخت ڕازابووەوە، بەڵکوو هەموو شارۆچکەکە خۆی، بەهەشتێ بوو، خوا لەسەر زەوی دروستیکردبوو! ئێمەش خانوویەکی گەورەمان هەبوو، باوکم پارەیەکی باشی دەستدەکەوت، هەموو پێداویستییەکانی میوانداریمان هەبوو، نوێنێکی زۆرمان کڕیبوو، باوکم و دایکیشم لە مێژبوو، لەگەڵ میوانداریدا ڕاهاتبوون و ئێوانیان خۆشبوو، ئەمانە هەموویان کارێکی وایان کردبوو، لە هەردوو وەرزی بەهار و هاویندا، میوانێکی زۆر لە (سولەیمانی)ەوە ڕوومان تێبکەن، ماوەیە لامان بمێننەوە و کاتێکی خۆش بەسەربەرن.
تا مامە (بەکر)م لامان بوو، چ لە خانووەکە و چ لە دەرەوە، زۆربەی کات هەر پێکەوە بووین. ڕۆژنامەیەکی دەکڕی و بەرەو (بەرباخ)، بە دەم پیاسەوە دەیخوێندەوە و جار جاریش، قسەی خۆشی بۆ دەکردم. ڕۆژێکیان، هاوڕێکانی لە (سولەیمانی)ەوە هاتن، چوون بۆ (بلکیان) بۆ سەیران، منیشی لەگەڵ خۆی برد. ئەوە یەکەمین جاربوو، مامم ببینم، لەگەڵ هاوڕێکانی دانیشێ و بخواتەوە. ڕەوشی تەندرووستی زۆر خراپ تێکچوو، بەپەلە بردمانەوە بۆ ماڵەوە، ئەو شەوە تا بەیانی هەر ڕشاوەتەوە و خەوی لێ نەکەوتووە، منیش بە دیاریەوە بووم. ئیدی جارێکی دیکە نەمبینی، بخواتەوە!
هەر لە ئەو ماوەیەدا، مامە (سالح)م و کۆمەڵێ هاوڕێی هاتن و سەردانیانکردین. من هەموویانم دەناسی، لە پێشدا لە ماڵی ئێمە دابەزین، دوایی منیشیان لەگەڵ خۆیان برد و لە هاوینەهەواری (بلکیان) دامەزراین.
بە ڕاستی، سەیرانێکی زۆر خۆشبوو، دوو شەو و دوو ڕۆژ، لە ئەو ناوە ماینەوە. ئەمان چونکە لاوبوون، سەیرانەکەیان خۆشتربوو، سەری خۆیان مەستکردبوو، هەر نوکتەیان دەگێڕایەوە و گۆرانییانیدەگوت، ئامێری مۆزیکیشیان پێ بوو، بەڵام مامە (بەکر)م و هاوڕێکانی، پتر باسی کێشەی ڕامیاری و پارتایەتیان دەکرد. ئیدی هەر کۆمەڵێ، بە جۆرێ دەژی و چێژ لە ژیان وەردەگری!

دوای ئەوە، پاییزێکی درەنگبوو،ماڵی هەردوو مامە (بەکر) و (عومەر)، هەردوو پورە (فاتم) و (نەسرین)یشم هاتن و چەن ڕۆژێ لامان مانەوە. زۆربەی سەیرانگەکانی دەوروبەری (پێنجوێن) گەڕاین و کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد. هێشتا ئەوان نەگەڕابوونەوە، ماڵی (کەریم چاوڕەش)یش هەموویان هاتن، لای من ئەم جارەیان، لە هەموو جارەکان خۆشتر بوو، چونکە منداڵەکانی هاوڕێی خۆم بوون. بە کورتییەکەی، ئەو چەن ساڵەی لە (پێنجوێن) بووین، میوانمان لێ نەبڕاوە، دایکیشم دریغی نەکردووە، بە شێوەیەکی زۆر جوان، پێشوازی لێ کردوون و ڕاژەیکردوون.

بەڵام بەهاری ساڵی (1961) بوو، چەن خزمێکی دووری باوکم هاتن و دوو شەو لامان مانەوە، ئێمە نەماندەزانی، میوانی ئەم جارەمان بۆیە هاتوون، ماڵمان لێ تێکدەن، دوایی بۆمان دەرکەوت، باوکم لەبنەوە، لەگەڵ کچە گەورەکەیاندا (سەبری) بەیەنی هەیە، کچیش چی، هەرچەندە بێوەژن بوو، بەڵام زۆر جوانبوو!

خۆشمان هێندێ جار سەیرانماندەکرد، ڕۆژێکی هاوینی زۆر گەرم و خۆش بوو، لەگەڵ چەن ماڵێکی ئاسیاوماندا کۆبووینەوە، چووین بۆ (سەرچەم)، نزیکەی ماوەی کاژێرێ لە (پێنجوێن)ەوە دووربوو. دەشتێکی زۆر گەورە و فراوانی هەبوو، ئاوێکی زۆری بەخوڕی پێدا دەڕۆی. بەڵام سەوزای کەمبوو. چونکە ڕۆژی هەینیش بوو، خەڵکێکی زۆری لێ بوو. لە لایەکەوە سەیرانکەرەکان چێشتیان لێدەنا و خوانیان دەڕازاندەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، هێندێ کەس یاری و هێندێکی دیکەش مەلەیاندەکرد، منیش ئەو ڕۆژە مەلەیەکی باشم کرد. هێندێ کەسیش بە تۆڕ ماسییان دەگرت. بە ڕاستی کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد، چونکە هاوتەمەنی خۆمی زۆر لێ بوو، بە شێوەیەکی بەردەوام، یارییماندەکرد و هەر دەترووقاینەوە!

## یەکەمین دیداری مام (جەلال)

ئێوارەیەکی بەهاری ساڵی (1961) بوو، لە ماڵەوە دانیشتبووم، کوڕێ هات و گوتی: باوکت لە لیژنەی ناوچەیە و دەڵێ: هەر ئێستە با بێ بۆ ئێرە، ئیشم پێیەتی. منیش هەستام و لەگەڵی ڕۆشتم.

کە چوویتەسەرەوە، خەڵکێکی زۆری لێ بوو، باوکم چاوەڕوانیدەکردم، یەکسەر پەلی گرتم و گوتی: وەرە (مام جەلال) هاتووە، حەزدەکا، بتبینێ. لەگەڵ باوکمدا چووینەژوورەوە، (مام جەلال) ڕاوەستابوو، پشتی لە ئێمە بوو، قسەی بۆ کۆمەڵێ لاو دەکرد. دەستی

ڕانکوچۆغەی شینکی لەبەردابوو، جامانەیەکی بەستبوو، چاویلکەیەکی پزیشکی لە چاودا بوو، زۆر گەنج و قۆز دیاربوو. ئەوە یەکەمین جاربوو، (مام) ببینم، پێشتر هەر ناویم بیستبوو، زۆرم خۆشویست!

خوالێخۆشبوو کاک (موحەممەدی حاجی سەفەر) بانگیکردم و بە (مام)ی گوت: ئەمە ئەو منداڵەیە، کە ڕۆژنامەی (خەبات)مان بۆ دابەشدەکا و کوڕی (شێخ موحەممەد)ە. ئەویش بە زەردەخەنەیەکی شیرینەوە سەیرێکیکردم، تەوقەی لەگەڵ کردم و منیش بەخێرهاتنم کرد. پاشان گوتی: ناوت چییە؟ گوتم: (حوسێن). گوتی لە پۆلی چەندی؟ گوتم: لە چوار. گوتی: ڕەوشی ڕۆژنامەی (خەبات) چۆنە، دەفرۆشری؟ منیش گوتم: نازانم، چونکە من نایفرۆشم، بەڵکوو تەنیا هەر بەسەر چەن ماڵە فەرمانبەرێکدا دابەشیدەکەم. گوتی: ئافەرین، تۆ کوڕی کوردەی، دەبێ ڕاژەی گەلی خۆت بکەی و چالاکبی. بە ئەو زووانەش ڕۆژنامەی (کوردستان) دەردەکەین، بۆتان دەنێرین، ئەویشمان بۆ دابەشدەکەی؟ گوتم: بەڵێ.

(مام جەلال) هەر ئەو جارە، داوای لێ کردین، بایەخ بە لیژنەی ناوچەی (یەکێتی قوتابیانی کوردستان) بدەین و چالاکی بنوێنین، داواشی لە لیژنەی ناوچەی (پارتی) کرد، ژوورێکمان بدەنێ و بیکەین بە بارەگەی (قوتابیان).

ئەو ڕۆژە شەهید (حەمەسدیق پێنجوێنی) و خوالێخۆشبوو (بەکری حاجی سەفەر) و چەن قوتابییەکی دیکەش لە ئەوێ بوون. ئەوەبوو، بڕیاردرا، لیژنەیەک لە قوتابیان دروستکرێ. پاشان ژوورێکی گەورەمان وەرگرت، هەر زوو ژوورەکەمان خاوێنکردەوە، هەموو دیوارەکانیمان بە کاغەز داپۆشی، بە وێنەی سەرکردەکانی کورد (قازی موحەممەد، شێخ مەحمودی حەفید و سەرۆک بارزانی) ڕازاندمانەوە. چەن کورسی و مێزێکیشیان داینێ، ئیدی بووین بە لیژنەی تەواو. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە (پێنجوێن) ڕێکخستنی (ی. ق. ک. ـ ع.) بارەگای هەبێ.

بۆ بەیانی، باوکم و چەن کادێرێکی دیکەی (پارتی) لەگەڵ (مام جەلال)، بەرەو گوندەکانی دەوروبەری (پێنجوێن) بەڕێکەوتن، پێوەندییان بە سەرۆک تیرە و هۆزەکانی ئەو نێوچەیەوە دەکرد. بەڵام من نەمدەزانی، چی لە گۆڕێ دایە، دوای دوو ڕۆژ باوکم گەڕایەوە، گوتی: زۆربەی سەرۆک خێڵەکانی نێوچەکەمان لەگەڵە، (پارتی) داوای مافە ڕەواکانی گەلی کورد لە میری دەکا. بە ڕاستی من هێشتا، زۆر سەرم لە ئەو جۆرە شتانە دەرنەدەچوو!



جەلال تاڵەبانی (1934 – 2016)

**هەواڵێکی درۆ**

ئێوارەیەکیان دەنگ بڵاوبووەوە و گوتیان: ئەم شەو هێزەکانی (ئێران)، پەلاماری (پێنجوێن) دەدەن و تاڵانیدەکەن. ئیدی هەر خەڵك بوو، لە ترساندا نەیاندەزانی، چی بکەن. کاتێ تاریکیشبوو، هەموو کەسێ بە پەلە، بۆ ماڵەکانی خۆیان گەڕانەوە، دەرگەی ماڵەکانیان توند داخست و چاوەڕێی چارەنووسێکی نادیاریان دەکرد!

ئەو شەوە، هێزێکی زۆری پۆلیس، لە شارۆچکەکەدا بڵاوبووبوونەوە. زۆربەی شوێنە گرنگەکانیان گرتبوو، خۆیان ماتکردبوو، چاوەڕێی شەڕەخۆرەکانی (ئێران)یان دەکرد. خەڵکی زۆر دەترسان، چونکە وەك باسیاندەکرد، پێشتر شتی وا ڕوویدابوو. لەبەرئەوە باوەڕناکەم، ئەو شەوە تا درەنگانێ، کەس خەو لە چاوانی کەوتبێ. کەچی بەیانی هەستاین، هیچ ڕووی نەدابوو، ئیدی وردەوردە، خەڵك هێواشبوونەوە. ▪ ئێستەش کەس

نەیزانی، ئەو هەواڵە چی بوو؟ کێ بڵاویکردەوە؟ بەڵام زیاتر لە ئەوە دەچوو، دەزگەکانی (ساواک)ی سەر بە شای (ئێران) بڵاویانکردبێتەوە، بۆ ئەوەی ئاژاوەبنێنەوە، خەڵك بترسێنن و ئائارامی بنافرێنن. چونکە وەك باسیاندەکرد، لە (پێنجوێن) بەکرێگیراوی (ئێران)ی زۆر تێدابوو، بە تایبەتی دوای کۆدەتاکەی ساڵی (1958)، دەوڵەتی شاهینشایی (ئێران)، بە هەموو شێوەیە هەوڵیدەدا، لە ناوچەکانی سەرسنووری، خەڵك بکڕێ و بنکەی سیخوڕی دامەزرێنێ. ئەو کاتەش ڕادیۆی (ئێران)، هەموو ئێوارەیە، هێرشێکی زۆر توندی، بۆ سەر (عێراق) دەکرد و هێندێ دەرەبەگی کوردیش (شێخ جەلالی حەفید) و (داودبەگی جاف)، دژی یاسای چاککردنی زەوی بوون، لەبەرئەوە ڕایانکردبوو و پەنایان بۆ (ئێران) بردبوو!

**برایەکی دیکەی ( پێنجوێنی )**

ڕۆژی (26. 06. 1961)، خوای گەورە جارێکی دیکە، بارانی سۆزی پڕ لە خۆشەویستی خۆی، بەسەر خێزانەکەماندا باران، کوڕێکی جوانی پێ بەخشین. ئەوە دوو برا، لە ئەم بەهەشتەی سەرزەمینەدا لەدایکبووین، ئاخر جگە لە ئەوەی براین، بووین بە هاوزێد و تەنیا جیاوازییەکیشمان هەبێ، لە ڕۆژ و مانگ و ساڵی لەدایکبوونەکەماندا دایە!
بەڵام ئەم جارەیان، باوکم پرسی بە باوکی نەکرد، تا ناوێکی گونجاو بۆ کۆرپەساوا جگەرگۆشەکەی بدۆزێتەوە، بەڵکوو بە خۆشی سەرۆك (بارزانی)ەوە، ناوی نا (بارزان). بەس نەبوو، ئەم برا جوانەم، باپیرم ناوی نەنا، ئەگینا لەبری ئەو ناوە کوردییە خۆشە، ناوێکی عەرەبی ناخۆشی وەك (ئەباعوبێدە، زوبێر، تەڵحە، وەقاص، خالید، عەبباس، عوسمان، عەبدولڕەحمان ...)ی بۆ دەدۆزییەوە، بۆتاقەتایە پێوەی دەلکا و لێی نەدەبووەوە!
ئاخر ئێمەی کورد، ماوەی پتر لە (70) ساڵ دەبێ، هەوڵێکی زۆرمان داوە، منداڵەکانمان ناوی کوردییان لێ بنێین، کەچی وا تازە پارتە ئیسلامییە ڕامیارییەکانی (کوردستان) دەیانەوێ، نەك هەر منداڵی کورد، بە ناوی عەرەبییەوە ناوبنێن، بەڵکوو جارێکی دیکە، ناوە کوردییەکانیش بگۆڕن و بیکەنەوە بە عەرەبی، وەك ئەوەی کوردی زمان نەبێ، کورد نەتەوە نەبێ و خوا دروستی نەکردبێ، وا ناوی سەرکردەی ئەو عەرەبە پاپەتی و داگیرکەرانەیان لێ دەنێن!! ئاخر گەر ئەوە سەرلێشێواوی و بیانییەرستی نەبێ، چی دیکە دەگەیەنێ، وا بە ناوی ئایینەوە خەریکن، هەموو شتێکی کوردی بسڕنەوە؟!!

**دڵداری جاران و یەکەمین خورپەی دڵ!**

لە ئەم خانووە و گەڕەکە نوێیەماندا، دراوسێیەکمان هەبوو، دیوارێکی نزممان نێوان بوو. خەڵکی (زاخۆ) بوو، ناوی (موحەممەد)ە فەندی بوو، لە فەرمانگەی قایمقامیەت کاری دەکرد. کچێکی تا بڵێی شۆخوشەنگی هەبوو، ناوی (حەلیمە) بوو. بەڵام (حەلیمە)، هەر بۆ خۆی (حەلیم) بوو، جوانێ بوو، لە (پێنتجوێن)دا وێنەی نەبوو!

لەگەڵ ئەوەشدا، بە ئەو منداڵییە، زۆر لەسەرخۆ، هێمن و ژیر بوو. باڵای رێك و باریك و کەڵەگەت، دەتگوت: لاولاوە و بە سووڕەچناردا هەڵچووە. نێوقەد و کەمەری تەنگ بوو، هەر لە شووشەی (بیبسیکۆلا) دەچوو! تازە مەمکی خڕکردبوو، وەك جووتێ هەڵوژەی کاڵ، لەسەر سنگی خۆیان ماتکردبوو و جێی خۆیان گرتبوو. کوڵمەکانی قەڵەو و ئاڵ هەڵگەڕا بوون، گوێچکەکانی هێندە پچووك، سپی و رێکوپێکبوون، دەتگوت: لە نایلۆن دروستکراون. لووتێکی قنج و چکۆلانەی هەبوو، بە ئاستەم دیاربوو. دەمێکی چکۆلانەی نووقوڵی پێوەبوو، دوو لێوی تەنك و شیرینی لەسەریەك دانابوو، کە پێدەکەنی، ریزێ ددانی رێکی وردە مرواری سپی، لە دوورەوە دەبریسکانەوە. پێستی سوور و سپی بوو. قژی زەرد و درێژ، تا سەر نێوقەدی هاتبوو. جووتێ چاوی شینی ئاسمانی پێوەبوو، کە چاوی بەرزدەکردەوە و نیگایدەکرد، نیگای هێندە شیرینبوو، هێزی ئەژنۆی دەشکاندا! قەڵەمی ڕووخساری زۆر ڕێك و جوان بوو. جوانییەکەی بە شێوەیە بوو، ڕەنگە گەر بڵێم: بە سەدساڵ جارێ، کیژە کوردێکی دیکەی لە ئەو شێوەیە، لە (کوردستان) لەدایکدەبێ، یا گەر بڵێم: وێنەکێشێکی وەك (داڤنشی)ش ناتوانێ، بە تەواوی، وێنەی هەموو ئەو ئەندامە ناسك و جوانانەی بکێشێ، زیادەڕۆییم نەکردبێ! بە ڕاستی جوانێبوو، کەم وێنە بوو، تا ئەو کاتە، شۆخی وام نەدیبوو! هەر لە یەکەمین نیگاوە شێتوشەیدایبووم و زۆرم خۆشویست. بەڵام خۆشەویستییەکی ساکاری پڕ لە هەستی خاوێنی منداڵی، بە جوانترین پەلکەڕەنگینەی ڕەوشت ڕازابووەوە!

هەیوانەکەی ماڵی ئێمە زۆر بەرزبوو، بەسەر حەوشە و سەکۆ بەرزەکەی ئەواندا دەیڕوانی، هەموو جارێ لە هەیوان ڕادەوەستام، ئەوم لە حەوشەوە دەبینی. تازە گوێزابووینەوە، چاوم پێی کەوت، زۆر حەزمدەکرد، قسەی لەگەڵ بکەم و ببین بە هاوڕێ. جگە لە ئەوەی، ئەو کەمێ بە تەمەن لە من گەورەتربوو، تا لە ئەو ناوە دراوسێش بووین، هاتوچۆمان نەبوو. باوکی پێی نەدەخوێند و هەر لە ماڵەوە بوو، منداڵی بەخێودەکرد و ئیشی نێوماڵی بۆ دایکی ڕادەپەڕاند. ئیدی وردەوردە، سەرەتای نیگا و چاوبڕکێیەکی پڕ لە شەرمانەمان

دامەزراند، دەمبینی، کاتێ من تەماشامدەکرد، خۆی نەدەشاردەوە، ڕووی گرژ نەدەکرد، جاروباریش، بە خەندەیەکی شیرین وەڵامیدەدامەوە، بە تیری نیگای چاوەکانیشی، هێندەی دیکە، دڵەی ساوامی دەپێکا!

هەموو ڕۆژێ، لەژێر سێبەری درەختێ، سەر سەکۆکەی نێو حەوشەکەیان، لەسەر کورسییەک دادەنیشت، خوشکە چکۆلانەکەی لەباوەشدەگرت و ژیریدەکرد. زۆر بە دەگمەن نەبێ، دایکی یا باوکیم نەدەدی. زۆر ماڵێکی بێ دەنگ و لەسەرخۆبوون. ئەو کاتانەی لە ماڵەوە بووم، هەوڵمدەدا، چاوم پێی بکەوێ. گەر دیار نەبووایە و لە ژوورەوە بووایە، هۆنراوەی فۆلکلۆریم دەخوێندەوە و دەنگم لێ بەرزدەکردەوە، هێندێ جاریش گۆرانیم دەگوت و دەنگم لێ هەڵدەبڕی، تا گوێی لێ دەبوو، هەمووی دوای چەن خولەکێ پەیدادەبوو، تەماشایەکیدەکردم و پێدەکەنی. گەر ئیشێکی هەبووایە، دەڕۆی، گەر هیچ کارێکیشی نەبووایە، ئەوا بە منداڵە پچووکەکەوە، لە شوێنی خۆی دادەنیشت و گوێی لێ دەگرتم. من لە ئەم دیو و ئەویش لە ئەو دیوەوە، هەر تەماشای یەکدیمان دەکرد، بێ ئەوەی هیچ قسەیەکبکەین، یا بە زمانی جەستە بدوێین، یا ئەنجامێکی هەبێ. ئاخر قسەی چی بکەین، ئەی ئەو نیگا جوانانەی دەیکرد، هەموو شتێکی نەدەگووت؟! ئەی ئەو زەردەخەنە شیرینەی سەر لێوەکانی، وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دڵەی هەتیومی نەدەدایەوە؟! دەی سا خوا چی بکەم، درەختی ئەم چاوبڕکێ و نیگاگۆڕینەوەیە، کەی بەردەگری؟! تا کەی بەردەوامدەبێ؟! جا خۆ گەر ئەو چاوبڕکێ و نیگاگۆڕینەوەیەشم لێ بڕایە، وەک (فەرهاد)ی کێوکەنم لێ دەهات!

ئیدی چی دیکە خۆم بۆ نەگیرا، بڕیارمدا، قسەی لەگەڵ بکەم. بەڵام هەرچەند دەمبینی، هەموو گیانم دەلەرزی و شەرمم لێ دەکرد. تا ڕۆژێکیان بەسەر ئاماژەم بۆ کرد و تێم گەیاند، بێتەدەرەوە. چوومە بەردەرگە و ئەویش دوای ماوەیە هات. کاتێ بۆ یەکەمین جار، لە نزیکەوە بینیم، هەموو ئەندامەکانی جەستەم، موچڕکی پێدا دەهات: لە خۆشیاندا خەریکبوو، لەرزملێبێ، چۆقەی ددانم دەسپێکا، دڵە ساواکەشم، وەک بەرپێنی چۆلەکە لێیدەدا! بەڵام کەمێ تەماشای یەکدیمان کرد، ئیدی بێ ئەوەی سڵاویش لە یەکدی بکەین، من خێرا پاشەوپاش گەڕامەوە و بەجێمهێشت. لە هەیوانەکە چاوەڕێمدەکرد، ئەویش هاتە وەژوورەوە و تەماشایەکیکردم، تێر پێکەنی! لە دڵی خۆمدا گوتم: ئێستە دەڵێ: هەی فشەکەری ترسنۆک!

ڕۆژێکی دیکە لە قوتابخانە گەڕامەوە، تەماشامدەکەم، لەسەر سەربانی ژووری نوێنگەکەی باوکم دانیشتووە، کە دیوارەکەی بە ماڵی ئەوانەوە نووسابوو، لە دیوی ئەوانەوە سەربانەکە زۆر نزمبوو. دایکیشی هەر لە ئەو دیوەوە ڕاوەستابوو، لەگەڵ دایکم و (شەونم)ی

خوشکەمدا قسەیانئەکرد. کاتێ ئەو دیمەن و گۆڕانکارییە گەورەیەم بینی، واقموڕما و زۆر شڵەژام، تەنانەت ڕووم نەهات، سڵاویشیان لێ بکەم. ئیدی دوای ماوەیە چووەخوارەوە و لەسەر سەکۆکەی ماڵی خۆیانەوە، هەر بزەی دەهات، منیش زۆر دڵم بە ئەو پێوەندییە نوێیەی هەردوولا خۆشبوو، هەر ئەو بزە شیرینەی ئەویش بوو، ئارامی بە گیانی شەکەتم دەبەخشی!

ڕۆژێ لە بازاڕ هاتمەوە، بینیم، لەسەر سەکۆکەی حەوشەی خۆیان بە تەنیا وەستاوە. لە ئەوە دەچوو، دایکی لە ماڵ نەبێ، چونکە خۆی گۆڕیبوو، هەر لە بووکەخان و پەری بەهەشت دەچوو! منیش پێم بە جەرگی خۆمدا نا و بە دەس سڵاوێکم لێ کرد. ئەویش بە سەر و بە دەم زەردەخەنەیەکی ئەفسووناوییەوە وەڵامیدامەوە، دەتگوت: هەردووکمان کەڕ و لاڵین، وا قسەناکەین و هەر بە زمانی جەستە، یەکدی دەدوێنین!

ئاخر، ئەوە نیشانەی دڵداری ڕاستەقینە و سەرداسەرییەکی خاوێنە، کە مێژی بەمێژی موگناتیزی خۆشەویستیی، دوو دڵ بۆ لای یەکدی ڕادەکێشێ! ئیدی ڕەوە کۆتری سرکی دڵ و گیانم، بە جارێ بۆ لای ئەو هەڵفڕی و لە هێلانەی خۆشەویستی ئەودا، بە تەواوی نیشتەوە و ئۆقرەیگرت، هەستی کپکراوی دەروونی کەیلم بوژایەوە، گرێی دەم و زمانم کرایەوە، زمانم پژا و وەک تالگە، قسە لە گەرووی زارمەوە هەڵدەڕژا. هێزم وەبەر خۆم نا و بۆ یەکەمین جار، بە دەم سڵاوم لێ کرد، ئەویش بە ئامێری ساتوسەمتووری زار و دەنگە ناسکەکەی خۆی وەڵامیدامەوە.

هەرچەندە دەمانزانی، ناومان چییە، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ قسەیەکم بۆ نەدەهات، لێم پرسی: ناوت چییە؟ ئەویش پێکەنی و گوتی، بۆ نازانی، (حەلیمە)م ناوە؟! گوتم: منیش ناوم (حوسێن)ە. گوتی: دەزانم. پاشان پرسیاری قوتابخانەی لێ کردم و هێندێ قسەی دیکەشمان کرد. گوتی: دەنگت خۆشە، بەڵام زۆر لە گۆرانییەکان تێ ناگەم.

دواتر وامان لێهات، هەر هەلێکمان بۆ هەڵکەوتایە، زۆربەی کات پێکەوە قسەمانئەکرد، کەسوکاری هەردوولاشمان پێیانئزانی، بەڵام وەک دوو منداڵی دراوسێ لێیان دەڕوانین، سووریش دەیانزانی، تەنیا پێوەندییەکی هاوسێیەتی نەبێ، هیچ شتێکی دیکەمان، لە نێوانندا نییە. لەبەرئەوە هیچ قسەیان نەکرد.

ئیدی گەر ڕۆژێ دیار نەبووایە، گۆڤاری (ڕۆژی نوێ)کەم دەکردەوە، بە دەنگێکی بەرز و بە ئاوازێکی فۆلکلۆری خۆش دەمخوێندەوە، ئەویش وەک کۆترەبارێکە، بە لاروولەنجە و نازێکی شەرمنانەوە دەردەکەوت و بەرانبەرم دەوەستا!

بەڵام داخەکەم، ئەم چاوبڕکێ خۆشە و ئەم دڵدارییە بێگەردەی نێوانمان، زۆری نەخایاند، لە ئەو خەوە خۆشەی بەهەشتی ئەڤین و دڵداری ڕاپانچڵەکاندم، منیان لە (حەلیمە) کرد و ئەویشیان تا مردن لە من کرد! چونکە سیخوڕەکانی دەزگەی دەوڵەت، ڕاپۆرتێکیان لەسەر باوکم نووسیبوو، بانگیانکرد و پێیان گوتبوو: تۆ فەرمانبەری میریت، یا کادیری (پارتی)ت، شەو و ڕۆژ جرتوفرتتدێ و چالاکی دەنوێنی، بە ئەم زووانە فرمانی گواستنەوەکەت دەگا، لەبەرئەوە دەبێ، لە ماوەی مانگێکدا (پێنجوێن) بەجێبێڵی، ماڵەکەت بارکەی و بڕۆی!

هەرچەندە ئەو کاتە، گرفتی ئامۆیی و دووڕە کەسوکارم نەمابوو، هاوڕێیەکی زۆرم هەبوو، وردەوردە بیر وهۆشم دەکرایەوە، ڕۆژبەڕۆژیش، پتر لەگەڵ شارۆچکەی (پێنجوێن) و خەڵکەکەیدا ڕادەهاتم، بە تایبەتی ئەوەتەی (حەلیمە)م دیبوو، ناسیبووم و لە یەکدی ئاشکرابووین، ئەڵقەی پێوەندی خۆشەویستییەکی خاوێنم لەگەڵ گرێدابوو، بێ ئەوەی ئەو ڕازە بۆ یەکدی بدرکێنین، نەک هەر (حەلیمە)، بەڵکوو بەهۆی ئەویشەوە، هەموو خەڵکی (پێنجوێن) و (ژاخۆ)شم خۆشدەویست! حەزمدەکرد، بە هیچ شێوەیە نەڕۆین، بەڵام کاتێ باوکم، مانگی هەشتی ساڵی (1961)، بۆ (سولەیمانی) گوێزرایەوە، ئیدی بە ئەو شێوەیە، کۆتایی بە ئەو فیلمە ڕۆمانسییە خۆشە هات، پەردەی تراژیدیایەکی خەمناک، سەراپای ئاوڕێوی دڵ و گیانمی داپۆشی، تەنیا بیری (حەلیمە)ش نەبێ، بیری هیچ شتێکی دیکەم نەما!

بەڵێ، بە ئەو شێوە دڵتەزێنە، زێدەکەم بە هەموو خێر و خۆشییەکییەوە، بە هەموو سەیرانگە و باخەکانییەوە، بە هەموو دارودرەخت و گوڵەکانییەوە، بە هەموو شیو و دۆڵەکانییەوە، بە هەموو کێو و چیاکانییەوە، بە هەموو کانیی و چەمەکانییەوە، بە هەموو خزم و دۆستەکانمانەوە، بە هەردوو ڕۆژنامەی (خەبات) و (کوردستان)ەوە، بە هەردوو لیژنەی ناوچەی (پارتی) و (قوتابیان)ەوە، بە قوتابخانەکەم و هاوڕێی پۆلەکانمەوە، بە خانووە خنجیلانەکەمانەوە، بە (حەلیمە)ی پەری ئاسای دڵ و گیانمەوە بەجێهێشت!

ئەو ڕۆژەی لۆری لەبەردەرگە ئامادەبوو، ماڵمان بارئەکرد، بۆ دوا جار من لە هەیوان و ئەویش لە سەر سەکۆکە وەستابووین، بە دووچاوی پڕ لە فرمێسکەوە، ماڵاواییمان لە یەکدی دەکرد. چووینە بەردەرگە، ژنانی گەڕەک کۆبووبوونەوە، خواحافیزیان لە دایکم دەکرد، (حەلیمە) و دایکیشی، لە نێو بەرێکاراندا بوون. بۆ دوا جار (حەلیمە)م لە بەردەرگە بینی و بۆ یەکەمین جاریش لە نزیکەوە، زمانی پڕا و بە خوای سپاردم. کاتێ سواری لۆرییەکەش بووم، هەر دەستی ڕادەوەشاند و ماڵاوایی لێ دەکردم!

سەیر ئەوەبوو، کەس ئاگای لە ئەم دڵبڕی و ماڵاواییەی خۆرپەی، دڵی ئەم دوو دڵدارە منداڵە نەبوو، تەنیا دووریەدوور تەماشای یەکدیمان دەکرد، لە دڵی خۆماندا دەکوڵاین و پێمان لە یەکدی دەکردەوە! ئاخر ماوەی ساڵ و نیوێ، لە ئەو ماڵەدا بووین، لەگەڵ (حەلیمە)دا، لە دوورەوە یەکدیمان خۆشدەویست، بێ ئەوەی باسیبکەین، تەنیا هەر ئەندامەکانی جەستەمان، گەواهی ئەو خۆشەویستییەمان بۆ دەدەن. چونکە چاومان لە چاوی یەکدی دەبڕی، بە دەس سڵاومان لە یەکدی دەکرد، بە بزەی شیرین و خەندەی سەر لێویش، لە یەکدی دەگەیشتین، بەڵام زمانمان بەسرابوو، بەشداری لە خۆشەویستییە خاوێنەکەماندا نەدەکرد!

بە داخەوە، جارێکی دیکە (حەلیمە)م نەدییەوە، نەمزانی، چی بەسەرهات؟ تۆ بڵێی ئەوە یەکەمین بەردی بناغەی، هەستی خاوێن و خۆشەویستییەکی پێگەردی، سەردەمی منداڵیم بووبێ؟! ئەدی گەر وا نەبووبێ، بۆچی تا ئێستەش، نەک هەر مانگی ڕوخساری شیرینی خۆی، بەڵکوو بستەبستی ئەو شوێنانەی حەوشە و سەرسەکۆکەشیانم، بیر نەچووەتەوە! تۆ بڵێی، گەر دەسی پلاری ڕۆژگار، ئەو دوو دڵەی لە یەکدی نەکردایە، دۆستایەتیمان هەر بەردەوامبووایە، خۆشەویستییەکەمان گڕی لە شار و لادێ بەردایە، لە ئاهەنگێکی شادیدا پێکبگەیشتینایە؟! تەنیا هەر ئەو کاتەش، هەموو گرێکوێرەکانی چانسی نووستوو و خەواڵوم بکردایەتەوە، گیانی ماندوو و شەکەتم، لە هێلانەی دڵە چکۆلانە خاوێنەکەیدا ئۆقرەیبگرتایە، لە پێشکەی خۆشەویستی ڕاستەقینەی پڕ هەست و بەسۆزی ئەو پەریزادەیەدا، هەموو هیوا و ئاواتەکانم ڕازەنایە؟! تۆ بڵێی ... تۆ بڵێی ... تۆ بڵێی ... (داری بەزەیی خوا) بەربیگرتایە، (ئەو دوو دڵە ببوونایە بە هاوڕێ و هاوسەر)، ئاخ (حەلیمە)کەم! ئاخۆ دەبێ ئێستە لە کوێ بێ؟! ئاخۆ ماوی یا نەماوی؟! گەر بە فیلمی ژیانی ڕابووردوو و بیرەوەرییەکانی سەردەمی منداڵیدا بچیتەوە، ئاخۆ منت لەبیرماوە، یا وێنەی منی تێدا سڕاوەتەوە؟!!

ئاخ هەموو شتێ کۆتاییهات، (حەلیمە)م لەکیسچوو، ژیانم لێ تاڵبوو، هیچم بۆ دەرنەچوو، جگە لە ئەوەی دەبووایە، منیش ماڵە ختجیلانەکەی خۆشەویستیم کۆکردایەتەوە، لاپەڕە زێڕینەکانی بیرەوەری و یادگارە خۆشەکانی، ڕۆژانی ژیانی خۆشەویستم بپێچایەتەوە، لەگەڵ خۆمدا بیانبەم و تولەتوند لە ئامێزیانبگرم، تێنییەکانی ئەو نەهێنە جوانە بێگەردە، لە نێو توێکاشی دڵ و قووڵایی دەروونمدا حەشاربدەم، بە دەم هەنسکی گریان و هەناسەی ساردیشەوە، (پێنجوێن) بەجێبێڵم! ئای چەن خۆشە، شنەبای هەناسەی ساردی بیرەوەرییەکانم، کڵوکۆی پشکۆی فرمێسکی گەرمی، دڵەی بە ئاکام نەگەیشتووم دامرکێنێتەوە!

ئاخر، جگە لە هەست و هۆشی گرگرتووی خۆم، دەبێ کەسی دیکە، ئاگای لە دەردی دڵە چکۆلانە هەتیوە کۆستکەوتووکەم بووبێ! ئاخر کەس نەیدەزانی، هەربۆ جۆگەی فرمێسکە گەرمەکانم، لە کام سەرچاوەی خەمەوە هەڵدەقوڵێن، بەرەو کام زەریای بێ بنی بێ (حەلیمەیی) دەکشێن و کەی کۆتاییاندێ! کەسێ نەبوو، پێم بڵێ، ئەم خەمە گەورەیە، چۆن لەبیردەچێتەوە و ئەو برینە سەختەش، کەی سارێژدەبێ؟!

بەلێ، ئەوە یەکەمین خوریە و خەتووکەی دڵە ساواکەم بوو، هەستێکی خاوێنی پڕ لە خۆشەویستی ڕاستەقینە بوو، لە منالدانی ناخمدا خۆی مالکردبوو، بەلام لەبارچوو، بە مرتووویی لەدایکبوو، هەر زوو تاسا و بە ئاتومێدییش سەرینایەوە!

**دوا هەواری ژیانم**

چەن کاژێرێ بەڕێوەبووین، پاشان گەیشتین. پیرەلۆری، لەبەردەم دەروازەیەکی کورتەبالای کۆنی تەختەدا ئیستۆپیکرد و وەستا. ئەوە لە ژیانی خێزانەکەماندا سێیەمین جاربوو، لە گەڕەکی (شێخان)، خانوو بە کرێبگرین و بژین.

ئەم هەوارە نوێیەمان، هەمووی (150) مەتر، لەسەرووی ماڵی (جەمالی عەلی باپیر)ەوە بوو. دیارە نەخشەی شارەکەمان، بە ئەو شێوەیە کێشراوە، گەڕەکێ لە گەڕەکێکی دیکە، بە کۆڵان و جادە لە یەکدی جیاکرێنەوە. هەرچەندە کۆڵانەکەمان، زۆر پانوپۆڕ نەبوو، بەلام ماڵەکانی ئەوبەرمان، لەسەر گەڕەکی (کانیسکان) بوون، هەمووشی سێ مەتر لە ئێمەوە دووربوون، کەچی ڕیزە ماڵەکانی ئێمە، سەر بە گەڕەکی (مەڵکەندی) بوون!

لە ئەم خانووە گەورە و نوێیەماندا، جگە لە ئێمە، دوو خێزانی دیکەشی تێدا دەژیان. بەلام خانووەکە وا دروستکرابوو، هەر سێ بەشەکە سەربەخۆبوون، خێزانەکان هیچیان ئاگایان لە هیچیان نەبوو. خاوەن ماڵەکە، تەنیا دایک و کچێ بوون، دایکەکە ناوی (ئامە)خان و کچەکەش (سوعاد)ی ناوبوو. لە ئەو خانووە گەورەیەدا، تەنیا تاکە ژوورێك و هەیوانێکیان، لە تەنیشت دەرگەی حەوشەوە بەرکەوتبوو!

ژن و پیاوێکی دیکەش، لە ژوور و هەیوانێکی تەنیشت ئێمەوە دەژیان. پیاوەکە نەوت فرۆشبوو، ڕیوەڵەیەکی چکۆلانەی چاوپڕپڕوشاوی بوو، (شێخەی نەوتفرۆش)یان پێ دەگوت. هەر ئێوارەی ئێدەهات، مەزەی دەڕازاندەوە، گۆشتی دەبرژاند و بۆنەکەی، بە حەوشەکەدا بلاودەبووەوە، تا درەنگانێکیش دەیخواردەوە. ژنێکی سپیکەلانەی چاو سەوزی جوانی بەخۆ و کەلەگەتیشی هەبوو، ناوی (دولبەر) بوو، زۆر لەسەرخۆ و هێمن و

بێدەنگ بوو، منداڵیشی نەدەبوو. خەڵکی دەیانگوت: مێشکی تەواو نییە، بۆیە شووی بە ئەو کەچەپیاوە کردووە! پیاوەکەش، سەرەڕای ئەوەی دڵی لێی پیسبوو، هەموو شەوێ بە سەرخۆشی، چیتێکی دەکوتا، کەسیش نەیدەزانی، بۆ لێیدەدا!

ئێمەش لە سێ ژوور و هەیوانێکی گەورەدا بووین، بەرەمبەر یەکێ لە ژوورەکانیش، باخێکی گەورەی ڕازاوە و حەوزوفوارەیەکی گەورەی خڕ بوو. هەر چواردەوری باخەکەش، بە دارسنەوبەر گیرابوو. بەیانیان لەبەر جریوەجریوی چۆلەکە، زوو خەبەرمانەبووەوە.

هەموومان خانووەکەمان بەدڵبوو، لەگەڵ دوو خێزانەکەی دیکەشدا، هیچ گرفتێکمان نەبوو. بەڵام گەورەترین کێشەمان ئەوەبوو، خانووەکە گەرماوی تێدا نەبوو، دەبووایە، هەموو جارێ، خۆمان لە گەرماوی دەرەوە بشتایە. جگە لە ئەوەی، یەك ئاودەستی بچووکیشی تێدابوو، لە تەنیشت دەرگەی حەوشەوەبوو، هەمیشە دەبووایە، سەرەمان بۆ بگرتایە، بە تایبەتی بەیانیان زۆر خراپبوو، بەرتەنەکەوت!

هێندە بەسەر گەڕانەوەماندا تێپەڕنەبووبوو، پورە (رەحمە) لە (پێنجوێن)ەوە هات و سەری لێ داین. هەر کە چاوم پێی کەوت، یەکسەر بردیم کولایەوە و (حەلیمە)م بیرکەوتەوە. هەرچەندە بۆ ساتێکیش چییە، لەبیرم نەکردبوو! باوەشپێداکردم و تێرتێر ماچیکردم. ماوەیەکی زۆر لامان مایەوە، شەوانە بە قسەی خۆش و پێکەنین، ڕامانەبوارد و خەوی لێ دەخستین!

**کوڕانی گەڕەك و هاوڕێ کۆنەکانم**

لە کۆڵانەکەدا، سەرەتا جگە لە دوکتۆر (تەیب شێخ ئەحمەد باراوی) و (تایەر)ی برا بچووکی و ئامۆزاکانی (عەلی و لەتیفی شێخ عومەر باراوی)، کەسی دیکەم نەدەناسی. هەرچەندە خزمی نزیکمبوون، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا زۆر تێکەڵاونەبووین. بەڵام دوای ماوەیە، هاوڕێیەکی زۆرم پەیداکرد، لە هەموویان نزیکتر کوڕێ بوو، ناوی (جەبار جەوهەر باڵوڵ شەمخاڵ) بوو، باوکی پۆلیس بوو، خوشکێکی چکۆلە (مینا) و دایکێکی دەموچاو شلەوێلە و خاڵخاڵاوی زەبەلاحی هەبوو. ئیدی لە گۆڕەکەی دارەقیتەلە بێ کەستربووین!

ئەوانیش تازە هاتبوونە ئەو گەڕەکە و خەڵکی (سولەیمانی) نەبوون، کەس نەیدەزانی، لە کوێوە هاتبوون، هەر لە گەرمیانی دەچوون. تەنیا ماڵێکیشمان نێوان بوو. یەکدیمان زۆر خۆشدەویست، هەمیشە چ لە دەرەوە و چ لە قوتابخانەش، هەر پێکەوە بووین.

لە خوار خۆشمانەوە، دۆستایەتیم لەگەڵ دوکتۆر (لاوچاکی شێخ قادری حەفید) و ئامۆزاکەی لیوا (مەنسووری شێخ کەریمی حەفید)دا هەبوو. زۆربەی کات خەریکی هەڵماتێن و تۆپتۆپێن بووین.

لە ئەم ماڵە نوێیەدا، هەردوو ماڵە کۆنەکەی سەردەمی منداڵیم لێوە نزیکبوو. ڕۆژانە هەموو هاوڕێ کۆنەکانم دەبینی. بە هۆی ماڵی باپیریشمەوە، جارجارێ هاوڕێ کۆنەکانی ئەوێشم بەسەردەکردنەوە. جگە لە ئەوەی هەموو پێکیشەوە، لە یەك قوتابخانە دەمانخوێند!

هەروەها جارێکی دیکەش، لەگەڵ کوڕانی کۆڵانی ماڵی (جەلال کابان)دا یەکمانگرتەوە، ئەوانەی پتر هاتوچۆمدەکردن، (فەرەیدوون و فەرهادی عیززەت کابان، ئەکرەم و ئەدهەمی سەیید مەجید) بوون. هەمیشە سەربانە و سەربان دەڕۆیشتین، لە ئەم سەربانەوە بۆ ئەو سەربان، خۆمان هەڵدەدا و بازبازێنەمانەدەکرد.

هەر بەرەوخواریش بووماینەتەوە، هێندێ جار سەرم لە باجی (عاسم) دەدا، بەڵام ڕێککەوتی کاکە (جەمال)ی کوڕیم نەدەکرد، کاتێ هەواڵیشم دەپرسی، دایکی دەیگوت: لە ماڵ نییە و کۆچیکردووە. ئیدی جارێکی دیکەش، هەموو ئەو کۆڵان و گەڕەکە ئاشنا خۆشەویستانە، لای من تێکەڵاوبوونەوە.

**دۆستایەتی ڕاستەقینە**

دوای ماوەیەکی کەم، لەگەڵ (ئامە)خان و (سوعاد)ی کچیدا، بە شێوەیە تێکەڵاوبووین، بێ یەکدی هەڵمان نەدەکرد و یەکدیمان زۆر خۆشدەویست. من (سوعاد)م هەر بە (باجی) بانگ دەکرد. لەبەرئەوەی بە تەنیابوون، دنیاش زۆر ناخۆشبوو، دەترسان، زۆربەی شەو لای ئەوان دەنووستم.

ئەو کاتە (سوعاد)، لە خانەی مامۆستایان دەیخوێند، بە هەر لایەکیشدا بڕۆشتایە، منی لەگەڵ خۆی دەبرد. کچێکی هاوڕێی هەبوو، ناوی (پەروین) بوو، بە (پەرەڕەش) ناوی ڕۆشتبوو، خوشکی (قالەڕەشی) گۆڵچی هەڵبژاردەی (سولەیمانی) بوو. گەلێ جار، (سوعاد) و (پەرەڕەش) دەچوون بۆ سینەما، ئەو سەردەمەش باوی فیلمی هیندی بوو، منیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد.

(سوعاد) و (قالەڕەش)، دڵیان بە یەکەوە بوو، چەن جارێکیش داوایکردبوو، بەڵام چارەنووسیان لە چارەنووسی (شیرین) و (فەرهاد) ڕەشتربوو! چونکە (سوعاد) لە باوکەوە، برایەکی گەورەی هەبوو، ناوی (عەبدولڕەحمان) بوو، بە هیچ شێوەیە قایل نەدەبوو، هەرچەندە لە (ڕانیە) فەرمانبەربوو، لێیانەوە دووربوو، کەچی هەمیشە ئاگای لێیان بوو، خانووەکەش هەر هی ئەوبوو، دەسەڵاتی تەرەقووشێکی بەسەریاندا هەبوو، زۆر لەگەڵیان خراپبوو، پیاوێکی پولەکی و دواکەوتوو بوو، تەنانەت دەیگوت: ئەو کەسەی داوای خوشکی من بکا، پێشەکی دەبێ، من داوا لە خوشکەکەی بکەم، ئینجا بەدیەمێ!

هەرچەندە ئەم پیاوە زۆر توورە و خراپبوو، بەڵام خوا هەڵناگرێ خاتوو (فاتمە)ی هاوسەری و منداڵەکانی (فەرید، فازیل و فریاد)، یەك لە یەكدی باشتربوون. ئەو کاتە، ئەو ماڵەم نەدەناسی، بەڵام جاروبار لە (ڕانی)یەوە، بە سەردان دەهاتنەوە، لەگەڵ کوڕەکاندا ئاشنایەتیم پەیداکرد، هێندێ جار لەگەڵیان دەچووم بۆ گوندی (قلیاسان)، چونکە ماڵی کەسایەتی ناسراوی گوندەکە کاك (حەمەعەلی) خزمیان، لە ئەوێ بوو، مەلەمان دەکرد و یاریماندەکرد، دۆی سارەمان دەخواردەوە، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەردەبرد و پاشان دەگەڕاینەوە!

کاتێ لە (پێنجوێن) گەڕاینەوە، (بارزان)ی برام تەمەنی سێ چوار مانگێ دەبوو. منداڵێکی زۆر جوانبوو، کەم کەس هەبوو، بە لایدا تێپەڕێ، ئاوڕی لێ نەداتەوە، بە زەردەخەنەیەکی شیرین بەسەری نەکاتەوە و سەرسامی خۆی دەرنەبڕێ!

(بارزان)، هەمیشە لای (سوعاد) بوو، زۆری خۆشدەویست. هەر لە خوێندنەکەی دەهاتەوە، جلەکانی دەگۆڕی، یەکسەر دەهات و (بارزان)ی دەبردە لای خۆی. جارێکیان چووین بۆ سینەما، فیلمێکی هیندی نیشیدەکرد، کچێکی منداڵ قورتکێکی چکۆلانەی تووکنی ڕەشوسپی زۆر جوانی هەبوو، ناوی (چێرۆ) بوو. ئیدی باجی (بارزان)ی هەر بە (چێرۆ) بانگدەکرد. ئەویش وا هۆگری بووبوو، هەر چاومان لێ نەبووایە، بەرەو ژوورەکەی (سوعاد)، لەسەر چوارپەل بە خێرایی دەڕۆی! لە ئەم دواییانەدا هەواڵی (باجی)م زانی، تا ئێستە ماوە، بەڵام بە داخەوە، ئاگای لە خۆی نییە و لەسەر جێ کەوتووە!

### قوتابخانەی سەرەتایی کانیسکان

باوکم لە نەخۆشخانەی سەرەوە دامەزرابوو، منیش لە مانگی نۆی (1961)ەوە، لە پۆلی پێنجی قوتابخانەی سەرەتایی (کانیسکان) وەرگیرام. قوتابخانەکەمان لە سەر جادەی بازارە چکۆلە بوو، لە ماڵی خۆمانەوە زۆر دوور نەبوو، هەر لە پشت قوتابخانەکەمانەوە، ماڵی باپیرم بوو.

زۆری پێ نەچوو، قوتابخانەکەمان بۆ (بەیتاڵخانە) کۆنەکەی سەرجادەی سەروو یانەی فەرمانبەران گواستییەوە، کە ئێستە قوتابخانەی (جەواهیری) پێ دەڵێن و بە عەرەبی تێیدا دەخوێنرێ. قوتابخانەکەشمان بوو بە قوتابخانەی (عێراقییە)ی سەرەتایی کچان. (شەونم)ی خوشکیشم هەر لە ئەوێ لە پۆلی یەك وەرگیرا.

ئەم قوتابخانە نوێیە، گەلێ خۆشتر و گەورەتر بوو. هەرچەندە خاوێنکرابووە و بۆیەش کرابوو. بەڵام تا ماوەیەکی زۆریش، ژوورەکانی هەر بۆنی پیسایی ئاژەڵەکانی لێ دەهات.

کاتێ گواستیشمانەوە، بەڕێوەبەر بڕیاریدا، هەموو قوتابییەکانی پۆلی پێنج و شەش، بەدەسی خۆیان کورسییەکانیان بگوێزنەوە. ئێمەش لە ئەو تەمەنەدا، توانای ئەوەمان نەبوو، کورسییەك بەرزکەینەوە و بیگوێزینەوە. هەرچی چۆنێ بوو، بە ئەو جادە و کۆڵانانەدا ڕامانکێشا، فەرمانەکەی بەڕێوەبەرمان جێبەجێکرد!

بەڕێوەبەرەکەمان مامۆستا (شێخ نەبوبەکر)ە فەندی بوو، نووسەرێکی دیاربوو، بە (أ. ب. هەوری) ناسرابوو، تا بڵێی، پیاوێکی تێگەیشتوو و ڕێکوپێك بوو، منداڵی زۆر خۆشدەویست، چونکە خۆی منداڵی نەبوو. تەنانەت ساڵی (1955)، هۆنراوەیەکی زۆر جوان و بەرزیشی، بۆ منداڵان هۆنیوەتەوە، کاتێ خۆی دەمخوێندەوە. لەبەرئەوە گەر هاروهاجیشمان بکردایە، چاوپۆشی لێ دەکردین! ئەمەش هۆنراوەکەیە:



*لە ئەوی ژینا، منداڵ چرایە*
*پێشتر لە خزم و باوك و برایە*
*بۆ دەرد و ئازار، کە دەرمانە منداڵ*
*خەمرەوێنیشە، کاتی گرۆکاڵ*
*بوڵەوەی بیێ بە خزمەتگوزار*
*ئەبێ لە ئساغیێ، دانا و خوێندەوار*
*بۆیە پێویستە، بە گیان و بە دڵ*
*پەروەردەبکرێ، زۆر چاکتر لە گوڵ*
*ڕەوشتی جوان و خوێندن و فرمان*
*ئەمڕۆ و دواڕۆژ، پەیڕەوی ژیان*

مامۆستا (غەریب)ێکی چاوکزمان هەبوو، هەمیشە دارێکی بەدەسەوە بوو، زۆر تووڕەبوو. کاتێ لە قوتابییەکی ئەدا، دەیگوت: قەحبە قەحبە! منداڵەوردکەی قوتابخانەکەش، لە حەوشە گاڵتەیانپێدەکرد، کەسیش لێی نەدەترسا. ماڵەکەیان لەسەر ڕێی قوتابخانەکەمان بوو، پەنجەرەیەکی نزمیان هەبوو، کاتێ لە خوێندن دەبووینەوە، خڕجبەردمان کۆدەکردەوە، لە دوورەوە پەنجەرەکەیمان دەشکاند و هەڵدەهاتین. لە پاڵ دیوارێکدا خۆمان دەشاردەوە، بە جنێودان دەهاتەدەرەوە، بەڵام کەسی نەدەبینی، لەبەرئەوە نەیدەزانی، چی بکا، لە تاواندا جنێویدەدا و دەیگوت: دەزانم، کێ بوون، بەیانی لە قوتابخانە دەتاندۆزمەوە!

مامۆستا (ئەنوەر فەخری واسف)، وانەی ئینگلیزی پێ دەگوتین. زۆر توندبوو، بەڵام هەم مامۆستایەکی زیرەك، هەم پیاوێکی بەڕێزیش بوو. مامۆستا (حەمەرەشید هەورامانیی)ش،

وانەی عەرەبی دەگوتەوە. ئەویش بە هەمان شێوە، مامۆستایەکی باش بوو. هێندێ مامۆستای دیکەشمان هەبوو، هەر یەکەیان وانەیەکی دیکەیان پێ دەگوتینەوە، بەڵام لە هەموویان خۆشەویستر، مامۆستایان (ئەحمەد گۆچان) و (ئەحمەد حوسێن) بوون، سروود و ژمێرەیان فێردەکردین.

لە قوتابخانە گەلێ هاوڕێی وەك (عوسمانی قالەمەتەوەر، ئەکرەمی سەییدمەجید، نامیقی ساڵحی میسری، عەلی سینەما، بەکری مەحەی ڕیش، کامیل نامیق، ئومێد کەریم ...)م هەبوو، هەمیشە پێکەوە بووین. هەرچەندە زۆربەشیان، کوڕی گەڕەکی خۆمان بوون، بەڵام هاوڕێیەتییەکەمان بەهێزتربوو. هەر لە ئەم خانووەدا بووین، لە تەمەنی یازدە ساڵیدا، لە ئەخۆشخانەی سەرەوە، (شێخ ئەحمەد باراوی)، من و (بارزان)ی برامی خەتەنەکرد و زوڕەی لێ هەستانین!

## سەرەتای پشێوی و نائارامییەکی بێ کۆتایی

دەرگەی خوێندنگەکان کرابوونەوە، سەرەتای مانگی سێپتێمبەری ساڵی (1961) بوو، لە نێو شاردا، هەست بە هەراوئاژاوەیەکی سەیر دەکرا. خەڵکی شار بە تەواوی شڵەژابوون. (سولەیمانی)، چالاکییەکی سەیری بە خۆیەوە دەبینی. مامە (بەکر)م هەر لە هاتوچۆ و جموجۆڵدا بوو. ئێمەش دەمانبیست، پێوەندی نێوان کورد و (بەغدا)، بەرەو خراپی دەڕوا، هێندێ لە سەرکردەکانی (پارتی)ش، خۆیان شاردبووەوە. دەنگیش وا بڵاوبوو، سەرۆك (بارزانی)، شاری (بەغدا)ی بەجێهێشتووە و بۆ نێوچەی (بارزان) گەڕاوەتەوە. ڕۆژانە ئەم دەنگوباسانەمان لە ماڵەوە، لە کۆڵان، لە سەرجادە و لە قوتابخانەکان دەبیست، باس هەر باسی تێکچوونی نێوان میری و (پارتی) بوو. ئیدی وردەوردە ناخۆشی، پشێوی و گرفت، لە نێوان هەردوولادا سەریهەڵدا.

ئەوەبوو، ڕۆژی (11، 9) بە تەواوی تەقییەوە، لە (دەربەندی بازیان) سوپای (عێراق)، پەلاماری هێزە چەکدارەکانی، هێندێ لە سەرۆك تیرە و هۆزەکانی کوردەی دا، ئیدی شەڕ گەرمبوو، میری بە فڕۆکە، تانك و تۆپە قورسەکانی، ئەو ناوەی داگرتەوە، هێزە چەکدارەکان شکان و خەڵکێکی زۆر بە خۆڕایی کوژران.

سەرەتا کۆمۆنیستەکان، زۆر دژی ئەو جموجۆڵە بوون، هێندێ جاریش کار لە قسەکردن و دەمەتەقێدا نەدەما، دەمەقاڵێ و پێکدادان لە نێوان ئەندامانی (پارتی) و کۆمۆنیستەکاندا دروستدەبوو.

لەبەرئەوەی شۆڕش دەستپێکرد، (عەبدولکەریم قاسم) لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانیدا، ڕۆژی (22. 9. 1961)، مۆڵەتی کارکردنی ئاشکرای لە (پارتی) سەندەوە، ڕۆژنامەی (خەبات)یشی داخست.
سەیر ئەوەبوو، هێندە شەڕێکی بێ سەروبەر و بێ بەرنامە بوو، لە ئەو کاتەدا، لەنێو خەڵکیدا وا باوبوو، گوایە (حاجی برایمی چەرمەگا) گوتوویەتی: بە قوربانی کوڕیم، شەڕیکەن، بە خوا وێنەی لاوژتان، بە دینارەوە دەبینن!
دوای ئەو تێکشکاتەش، خەڵکی نیشتمانپەروەری شار بە تایبەتی و گشت (کوردستان) بە گشتی، وەک خۆڵ و دزیان بەسەردا کرابێ، وابوو. ماتەمینی دایگرتبوون، لە هەر شوێنێ، دوو کوردپەروەر پێکەوە ڕاوەستانایە، هەر باسی چارەنووسی گەلی کورد، دوارۆژی (کوردستان) و ئەو شەڕەی (دەربەندی بازیان) بوو!

**فڕۆکە جەنگییەکانی (عێراق)**

هەر دوای چەن ڕۆژێ، چەن فڕۆکەیەکی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، بۆ چاوترساندنی خەڵکی شارەکە، زۆر بە نزمی و تیژی، بەسەر (سولەیمانی)دا تێپەڕین، هێندێ تەقەیان بە ئاسماندا کرد، دەنگەکەی زۆر گەورەبوو، بە جارێ لە هەموو شوێنێکی شاردا دەبیسرا و دەنگی دەدایەوە. خەڵک بە تەواوی خرۆشان. زۆربەی خەڵکی وایان دەزانی، فڕۆکەکان بە ڕاستی، بۆردوومانی شارەکە دەکەن. ئاخر بۆ نایکەن، خۆ ئەوە یەکەمین جار نییە، ئەم شارە بۆردومانکرێ، ئەی لە سەردەمی شۆڕشەکەی (شێخ)ی نەمر و لە ساڵەکانی بیستی سەدەی پێشوودا، فڕۆکەکانی ئینگلیز و دەسەڵاتی (عێراق)ی عەرەبی، شاری (سولەیمانی)یان بۆمبابارن نەکرد؟! لەگەڵ ئەوەشدا داگیرکەر هەر داگیرکەرە، شاری (سولەیمانی)ش، لە هیچ شارێکی دیکەی ئەم سەر زەوییە، پیرۆزتر و جیاوازتر نییە!
من لە ئەو کاتەدا، لە کۆڵانی بەتزینخانە کۆنەکەی گەڕەکی (کانیسکان) بووم. هەر گوێم لە دەنگی ئەو تەقانە بوو، وەک هەموو ئەو کەسانەی دەوروپشتم، ڕاچڵەکیم و زۆر ترسام. بە پەنجەکانم هەردوو گوێم گرت و پاڵکەوتم. لە ترساندا و لە دڵی خۆمدا، هاواری خوا و پێغەمبەر و (کاک ئەحمەدی شێخ)م دەکرد. بەڵام دوای ماوەیە، فڕۆکەکان لەچاو ونبوون، دەنگ وا بڵاوبوو، چەن کەسێ بریندابوون، بە ئەو شێوەیە، شۆڕشی (11. سێپتێمبەری 1961) دەستپێکرد.

* * *

**بارودۆخی نێو شار**

هەر دوای ئەو شەڕەی (دەربەندی بازیان)، ڕۆژانە سەرانی میریی (عێراق)، بە ڕۆژنامە و لە وێزگەی (بەغدا)وە، بە هەردوو زمانی کوردی و عەرەبی، هێرشی توندیان بۆ سەر سەرۆک (بارزانی) و سەرکردایەتی (پارتی) دەکرد، هەڕەشەی لەنێوبردنیان لێ دەکردن. هەست و هۆشی نەتەوەیی، گەلی کوردی باشووری (کوردستان)یان برینداردەکرد. پەیتاپەیتا هێزەکانی سوپایان، بۆ (کوردستان) بە گشتی و نێوچەی (سولەیمانی) بە تایبەتی ڕەوانە دەکرد، لە زۆربەی سەرجادە و شەقامەکان، پۆلیس و سەرباز وەستابوون، داوای پێناسیان لە خەڵکی دەکرد. شارەکە لە پۆلیس و سەربازی عەرەب جمەیدەهات. زۆڵەکورد و سیخوڕی کوردیش پەیدابووبوون، یارمەتی هێزەکانی داگیرکەریان دەدا.

ئیدی بە ئەو شێوەیە و هێندیهێندی، بارودۆخەکە بە تەواوی تێکچوو، نرخی کەلوپەل و خواردەمەنیش، لە نێوبازاڕەکاندا بەرزبووەوە، نائارامی و پشێویی بڵاوبووەوە. خەڵکیش وەک جاران، شەو تا درەنگانێ لە دەرەوە نەدەمانەوە. دووکانی سەرجادەکان هەر زوو دادەخران، زۆربەی هاووڵاتیان، سەریان لێ تێکچووبوو، نەیاندەزانی، چی بکەن!

لە ئەو ڕۆژانەدا، ئەندامانی سەرکردایەتی (پارتی)، بە تەواوی شلەژابوون. باوکم و مامە (بەکر) و (شێخ عوسمان) و هێندی خزمی دیکەش، هەر لە ڕاوتەگبیردابوون. هێندەم زانی، مامم دیارنەما، دوای ماوەیە بۆم دەرکەوت، لەگەڵ چەن کەسێکدا، لە چیای (ئەزمڕ و دەبانەوێ)، هێزی چەکداری (پارتی) دامەزرێنن.

ئەو کاتە تازە وشەی (پێشمەرگە)، لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا بڵاوبووبووە، ئینجا تێگەیشتم، بۆچی مامم گۆڕی ونبووە! بۆچی کاتێ هەواڵی کاکە (جەمال)م لە باجی (عاسم) دەپرسی، دەیگوت: کۆچیکردووە. پاشان بۆم دەرکەوت، (جەمالی عەلی باپیر)، یەکەمین پێشمەرگەی لاوی شۆڕشی گەلەکەمان بوو!

دوای ماوەیە، (پارتی) هێزی پێشمەرگەی (کوردستان)ی دامەزراند، لە نێوچەکانی سەر بە پارێزگەی (سولەیمانی)، چالاکییەکی زۆریان نواند. زۆربەی بنکەکانی پۆلیسی نێوچەکانی (ماوەت، چوارتا، بەرزنجە، ئەزمڕ، پێنجوێن، شارەزوور و قەراخ)یان گرت. هێندێ لە ئەو بنکانە، خۆیان بەدەستەوەدا و هێندێکی دیکەشیان، بە شەڕ گیران، پۆلیسێکی زۆری نیشتمانپەروەری کورد، لە ڕیزەکانی شۆڕشدا بوون بە پێشمەرگە. لە سەرانسەری (کوردستان)دا، خەڵکێکی زۆر پەیوەندییان، بە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (پارتی) و شۆڕشەوە کرد. لە ماوەیەکی کەمدا، جەماوەری (پارتی) لە (کوردستان)، بەشێوەیەکی چاوەڕوانەکراو زیادیکرد. زۆربەی پۆلیس و سەربازە هەڵاتووەکان، بە خۆیان و چەکەکانیانەوە، ڕیزەکانی سوپای دوژمنی داگیرکەری (عێراق)یان چۆڵکرد و لە ڕیزەکانی سوپای شۆڕشگێڕی گەلەکەماندا

گیرسانەوە. میریی بە تەواوی، تووشی هیستیریا بووبوو، لە ئاوالندا، لە گیانی جەماوەری نێو شارەکان بەربووبوو، سەربازە عەرەبەکان بە ئاشکرا، سووکایەتییان بە خەڵک دەکرد، ماڵانیان دەپشکنی، دەستیان بەسەر سامان و موڵکی هەڵاتووەکاندا دەگرت. گرتووخانەکان بە خەڵکی کوردپەروەر ئاخنرا بوون، لە گرتووخانەی سەرەوە (پارکی دایکی ئێستە)، جێ نەمابوو، کەسی دیکەی تێدا بەندکەن. فەرمانگەکانی (ئەمن) و بارەگای لیوا سەربازییەکانیان پڕبووبوون. لەبەرئەوە، گرتووخانەیەکی تایبەتیان بەرانبەر کۆڵانەکەی (باخی گشتی) کردبووەوە، ئەویشیان پڕکردبوو، خەڵکیان بە هەموو شێوەیە ئازارەدا، بە تایبەتی لە (ئینزیباتخانە)، بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە، سزای خەڵکیان دەدا. وەک دەیانگێڕایەوە، سەربازێکی قەڵەوی ڕەشی دانەرێژی عەرەبی لێبوو، هەر گازێکی بە (250) فلسی ئەو سەردەمە؛ لە گیراوەکان دەگرت، کە دەمیشی لە قۆڵ و ڕان و شوێنەکانی دیکەی جەستەی گیراوەکان بەردەدا، گۆشتی دەپچڕی و خوێنی لێ دەهێنا! تەنیا بۆ ئەوەی قسەبکەن، نهێنییەکیانیان بە زۆر لێ دەربێنن و دان بە ئەوەدا بنێن، ئەندامی (پارتی)ن و پێوەندییان بە شۆڕشەوە هەیە. ئیدی باروودۆخێکی وا ئەفرێندرابوو، کەس لە ژیانی خۆی دڵنیا نەبوو. لەبەرئەوە هەر ڕۆژەی هەواڵی هەڵاتن، یا گرتن و کوشتنی کوردێکی نیشتمانپەروەر، لەنێو خەڵکیدا بڵاودەبووەوە.

ئەوێ باوکم و مامە (بەکر)م و (شێخ عوسمان) کۆبوونەوە، باسی کوڕە و باری بنەماڵەکەمانیان دەکرد. هەرسێکیان دەیانویست، لە شۆڕشدا بەشداربیکەن. بەڵام ئەوان بە باوکمیان گوت: تۆ مەیەرە دەرەوە، ئێمە هەردووکمان دەڕۆین و تۆ ئاگات لە خێزانەکانمان بێ. ئەوە بوو، ئەوان لە میلی پێشمەرگەی نێو شار و باوکیشم، لە ڕێکخستنەکانی (پارتی)دا کاریاندەکرد.

ماوەیە مامم دیارنەما. ئێوارەیەکیان بە پەلەپڕۆزێ و لە ئاکاو، خۆی کرد بە ژووردا. لەگەڵ باوکمدا هەر مشتومڕیانبوو. من هیچ شتێ تێ نەدەگەیشتم، بەڵام دەمزانی، شتێ هەیە و لە ئێمەیان شاردووەتەوە. ئینجا چاوەڕێیانکرد، تا بە تەواوی تاریکبوو. پاشان جانتاکەی کردەوە و غەدارەیەکی کونکونی دەرهێنا. گوتی: تا ماوەی چەن ڕۆژێ، با ئەم چەکە لێرە بێ، دوایی دێم و دەیبەم. پاشان غەدارەکەی هەڵوەشاند، پارچەکانی چەورکرد، بە نایلۆنێ پێچایەوە و زۆر بە هێواشی، لەبەردەمی پەنجەرەکەی خۆمان و لە نێو گوڵەکاندا، چاڵێکی بۆ هەڵکەن و شاردییەوە، بێ ئەوەی کەس پێ بزانێ. دوای ماوەیەکی کەم هاتەوە و بە هەمان شێوە بردیەوە. ئیدی نامەزانی، چی لێ کرد و بۆ کوێی برد! پاشان بۆمان دەرکەوت، ماوەیە لە دەرەوەبووە و ئێستە گەڕاوەتەوە، لەنێو شاردا کاریکا!

## شۆڕش و زۆڵەکوردەکان

لەگەڵ ئەوەشدا، کە زۆربەی زۆری خەڵکی لەگەڵ شۆڕشدا بوون، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، هێندێ کەس هەبوون، لە ترساندا یا لەپێناوی پارە و دەسەڵاتدا بوونە؛ ویژدان و ئابڕووی نەتەوەیی خۆیان، بە دوژمنی داگیرکەر فرۆشتبوو، سیخووڕی میری بوون، بە دوای نیشتمانپەروەرانی کورددا دەگەڕان، تا تووشی گرفت و چەرمەسەرییان بکەن. هێندێ کەسیش دەیانویست، چەن کەسێ لە خۆیان کۆکەنەوە و دژی شۆڕش چەک هەڵگرن، تا دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، ئاوڕێکیان لێ بداتەوە. هەروەها هێندێ سەرۆک تیرە و هۆزیش هەبوون، بەرژەوەندی چینایەتییان لە ئەوەدابوو، لەگەڵ میرییدا بن!

لە ئەو ماوەیەدا، شۆڕش بڕیاریدا، سنوورێ بۆ ئەو ناپاکانە دانێ. ئەوە بوو، شەهید (سەلامی مەلاسابیر)، سەرۆک هۆزێکی خۆفرۆشی وەک (مەحموودە فەندی فەقێ موحەممەدی هەمەوەندی) لە (سولەیمانی) کوشت، کە بە تەواوی، دەسی لەگەڵ دەسەڵاتی داگیرکەر تێکەڵکردبوو. ئەو کاتە، بە ئەو جۆرە کەسانەیان دەگوت: (جاش). ئیدی هەردوو وشەی جاش و پێشمەرگە، وەک دوو زاراوەی ڕامیاری و سەربازی دژبەیەک، لە نێو خەڵک و نووسینی کوردیشدا، بڵاوبوونەوە و چەسپان.



سەلامی مەلاسابیر (1933 – 16 .10 .1984)

## چیرۆکی لووتبڕاوی خۆفرۆش

ڕۆژێ، پێشمەرگە پیاوێکی لادێیی خۆفرۆشی خەڵکی (کانیسپیکە)یان فڕاند، بەڵام نەیانکوشت، تەنیا هەر ویستیان، تەمبێیکەن و بەپەنگیکەن، خۆفرۆشانی دیکەی پێ چاوترسێن و وریاکەنەوە، کە هەر کەسێ ناپاکی بەرانبەر شۆڕش و گەلەکەی خۆی بکا؛ لە

هەر کوێیە بێ، دەستی شۆڕش دەیگاتێ و بە هەر شێوەیەکیش بێ، سزای خۆی وەردەگرێ، لەبەرئەوە لووتیان بڕی و بەرەڵایانکرد، ئیدی ئەو خۆفرۆشە، تا ئەو ڕۆژەی کوشتیشیان، هەر بە (لووتبڕاو) ناسرا و کەس ناوی ڕاستەقینەی خۆی نەدەزانی!

ئەو پیاوە خۆفرۆشە ناشیرینە، لەبری لە کارەکەی پەشیمانبێتەوە، واز لە ناپاکی بێنێ، گەڕایەوە بۆ نێو شار و وەك سەگی هاری لێهات، پەلاماری چاك و خراپی خەڵکی دەدا. دەستێ جلی ڕانکوچۆغەی لەبەردابوو، جامانەیەکی دەبەست، لکێکی جامانەکەی بە دەم و لووتیەوە هەڵدەپێچا و لووتەبڕاوەکەی پێ دەشاردەوە. دوو سەربازی چەکداری عەرەبیشی بەدواوەبوو، بەنێو شاردا دەگەڕا، ڕقی لە هەر کەسێ بووایە، پەنجەی بۆ ڕادەکێشا و سەربازەکانیش دەیانگرت. ئەم کارە درێژەیکێشا، خەڵکێکی زۆر گیران و نیگەران بوون. تا لە ئەو کاتانەدا، (پارتی) لە ڕیزی پێشمەرگەی نێو شار و ڕێکخستنەکانی خۆیدا بڵاویکردەوە: کێ دەتوانێ، خۆبەخشانە ئەو دوژمنە سەرسەختە خۆفرۆشەی کورد بکوژێ، یەکێ لە ئەو پیاوە مەردە کوردانەی خۆی هەڵبژارد، ئەو کارە گرنگە بکا و ئەو ئەرکە نەتەوەییە پیرۆزە جێبەجێبکا، (شێخ عوسمان باراوی) بوو. هەڵبەتە بازی سەرکردایەتی (پارتی)ش، هەر بەسەر ئەوەوە نیشتەوە، لەبەرئەوە ئەویان هەڵبژارد، تا بە هەر شێوەیەبێ، لەنێویبەرێ.

(شێخ عوسمان باراوی)، خۆی لەبەرچاو ونکرد. لەنێو شاردا بە نهێنی، بە دوای لووتبڕاودا دەگەڕا و زانیاری لەسەر کۆدەکردەوە. چونکە کوشتنی زۆڵەکوڕەیێکی چەپەڵی وەك ئەو، هەروا کارێکی ئاسان نەبوو، خۆی هەمیشە وریابوو، چەکیشی پێبوو، دوو چەکداریشی بەدواوەبوو. بەڵام لە ئەنجامدا، هەر کوشتی و گیانی پۆخڵی، بە دۆزەخی ناپاکی شادکرد. ئەو، ئەو کارەیکرد، یەکسەر ڕایکرد و لە نێو شاردا نەما، بەڵکوو چووە دەرەوە و بوو بە کادیری نێوچەی (شارباژێر).

دوای چەن ساڵێ، چەن خزمێ پێکەوە دانیشتبووین، زۆرمان لێ کرد، بۆمان بگێڕێتەوە، ئەو ئەمەرەی چۆن کردووە! گوتی: چەن ڕۆژێ بوو، بە دوایەوە بووم، چاودێریمدەکرد. زۆر بیرم لێ دەکردەوە، چۆن و بە چی بیکوژم. هیچ هەلێکی وام بۆ هەڵ نەدەکەوت، تا لەنێوییبەرم. بڕیارمدا، دەستێ جلی شڕی لادێیانە لەبەرکەم، دوور و نزیك بە دوایەوەبم، هەر هەلێکم بۆ هەڵکەوت، پەلاماریبەم و سەریبڕم. چەقۆیەکی گەورەی تیژم کڕی، هەموو ڕۆژێ بە هەسان تیژمدەکردەوە. ئەوە باشترین ڕێ و چارەسەر بوو. چونکە تەقەم لێ بکردایە، ئەوانیش چەکداربوون و تەقەیان لێ دەکردمەوە، هێزی چەکداری دیکەش بەدەم تەقەکانەوە دەهاتن و فریایانەکەوتن، جگە لە ئەوەی خەڵکێکی زۆریشی تێدا دەکوژرا. ئیدی ئەو ڕۆژەی بڕیاربوو،

بیکوژم، بە دوایەوەبووم، لەبەر کۆشکەکەی (تۆفیق قەزاز)ەوە، خۆی و چەکدارە پارێزەرەکانی، بەرەو مەیانی ماستفرۆشەکان تلبوونەوە، گەیشتنە بەر کەبابخانەکەی (تۆفیق ئەبوشوارب) و وەستان. دوو چەکدارەکەی لەگەڵیشی بوون، پشتیانتێکرد و لە دووکانێ، خەریکی شتکڕین بوون. منیش هەلم لەدەس نەدا، یەکسەر چەقۆ تیژەکەم دەرهێنا، لە پشتەوە پەلامارمدا، بە دەس توند دەمیم گرت، یەکسەر سەرمبڕی و خوێن فیچقەیکرد، بێ ئەوەی دەنگی لێوە بێ، کەوت و دەسی بە لنگەفرتێ کرد. منیش هەر زوو بۆی دەرچووم، کەمێ لە خوار ئەو شوێنەوە، ترومبیلێ چاوەڕێیدەکردم، سواربووم و ڕۆیشتم.



شێخ عوسمانی شێخ مستەفای باراوی (1930– 2010)

دوای ئەوەی لووتبڕاو مرد، پۆلیس و سەربازێکی زۆر دابارین، دەسیان بە لێدانی خەڵک کرد، زۆربەی دووکاندارەکانی ئەو ناوەیان گرت، لە (ئیشزیباتخانە) ئەشکەنجەیەکی زۆریان دان، بەڵام کەڵکی نەبوو، چونکە ئەو داماوانە، ئاگایان لە هیچ نەبوو، هیچیشیان نەدەزانی. لەبەرئەوە ناچاربوون، بەرگەی ئەو هەموو لێدان و سووکایەتیپێکردنە بگرن! ئیدی بە ئەو شێوەیە، خەڵکی شار لەدەس ئەو خۆفرۆشە بێ ویژدانە ڕزگاریانبوو. تا خۆشی مابوو، ئەو چەقۆیەی هەر هەڵگرتبوو، ئێستەش ئەوەکانی هەر پاراستوویانە!

یەکەمین بۆردوومانی (پێنجوێن)

ماوەیە بوو، (پێنجوێن) ناوچەیەکی ڕزگارکراو و ئازاد بوو، بەدەس پێشمەرگەوە بوو، دەسی دوژمنیش نەدەگەیشتێ، تا داگیریکاتەوە. بەڵام ساڵی (1962)، پێشمەرگە کشایەوە و دانیشتووانەکەشی، لە ترساندا چۆڵیانکرد. کاتێ سوپای (عێراق) چوون و

داگیریانکردەوە، چۆڵبووبوو، لەبەرئەوە، هەمووماڵەکانیان سووتاند. پاشان کەسێ ئاوەدانیبووەوە، کەچی کاتێ (بەعس) یەکەمین کودەتایکرد و دەسی بەسەر دەسەڵاتدا گرت، مانگی نۆی ساڵی (1963)، فڕۆکەکانی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، شارۆچکەکەیان بە بۆمبای ناپاڵم بۆردوومانکرد، هێندێ کەس بریندار و شەهیدبوون. داروبەردێکی زۆریش سووتا. خەڵکەکەی دەربەدەربوون. زیانێکی زۆری گیانیی و ماڵییان پێ گەیی.
خانووەکەی ئێمەش، یەکێ لە ئەو خانووانە بوو، بەرکەوت و ڕوخێنرا. جگە لە ئەوەی ئەو هەموو ئەرکەمان تێدا کێشابوو، هەرچیشمان تێدا خەرجکردبوو، هەمووی بە خۆڕایی ڕۆی و دەسمان نەکەوتەوە، سەرەڕای ئەوەش، شەوێکی خۆشیش تێیدا نەحەواینەوە. پاشان لە گفتوگۆکەی ساڵی (1964)یشدا، باوکم زەوییەکەی فرۆشت و قەرەبووشی وەرنەگرتەوە!

مامە (شێخ حوسێن)
لە ماڵی (ئامنە) خانێدا بووین، ڕۆژێکیان، پیاوێکی پیر بە جامێ ماستەوە، خۆی کرد بە ژووردا. دایکم بە پیریەوە چوو، زۆر بە گەرمی چاکوچۆنی لەگەڵ کرد. پاشان دایکم گوتی: ئەمە مامە (شێخ حوسێن)ە.
دوای ئەوەی شەش ساڵ بەسەر بینین و ناسینی خاڵە (ڕەحیم)دا تێپەڕی، ئەوا ئێستەش چاوم بە دووەمین کەسی دایکم کەوت. ماوەیە دانیشت و دوایی بۆ گوندەکەی خۆیان داوەتیکردین. ئەو کاتە لە گوندی (دەرگەزێنی بابەعلی) لە شارۆکەی (بازیان) دەژیان. زۆر لە شارەوە دوور نەبوو، نزیک چاڵەش بوو.

سەرەتای کارساتێکی نوێ
چەن ڕۆژێ بوو، دیسانەوە باوکم شەو درەنگ دەگەڕایەوە. هەموو بیانووەکەشی ئەوەبوو، گوایە خەریکی کاری نەخۆشخانەیە و کوردایەتی دەکا! وەک جارانیش، ڕووی لەگەڵماندا خۆش نەبوو. لێمان تووڕەدەبوو، بە ئاشکراش شەڕی پێ دەفرۆشتین.
ڕۆژێکیان، (سەبری) و (بەدریە)ی خوشکی، سەریان لێ داین. دایکم زۆری پێ ناخۆش بوو، چارەی نەدەویستن و حەزی بە هاتوچۆیان نەدەکرد. هەڵبەتە ئاسایی نەبوو، (سەبری) بێوەژنێکی جوان و ڕێکوپێک بوو. باوکیشم لە ئاستی جوانی ژناندا، زۆر لاوازبوو، ئامانی نەبوو! دایکیشم وەک مارانگازێ، لە خشەی مارومێرووی چاوبازان دەترسا!

**گەشتی (ڕانیە)**

سەرەتای ساڵی (1962) بوو، باوکم بۆ شارۆچکەی (ڕانیە) گوێزرایەوە. لە ماڵی پورە (سەبیح)م، دوو ژووری لەسەر دالانێکی درێژ نزیک دەرگەی حەوشە گرتبوو. دوای ماوەیە دەنگبڵاوبووەوە، کە باوکم (سەبری) هێناوە و لە (ڕانیە) پێکەوە دەژین. بە ڕاستی ئەو هەواڵە زۆر ناخۆشبوو، هەموومانی تەزاند و ئەوەی دایکم لێی دەترسا، ڕوویدا! لەبەرئەوە، دایکم منی ناردە بۆ (ڕانیە)، تا بزانم، دەنگوباس چییە؟

پشووی نیوەی ساڵبوو، خۆم کۆکردەوە و بەرەو (ڕانیە) سواربووم. لای کارگەی سەهۆڵەکەوە (تەلاری سالمی ئێستە)، ئەو کاتە ئەو ناوە چۆڵبوو، زاڵکەیەکی پشکنینی سەربازی لێ بوو، دایانبەزاندین و کەمێ ترومبێلەکەیان پشکنی، ئینجا داوای ناسنامەیان لێ کردین و دوایی سواربووینەوە.

ئەوە یەکەمین جاربوو، لە (سولەیمانی)ەوە بە ئەو ڕێیەدا بڕۆم، دەشتودەر و گوندەکانی قەراغ جادەکان ببینم. زووزوو دەمپرسی، ئەم شوێنە کوێیە؟ ئەوەی لە تەنیشتیشمەوە دانیشتبوو، زۆر بە سنگفراوانییەوە وەڵامیدەدامەوە و هەمووی بۆ باسدەکردم. ئای چەندم لا جوانبوو، کاتێ بەرەو (کۆیەل) سەرکەوتین و پاشان ڕووەو (کانیسارد) خلبووینەوە. چەمەگەورەکەی (دووکان)، بیری سەرچەمی (پێنجوێن)ی دەخستمەوە!

ئەو کاتە هەموو ترومبێلەکان، بەسەر پردە گەورەکەی (دووکان)دا هاتوچۆیاندەکرد. لەسەر پردەکە، چاوم بە ئاوی زەریاچەکە کەوت، یەکسەر ئاوەکەی چەمی (سیروان)م بیرکەوتەوە، کاتێ ساڵی (1957)، لە (سەییدساق) بووین و چووین بۆ (هەڵەبجە)، هەردووکیان لە دوورەوە شینیاندەکردەوە. ئیدی یەکسەر پەنجەرەی قەمەرەکەم دادایەوە، شۆفێرەکەش ئەو ماوەیەی سەر پردەکەی، بە کاوەخۆ بڕی، منیش هەر تەماشای ئەو دیمەنە دڵفرێنەم دەکرد، تێرتێریش پڕ بە سییەکانم، هەوای خاوێن و سازگارم هەڵمژی. زۆریش دڵم خۆش بوو، کە زەریاچەیەکی وا گەورە و پانوبەرینمان هەیە. پێشتر ناوم بیستبوو، بەڵام نەم دیبوو، لە ئەو باوەڕەشدا نەبووم، هێندە گەورە و جوان بێ!

ئەو کاتە، چاخانەکانی (کانیوەتمان) نەبوو، شۆفێرەکان لە (خەلەکان) لایاندەدا. ئێمەش وەستاین، تا پشوویەک بدەین و شتێ بخۆین. ماستاوێکی کوڵکتی خەست و بە تاممان خواردەوە و سواربووینەوە.

پێش ئەوەی بگەینە (چوارقوڕنە)، پردێکی ئاسنی درێژی لێ بوو، پێیان دەگوت: پردی (هیزۆپ). لە نزیک پردەکەوە، شۆفێرەکە وەستا و چەن هۆڕنێکی لێدا. هێندەم زانی، پیاوێ بە جلی خاکییەوە، لە بن پردەکەوە سەرکەوت، بەرەوڕوومان هات و تفەنگێکیشی

پێ بوو. ماندوونەبوونی لێ کردین و تەماشایەکی نێو ترومبێلەکەی کرد، داوای ناسنامەی لێ کردین، پاشان لە شۆفێرەکەی پرسی: دەنگوباسی شار چییە؟ شۆفێرەکەش گوتی: زۆر خراپە، پۆلیس و سەربازە عەرەبەکان ناخۆشیانکردووە و ئازاری خەڵکی دەدەن. ئەویش گوتی: ئاخر بۆ خەڵکی شار ئازان، گەر ڕاستدەکەن، با بە ئێمە بوێرن! ئیدی بوو بە پێکەنین و ڕۆیشتین.

نزیکەی دوو ساڵبوو، ناوی پێشمەرگەم بیستبوو، بەڵام ئەوەتەی شۆڕش دەستی پێ کرد بوو، ئەوە یەکەمین جاربوو، بە چاوی خۆم پێشمەرگە ببینم و گوێم لە دەنگی بێ! بە ڕاستی هێندەم خۆشدەویست، هەر تەماشای بەژنوباڵا و تفەنگەکەی شانیم دەکرد، لە خۆشیاندا خەریکبوو، دابەزم و دەستی ماچکەم، تا بە تەواوی دووریشکەوتینەوە، هەر ئاوڕم لێ دەدایەوە! ئیدی کاتێ ڕۆیشتین، سەرنشینەکانی نێو ترومبێلەکە، بە شان و باڵووی پێشمەرگەیاندا هەڵدەدا، منیش بۆ خۆم، بێ دەنگ گوێم گرتبوو!

دوایی بە نێو (چوارقوڕنە)دا تێپەڕیووین و هەمووی هێندەی نەبرد، لە نێو بازاڕەکەی (ڕانیێ) دابەزین. منیش یەکسەر هەواڵی دووکانەکەی (سەییدعەبدوڵڵا)ی مێردی پورە (سەبیح)م پرسی و پیشانیاندام. ئیدی لەگەڵ کوڕە گەورەکەی پورمدا (دلاوەر) ڕۆیشتینەوە بۆ ماڵەوە. لە دەرگەمان دا، (سەبری) لێی کردینەوە. یەکسەر پەلاماریدام و ماچیکردم، گوایە زۆری خۆشدەوێم! منیش لە دڵی خۆمدا و لە داخاندا دەمکوڵام. ئینجا تێگەیشتم، خەڵکی هەروا بە خۆڕایی، تفەنگ بە تاریکەشەوەوە نانێن!

پاشان بۆم دەرکەوت، تازە کار لە کار ترازاوە، باوکم ژنی پێنجەمی هێناوە، جارێکی دیکەش بە دەستی خۆی، سەری لە خۆی و ئێمەش شێواندەوە. پاشنیوەڕۆ باوکم لە نەخۆشخانە گەڕایەوە، باوەشی پێداکردم و ماچیکردم. هەواڵی منداڵەکانی پرسی، بەڵام ناوی دایکمی نەهێنا! ئیدی خۆی و (سەبری)، هێندە بە دەوروپشتمدا هاتن و ڕێزیان لێ گرتم، هەر شەرمەزاریانکردم. دیارە دەیانویست، هەرچی چۆنێبێ، دڵم نەشکێنن و ژیانی هاوسەرگیرییان، بە ئاسای وەرگرم. منیش هیچ قسەم نەکرد و بە ڕووکەش ئاساییبووم، بەڵام لە ئاخەدا، جەرگم بۆ خێزانەکەمان ژانیدەکرد!

ماوەی هەفتەیەک لە ماڵی پورم مامەوە. ڕۆژێ لەگەڵ باوکمدا چووین بۆ (قەلادزێ) و سەرێکمان لە پورە (خانم) دا. چاوم بە منداڵەکانی کەوت و کەمێ بە نێو بازاڕەکەدا گەڕاین، دوایی گەڕاینەوە. ئەو کاتە ئەو ناوچەیە هەمووی بە دەست پێشمەرگەوەبوو، ڕزگارکرابوو، مەرییی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی نەبوو. خەڵکی ئازادبوون و زۆر خۆشبوو.

کاتێ گەڕامەوە، باوکم کاتژمێرەکەی دەستی خۆی دامێ. ئەوە یەکەمین جاربوو، کاتژمێر لە دەستکەم. هەرچەندە دڵم زۆر خۆشبوو، بەڵام زۆر بیری دایکم و منداڵەکانم دەکرد. لە (ڕانی) کاتێکی زۆر خۆشم، لەگەڵ کوڕەکانی (ئەوڕەحمان)ە فەندی بەسەربرد. هەموو شارۆچکەکەیان گێڕام و بۆ ماڵی خۆشیان داوەتیانکردم.

دواتر، پورم بە دزییەوە پێی گوتم: (سەبری) سکی هەیە. کاتێکیش باوکم بەڕێیکردم، ئینجا گوتی: (سەبری) کەسی نییە، گوناحە و خزمی خۆمانە، وەك دایکت وایە، گەر (رەحمە) لێی پرسیت، باسی هیچ نەکەی، تا خۆم دێمەوە. منیش هیچ قسەم نەکرد، ئیدی چۆن و بە چ خۆشییەکەوە هاتبووم، بە هەمان ڕێدا بە دڵشکاوی و خەمباری گەڕامەوە!

کاتێ گەیشتمەوە (سولەیمانی) و چوومەوە بۆ ماڵەوە، هەموویان لە دەورم کۆبوونەوە. دایکم پرسیاری لێ دەکردم و منیش، هەر خۆم لە پرسیارەکانی دەدزییەوە. سڵاوی باوکم و پورم پێ گەیاندن، باسی (ڕانیێ) و گەشتەکەی (قەڵادزێ)م بۆ کردن. هەرچەند ویستی، ڕاستی بزانێ، من هەر دەمگوت: نازانم، ئاگام لێی نییە و کەسم نەدیوە. دایکیشم دەیگوت: ئەی من تۆم بۆچی نارد؟ تا (سوعاد) لەگەڵ خۆی بردمیە خوارەوە، بە زیرەکی خۆی، هەموو شتێکی لێ دەرهێنام و ئەویش هەمووی بۆ دایکم گێڕایەوە. دایکیشم زۆر خەفەتیخوارد و پێی ناخۆشبوو. بەڵام بڕیاریدا، لێی نەپرسێتەوە و حەواڵەی خوای کا!

پاشان دوایی زانیمان، هەر لە (سولەیمانی) مارەیکردووە، لە ماڵی (بلەسووری عەرەبانچی)، ژوورێکی بۆ گرتووە، بە دزییەوە سەری لێ دەدا. واتە دوو ماڵی هەبوو، هەر لەبەرخاتری ئەویش هەوڵیدابوو، بیبنێرن بۆ (ڕانیێ). بێگومان ناخۆشی لە نێوان ئێمە و باوکمدا پەیدابوو، هیچ پێوەندییەکمان لەگەڵی نەما، نە ئەو سەردانی (سولەیمانی) دەکرد و نە ئێمەش، سەرمان لێ دەدا. تەنیا ئەوە نەبێ، هەموو سەری مانگێ، بە یەکێکدا پارەی بۆ دەناردین. ئەم دابڕان و زویربوونە، ماوەی چوار مانگی خایاند.

ئێوارەیەکیان لە ناکاو باوکم هاتەوە. ئێمەی یەکەیەکە ماچکرد و لەگەڵ دایکمدا، لێیان بوو بە هەرا، بەڵام زۆری نەخایاند، چونکە بە قسەکانی باوکمدا وا دەردەکەوت، پەشیمانە. (سەبری)ش سکی پڕبوو و نەیدەزانی، چی بکا! هەرچی چۆنێ بوو، سووکە ئاشتی و هێمنییەك، لە نێو ماڵەکەدا هاتەکایەوە. دوای ئەوەی باوکم کارەکانی خۆی تەواوکرد، گەڕایەوە.

تا لە ئەم خانووەدا بووین، دایکم کولێچەی ڕۆژەی بۆ دەبرژاندم و منیش دەمفرۆشت. چونکە ئەو پارەیەی باوکم بۆی دەناردین، کەمبوو، بەشی نەدەکردین. جارجاریش (حەسەن)ی

برام، لەگەڵ خۆی دەیبردم و ماوەیە پێکەوە کرێکاریماندەکرد. سەردەمێکیش لە خوار بازاڕی (سەلاحەددین)ەوە، سوپچگەرخانەی دانابوو، منیش بەربەسیەدەکرد و ڕۆژانە شتێکی دەدامێ.

## جگەرەکێشان

ئەو ماوەیە زۆربەی کات، (حەسەن) لای ئێمە بوو. پێکەوە دەچووینەدەرەوە و دەگەڕاین. لەگەڵ خۆی دەیبردم بۆ سینەما. ڕۆژێکیان لە چلی سینەمای (سیروان)، لەگەڵ هاوڕێکانیدا دانیشتبووین، چاوەڕێماندەکرد، فیلمەکە دەستپێبکا. ئەوان هەموو جگەرەیان دەکێشا، ڕوویکردە من و جگەرەیەکی دامێ. منیش گوتم: جگەرەناکێشم. گوتی: ها بیکێشە، ئەگینا ئەم لا و ئەو لات، بە شەپازلە سووردەکەمەوە. منیش لە ترساندا لێم وەرگرت و چەن مژێکم لێدا، زۆر تاڵ و ناخۆش بوو، گوتم: ئیدی بەسە، لە ئەوە زیاتر ناتوانم. ئەو هەر زۆری لێ کردم و گوتی: دەبێ، هەمووی بکێشی و دووکەڵەکەشی هەڵمژی. هەر هێندە یەک مژم لێ دا و دووکەڵەکەیم هەڵمژی، دەسم بە کۆکین کرد و خەریک بوو، بخنکێم. لە تاوانا فرێمدا، (حەسەن)یش پێکەنی و گوتی: ئەوا، هەر ئەم جارەی ناخۆشبوو، ئیدی فێردەبی. ڕاستیشیکرد، دوایی خۆم بە دوایدا دەگەڕام و دەستمپێکرد، تا ساڵی (2005)یش هەر دەمکێشا، بەڵام هەموو ژیانی خۆم هەر لاکێشبووم، هیچ ڕۆژێ لە دە جگەرە پترم نەکێشاوە!

## جارێکی دیکەش (ڕانیێ)

بە ئەو شێوەیە، ژیانمان بەسەربرد. هەمووی چەن مانگێکی نەبرد، هەواڵێکمان بیست، کە باوکم وازی لە (سەبری) هێناوە و جیابوونەتەوە. (سەبری)یش لە ئەوێ نەماوە و بۆ (سولەیمانی) گەڕاوەتەوە. منیش ئەو کاتە پۆلی چوارم بڕیبوو، بۆ پێنج دەرچووبووم، پشووی هاوین دەستپێکرد. پاشان باوکم گەڕایەوە، هەمووومان پێکەوە بۆ ماوەی مانگێ لەگەڵ باوکمدا، بە سەردان چووین بۆ (ڕانیێ) و ژوورەکەی (سەبری)مان داگیرکرد!

لە ماوەیەکی کەمدا، ئەوە دووەمین جاربوو، ئەو شارۆچکەیە ببینم، بەڵام ئەم جارەیان گەلێ خۆشتربوو، دایە و بابە یەکیانگرتەوە، خوشک و براکانیشم لەگەڵبوو. کاتەکەی زۆر خۆشبوو، نێوەڕاستی مانگی حەوت بوو، سەوزە و مێوەیەکی زۆر لە بازاڕدا هەبوو، شیرەمەنی: ماست، پەنیر، کەرە و شیرێکی زۆریان، لەسەر جادەکان دەفرۆشت. لەچاو (سولەیمانی)دا، هەموو شتێ هەرزانتربوو. زۆربەی ئێواران لە ماڵێ داوەتبووین، لە بەشت و سەیرانگەکان دەگەڕاین، خۆمان نوێکردەوە!

**هەڵکەوتی (ڕانیە)**

(ڕانیە)، شوێنێکی زۆر دڵگیر و خۆشە، زۆر حەزدەکەم، بیبینم. جگە لە (کێوەڕەش)، لە هەرسێ لاکەی دیکەیەوە، بە دەشتێکی پان و بەرینلاو دەورەدراوە. مرۆ بە هەر لایەکدا بڕوا، دارودرەخت، سەوزای و ئاو دەبینێ.

لە نێو (ڕانیە)دا، ئەوەی زۆر دڵم پێی دەکرایەوە، ئاوە جوانەکەی (قوولێ) بوو. سەرچاوەکەی بە دیوارێکی بازنەیی نزم دەورەدرابوو، بە هەر چواردەوریشیدا، چیمەن و گوڵ چێنرابوو. لە نێو ئاوەکەشدا، چەن دارچناری ڕوابوو، دیمەنێکی زۆر جوانی هەبوو. لە ئەو دیویشەوە، ئاوێکی زۆری لەبەردەڕۆی و چەمێکی تەنکی چکۆلانەی دروستکرد بوو. هەمیشە سەر بەردەکانی دەوروبەری چەمەکە، یەکێکی دیکەی نەدەگرت، هێندە چەنجاڵبوو. نێو ئاوەکەش بەقاز، مراوی و سۆنەی ئێسکسووک ڕازابووەوە. بەردەوام قیڕەقیڕ و گارەگاریان دەکرد، وەک بەلەمێکی خنجیلانە، لەسەر ئاوەکە لەنگەریانگرتبوو، جارجاریش دەڕۆیشتن و بە دوای خواردندا دەگەڕان. هەردوو بەری ئاوەکەش، بە دار و درەخت گیرابوو، ئیدی دیمەنێکی هێندە جوان و ئاوازەی هەبوو، ئاوەکەشی هێندە شیرین و سازگاربوو، وەک دەڵێن، سەد دەردی دەپەڕاند و مرۆ دڵی نەدەهات، بەجێبێڵێ!



وێنەی شارۆچکەی (ڕانیە)ی کۆن



وێنەی شارۆچکەی (ڕانیە)ی نوێ

## کۆمەڵێ هاوڕێی خۆشەویست

لێرەش، لەگەڵ منداڵانی دراوسێکانی ماڵی پورم، هێندێ هاوڕێم پەیداکرد. لەنێو هەموویاندا، (شەماڵی جەرجیس) و (هەژار) ناویکم، زۆر خۆشەویست. جگە لە ئەوەی، فەرمانبەری خەڵکی (سولەیمانی) زۆر لێبوو، لەگەڵ کوڕەکانیاندا دۆستایەتیمان هەبوو. لە ئەو برادەرانەش، کوڕەکانی (ئەوڕەحمانە) فەندی خاوەن ماڵەکەی (سولەیمانی)مان، (فوئادی خاڵەسەعدەدین، دلێری ئەحمەد مەجید، هوشیاری ئەحمەدە فەندی هەمەوەند)، زۆربەی کات پێکەوە بووین و تۆپەتۆپێنمان دەکرد.

سەیر ئەوەبوو، هەموومان بە دزی کەسوکارمانەوە، فێری جگەرەکێشان بووبووین و جگەرەی (جمهوری) بێ فیلتەرشمان دەکێشا. کەسیشمان نەماندەوێرا، پاکەت و شقارتە هەڵگرین. ئەو کاتەش، جگەرەیان بە دانە نەدەفرۆشت. لەبەرئەوە ناچاربووین، هەموو جارێ پارەکۆکەینەوە، پاکەت و شقارتە بکڕین!

یەکەمین پاکەتمان کڕی و لە پشت ماڵی فەرمانبەرەکانەوە، دەشتێکی لێبوو، چووین بۆ ئەوێ و دەستمان بە جگەرەکێشان کرد. ماوەیە مایەوە، بە دەم قسەکردنەوە، سەرێ دوو جگەرەمان کێشا. پاشان پاکەت و شقارتەکەمان، بە نایلۆنێ پێچایەوە، چاڵێکمان بۆ هەڵکەند و تێمانخست، سەرمان داپۆشی و ڕۆیشتین. بڕیارماندا، بێ یەکدی سەری چاڵەکە هەڵ نەدەینەوە و جگەرە نەکێشین. ئیدی بە ئەو چەشنە، هەموو ڕۆژێ یەکمان دەگرتەوە و بەرەو لای چاڵەکە دەڕۆیشتین. بە پەلە سەری چاڵەکەمان هەڵدەدایەوە، سەرێ جگەرەمان دادەگیرسان و زۆر بە تامەزرۆییش دەمانکێشا!

### گرتووخانەی (ڕانی)

ئەم سەردان و گەڕانە، ئەم خۆشی و یارییکردنە، زۆری نەخایاند، باوکم لەسەر کوردایەتی گیرا. سەرەتا هیچمان نەدەزانی، بەڵام دوایی ڕێیاندایین، چاومان پێی بکەوێ. من هەموو ڕۆژێ خواردنم بۆ دەبرد و دەمبینی. هەر چارەڕێی ئەوەمان دەکرد، وەڵامی گرتن و کۆڵینەوەی پۆلیس، لە فەرمانگەی (ئەمن)ی (سولەیمانی)ەوە بێتەوە و بەربدرێ. بەڵام کەڵکی نەبوو، ماوەیەکی زۆر مایەوە و ئێمەش ناچاربووین، تا لایە بە لایەکدا دەکەوێ، بمێنینەوە. بەڵام بە داخەوە، هیچ ئەنجامێکی نەبوو.

باوکم لەگەڵ (حەسەنی کانەبی) گیرابوو، گوایە ویستوویانە، (موهەلهەل) ناوێکی عەرەب، عەریفی پۆلیس بوو، دەرمانخواردکەن و بیکوژن! لەبەرئەوە، تاوانەکەی زۆر گەورەبوو، بەریان نەدا و ئێمەش هەر چاوەڕوانبووین!

### سوپای داگیرکەری (عێراق)

بۆ ماوەی مانگێ، بۆ گەشت و سەیران چووین، کەچی باوکم گیرا و ڕێش لە ئێمە گیرا! چونکە هەر دوای چەن ڕۆژێ، سوپایەکی داگیرکەری (عێراق)، بە هاوارهاوار هاتنە نێو (ڕانی)وە و بە نێو بازاڕەکەدا دەگەڕان، بەسەر زیلەکانیانەوە بە ئاسماندا تەقەیاندەکرد، خەڵکیان دەترساند و هاواریاندەکرد: (نیحنە ئەلیەدو، وێن ئەلعەدو!) واتە: ئێمە دەشتەکین، دوژمن لە کوێیە؟

بەڵام زۆر سەیرم لێدەهات، کەس دووکانی دانەخست و ڕای نەکرد، بەڵکوو خەڵک، لە ئەم بەر و ئەو بەری جادەکانەوە وەستابوون و بە چاوی پڕ لە کینەوە تەماشایاندەکردن. دوای ئەوە سەربازگەیەکیان، لە نێوان (چوارقوڕنە) و (ڕانی)دا دامەزراند و جێگیربوون. ئەوە یەکەمین جاربوو، سوپای داگیرکەری (عێراق) بێت و ئەو نێوچەیە داگیرکا، ئەگینا هەر بنکەی پۆلیسی لێبوو. پاشان سەرباز و ئیستیخبارات، بە نێو بازاڕەکاندا بڵاوبوونەوە.

هەمووی دوو سێ ڕۆژی پێ نەچوو، پەلاماری شاخی (کێوەڕەش)یان دا، شەڕ لە نێوان پێشمەرگە و سوپادا دەستپێکرد، خەڵکی (ڕانی)، لە سەربانی ماڵەکانیانەوە تەماشایان دەکرد. چاومان لێبوو، چیاکەی بە فڕۆکە بۆمباراندەکرد، بە تۆپی قورس لێیدەدا، سەرباز و جاشەکانی نێوچەی (بادینان)یش، بە جلە خەتدارەکانیانەوە، هەر لە جاشەکەری کێوی دەچوون، هێرشیان دەستپێکردا پێشمەرگە ئازاکانی ئەو نێوچەیەش، لە سەنگەرەکانیاندا دامەزرابوون، کەوکوژی تێیانکەوتن و دەستێکی مەردانەیان لێ وەشاندن،

گەلێکیان لێ بریندارکردن، هێندێکیشیان لێ کوشتن و بە چیاکەدا تلۆرەبوونەوە. ئەوانەی مابوونەوە، لە ترساندا هەڵاتن و گەڕانەوە، لە گوندی (کونەسەگ) کۆبوونەوە، جارێکی دیکەش خۆیان کۆکردەوە و هێرشیانکرد. بەڵام ئەم جارەیان، لە جاری پێشوو خراپتر شکان، ئیدی سواری زیلەکانیان بوون و گەڕانەوە. خەڵکیش ترسان، هەموو لە سەربانەکان دابەزین.

پاشان وردەوردە، باروودۆخی نێو شارەکە بە تەواوی ناخۆشبوو. ڕێی هاتوچۆی نێوان (ڕانی) و (سولەیمانی) داخرا، چونکە ئەو ڕێیانە هەمووی، بە دەس پێشمەرگەوە بوو، دەسەڵاتی میری و سوپا، تەنیا هەر لە نێو (ڕانی)دا هەبوو. بەڵام ئەوەبوو، مانگی جارێ، کاروانێکی سەربازی، لە نێوان ئەو دوو جێیەدا دەهات و دەچوو. لەگەڵ ئەو کاروانەشدا، هەموو گیراوەکانیان، ڕەوانەی (سولەیمانی) کردبوو. ئێمەش، ڕێمان لێ گیرابوو، بە هیچ شێوەیە نەماندەتوانی، بگەڕێینەوە!

قوتابخانەی (ڕانی)

سەرەتای مانگی (9) بوو، دەرگەی قوتابخانەکان کرانەوە و خوێندن دەسپێکردەوە. منیش ناچاربووم، هەوڵبدەم، لە خوێندنەکەم دوانەکەوم و بخوێنم. مامۆستا (عومەری مەلانیسەک)، بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو، هاوڕێی باوکم و دۆستی ماڵی پوورێشم بوو. هەرچی چۆنێ بوو، لە پۆلی پێنج وەریگرتم و دەسم بە خوێندن کردەوە.

ئەو ماوەیە، زۆر بێ هێز و بێ ورە بووم، بیری (سولەیمانی)م دەکرد و بیریشم هەر لای باوکم بوو. چونکە بە هیچ جۆرێ، هەواڵمان نەدەزانی. خۆم گەورەی خۆم بووم. ڕۆژانە (سەلاح)ی برام پێش خۆم دەدا، بە قەڵاکەی پشت مزگەتی گەورەی (ڕانی)دا سەردەکەوتین، تازە (6) ساڵی پڕکردبوەوە، لە پەنا تەنکی ئاوەکەدا لێی دادەنیشتین و جگەرەم دەکێشا. ڕووم نەدەهات، لەبەرچاوی خەڵک بیکێشم.

ڕاستیان گوتووە: گەورە ئاودەڕێژێ و بچووک پێی لێدەخا! چۆن (حەسەن) منی فێری جگەرەکێشان کرد، منیش هەر بە ئەو شێوەیە، زۆرم لە(سەلاح) کرد، جگەرەبکێشێ، خۆ منالیش هەر یەک دوو جگەرەی زەحمەتە، ئیدی وەک دەڵێن: ئەوی دیکەی ڕەحمەتە! جا سەیر ئەوەبوو، پارەشم پێ نەبوو، جگەرە بکڕم، هەموو شەوێ (سەیید عەبدوڵڵا)ی زاوام، لە هەیوانەکە دەنووست، بە ئاسپایی دەچووم، قتوی جگەرەکەیم دەکردەوە، سێ چوار جگەرەی زلم دەردەهێنا و ڕۆژی دوایی دەمکێشا. ئەویش هەر ڕۆژێ دووان پێی نەزانی،

دوایی هاواری لێ هەستا و گوتی: خۆزگە دەمزانی، کێ دەسکاری قتووەکەم دەکا، من هەر قتوو پڕەکەم و بەیانی هەڵدەستم، نیوەیی بووە! تا لە ئەوێش بووین، مامە (سەیید) لە ئەو بەزمە تێ نەگەی و نەشیدەتوانی، کەس تاوانبارکا، چونکە ماڵەکە جمەیدەهات و منالیشی زۆر تێدابوو!

### گەشتی (قەلادزێ)

ڕۆژێ لەگەڵ (هەژار)ی هاوڕێمدا ویستمان، کەمێ بای باڵی خۆمان بدەین. لەبەرئەوە، سواری پشتی گەلابەیەك بووین، چووین بۆ (قەلادزێ). سەرەتا لە ئەوێ، سەرێکی ماڵی پورە (خاتم)م دا و نانمانخوارد. پاشان کەمێ بە نێو بازاڕەکەدا گەڕاین، دوایی ویستمان، بگەڕێینەوە، ترومبێلمان دەس نەکەوت. ناچاربووین، هەر بە جادەکەدا بەپێ گەڕاینەوە.
ئێوارە بە تەواوی تاریکیکردبوو، تازە لە دەربەندەکەی (ڕانیێ) ڕەتبووبووین، لە پڕ دەنگی وڕەوڕێکی گەورە و ژاوەژاوێکی زۆمان گوێ لێبوو، تا دەهاتیش، دەنگەکە زیادیدەکرد و نزیکتردەبوورەوە. (هەژار) گوتی: بە خوا ئەوە دەنگی تانکە و سوپا بەرەو (قەلادزێ) دەچێ، ئێستە بە ئەم شەوە تاریکە بمانگرن، دەمانکوژن. با لە جادەکە لادەین و تا زووە ڕاکەین. ئیدی من چارم نەما، زۆر ترسام و دوایکەوتم.
(هەژار) خەڵکی (ڕانیێ) بوو، هەموو ئەو ئێوچەیە شارەزابوو، بە ئەو شەوە تاریکە، بە ئەو دەشتەدا، بە نێو ئەو بێستان و جۆگاتەدا ڕامانکرد، تا گەیشتینە گوندی (بۆسکێن). کاتێ چووینە نێو گوندەکە، کەسمان نەدی و چۆڵکرابوو. ئێمەش زۆر ماندووبووین، مژگەرتەکەمان نەدۆزییەوە، چووینەژوورەوە، یەك دوو حەسیرە شڕی لێ داخرابوو. یەکسەر پەلاداهاتین و سەرخەوێکمان شکاند. بەلام هەر زوو، لە دەنگی کەرە بەرەلاکانی گوندەکە خەبەرمانبووەوە. ئیدی هەستاین، بە قەراغ جۆگەکەدا و بە بن ئەو دارانەدا، گەیشتینەوە سەر ڕێگاکەی (قوولێ)، ئینجا جیابووینەوە و هەریەکەمان بۆ ماڵی خۆمان گەڕاینەوە.
ئەو شەوە تا گەڕامەوە، کەس لە ئەو ماڵەدا خەوی لێ نەکەوتبوو، چونکە نەیاندەزانی، لە کوێم و چیم بەسەرهاتووە. بۆ بەیانی بۆمان دەرکەوت، وڕەوڕەکە گەلابەبوو، تانك و سوپا نەبوو، ئەمە گوایە گەشتمانکرد!

### هێندێ لە شتە خۆشەکانی (ڕانیێ)

لە (ڕانیێ)، چەن شتێکی خۆشی لێبوو، هەرگیز بیرم ناچێتەوە. لە تەنیشت ماڵی پورمەوە، ژنێکی قەڵەوی ڕەشتاڵە دەژیا، ناوی (ئایشێ زەولە) بوو. هەموو ڕۆژێ لەبن دارتووەکەی

سەر کانییەکەی بەر ماڵی پورمدا دادەنیشت، گەر یەکێ تەماشایکردایە، تووڕەدەبوو. ئێمەش بەرانبەری نەوەستاین و پێی پێدەکەنین. ئەویش هەرچی بە دەمیدا بهاتایە، دریغی نەدەکرد وبەیگوت، بە دیاری بۆ کەسوکاری دەناردین!



وێنەی دارتووەکە و سەر کانییەکەی بەر ماڵی پورم

پیاوێکی ڕووتەڵەی شێتیشی لێ بوو، ناوی (نەبی) بوو، هەمیشە منداڵی ڕاودەنا و لێیان تووڕەدەبوو، وەك (وەفایەکەچەڵ)ی لای خۆمان، بەردی دەهاویشت. منداڵانیش پیاوی ساغ شێتدەکەن، جا یەکێ خۆی شێتبێ و تووڕەشبێ، لە خوایان دەوێ و دەبێ چی لێ بکەن؟! زۆر جار بە بەردەوە ڕاویدەنام، لە تاواندا لە حەوشەکەش خۆم بۆ نەدەگیرا و بە پەیژەکەدا سەرنەکەوتم بۆ سەربان، لە ئەوێوە بانگمدەکرد، پێی پێدەکەنیم و گاڵتەم پێ دەکرد. ئەویش هیچ دەسەڵاتی نەبوو، دەستی نەدەگەیشتمێ، لە تاواندا: هەر هاواریدەکرد و کەسیش تێی نەدەگەیی! زۆربەی جار، (شەونم)ی خوشکم و (سەلاح)ی برام، بە ئەوە دەترساند و خەویان لێ دەکەوت، دەمگوت: گەر نەنوون، دەڕۆم، (نەبی)یە شێتتان بۆ بانگدەکەم. ئەوانیش دەگریان و بە هێمنی دادەنیشتن.

سەیر ئەوەبوو، یەکەمین ژنی باوکم (شەفیقە)ی ناوبوو، لە (ڕانیێ) شوویکردبوورەوە و دراوسێی ماڵی پورم بوو، ئەویش هەر لەبن تووەکەدا دادەنیشت. ئەو کاتە ژنێکی قەڵەوی بەساڵاچووبوو. کاتێ ئێمەی دەبینی، دەیگوت، قێی لێهاتووە، لێمان مۆڕدەبوورەوە و جنێوبارانی دەکردین، وایدەزانی، خەتای ئێمە بووە، باوکم وازی لێ هێناوە!

پیاوێکی دیکەش هەبوو، ناوی (عەوڵاکوێر) بوو. ئەم پیاوە ئاشیرینبوو، بەڵام زۆر عەنتیکە و قسە خۆش بوو، لە مانگی ڕەمەزاندا، بە کۆڵانەکانی (ڕانیە)دا دەگەڕا، ئێواران و پارشێوان دەمەوڵیدەکوتا. ئێواران خەڵکی ئاگاداردەکردەوە، کە ڕۆژوەکانیان بشکێنن و پارشێوانیش، بۆئەوەی هیچ نەخۆن. منداڵانی گەڕەکیش، ئێواران لێی کۆدەبوونەوە و دوای دەکەوتن، ئەویش گۆرانی بۆ دەگوتن. منداڵەکان فێربووبوون، بە دوایدا دەڕۆیشتن و هاواریانئەکرد، ئەویش بە دەنگە ناسازەکەی خۆی وەڵامیدەدانەوە، سەر بە قوورییان دەخستە پێکەنین:

*منداڵەکان: عەوڵاکوێری عەواڵان*

*عەوڵا: دەگێ داکی منداڵان*

*منداڵەکان: عەوڵاکوێری تەرسە*

*عەوڵا: گاڵاوەکەی مەردەزە*

*منداڵەکان: عەوڵاکوێری کەوادە*

*عەوڵا: پشتی ملی لیادە*

ئیدی بە ئەو شێوەیە، ئەو منداڵانە، بێ ئەوەی پێ بزانن، (عەوڵاکوێر) جنێوی خۆی بۆ دایکیان ڕەوانەدەکرد. خەڵکیش شاییان پێ دەهات و توڕە نەدەبوون! دیارە هەر شوێنێ کەلتوور و نەریتی تایبەتی خۆی هەیە، دانیشتووانی هەر شوێنێکیش، بە شێوەیەکی جیاواز چێژ لە ژیان وەردەگرن. هەڵبەتە خەڵکی (ڕانیە)ش، بە ئەو شێوەیە بوون!

گەڕانەوە

ئەو ماوەیەی لە (ڕانیە) بووین، هەر لە ماڵی پورمدا بووین. پارەمان لە (سەییدعەبدوڵڵا) بە قەرز وەردەگرت و پێی دەژیاین. بە تەواوی وەڕزبووبووین، بە کولەمەرگی دەژیاین و باوکیشم ڕەوانەی (سولەیمانی) کرابوو، هیچ دەنگوباسێکیمان نەدەزانی.

ئێمە هیچ ئیشێکمان، لە (ڕانیە) نەمابوو، ناچاربووین، بە زاوڵەکەمان بڵێین، چارەسەرێکمان بۆ بدۆزێتەوە و لێرە ڕزگارمانبێ. (سەییدعەبدوڵڵا) تا بڵێی، پیاوێکی باشبوو، قسەکانی زۆر خۆشبوون، خەڵکی (ڕانیە) زۆریان خۆشەویست و ڕێزیان لێ دەگرت. هەرچەندە سەری بچووبایە، نوێژی نەدەچوو، کەچی لە (مارکس) و (ئینگلز)، کۆمۆنیستتربوو! جاروباریش شەرابی دەخواردەوە. دۆستێکی نزیکی هەبوو، ئاسیاوی باوکیشم بوو، ناوی (موحەممەدی سەییدقادر) بوو، ئەویش هەر کۆمۆنیست بوو. پەیمانیدابوو، یارمەتیمان بدا و لە (ڕانیە) دەربازمانکا.

ئێوارەیەکیان دنیا تاریکبووبوو، بەپێ لەگەڵ (سەییدعەبدوڵڵا) و کاک (موحەممەد)دا، چووین بۆ دەشتەکەی پشت بەنزینخانەکەی ئێستە، لە ئەوێ دوو پیاو وەستابوون، سێ یەستریان پێ بوو. ئیدی ناوی خوامان لێهێنا و سواربووین. کاک (موحەممەد)یش لەگەڵمان هات و ماڵئاواییمان لە (ڕانی) کرد، چۆن هاتبووین، هەروایش گەڕاینەوە، جگە لە جلەکانمان، هیچی دیکەمان پێ نەبوو! سواربووین و بەڕێکەوتین.
سەرەتا ترساین، نەبا بمانگرن. بەڵام وردەوردە دوورکەوتینەوە، ئیدی هیچ جۆرە ترسێ نەما. کاروانچییەکان ڕەشمەی وڵاخەکانیان بە دەستەوە گرتبوو، ڕایاندەکێشا. ماوەیە ڕۆیشتین، تووشی کۆمەڵێکی دیکە بووین. دوایی تێگەیشتم، ئەوان پێشتر دەرچوون و لێرە چاوەڕێی ئێمە دەکەن. پاشان کاروانەکە یەکیگرتەوە، بە نێو ئەو شێو و دۆڵانەدا بەڕێکەوتین، تا درەنگانێ هەر ڕۆیشتین. ئینجا گەیشتینە (چناڕۆک).
ئەو کاتە، (چناڕۆک) وەک ئێستە ئاوەدان نەبوو، تەنیا چاخانەیەکی چکۆلانەی قوڕینی لێبوو، دابەزین و پشوویەکماندا، ئاوێکی سازگار و چایەکی زۆر خۆشمان خواردەوە. پاشان سواربووین و سەرلەنوێ بەڕێکەتینەوە. کاتێ گەیشتینە سەر لووتکەی چیای (هەیبەسوڵتان)، شارۆچکە خنجیلانەکەی (حاجی قادر)مان لێ دەرکەوت.
هێشتا بە تەواوی، دنیا ڕووناک نەبووبووەوە، گەیشتینە نێو ماڵەکانی (کۆیە). کاک (موحەممەد)، ئێمەی لە ماڵی ئاسیاوێکی خۆی دانا و گوتی: کەمێ بحەوێنەوە، تا ترومبێلتان بۆ پەیدادەکەم. وا بزانم، ئەو ماڵەش هەر کۆمۆنیست بوو، دابەزین و خواردنیان بۆ داناین. پاشان قەمەرەیەک هات، ئیدی ماڵئاواییمان لە کاک (موحەممەد) و ماڵەکە کرد، سواربووین و لەچاو ونبووین.
بە ڕێی (کەرکووک)دا بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە. لە ڕێ قەمەرەیەکی سووتاومان بینی، لە قەراغ جادەکە ڕاگیرابوو، شۆفێرەکە گوتی: هەمووی هەفتەیە لەمەوبەر، فڕۆکە بۆمبایەکی پێدا کێشاوە، کەسی تێدا دەرنەچووە و هەموویان شەهیدبوون. یەکێکیان بەرگدروویەکی خەڵکی (سولەیمانی) بوو، ناوی (ئەحمەد هوشیار) بوو. ئەو پیاوە هەژارە، کەمێ لە خوار ماڵی ئێمەوە بوو، (سیروان) و (سەردار)ی کوڕیم دەناسی. ئیدی تا لە ئەو ڕێوبانە دەرچووین، لە ترسانا، دڵم لەسەر سەد لێیدەدا! بەڵام کاتێ لە مەترسی دەرچووین و گەیشتینە سەر ڕێی گشتی، ئارامێکمان پێداهاتەوە، چونکە فڕۆکەکان بۆمبارانی ئەو جادانەیان نەدەکرد. بەڵام هەر ئاوبەناو، سەرم لە پەنجەرەی قەمەرەکەوە دەردەهێنا، تەماشای ئاسمانم دەکرد و بۆ فڕۆکە دەگەڕام. هەڵبەتە خوا بەزەیی پێماندا هاتەوە، تووشی ئەو بەڵا گەورەیەی نەکردین!

ئیدی بە ئەو شێوەیە، لە کۆتایی مانگی ئەدا گەیشتینەوە ماڵەوە، گەشتەکەی ئەم جارەی (ڕانی)شمان، بە ناخۆشی کۆتاییهات! ئەمەرەکە لەبەر ماڵی خۆمان وەستا و دابەزین. (ئامە)خان و باجی (سوعاد)، لێمان کۆبوونەوە و پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین. دراوسێ و خزمەکانیشمان بەخێریانهێنایینەوە.

## جارێکی دیکەش قوتابخانەی کانیسکان

بۆ بەیانی چووم بۆ قوتابخانە، بەسەرهاتەکەم بۆ بەڕێوەبەر گێڕایەوە. ئەویش زۆر مەردانە و کوردانە، دڵنەوایکردم و گوتی: بەیانی وەرە و لەسەر خوێندنی خۆت بەردەوامبە. کاتێ بەیانی چووم، هاوڕێکانم لێم کۆبوونەوە و هەر پرسیاریان لێ دەکردم. منیش هەموو شتێکم بۆ گێڕانەوە و ئەوانیش زۆر بە کوڵودڵەوە، گوێیان لێ گرتبووم.
لە ئەو پۆلەدا، زۆربەی هاوڕێ کۆنەکانی ساڵی پێشوو و گەڕەکی خۆمانی تێدابوو. زۆربەی کات، (عەلی سینەما، بەکری محەی ڕیش و دوکتۆر کامیل ئامیق) پێکەوە بووین. ماڵی (عەلی)، لە ئەوبەر قوتابخانەکەمانەوە بوو، زووزوو خۆمان پێدا ئەکرد و دایکی پارووی بۆ ئەکردین. هەروەها (عوسمانی قالەمنەوەر، ئەکرەمی سەییدمەجید) و چەن هاوڕێیەکی دیکەشمان لەگەڵ بوو، ئەوان بە تەمەن لە ئێمە گەورەتربوون، بەڵام چەن ساڵێ مابوونەوە، پێیان گەیشتینەوە، چونکە تاقەتی خوێندنیان نەبوو!
(کەمال جەلال)یش، دوای ئەوەی (پێنجوێن) کاولکرا، ماڵیان لە گەڕەکی (کانیسکان) بوو، هەر لە ئەوێش دەیخوێند و جارجار دەمبینی. ئیدی بە ئەو شێوەیە، دەستە هاوڕێیەکی زۆر خۆش کۆببووبووینەوە، هەمیشە یارییمانئەکرد.
(عوسمان)، حەزی لە وانەی ئینگلیزی ئەکرد، هەر لە ئەو وانەیەشدا باشبوو. هەموو جارێ مامۆستا (ئەنوەر فەخری واسف)، لێی دەپرسین: ئەو (S)ە بۆ لە دوای ناوی (Zeki)ەوە هاتووە؟ ئێمە ئەمانئەزانی، ئەویش ئەوەی باش ئەزانی و هەمیشە، پەنجەی بە حەواوەبوو، هاواریئەکرد: مامۆستا من دەیزانم. ئەویش ئەیگوت: باشە ئەیکە بە هەرا، فەرموو. (عوسمان)یش دەیگوت: (The third person of singular). مامۆستا ئافەرینی لێ ئەکرد، ئەویش تەماشایەکی ئێمەی ئەکرد و پێئەکەنی، وەک قەڵای (خەیبەر)ی گرتبێ! هێندێ برادەری دیکەش هەبوون، شتی زۆر خۆشیان هەبوو، بەڵام لە ئەم یاد و بیرەوەرییەدا ناکرێ، هەموویان تۆمارکرێن. (شێخ جەعفەر)ی برای کاک (عومەری سەییدعەلی)ش، جارجارێ لەگەڵ خۆی کولیچەی ئەهێنا و بەشی ئێمەشی ئەدا. لەبەرئەوە ناویاننابوو، (جەعفەر کولیچە). ئای چەن ڕۆژانێکی خۆشبوو، جا دەبێ چی لە ئەوە خۆشتربێ، مرۆ لە نێو شاری خۆی و خزم و هاوەڵەکانیدا بژی!!؟

## مامەقاڵە

هەموو ڕۆژێ، کاتێ لە خوێندن تەواودەبووین، (مامەقاڵە) لەبەردەرگە وەستابوو. پیاوێکی پیری ڕیشسپی بوو، هێندە لەشسووک و گیانشیرین بوو، هەموو کەس خۆشیدەویست، زمانی زۆر شیرین و لووس بوو، منداڵانی لە خۆی کۆدەکردەوە و قسەی خۆشی بۆ دەکردن. جگە لەوەی ڕۆژانە، لەبەردەم قوتابخانەکەماندا دەمانبینی، هەر لە گەڕەکی خۆشمان دەژیا و هەمووی چەن ماڵێکیش لێمانەوە دووربوو.

لە زستانانا، قاورمەی نۆکی دەفرۆشت. هاواریدەکرد: قاورمەی نۆک، هێندە بە تامە بۆ خۆشم حەزی لێ دەکەم. ئێمەش لێی کۆدەبووینەوە و لێمان دەپرسی: ئەی بۆ نایخۆی؟ ئەویش دەیگوت: ئاخر دایکم لێمدەدا. دەمانگوت: بۆ دایک ماوە؟ چۆن دەزانێ، خۆ لێرە نییە؟ دەیگوت: چۆلەکەکان بۆی دەگێڕنەوە!

جا هەر بە ڕاستی، قاورمەکەی هێندە بە تام و خۆش بوو، لە گەڵێ خواردن خۆشتربوو، کاتێ پارووشی بۆ دەکردین، بە کولێرەی بازاڕ و کەوەر دەیپێچایەوە، کەمێ ئاڵەتیشی پێوەدەکرد، بە ئەو وەستایی و بە ئەو پەلەپەلییە، هەر لە دەسوپەنجەی خۆی دەهات!

لە هاوینانیشدا شەربەتی مێوژی دەفرۆشت و هاواریدەکرد: شەربەتی مێوژت بەمێ، سارد و شیرینە شەربەت، خەستەوخۆرەی نایە شەربەت، سەفرا شکێن و عیللەتپڕێنە شەربەت، کەللە تەزێنە شەربەت. شەربەتەکەشی هێندە سارد و شیرین و خۆش بوو، گڕی دڵ و دەروونی دادەمرکاندەوە. ئاخ هەزار خۆزگە، بە ئەو سەردەمانە، تازە ڕۆژی و ناگەڕێنەوە!

## باوکم و باپیرم

دوایی هەوڵی باوکمان زانی، لە گرتووخانەی سەرەوە گیرابوو، سەرمان لێ دا و خواردنمان بۆ برد. بەڵام بە بۆنەی جێژنی قوربانەوە، هێندێ لە گیراوەکانیان، بە (کەفیل) بەردا. یەکێ لە ئەوانە باوکم بوو.

چەن ڕۆژێ پێش ئەوەی بەربێ، دوو تۆرتەمان هەبوو، هەر لە (پێنجوێن) کڕیبوومان. باپیرم یەکێکی نارد و دانەیەکیان برد، بۆ جێژن دایخەن و دوایی بیگێڕنەوە. ئێوارەی جێژن بوو، لەگەڵ باوکم چووین بۆ ماڵی باپیرم، هەموو لە گوێ مەقەڵی ئاگرەکە دانیشتبووین، بابەگەورە گوتی: (حەمە) ئەو مۆرتەیەت بە چەن کڕیوە؟ باوکیشم گوتی: کاتی خۆی لە (پێنجوێن) کڕیومە و حەفتا دینارم پێداوە. گوتی: مەیبەرەوە، پارەکەت دەدەمەوە. ئیدی باوکم لە ڕوودااما و قسەی نەکرد، باپیریشم پێرە مۆرتەی لەبن ئێمە دەرکێشا و بە تاڵان بردی، چونکە ئەو جۆرە مۆرتەیە، زۆر جوان و ڕێکوپێک بوو، (200) دیناری ئەو ڕۆژەی دەکرد!

**ڕۆژانی جێژن و بەرمزگەوتی گەورە**

ڕۆژانی جێژن، لەبەردەم مزگەوتی گەورەدا، هێندێ کەسی لە ئێمە گەورەتر، لگاویان دادەنا. یەکێکیشیان لەسەر سووچەکە دادەنا، ئیشەکەی ئەوەبوو، گەر پۆلیس هات، هاوارکا و ئاگاداریانکاتەوە، یا هەر خۆی خێرابێ، مۆر و مشەماکە بفڕێنێ. زستانان ساردەبوو، بەربەمی مزگەوت قوڕوچڵپاوبوو، جلەکانمان پیسدەبوو، سەری پەنجەکانی هەردوو دەس و قاچمان دەتەزی. یاری لگاو گەرمدەبوو، زۆربەی منداڵەوردەکە نەزانەکان یارییانئەکرد و دەیانویست، شتێ بەرنەوە و بە پارەکەی ڕابوێرن.

هێندێ جاریش لەسەر پارە و گزیکردن، لگاوچییەکان لێیان دەبوو بە شەڕ، یەکدیان بە بۆکس و شەق دادەگرتەوە، تا پۆلیس دەهات و هەریەکەیان بە لایەکدا ڕایاندەکرد. گەلێ جاریش باوکم دەهات، لە دوورەوە چاوی دەگێڕا و بە دوای ئێمەدا دەگەڕا. لە ڕاستیدا، من هەرگیز حەزم لە ئەو جۆرە کارانە نەکردووە و لە هەموو ژیانمدا، هیچ جۆرە قوماریکم نەکردووە، بەڵام هێندێ جار، (حەسەن)ی برلم و هاوڕێکانم دەیانبردم، منیش بۆ خۆم هەر تەماشامیەکرد!

هەر لە یەکێ لە ڕۆژەکانی جێژنی قورباندا بوو، لە بازاڕەچکۆلە تووشی (عوسمانی قالەمشەوەر) بووم، سینییەکی بە تاڵ و پیاڵەیەکی بەدەستەوە بوو. بارانێکی زۆریش دەباری، جالەکان هەمووی قوڕوچڵپاوبوو. گوتم: ئەوە چییە، چی ڕوویداوە، بۆ وا نیگەرانی؟ گوتی: سینییە قەزوانم پێ بوو، هەموویم فرۆشت، هەموو پارەکەم بە لگاو دۆڕاند. ئێستە ناوێرم بڕۆمەوە، (حەلاو) دەمکوژێ. منیش گوتم: وەرە با بڕۆین، من پارەتیتیەدەم. گوتی: چۆن؟ پیاڵەکەم شکاند، سینییەکەم تۆزێ قوڕاویکرد و پێم گوت: چاخانەکان دەگەڕێین، تۆ دوامکەوە و بگری، منیش دەڵێم، ئەو منداڵە سینیە قەزوانی پێ بوو، بەدەمدا کەوتووە، هەموو قەزوانەکەی لێ ڕژاوە و پیسبووە، ئێستە لە ترسی باوکی ناوێرێ بڕواتەوە، خێرتاندەگا، بەڵکوو یارمەتییەکی بدەن. گوتی: باشە. چاخانەکانیش جمەیاندەهات، چونکە لە لایەکەوە باراندەباری، لە لایەکی دیکەشەوە جێژنبوو، خەڵک کاریان نەدەکرد و دۆمینەیاندەکرد. هەر لەبەردەرکی سەراوە تا بەرخانەقا و سەرشەقام، چاخانە بە چاخانە گەڕاین، بە ئەو شێوەیە پارەیەکی زۆرمان کۆکردەوە. دوایی درەنگانێ بەرەوماڵەوە گەڕاینەوە، (عوسمان) پێنەکەنی و گوتی: ئەم چاکەیەی تۆم، هەرگیز بیرناچێ و هەر پێشی دەگوتم: (شێخە حەیاتەکە!)

**سەرجادەی گەڕەکی (شێخان)**

دوای ماوەیە، باوکم بە یەکجاری بەربوو، لە تەخۆشخانەی سەرەوە دامەزرایەوە و خێزانەکەمان؛ بە تەواوی یەکیگرتەوە. لەبەرئەوە، لە ماڵی (ئامە)خان جێمان نەدەبووە و گواستمانەوە. بە ڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، چونکە (ئامە)خان لە دایك و باجی (سوعاد)یش، لە خوشکێکی گەورە بۆ من باشتربوون. زۆربەی کات لای ئەوان بووم، باجی (سوعاد) یارمەتیدەدام و وانەکانی پێ ڕەواندەکردم.

خانوویەکی سەربەخۆی گەورەمان، لە تەنیشت دووکانی (شێخ سەلامی بەرلەزەردی) و لەسەر جادەی (شێخان)، لە (حاجی کەریم بێکراس) بە کرێگرت، دیوارمان بە دیواری ماڵی (سالحی میسری)یەوە بوو. تا ماوەیەکی زۆریش، (ئامە)خان و (سوعاد)ی کچی، سەریان لێدەداین و لامان دەمانەوە. جاری واشبوو، دایکم منی بە شوێنیاندا دەنارد و دەیگوت: پێیان بڵێ، گەرماومان داخستووە، با بێن، خۆیان بشۆن، چونکە خانووەکەیان گەرماوی تێدا نەبوو. جا هەر بە ڕاستی، ئەو سەردەمانە ڕۆژانێ بوو، کوڕ و کچی گەڕەك، هەموو وەك خوشك و برا وابوون و خەمی یەکدیان دەخوارد، نەك وەك ئەم سەردەمەی، هیچ جۆرە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی خاوێن نەماوە!

**یەکەمین کودەتای بەعس**

نازانم، هۆی چی بوو، جارێکی دیکە باوکمیان؛ لە قوژبنی گرتووخانەی سەرەوە توند کردەوە. زۆر نیگەرانبووین و هەموو ڕۆژێکی هەینی، سەرمان لێ دەدا. بەڵام زۆری نەخایاند و ئەوەی چاوەڕوانمان نەدەکرد، ڕوویدا.

ڕۆژێ لە سەرجادەی (شێخان) بوو بە هەرا و دەنگەدەنگ پەیدابوو. خێرا چوومەدەرەوە، تەماشامکرد، خەڵکێکی زۆر وەستاون و گوێ لە ڕادیۆ دەگرن، وێزگەی (بەغدا) پەیتا پەیتا، بڵاوکراوەی دەخوێندەوە و سروودی شۆڕشگێڕانەی عەرەبی لێدەدا. دوای ماوەیە بڵاویانکردەوە، کە (عەبدولکەریم قاسم)یان گرتووە و گولەبارانیانکردووە. ئەو ڕۆژە ڕۆژی (08. 02. 1963) بوو.

لە گەڕەکی ئێمە، جگە لە کۆمۆنیستەکان، هەموو خەڵکی پێیان خۆشبوو، چونکە زۆربەیان (پارتی) و پێشمەرگە بوون. هەر دوای چەن ڕۆژێکیش، دەرگەی گرتووخانەکان کرانەوە و هەموو گیراوەکانیش بەربوون. جا ئیدی چی لە ئەوە خۆشتردەبێ و بۆ پێم ناخۆشبێ؛ کودەتاچییەکان سەرکەوتوون، گرینگ ئەوەبوو، باوکم بەرەڵابوو!

### یەکەمین گفتوگۆ و دووەمین دیداری (مام جەلال)

پاشان زۆری نەخایاند، گفتوگۆ لە نێوان هەردوو سەرکردایەتی شۆڕش و (بەعس)دا دەستپێیکرد. ڕۆژێ لەبەردەمی دووکانی (شێخ سەلام)دا وەستابووین، لە پڕ خەڵک بەرەو بەرەبەرکی سەرا ڕایاندەکرد. گوتمان چییە؟ گوتیان: (مام جەلال) هاتووە، لە ئوتێلەکەی (نوری عەلی) دابەزیوە و چەن پێشمەرگەیەکیشی لەگەڵ دایە، نیازیان هەیە، بچن بۆ (بەغدا)، سەبارەت بە مافەکانی گەلی کورد گفتوگۆبکەن. من و ڕەوانشاد (کەریمی شێخ سەلام)یش ڕامانکرد و بە پەلە خۆمان گەیاندە ئەوێ. کە چووین، تەماشامانکرد، هێندەی خەڵک لێبوو، یەکێکی دیکەی نەدەگرت. هاوارهاوار و هوتافکێشانێ بوو، پەردەی گوێی مرۆی دەبڕی. تەماشایەکی جەنجاڵەکەم کرد، یەکسەر جەنجاڵ و بەزمەکەی ساڵی (1958)م بیرکەوتەوە. کاتێ سەرۆک (بارزانی) هات و لە هەمان ئوتێل دابەزی، بە هەمان شێوەش، خەڵکێکی زۆر کۆبووبوونەوە.

خەڵکەکەش داوایاندەکرد و هاواریاندەکرد: با (مام جەلال) بێ و قسەمان بۆ بکا. زۆری نەخایاند، (مام جەلال) دەرکەوت، چەن پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو، من تەنیا ڕەوانشاد (سەلامی مەلاسایر)ی خزممان ناسییەوە.

(تاڵەبانی)، هەر لە شوێنەکەی (بارزانی) وەستابوو، سڵاوی لە جەماوەرەکە کرد و بە زمانێکی ڕەوان، دەستی بە قسەکردن کرد. درێژەی بە قسەکانی دا و هێشتا مەبەستی سەرەکی باس نەکردبوو. هەر دوای ئەوەی ستایشێکی زۆری شاری (سولەیمانی) کرد، باسی شاری هەڵمەت و قوربانی، شاری شەڕی بەرەبەرکی سەرا، شاری (شێخ مەحموود)ی نەمر و شاری ڕەوانشاد (ئەختەر)ی هاوسەری (ڕەشۆڵ) و کێ و کێی دیکەی کرد، ئینجا گوتی: (لامەرکەزی)مان وەرگرتووە و نێوەڕۆکەکەی (حوکمی زاتی)یە! ئیدی بێ ئەوەی کەس لە ئەو زاراوە قورس و قەبانە تێبگا، بوو بە چەپڵەلێدان، دەنگی هاڕەی چەپڵە و هوتافکێشان بەرزبووەوە، دوای کەمێکیش خەڵکەکە بڵاوەیان لێ کرد.

### گوندی (سیوەمێرگ)

ڕۆژێکی بەهاری ساڵی (1963) بوو، ڕژێمی (عەبدولکەریم قاسم) ڕووخابوو، لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و (بەعس)دا، ئاگربڕ ڕاگەیەندرابوو، ڕەوشەکە مەترسی نەبوو. لە گوندی (سیوەمێرگ)، کوێخا (عومەر) ژنی بۆ کوڕەکەی هێنابوو، ماڵی پورە (مەلیح)یشم داوەتکرابوون، منیش لەگەڵیان چووم و شاییەکی زۆر خۆشبوو. خۆشترین شتیش ئەوە بوو، ماوەی پتر لە دوو ساڵ دەبوو، (شێخ عوسمان)م نەدیبوو، ئەویش لە ئەوێ بوو،

چاوم پێی کەوتەوە. دوای ئەوەی بەزموڕەزمی شایی تەواوبوو، بووکیان بۆ زاوا لە پەردە کرد، ئێوارە هەموومان لە ماڵی کوێخا کۆبووینەوە. کاکە (نوری ئەحمەدی تەها)ش لە ئەوێ بوو، هەواڵی باوکمی لێ پرسیم.

هەروەها، چەن پێشمەرگەیەکی وەک (جەمالی عەلی باپیر، مام رەووف قەزوانفرۆش، کەمالی عیسمەت ...)یشم بینی، هەموشیان خەڵکی (سولەیمانی) بوون و دەمناسین. کاکە (جەمال) خۆشهاتنی لێ کردم و گوتی: دەڵێی چی هەڵماتێنەکەمان بکەین؟ ئێستەش نیازت نییە، قیچەکەی؟ زۆر دڵم بە ئەوە خۆشبوو، ئەو کوڕە مەردەم بینییەوە!

ئەو شەوە، هەرچی ئەو منداڵانەی لە شارەوە، لەگەڵ کەسوکاریان بۆ شاییەکە هاتبوون، کۆیانکردینەوە، کاک (نوری) داوای لێ کردین، سروودەی کوردی بڵێین. ئێمەش زۆر باشمان لەبەر نەبوو، ئەویش گاڵتەی پێ دەکردین!

ئەوە دووەمین جاربوو، دوای پتر لە دوو ساڵ شۆڕش، لە نزیکەوە بنکە و بارەگەی پێشمەرگە ببینم و قسەیان لەگەڵ بکەم. شاییەکی زۆر خۆشبوو، شایەریان هێنابوو، دەمزڵیانتەکوتا و زوڕنایانلێدەدا، چەندین گۆرانی خۆشی فۆلکلۆری کوردییان ئەچڕی و ئەوەی دەیانگوت، ئەیاندەگوتەوە، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد، پاشان بۆ بەیانی، ماڵاواییمان لە (شێخ عوسمان) کرد و گەڕاینەوە.

## تاقیکردنەوەی بەکەلۆری

هەمووی چەن مانگێ بوو، لە ئەم خانووە خۆشە نوێیەدا دەژیاین، ساڵی (1963)، تاقیکردنەوەکانی سەری ساڵی پۆلی شەشی سەرەتایی بەکەلۆری دەسپێکرد. زۆر باش خۆم بۆ ئامادەکردبوو، زۆر خۆم ماندووکردبوو، باشبوو، هەر خولی یەکەم، لە هەموو وانەکاندا دەرچووم، یەکەمین قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم بڕی و تەنیا وەک یادگارێ، لە ژیانمدا مایەوە!

## پشووی هاوین

مامە (عومەر)م، بەرانبەر دووکانی باپیرم و لەبەر شارەوانییە کۆنەکەی نێو بازاڕ، دووکانی میوەفرۆشی هەبوو، ئێستەش هەر لە ئەوێ ماوە و پیازەفرۆشێ. بۆ ئەوەی ئەسوڕێمەوە و نازاوە نەنێمەوە، لە کێشە و گرفت دووریم، باوکم لای مامم دایناام.

مامم، هەر لە سەرەتای لاوێتییەوە، لەگەڵ (مامەعەلی) هاوڕێیدا، پێکەوە کاریانکردووە. پیاوێکی زۆر قسەخۆش و زمان شیرینە، تا بڵێی هێمن و لەسەرخۆیە. کۆن ئەندامی پارتی (کۆمۆنیست) بوو.

لە ئەو ماوەیەدا، لای مامم بووم، بێ بەرانبەر کارمدەکرد، بێ ئەوەی یەك پولی قەڵپم بداتێ، تەنانەت نانی نیوەڕۆشی بۆ نەدەکڕیم! بە شێوەیەکی گشتی زۆربەی (باراوی)ەکان چرووکن، لە بنەماڵەی (شێخ عەزیز)یشدا، جگە لە باوکم، هەر سێ کوڕەکەی دیکەی، هەم پژد و هەم بەرچاوتەنگ بوون، کاتێ باوکیشم پیربوو، خوی براکانی دیکەی گرتەوە!

بەڵام لە هەمان کاتیشدا، گەلێ شت فێربووم، بە ئەو تەمەنەوە (13 ساڵان)، تێکەڵاوی ژیانی نێو بازاڕ و کارکردن بووم. ئەزموونێکی نوێبوو، لە لایەکەوە، گەلێ کەسم لە هەموو جۆرە تەمەن و پیشەیەك ناسی، لە لایەکی دیکەوە تێکەیشتم، ئەو خەڵکە بە چ شەڕەشەقێ، پارە پەیدادەکەن، پاروویە نان بۆ خۆیان و منداڵەکانیان دابیندەکەن. لە لایەکی دیکەشەوە، بە تەواوی چاوم کرایەوە و فێربووم، چۆن هەوڵبدەم، باوەڕ بە خۆم بکەم و فێری نانپەیداکردن بم!

بە ڕاستی، هەرچەندە ڕەوشی نێو بازاڕ و گەرمای هاوین، هێندێ گرفت و بێ ئارامی هەبوو، بەڵام لە هەمان کاتیشدا، ڕۆژانێکی خۆشبوو، یاد و یادگارەکانیشی، هەر لە بیرەوەریمدا، بە زیندوویی ماونەتەوە. چونکە، من بە ئەو ناوە نامۆ نەبووم و شارەزای بازاڕەکە بووم، بەڵکوو هەر لە منداڵیشەوە، مۆگری بازاڕبووبووم، دووکانی باپیرم و مامەکانم، لە ئەوێ بوون. بۆیە ئێستەش، زۆربەی کات سەر لە ئەو ناوە دەدەم، لەگەڵ مامە (عومەر)م و مامە (عەلی)دا، یادی جاران دەکەینەوە!

★ ★ ★



لە ڕاستەوە: مامە عەلی، خۆم، مامە عومەر و شێخ بەختیار باراوی

### قەدەغەکردنی هاتوچۆ

گفتوگۆی نێوان هەردوو سەرکردایەتی (پارتی) و (بەعس)، زۆری نەخایاند، هەمووی دوای چوار مانگ، سوپای دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، پەلاماری (کوردستان)ی دایەوە، دووبارە جەنگ و ناخۆشی دەستیپێکردەوە. ڕەوشی (کوردستان) بە گشتی و باری نێو شاری (سولەیمانی) بە تایبەتی، بە تەواوی تێکچوو.

سەرلەبەیانی زووی ڕۆژی (9. 6. 1963)، بڵندگۆ بە هەموو جادە و شەقامەکانی نێوشاردا دەگەڕا و قەدەغەکردنی هاتوچۆی ڕاگەیاند. لە هەمان کاتیشدا، لە هەموو لایەکەوە دەنگی تەقەیەکی زۆر دەهات.

ئەو شەوە، باوکم لە نەخۆشخانە نێشکچیبوو. ئێمەش نەماندەزانی، چی ڕوویداوە و زۆر دەترساین. لە پەنجەرەی ژووری سەرجادەکەوە، تەماشای دەرەوەم دەکرد، جگە لە زیلی سەربازی و ترومبیلەکانی پۆلیس، سەگ و پشیلە خوێڕییەکانی گەڕەک، هیچی دیکە نەدەبینرا. هەموو سەرجادە و نێوکۆڵانەکان چۆڵبوون و چۆلەکەبەکوژیان تێدا نەبوو. هەر کەسێ لە ماڵی خۆی بێدەنگ دانیشتبوو، کەس نەیدەزانی، چ چارەنووسێکی ڕەش چاوەڕێیدەکا!

هێندەی پێ نەچوو، سەرجادەکەی بەرماڵی ئێمەش پڕبوو، گوێم لێبوو، کۆمەڵێ سەربازی عەرەب دەگیاندەهات و جنێویان بە خەڵک دەدا. لە ئەو ڕیزەماڵەی ئێمە، لە پێش هەموو کەسێکدا، (شێخ سەلام)ی دوکانداریان گرت، لێیاندەدا و بە پاڵ بردیان، ئەویش هەر هاواریدەکرد. ترومبیلێکی سەربازی گەورە وەستابوو، جەمەیدەهات و ئەویشیان تێ ترنجاند. لەسەر جادەکە، تەنیا دوو ماڵی لێبوو، ئێمە و ماڵی (ساڵحی میسری) بووین، لە کۆڵانەکەی تەنیشتیشماندا، ئەم بەر و ئەو بەر ماڵ بوو، بەڵام سەیر ئەوەبوو، کەس لە دەرگەی ئەو ڕیزەماڵەی ئێمەی نەدا! ئەم کشوماتی و بێدەنگییە، ئەم ڕەشبگیری و کوشتنوبڕینە، دوو ڕۆژی خایاند، دوای ئەوە بە بڵندگۆ هاواریانکرد، خەڵک بۆی هەیە، ماوەی دوو کاژێر هاتوچۆبکەن و لە بازاڕ، پێداویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆیان بکڕن!

### مۆڵەتێکی کورت و ڕەوتی ڕووداوەکان

کاتێ چووینەدەرەوە، ئینجا زانیمان، خەڵکی گەڕەکەکەمان چییان بەسەرهاتووە. زۆربەی زۆری ئەو ماڵانەیان پشکنیبوو، پیاویان تێدا نەهێشتبوو، هەموویان گرتبوون.

من و (کەریمی شێخ سەلام) بەرەو مزگەوتی گەورە ڕۆیشتین. خەڵک دەستەدەستە، سەریان لە باخی نەخۆشخانەکەی بەرانبەر مزگەوتەکە دەدا، ئێمەش چووین و سەیرمانکرد،

پیاوێ کەوتبوو، دەستێ چلی مراخانی لەبەردابوو، چاماتەیەکی بەسەرەوەبوو، هەموو سەروچاوی بە خوێنێکی ورشکەوەبوو داپۆشرابوو، جەستەی بە تەواوی ئاوسا بوو، مێشێکی زۆر تێیاتدابوو، بۆگەنیکردبوو، بێ خاوەن لە ئەو ناوە فڕێدرابوو، کەسیش نەیدەوێرا، هیچ بڵێ، یا خۆی بکا بە خاوەنی!

لە ئەو لاشەوە، وەجاخە دەسگێڕەکەی کەوتبوو، دیاربوو، بە لەقە بۆیان قوپاندبوو، هەموو پیاڵە و ژێرپیاڵەکانیشیان شکاندبوو. ئیدی ئەو خەڵکەی دەیبینی، دڵی بۆی پڕ دەبوو، کەمێ تەماشایاندەکرد و دەڕۆیشتن. ئێمە دوایی زانیمان، ئەو پیاوە کوردە ڕەوانشاوە، (ئامدار)ی چایچی بوو. هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو، لە ماڵەوە دەردەچوو، چای بە کرێکارەکان دەفرۆشت. دیارە ئەو بەیانییە، ئاگای لە بڕیاری قەدەغەکردنی هاتوچۆ و ڕەشبگیرییەکە نەبووە، لەبەرئەوە دیویانە و لە دوورەوە دەسڕێژیان لێ کردووە، پاشان تەرمەکەیان، لەنێو ئەو باخەدا فڕێداوە، هەر وەک چۆن (خولەبور)یشیان، بە ئەوە شێوەیە کوشتبوو، کە شێتێکی فریشتەئاسابوو، ئاگای لە هیچ نەبوو!

هاتینەوە بەر مزگەوتی گەورە، مامە (بەکر)م بینی، لێی پرسیم: ئەوە چی دەکەی؟ بڕۆرەوە ماڵەوە، بە ئەم زووانە ماوەی هاتوچۆکە تەواودەبێ. منیش یەکسەر ڕۆشتمەوە.

نەخۆشخانەی گەورەی سەرەوە

هێندەم زانی، باوکم بە ترومبیلی فریاکەوتنی خێرای نەخۆشخانە هات، بە سەدرییەکی سپی نەخۆشخانەوە، خۆی کرد بە ماڵ و گوتی: خەڵکێکی زۆر کوژراو و بریندار هەیە، سەرم لە ماڵی باوکم داوە، (بەکر) لە ئەوێ نەبوو، بەڵام (عومەر) زۆر پەرێشانە، بڕیارم داوە، لەگەڵ خۆم بیبەم بۆ نەخۆشخانە، تۆش خۆت کۆکەرەوە، لەگەڵ ئەودا وەک نەخۆش دەتانخەوێنم. باوکم پتر لە هەموو کەسێ، خەمی براکانی بوو، ئیدی ڕۆیشت!

پاشان مامم بە پەلە هات. هێشتا کەمێکی مابوو، ماوەی هاتوچۆکردن تەواوبێ. ئیدی هەردووکمان خۆمان گەیاندە نەخۆشخانەی سەرەوە. پێش ئەوەی ئێمە بگەین، بەهۆی دوکتۆرێکی ناسیاوییەوە، باوکم مامە (عومەر)ی بە نەخۆش و منیشی بە هاوڕێنەخۆش تۆمارکردبوو. کراسی سپی نەخۆشخانەمان وەرگرت و لەبەرمانکرد. لە ژوورێکی گەورەدا، لەسەر دوو قەرەوێڵە لێی پاڵکەوتین. مامیشم هێندەی دیکە پەرێشانبووبوو، چونکە هەر شتێ لێکدەدایەوە و ترسابوو. گوتی: گەر هاتن، ناڵێن تۆ چیتە، وا لێرە کەوتووی؟ منیش لەبەر پێکەنین، خۆم بۆ نەدەگیرا. ئەویش تووڕەدەبوو. باوکم پێی گوت: گەر لێیان پرسیت چیتە، بڵێ، گەدەم دێشێ و چاوەڕێی نەشتەرگەری دەکەم. مامم هێندە

دەترسا، بە تەواوی پێ ئامیکردبوو، هەمیشە بە ئەو گەرما و بە ئەو ڕۆژە خۆشەی مانگی شەش، هەر لە ژوورەوە پاڵکەوتبوو و دەرەوەی نەدەدی. من بیانووم هەبوو، جارجاری سەرێکم لە ژوورەکەی باوکم دەدا و کەمێ لە نێو باخەکانی حەوشەکەدا دەسووڕامەوە، جاروبارێش لە دوورەوە، دەنگی تەقە دەهات، وا دیاربوو، هێزەکانی سوپای داگیرکەر، هێشتا پلانەکەی خۆیان، بە تەواوی جێبەجێ نەکردبوو، هێشتا ئامانجەکانی خۆیان نەپێکابوو!

دوو ڕۆژمان بە ئەو شێوەیە بەڕێکرد و هیچ نەبوو. سەری سێیەمین ڕۆژمان بوو، زۆرم لە مامم کرد، سەرێ لە دەرەوە بدا و هەوایەکی خاوێن هەڵمژێ. هەر هێندە، کەمێ لەبەر ژوورەکەی باوکمدا دانیشتین، دوو مەدرەعە و پیکابێکی سەربەتاڵ هاتن. پیکابەکە لەبەردەمی ئێمەدا وەستا، پڕبوو لە بریندار. لەنێو بریندارەکاندا، کاک (عەلی) فەڕاشی نەخۆشخانەکەی (سەییدسادق)ی تێدابوو. یەکسەر ناسیمەوە.

بە باوکمی گوت: (جەمال)ی برامیان، لەبەردەمی دایکمدا گوللەبارانکرد. باوکیشم گوتی: زۆر قسەمەکە، لەبەر برینەکەت خراپە. ئیدی مامم کە گوێی لە ئەم قسانەبوو، بە پەلە هەستا، هاواری سەگی دەکرد و گوتی: وەرە ژێر باڵم. منیش ناچاربووم، دەسی بگرم و لەگەڵیدا بڕۆم. بەڵام پێکەنینی گرتبوومی، خۆم بۆ نەدەگیرا، چونکە پێش ئەوە هیچی نەبوو، لەبەر خۆرەکە دانیشتبوو، جگەرەی دەکێشا. ئەویش بە تەواوی تووڕەبووبوو، جنێوی پێ دەدام و دەیگوت: با ئەمانە بڕۆن، چارتدەکەم. هەر کە چووینە ژوورەکەی خۆمان، یەکسەر پاڵکەوت، سەر و نێوچەوانی توندتوند بەست، بە منی گوت: دەی قاچ و دەسم پشێلە، سەرمامبووە و کۆڵنجمکردووە. تا دوایی باوکم هات و کەمێ هێواشی کردەوە. ئینجا گوتی: من لە ماڵەوە لە ترسی ئەم بەزمە ڕامکردووە، بەڵام وا دیارە، ئێرە خراپترە، هەر بەیانی هاتوچۆکرایەوە، یەکسەر دەردەچم. پاشان هەر واشیکرد و بۆ سبەینێ هەردووکمان لە نەخۆشخانە دەرچووین.

باوکم دوایی گوتی: هەموو ئەو بریندارانەیان لە (هەربەت) و (سەییدسادق)ەوە هێنابوو. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، تەنیا هەر لە نێو شاری (سولەیمانی)، هاتوچۆ قەدەغە نەکرابوو، بەڵکوو لە هێندێ شوێنی دەوروبەری شاریش، ئەو کارەیانکردبوو. خەڵکێکی زۆریشیان بریندار و شەهید کردبوو!

مامم بە تەواوی تێکچووبوو. چونکە بەرانبەر ماڵی باپیرم، دەسڕێژیان لە دایک و کوڕێ کردبوو، (شەمسە)خان و (جەلیل)ی ئاغەوا، هەردووکیان بەسەر یەکدا کەوتبوون و گیانیان دەرچووبوو. ئەویش لە پەنجەرەی ژوورەکەی خۆیەوە، ئەمەی بە چاوی خۆی دی بوو، ئیدی بە جارێ فریشکیکەوتبوو!

دوای ماوەیەکی کەم، ورده‌ورده بارودۆخەکە هێوربووەوە، ماوەی هاتوچۆکردنیان زیادکرد، تا وای لێهات، هەر لە بەیانییەوە تا کاژێری (5)، خەڵك بۆی هەبوو، هاتوچۆبکا و دووکان بکاتەوە. ئینجا بە تەواوی دەرکەوت، سەربازە کێویلە دڕندەکانی (بەعس)، چیان بەسەر خەڵکی شار هێناوە، چیان لە خەڵکی بێدەسەڵات کردووە، چەن کەسیان بریندار و شەهید کردووە، ئەوانەی گرتبوویشیان، تا ئەو کاتە هەموویان، بێ سەر و شوێن بوون، کەس نەیدەزانی، لە کوێن و چیان بەسەرهاتووە!

## دەسەڵاتی شۆڕش

دوای ئەو کارەساتانەی دوژمنی داگیرکەر، بەسەر گەلەکەمانیاندا هێنا، شۆڕشی کورد ڕۆژ بە ڕۆژ بەهێزتردەبوو. خەڵکێکی زۆر لە تاو ڕاونان و گرتن، چەوساندنەوە و ڕەشەکوژی (بەعس)، پەنایان بۆ شۆڕش و چیا سەرکەشەکانی (کوردستان) برد، ڕوویان لە ڕووگەی کوردایەتی ڕاستەقینە و تێکۆشان کرد، هێندەی دیکە، ڕیزەکانی شۆڕش و لەشکری ڕزگاریخوازی گەلەکەمان گەشەیکرد.

هەر لە یەکەمین ڕۆژی کودەتا ڕەشەکەی (بەعس)ەوە، زۆر خراپ پەلاماری (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)یشیان دا، بە هەزارانیان لێ گرتن و کوشتن. بڵاوکراوەی ژمارە (13)یان دەرکرد، بەپێی ئەو بڵاوکراوەیە دەبووایە، کۆمۆنیستەکانیان قڕکردایە. لەبەرئەوە لە ناچاریدا، پەنایان بۆ شۆڕشی کورد برد، بە سەدان کۆمۆنیستی کورد و عەرەب ڕایانکرد، لە ڕیزەکانی شۆڕشی گەلی کورددا، دژی دەوڵەتی داگیرکەری (بەعس) دەجەنگان. بە کورتییەکەی، نێو شارەکان چۆڵ و چیاکانیش پڕبووبوون!

لە ئەو ڕۆژە ڕەش و سەختانەدا، بارێکی زۆر خراپی نەتەوەیی، ڕامیاری، ئابووری و کۆمەڵایەتی، لە سەرتاسەری (کوردستان)دا دەفرێندرابوو، پرۆسەی بەعەرەبکردنی ناوچە (کوردستان)ییەکانی دەڤەری گەرمیان بە گشتی و نێو شاری (کەرکووک) بە تایبەتی دەستپێکرد. پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردیش، دریغییان نەدەکرد و بە دەستێکی پۆڵایین، لە هێزەکانی دوژمنی داگیرکەریان دەدا و دەستێکی باشیان لێ دەوەشاندن.

## قۆناغی خوێندنی ناوەندیی (1963 – 1967)

سەرەتای مانگی نۆبوو، دیسانەوە دەرگەی قوتابخانەکان کرانەوە. هەرچی بڕوانامە و شتی پێویستبوو، ئامادەمکرد و لەگەڵ ڕەوانشاد (حەمەساڵحی عەبەپشی)دا، لە ئامادەیی

(سولەیمانی) وەرگیراین. هەمووی چەن ڕۆژێ بوو، دەمانخوێند، بەڕێوەبەری ئامادەیی مامۆستا (سامی حوسێن نازم) و یاریدەدەرەکەی مامۆستا (ئیحسان)، بەسەر پۆلەکاندا گەڕان و پێیان ڕاگەیاندین، نابێ بە جلی کوردییەوە بێن و دەبێ چاکەت و پانتۆڵ لەبەرکەن. بەڵام ئێمە گوێمان نەدایە، هەر بە جلی کوردییەوە دەچووین! وا بزانم، هەمووی هەفتەیەک بەسەر ئەو ڕاگەیاندنەی بەڕێوەبەری قوتابخانەدا تێپەڕیووبوو، بەیانییەکیان کەمێ دواکەوتین، یاریدەدەری بەڕێوەبەریش، لەبەردەمی دەرگە گەورەکەی نێو قوتابخانەکەدا وەستابوو، دارێکی ئەستووریشی بەدەستەوەبوو، چاوەڕێی ئەو قوتابیانەی دەکرد، کە دواکەوتوون.

ئێمە یەکەم جلی کوردییمان لەبەرابوو، دووەمیش دواکەوتبووین. بۆیە بانگیکردین و ویستی داریکاریمانکا، ئێمەش نەمانهێشت و قەبووڵمان نەکرد. ئەویش گوتی: کەواتە، لەبەردەم ژووری بەڕێوەبەردا بووەستن، تا دێم. هات و گوتی: ئێوە لە چ گەڕەکێ دەژین؟ من گوتم: لە گەڕەکی (شێخان). ئیدی دۆسیەکەی دەرهێنام، نووسراوێکی نووسی، دایە دەستم و گوتی: تۆ بڕۆ بۆ قوتابخانەی (شۆڕش)، ئەوێ بەکەڵکی تۆ دێ، دوانەکەوی، جلی کوردی لەبەردەکەی، کەس لێت ناپرسێتەوە! ئیدی بێ ئەوەی هیچ بڵێم، یەکسەر ڕۆیشتم، هەر ئەو ڕۆژەش دۆسیە و نامەکەم برد و وەرگیرام.

### ناوەندیی (شۆڕش)ی کۆن

قوتابخانەی شۆڕش، لە خوار ئەخۆشخانەی سەرەکی و لە تەنیشت هەتیوخانەکەی گەڕەکی خۆمانەوە بوو، هەر دیوارێکیان لە نێواندابوو. بەڕێوەبەری قوتابخانەکەش، (شەوکەت)ە فەندی بوو. چوومە لای و گوتی: بەیانی زوو وەرە، لە پۆلی یەک دەوامکە.

قوتابخانەی (شۆڕش)، ناوی زۆر خراپ ڕۆیشتبوو. چونکە ئەو قوتابیانەی، حەزیان لە خوێندن نەکردایە، یا سەربەگوێبەتبوونایە، لە ئەوێ کۆیاندەکردنەوە. زۆر جار هەر لە وانەکانیشدا ئامادە نەدەبوون و کەسیش لێی نەدەپرسینەوە! بەڵام من، گوێم بە ئەو شتانە نەدەدا، بۆ یەکێکی وەک من زۆر باشبوو، چونکە یەکەم لە ماڵی خۆمانەوە زۆر نزیک بوو. دووەم زۆربەی هاوڕێکانی هەموو ئەو کۆڵانانەی لێی ژیابووم، هەر لە ئەوێ دەیانخوێند. جگە لە ئەوەی، ئەو سەربەستییەی لە قوتابخانەی (شۆڕش) هەبوو، لە هیچ قوتابخانەیەکی دیکە نەبوو، کە قوتابی لە ئەو قۆناغەی ژیانیدا، حەزی لێ دەکا، زۆر بیر لە خوێندن و دواڕۆژ ناکاتەوە، وا دەزانێ باوک و دایکی بە زۆر پێی دەخوێنن، فرمانێکە و دەبێ، هەرچی چۆنێ بێ، جێبەجێیکا!

هەرچەندە قوتابخانەکە زۆر کۆنبوو، بەڵام لەسەرێکی دیکەوە، زۆر خۆشبوو، چونکە حەوشەیەکی زۆر گەورەی هەبوو، گۆڕەپانێکی فراوانی وەرزشی تێدابوو، هێندێ درەخت و سەوزایشیان لێ ڕواندبوو، ئەو ناوەی ڕازاندبووەوە. ئێمەش هەمیشە، خەریکی ڕاوڕاوێن و یاریکردن بووین.

## قوتابخانەی شۆڕش و ململانێی هێزەکان

لە قوتابخانەی ناوەندیی (شۆڕش)، ململانێیەکی زۆر توند، لە نێوان ئەندامانی (پارتی) و (کۆمۆنیست)ەکاندا هەبوو. ئەو ململانێیە بە شێوەیە بوو، هێندێ جار شەڕی گەورە، لە نێوانیاندا دروستدەبوو. (پارتی) هێندێ کوڕی ئازا و ناسراوی وەك (عوسمانی حاجی غەریب، ئەحمەدی حەمکوڵ، ئاسۆی شێخ نوری، حیکمەتی عەبەپاشا) و گەلێکی دیکەشیان هەبوو. کۆمۆنیستەکانیش لە ئەو سەردەمەدا، هێندەی بیرمبێ، چەن کادیرێکی دیاری وەك (عومەری ساریێ (دڵپاك)، کەمال جەلال (کەمالەکوێر)، جەمالی عەلی فایێ، مستەفا چاوڕەش، موعتەسەم عەبدولکەریم، شێخ جەعفەری شێخ مستەفا)یان هەبوو. هەموویان بە تەمەن لە ئێمە گەورەتربوون. هەرچەندە ئەمانە هەموویان، هاوڕێ و قوتابیی یەك قوتابخانەش بوون، بەڵام ئەو ناکۆکی و ڕکەبەرایەتییە ڕامیارییەی، لە نێوان هەردوو پارتەکەدا هەبوو، لەنێو هەموو دەزگەکانی دەوڵەتیشدا ڕەنگیدابووەوە، هەموویانی لە یەکدی کردبوو، هەمیشە لەگەڵ یەکدیدا ناکۆکبوون!

لە ئەم قۆناغە نوێیەی خوێندندا، کۆمەڵێ برادەری دیکەم ناسی، وەك (فەرەیدوونی حەمەی شێخعلی، علی حاجی سەعەڕەش ...) و گەلێکی دیکەش، بەڵام ئەوانەی زۆربەی کات پێکەوە بووین، (فووادی مچەی ڕەعنا، سەرداری ئەحمێق، سەلاحە لورتە، حەمەی زیە و فەرەیدوون مەجید) بوون. بە داخەوە هێندێکیان نەماون.

لە ڕۆژەکەشماندا، گەلێ برادەری خەڵکی (سولەیمانی) و گوندەکانی دەوروبەری لێ بوو. لە نێو هەموویاندا، (قالەی حوسێنە فەندی، فوواد یاسین ـ فوولەڕەش، مەحموود مەعروف، ئەحمەد حوسێن)م، زیاتر خۆشدەویست. ئەو دووانەی دواییان، خەڵکی گەڕەکی (سەرکارێز) بوون، بەڵام ئەوانی دیکە، هەموویان هەر لە گەڕەکی خۆمان بوون و پێشتر دەمناسین.

ئیدی ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، ئەڵقەی پێوەندییەکانم فراوانتردەبوو، چ لە دەرەوە و چ لە نێوەوەی قوتابخانە، خەڵکم پتر دەناسی. لە ئەم گەڕەکەش، جگە لە هاوڕێکانی سەردەمی منداڵی، گەلێ هاوڕێی خۆشەویستی دیکە، جارێکی دیکە لە ژیانمدا پەیدابوونەوە، هەرە

نزیکەکانیان ئەمانە بوون: (سمەی بلەسووری عەرەبانچی، سەعمەلە، کەمالی عەبە ڕادیۆ، عەلی حەمەجەلیلی سویچگەرچی، هێرشی حەمەی شێخەلی، کەریمی شێخ سەلام، کەمالی ڕەشیدئاغا، دارای حەمەڕەشیدی بەقاڵ، سالار و سەلاحی ئەحمەدی سەرووپێ، کەریم قەرەژان...)، هەموویان کوڕی باش و دڵسۆزبوون، هەمیشە پێکەوە بووین، بە تایبەتی (سمە) و (هێرش)، لە یەکدی جیانەدەبووینەوە!

## ڕێکخستنی ( پارتی )

هەمووی مانگێکی نەبرد، (حوسێنی حەمەی مەلافەتاح)، کە بە (حسەکوێ) و (حسە ڕەبیعە) ناوی ڕۆشتبوو، هات و گوتی: ئێمە تۆ دەناسین، لە خێزانێکی کوردپەروەری، باوکت و مامەکانت هەموویان (پارتی)ن. ئێم یەکدی ناسینەمان بە هەل زانی، تا پێش ئەوەی کۆمۆنیستەکان، بە لای خۆیاندا ڕاتکێشن، پێوەندیت پێوە بکەین، لە ڕیزەکانی (ی. ق. ک.) و (پارتی)دا، کارمان لەگەڵ بکەی و ڕاژەی گەلەکەی خۆت بکەی. منیش بێ ئەوەی بیری لێ بکەمەوە، یەکسەر گوتم: زۆر سوپاس و شانازی پێوە دەکەم، لە ڕیزەکانی (پارتی)دا کاربکەم، بەڵام حەزناکەم، لە (یەکێتی قوتابیان)دا کاربکەم. ئەوە بوو، ئاسەم نووسی و دوای ماوەیە وەڵامیاندامەوە، بە لایەنگیر وەرگیرام، لە شانەیەکدا ڕێکیانخستم و هەر کاکە (حسە)ش لێپرسراومان بوو.

## کۆدەتایەکی چاوەڕواننەکراو

دوای ئەوەی (بەعس)، نۆ مانگ دەسەڵاتداربوو، بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە، فرمانڕەوایی دەکرد، هەوڵیدەدا، بە ئاگر و ئاسن، شۆڕشی کورد نەهێڵێ، هەموو جۆرە ئازادییەکیشی، لە گەلانی (عێراق) زەوتکردبوو. بەڵام باشبوو، لەنێو خۆیاندا تێکچوون. (عەبدولسەلام عارف)ی هاوپەیمانی (بەعس)، ڕۆژی (18. 11. 1963)، کۆدەتایەکی سەربازی بەسەردا کردن، هێندێکی لێ گرتن و ئەوانی دیکەش پەرەوازەبوون. تا ماوەیەکیش، گەلانی (عێراق)ی لە دەس چەوساندنەوە، دڕندەیی و ڕەشەکوژی سەرانی (بەعس) ڕزگارکرد.
لە ئەو ماوەیەدا، جەنگ لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و دەسەڵاتی نوێی دەوڵەتی (عێراق)دا وەستا، بێ ئەوەی هیچ جۆرە مافێکیان بۆ گەلی کورد دیاریکردبێ! بەڵام ماوەیە کوشتنوبڕین ئەما و ڕۆڵەکانی گەلەکەمان، پشوویەکیاندا و ئاهێکیان پێدا هاتەوە، کە ئەوەش خۆی لە خۆیدا، بە یەکێ لە ئوروشستیە گەورە و خاڵە لاوازەکانی شۆڕشەکە دادەنرێ!

## سەرەتای ناکۆکی و دووبەرەکی

سەرەتای مانگی سێ بوو، لە جێژنی (نەورۆز) نزیکبووبووینەوە، ڕۆژێکیان بەیانی زوو چووم بۆ قوتابخانە. لە نێو قوتابیانی پۆلەکەماندا، بوو بە هەرا و گوتیان: (بارزانی) باوەڕی بە خەباتی پارتایەتی نەماوە. منیش وەک لە بانێ بەربمەوە، لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم قسەقۆڕانە چییە، (بارزانی) خۆی، یەکێ لە دامەزرێنەرانی (پارتی) بووە، ئێستەش سەرۆکی (پارتی)ە و چۆن باوەڕی پێی نییە؟!

دوایی (مەحموود مەعرووف)ی هاوڕێم، کە پێکەوە لەسەر یەک کورسی دادەنیشتین، پێی گوتم: بۆ بڕواناکەی؟ گوتم: بڕوا بە چی بکەم، ئەوە درۆیە و دەسەڵات بڵاویدەکاتەوە، بۆ ئەوەی ناکۆکی لەنێو ڕیزەکانی کورددا دروستکا. گوتی: ها ئەوە ڕۆژنامەکە بیخوێنەرەوە. منیش تەماشایەکی گوتەکانی (بارزانی)م کرد، بە تەواوی دڵم شکستبوو. هەر لێکمدەدایەوە و لەبەر خۆمەوە دەمگوت: ئەو پیاوە چۆن قسەی وا دەکا؟! چۆن دەڵێ: باوەڕم بە هیچ پارتێ نییە، کورد و عەرەب بران، هەر کەسێ بچێتەوە سەر کاری خۆی و لە ماڵی خۆی دانیشێ؟! بە ڕاستی وەک ئەوە وابوو، یەکێ لەناکاو شەپازلەیەکی توندم لێدا، سڕبووم و مێشکم هیچی وەرنەدەگرت!

یەکسەر چووم و (حسەکوێر)م دۆزییەوە، لێم پرسی: چی ڕوویداوە، ئایا ئەو دەنگوباسانە ڕاستن؟ (بارزانی) وا دەڵێ؟! ئەویش گوتی: من لە لێپرسراوەکەمەوە، هیچم بە فەرمی پێ نەگەیشتووە و نازانم، هەر کاتێ وەڵامێان بۆ هات، ئاگادارتدەکەمەوە. ئیدی هەر چاوەڕێ بووم، بەڵام تا ئێستەش لە (پارتی)ەوە هیچمان پێ نەگەیشت! تەنیا هەر ئەوە بوو، لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا دەمبیست، دەنگۆکەش ڕۆژبەڕۆژ پتر بڵاودەبووەوە و ئەنجامەکەشی ئاشکرایە، (پارتی) دوولەتبوو، جگە لە نووشوستی و ماڵوێرانی، هیچی دیکەی لێ شین نەبوو!

لەبەرئەوە، ناکۆکی و دووبەرەکی، لەنێو ڕیزەکانی سەرکردایەتی (پارتی)، هێزی پێشمەرگە و شۆڕشدا سەریهەڵدا، هەر بە شێوەیەکی گشتی، خەڵکەکە بوون بە دوو بەشەوە: بەشێکیان بە خۆیان دەگوت، باڵی پەلیتبیرۆ و دواتر بە (جەلالی) ناسران. خۆیان بە خاوەنی ڕەوای (پارتی) دەزانی. ئەم بەشە زۆربەی ئەندامانی ڕێکخستنەکانی خوارەوە، کادێر و سەرکردایەتی (پارتی)یان لەگەڵ بوو. (برایم ئەحمەد) و (مام جەلال) سەرکردایەتییان دەکردن. بەشەکەی دیکەشیان، هەموو ئەوانە بوون، باوەڕیان بە سەرکردایەتی (بارزانی) هەبوو، دژی باڵەکەی پەلیتبیرۆ بوون، بەشی زۆری کادێرە سەربازییەکانی شۆڕشیان لەگەڵ بوو، ئەم باڵەش بە (مەلایی) ناسران.

سەیر ئەوە بوو، هێشتا هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی، ڕامیاری و کەلتووری بۆ کورد وەرنەگیرابوو، ئەم دوو لایەنە ناکۆکە، لەسەر کێشەی سەرکردایەتی و گفتوگۆکردن، پڕوپاگەندەی خراپ و ناشیرینیان، دژی یەکدی بڵاودەکردەوە، ڕیزەکانی (پارتی) و شۆڕش و گەلەکەمانیان دووڵەتکرد، پیلانە گڵاوەکانی داگیرکەری دەوڵەتی (عێراق)یان جێبەجێکرد. واتە، بە دەستی خۆیان، ماڵی خۆیان وێرانکرد!
بە ڕاستی ئەو دووبەرەکییە، کارەساتێکی هێندە گورچبڕبوو، جەماوەری گەل لە داخاندا نەیاندەزانی، چی بکەن و وایاندەزانی، کۆستێکی گەورەیان کەوتووە و ڕەنگی مردوویان لێ نیشتبوو، بە تایبەتی ئەو بنەماڵە تێکۆشەرانەی، قوربانییەکی زۆریان دابوو، خاوەنی شەهید بوون. ڕەوشێ دروستببوو، وای لێهاتبوو، ڕۆژانە لە هەموو شوێنێ، باس هەر باسی ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە بوو!
لە ئەنجامدا، کۆتایی ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە، بە ئەوە شکایەوە، باڵی جەلالی لە گوندێکی نزیک شارۆکەی (ماوەت)، لە مانگی چواردا کۆنفرانسێکیان گرت، لە کۆتاییدا بڵاوکراوەیەکیاندەکرد، ناونیشانەکەی (ڕێکەوتنەکەی مشیر ـــ بارزانی خۆبەدەستەوەدانە یان مافوەرگرتن) بوو، سەرۆکی (پارتی)یان لە دەسەڵات رووتکردەوە. (بارزانی)ش دانی بە بڕیارەکانی ئەو کۆنفرانسەدا نەنا، خۆی کۆکردەوە و زۆری نەخایاند، لە هاویندا هێزێکی کۆکردەوە، پەلاماری سەرکردایەتی جەلالییەکانی دا و لە ناوچەی (ماوەت) دەرییەڕاندن. دوای شەڕێکی کەمیش، هێندێکیان گەڕانەوە و وازیان لە باڵی جەلالی هێنا، هەموو ئەوانەی مانەوە و دژایەتی باڵی مەلاییان دەکرد، ڕاویاننان. تێکشکان و پەنایان بۆ (ئێران)ی دۆستە دێرینەکەی خۆیان برد، لە شاری (هەمەدان) جێگیربوون!
لە ئەو ماوەیەدا، هەرچی دژی باڵەکەی جەلالی بووایە، لە کەشتییەکەی (پارتی)دا، بە سەرۆکایەتی (بارزانی) جێیدەبووەوە. بۆ نموونە: لە گەڕەکی ئێمە کوڕێ هەبوو، ناوی (عوسمانی باجی قەیەم) بوو، بە (عوسمەحەوتە) ناوی دەرکردبوو، پێشمەرگەیەکی زۆر ئازا و قارەمان بوو، هەر لە گەڕەکی خۆشمان بوو. پێش ئەوەی ناکۆکی و دووبەرەکییەکە ڕوویدا، چەن پێشمەرگەیەکی هاوڕێی خۆی، بە زۆر سواری بووبوون، ئەویش لە بێدەسەڵاتی و لە شەرماندا، خۆی کوشت. سەرکردایەتی (پارتی)ش، هەموویانی گرت و چارەڕێبوون، دادگاییبکرێن. کەچی کاتێ دووبەرەکییەکە پەرەیسەند و یەکلاییبووەوە، باڵی مەلایی هەموویانیان بەردا و بە هەموو شێوەیە، دژایەتی باڵەکەی جەلالییان دەکرد، وەک ئەوەی ئەوان لەسەر دید و بۆچوونی جیاوازی ڕامیاری گیرابن!

## لایەنەکانی دیکە

ساڵی (1964) بوو، (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)، ئەو کۆمۆنیستانەی لەگەڵ شۆڕشی کوردا نەبوون و پشتگیری ڕژێمەکەی (عەبدولکەریم قاسم)یان دەکرد، دوای ئەوەی (عەبدولکەریم) نەما، بەعسییەکان دەسەڵاتیان وەرگرت، بە دەستێکی پۆڵایین لێیاندان و ڕاویاننان. ئەوانیش لایەنی (مەلامستەفا)یان گرت و دژی باڵەکەی جەلالی بوون.

(کۆمەڵەی ئازادیی و ژیانەوە و یەکێتی کورد ـ کاژیك)یش، بە هەموو شێوەیە، دژایەتی باڵەکەی جەلالی و پشتگیری مەلاییەکانیان کرد. جگە لە زۆربەی سەرۆك تیرە و هۆزەکان، هێزە کۆنەپەرست و مەلاکان، هەر لەگەڵ (بارزانی) بوون.

ئیدی هەرچی دەهات، زیاتر بەنزینی بە ئاگری دووبەرەکی و ناکۆکییەکەی نێوان هەردوو باڵەکەی مەلایی و جەلالیدا دەکرد، لەسەر حسابی بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد، گڕی ئاگری فیتنەیەکی گەورەی پتریان خۆشدەکرد، تا وای لێهات، ڕۆژبەڕۆژ هێزی مەلایی زیادیکرد و ئای تەرازووی باڵەکەی جەلالی، بە حەواداچوو!

## سەردەمی (کانیی ماسی)

لەنێو بنەماڵەکەی ئێمەدا، تەنیا باوکم لەگەڵ باڵی مەلایی بوو، ئەویش وەنەبێ، هێندە لە کاری ڕامیاریدا شارەزابووبێ، ئەو ڕێبازەی هەڵبژاردبێ، بەڵکوو هاوڕێکانی، کاریان تێ کردبوو. دوای ماوەیە، باڵی جەلالی ڕێکخستنەکانی خۆیان دامەزراندەوە. ئەو کاتە لە (ئێران)ەوە، سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانیان دەکرد. منیش وەك پالێوراوێکی (پارتی)، دوای جەلالییەکان کەوتم و پێوەندییان پێوە کردمەوە.

لە ئەو سەردەمەدا، هەرچی سەرسەری، خوێڕی، هیچوپووچ، پیاو خراپ و هەتیوبازی (سولەیمانی) بوو، لە باڵی مەلایی کۆببووبوونەوە. ئەوەی لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا (1964–1966)، لە شاری (سولەیمانی) ڕوویدا، مەگەر هەر مێژوونووسێکی وریا و بەئاگا، شارەزا و زیرەك، بوێر و ئازا بتوانێ، ڕۆژبەڕۆژ لە پەناوە تۆماریکا، ئەگینا نە بە دەم دەگێڕدرێتەوە، نە لە بیرەوەری کەسیشدا جێیدەبێتەوە. شەو نەبوو، ماڵێ تاڵان نەکرێ، ڕۆژ نەبوو، سوکایەتی بە چەن کەسێ نەکرێ، هەموو جۆرە ئازادییەکیان، لە ڕۆڵەکانی کورد قەدەغەکردبوو، بە تایبەتی ژیانیان، لە خەڵکی (سولەیمانی) تاڵکردبوو! تەنانەت ئەوەی کەسێ قژی درێژبووایە، لەسەر جادەکان و لەبەرچاوی خەڵك، قژیان پاکپاك دەتاشی! مناڵی جوانکیلەی کوردیان، بە زۆر دەبرد و سواریدەبوون. سەرانەیەکی زۆریان،

له دەوڵەمەند و کاسبکارەکان دەسەند. هەر هێندەمان دەزانی، یەك دوو جێبی پڕ لە دەمانچە لە باخەڵ ڕادەوەستا، کۆمەڵێکیان بەر شەق و شەپازلە دەدا و بۆ (کانیی ماسی) ڕاپێچیاندەکردن. دژایەتییەکی زۆری باڵەکەی جەلالییان دەکرد. ئیدی بە جۆرێ باری شارەکە تێکچووبوو، کۆمەڵانی خەڵکی بێچارە، ئاواتیان بە سەردەمی دەسەڵاتی میریی دەخواست!

تەنانەت کۆمۆنیستەکان، لە پەنا (بارزانی)شدا بوون، ئەوانیش لە دەس چەوساندنەوە و زۆرداری لووتبەرزیتەبوون، بە ڕۆژێ چەن کەسێکیان لێ کوشتن. ئیدی وای لێهات، کەس لە سەر و ماڵ و ئابڕووی خۆی دڵنیا نەبوو.

لەبەرئەوە خەڵکەکە پەنایان بۆ (بارزانی) برد و داوایان لێ کرد، سنوورێ بۆ ئەو بارە نالەبارەی (سولەیمانی) دانێ و چارەسەرێکی بە پەلە، بۆ ئەو ڕەوشە خراپە بدۆزێتەوە. ئەویش کۆمەڵێ چەکداری نارد، بۆ ئەوەی ئەو پیاوخراپانە دەسگیرکەن، لەبەرئەوە لە نێو بازاڕدا بوو بە تەقە. بڵاوکراوەیەکیشی دەرکرد، کۆمەڵێ ناوی تێدابوو، هەموویانی تاوانبارکرد و داوایکردبوو، لە هەر کوێ بن، بیانگرن. *

پاشان (عەگید سدیق) هات و لە (سولەیمانی)، نوێنەری (بارزانی) بوو، سەرپەرشتی کارەکانی دەکرد، بەڵام ئەویش هیچی بۆ نەکرا. دوایی، ئەویش لە هەموو کەس خراپتر دەرچوو، دزییەکی زۆری کرد و بوو بە پیاوی میرییش. ئاخر لێپرسراوێ ویژدانی نەبێ، لەسەر ژیان و گیانی ڕۆڵەکانی گەلەکەی بژێ، ڕەوشتی کۆمەڵایەتیشی نییە!

ئەز پێم وایە، ئەوەی لە پشت ئەم بارەنالەبارەوە بوو، بە پلەی یەکەم، (ڕێکخراوی لاوانی نەتەوەی کورد) بوو، کە سەر بە (پارتی گەلی کورد) بوو. هەرچەندە تا ئێستەش، سەرکردەکانی ئەو ڕۆژەی ئەو ڕێکخراوە، نکوڵی لێ دەکەن و دەڵێن: جەلالییەکان بوون، بۆئەوەی بارەکە بشێوێنن، ئاژاوەبنێنەوە و ناوبانگی ئێمەش خراپکەن! بەڵام ئەو قسەیە ڕاست نەبووە و ڕاستیش نییە. گەر سەرکردایەتی ئەو پارتە ڕاستیانەکرد، هەر زوو دەبووایە، هەڵوێستیان وەرگرتایە، بڵاوکێکیان دەرکردایە و دژی ئەو کارە قێزەونانە بووەستانایەتەوە!

سەیر ئەوەیە، هێشتا جەنگ لە (کوردستان) تەواونەبووبوو، هێشتا هیچ جۆرە مافێکی نەتەوەیی و ڕامیاری وەرنەگیرابوو، کەچی لێپرسراوان بە دوای پلەوپایە و دەسکەوتە تایبەتەکانی خۆیاندا وێڵبوون!

---

* بڵاوکراوەکە لە کۆتایی ئەم بەشەدا هەیە.

لێرەدا، گوتەیەکی پڕ بایەخی (بارزانی)م بیردەکەوێتەوە، گوتوویەتی: (حوکوومەتی عێراق زۆر بێ ئەقڵە، ئێمە داوای حوکمی زاتی ئەکەین، کەچی ئەوان ئەستیدەستیمان پێ دەکەن. ئەگەر ئەقڵیان هەبێ، سەربەخۆیی تەواومان دەدەنێ، ئینجا بزانن، دوای شەش مانگ لێپرسراوانی کورد، چی بەسەر میللەت ئەهێنن) *

## باری خوێندن و کاری ڕامیاری

پڕیشکی ئەو ئاگرەسوورەی، شاری (سولەیمانی) گرتبوویەوە، بەر ئێمەی قوتابیانیش کەوت. ڕێکخستنی مەلایی و کۆمەڵەکەی (کانیی ماسی)، دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، هەرچی کوڕی ئازا و دەسرەشێن هەبوو، لەگەڵ ئەوان بوو. گوشارێکی زۆریان لێ دەکردین، نامەبنووسین و هەڵوێستی خۆمان، دژی باڵەکەی جەلالی ڕوونکەینەوە.
هێندێ لە هەڤاڵە کۆنەکانی هاوڕێی خۆمان، لە هەموو کەس خراپتربوون، هەرچییەکمان دەبینی، دەمانچەیەکی پێ بوو، خۆی پێوە بادەدا و دەیگوت: پێشمەرگەم. جگە لە ئەوەی شەڕی نێوان قوتابیە کۆمۆنیستەکان و کۆمەڵەکەی (کانیی ماسی) هەر بەردەوامبوو، لە جارانیش خراپتربوو، بە تەواوی تاویسەندبوو، کەم ڕۆژ هەبوو، یەکێ بە بۆکسی ئاسن و بە چەقۆ بریندار نەکرێ، پۆلیس نەیە، کۆمەڵێ ڕانەکا و کۆمەڵێکی دیکەش بۆ کۆڵینەوە ڕاپێچ نەکەن!
لە گەرمەی ئەو گێرمەوکێشانەدا بوو، ڕۆژێکیان باوکم هات و گوتی: لە قوتابخانەوە ڕاپۆرتێکیان لەسەر نووسیووی، گوایە لەگەڵ کۆمەڵی جەلالی کاردەکەی، گەر بانگتکەن و لە (کانیی ماسی) دارکاریتکەن، کەس ناتوانێ، یارمەتیتبدا و ڕزگارتکا. هەرچەندە ویستم، تێی بگەیەنم، هیچ پێوەندییەکم بە ئەوانەوە نییە، کەڵکی نەبوو، چونکە ئەوان هەرچی کاری لەگەڵ نەکردنایە، بە دژی خۆیانیان دەزانی و وایان دادەنا، پێوەندی بە لایەنەکەی دیکەوە هەیە. بۆیە باوکم بە زۆر، نامەیەکی پێ نووسیم، لە نامەکەدا داوای بۆ کردبووم، لە ڕیزەکانی (پارتی)دا وەرمگرن!
ئەوەبوو، هێندەی پێ نەچوو، (جەمال حەمەئەمین) هات، نامەیەکی دامێ و گوتی: لەمەودوا پێوەندیت بە منەوە دەبێ. (جەمال)م دەناسی، کوڕی (حەمەئەمین)ی شۆفێری ترومبیلی فریاکەوتنەکەی نەخۆشخانە بوو، ئاسیاوی باوکیشم بوو. دوایی نامەکەم کردەوە، مۆری (لاوانی نەتەوەی کورد)ی پێوەبوو.

---

* شەوکەت مەلا اسماعیل حەسەن، بارزانی لە مێژووی شۆڕشی ئەیلول 1961–1975، هەولێر، 2007، ل5.

بەڵام خوا بەزەیی بە ئەو گەلە هەژارەدا هاتەوە، ئەو ڕەوشە خراپە، زۆر بەردەوام نەبوو، زوو تێکچوو و هەر ئەو نامەیەشم بۆ هات، ئیدی کەسی دیکە پێوەندی پێوە نەکردم، لە ئەوە زیاتریش گەڕیان پێ نەکردم.

لە ئەوە دەچوو، وەک شتێ تەنیا ویستبێتیان، لووتمان بشکێنن و نامەیان بۆ بنووسین، بە خەیاڵی خاوی خۆیان بێدەنگمانتەکەن و لە ڕیزەکانی ڕێکخستن دوورماندەخەنەوە، بەڵام نەیاندەزانی، ئێمە لە بنەوە، هەر کاری خۆمان دەکرد!

منیش لە ئەو تەمەنە کورتەدا، وەک هەموو مێردمناڵێکی کورد، چاوم بە ڕاونان و گرتن، کوشتن و بڕین هەڵهێنابوو. گوێم بە هاواری لێقەوماوان و چەرگسووتاوان ڕاهاتبوو، (پارتی) بووکە و (بارزانی) پەیامبەری کوردایەتیم بوون. (کوردستان) لانەی بەهەشت و کوردیش برای ڕەسەنم بوون. بە تایبەتی دوای ئەوەی، شۆڕشی (11. 9. 1961) هەڵگیرسا، وەک چۆن دەروێشێکی خاوەن باوەڕی گەورە، بڕوا بە شێخەکەی دەکا، منیش هەر بە ئەو چەشنە، ئالیسمی خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوەکەم، کارێکی زۆری تێ کردبووم. بەڵام بە داخێکی گەورە و گرانەوە، کارەساتی دووبەرەکی ساڵی (1964)، هەر زوو لە ئەو خەونە خۆشە ڕایچڵەکاندم و هەموو گوڵی هیواکانیشمی، هەر بە خونچەیی هەڵوەراند!

گەشتی (سەییدسادق)

هێشتا هەر لە گەڕەکی (شێخان) بووین، هاوینی ساڵی (1964) بوو، باوکم جیپێکی کورتی چکۆلانەی کڕی. بەڵام نە مۆڵەتی لێخوڕینی هەبوو، نە شۆفێریشی باش دەزانی، بەڵکوو تازە فێربووبوو، شتێکی کەمی لێ دەزانی!

ڕۆژێکی هەینی بوو، باوکم گوتی: لەگەڵم وەرە، پێکەوە دەچین بۆ (سەییدسادق)، کەمێ ئیشم هەیە و پاشان دەگەڕێینەوە. هەرچەند گوتم: نایەم، کەڵکی نەبوو. گوتی: گیانی تۆ لە گیانی من زیاتر نییە! هەرچی چۆنێ بوو، لە بەردەم ماڵی خۆمانەوە، دوو قۆڵی سواربووین. لە چاخانەکەی (کۆزەڕەقە)، پیاوێکی لادێیی دەستی لێ ڕاگرتین و ئەویشی سوارکرد.

باوکم لە هەورازەکاندا نەیدەزانی، چۆن لێخوڕێ و سەرپێچا، لەبەرئەوە دەکوژایەوە، جیپەکەش پاشەوپاش بۆ دواوە دەگەڕایەوە. منیش زۆر دەترسام. شۆفێرێ بە لاماندا تێپەڕیبوو، هاواریکرد: ئیستۆپیکرە و لە شوێنی خۆت بووەستە. ئیدی کابرای شۆفێر هات و هاندبرێکەکەی ڕاکێشا. بە باوکمی گوت: دابەزە، بزانم چییەتی. کابرا سواربوو، بەنزینی دایە و وەک ئیسکەی تفەنگ بزی دەرچوو، بێ گرفت بە هەورازەکەدا سەرکەوت.

منیش پێکەنینم دەهات و باوکیشم لێم تورەبوو! پاشان سەرکەوتین و بە جادە تەختەکەدا ڕۆیشت. باوکم هێندە لە خۆی بایبووبوو، بە دەستێ لێی دەخوڕی و دەستەکەی دیکەشی بە گێرەکەوە گرتبوو، گۆرانیشیدەگوت و لە هەوای خۆیدا بوو!

کاتێکم زانی، ئاگای لە خۆی نەما و لە جادە لایدا. ئیدی هەرچی کرد، بۆی نەگێرایەوە و نەیدەزانی، چی بکا. جیپەکە قڵپبووەوە، هەر چوار تایەکەی ڕووی لە ئاسمان کرد و ئێمەش لە ئێویدا بووین. یەکەم کەس من هاتمەدەرەوە، هاوارمکرد: بابە، بابە، لە کوێی، بۆ نایەیتەدەرەوە؟! هێندەم زانی، ئەویش هاتەدەرەوە و دواتر کابرای لادێییش دەرچوو. نازانم، خوا بەزەیی بە کاماندا هاتەوە، وا هیچمان لێ نەهات و بە ئاسانی ڕزگارمانبوو. من تەنیا تۆزێ ئازاری شان و مل نەبێ، هیچی دیکەم نەبوو!

بە ڕێککەوت (عەبدولخاق)ی فیتەر، لە (هەڵەبجە)وە گەڕایەوە، کە ئێمەی بینی، وەستا و دابەزی، باوکمی دەناسی و هێندێ قسەیان پێکەوە کرد. دوایی من لەگەڵی سواربووم و گەڕامەوە، تا ترومبێلێ بێنم، ڕایکێشین. سەیر ئەوەبوو، ئەویش هەر جیپێکی لە ئەو چەشنەی باوکمی پێبوو!

من لە پێشەوە سواربووبووم، پیاوێکی کەنەفتەکاری (شارەزووری)ش، لە دواوە بە تەنیا دانیشتبوو. سەروڕیشی سپیبووبوو، جامانەیەکی شڕی بەستبوو، مراخانییەکی چڵکنی لەبەردابوو، دەرپێیەکی سپی درێژی کوردی لەپێدابوو، پشتێنێکی لەسەر بەستبوو، دارجگەرەیەکی درێژیشی بەدەستەوەبوو، خێراخێرا مژی لێ دەدا، دووکەڵی بەبادەکرد و بە چارەدرکەڵێ بێزاریکردبووم.

من دەستم درێژکردبوو، لەسەر قەراغی کورسییەکەی پشتمەوە دامنابوو، کاتێکم زانی، یەکێ بە هێواشی، زۆر بە سۆز و بە نەرمی، دەست بە دەستمدا دێنێ. کە ئاوڕمدایەوە، کابرای پیرەبوو، تەماشایدەکردم و پێدەکەنی. منیش سەیرێکمکرد و لێی مۆڕبوومەوە، تا توانیشم، پەلێ دانەم بە دەستیدا کێشا، ئیدی بێ دەنگبوو. وتوومەس خاڵۆی پیرە، لە کۆمەڵەکەی (لوطە) و حەزی لە منداڵبازییە. ئەی خوایە! ئێمە چیمان لێ قەوماوە و تووشی چی بووین؟!

**حەمەخورشە ی نالبەند**

(حەمەخورشە)ی ناڵبەند، باوکی (لەتیف)ی هاوڕێم بوو، یەکێ لە پیاوەکانی (شێخ مەحموودی حەفید) بوو. هەموو جارێ کە تووشی دەبووین، یا دەهات بۆ ماڵی (شێخ)، بە

ڕیش و سمێڵێکی سپییەوە، بە ڕوویەکی خۆش و بە دەم زەردەخەوە، چارەکزەکانی ئاویان تێ دەزا، بە دەنگێکی نزمی خۆش، ئەم گۆرانییەی بۆ (شێخ کاوە) دەگوت:

*ئەی برای گوریەم، چیتە پێ کردم*

*دووکانت پێ داخستم، لە ماڵ و منداڵت کردم*

*هیچت پێ نەهێشتم، تا ئاوقەدت بۆ بردم!*

ئێمەش تەماشای یەکتریمان دەکرد، هەم پێدەکەنین و هەم دەشمانگوت: بە خوا ڕاستەکا!

## گۆڕانکاری و ڕووداو

ساڵی (1965)، لە پۆلی دووی ناوەندیی بووم، چەن گۆڕانکارییەکی کتوپڕی گرنگ، بەسەر ژیانی خۆم، خێزانەکەمان و گەلی کورددا هات، بە جارێ شێوەی بیرکردنەوە، شێوازی کارکردن و ڕەوتی ژیانی گۆڕیم. یەکێ لە ئەو گۆڕانکارییانە ئەوەبوو، خوا ئایە دڵی باوکمەوە، وەک بریتیپێچیێ لەسەر حیسابی دەوڵەت، چوو بۆ (حەج). ئیدی ئەو ماوەیە من بە تەواوی، ئازادبووم و خۆم بە گەورەی ماڵ دەزانی. کەسێ نەبوو، چاوم لێ بزکاتەوە و بڵێ، ئەوە مەکە و ئەوە بکە! شەو تا درەنگانێ، لە دەرەوە و لە سینەما بووم. هێندێ ڕۆژیش، دەوامی قوتابخانەم نەدەکرد. هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانمدا، سواری پاسکیل دەبووین، دۆمینەمانمەکرد و دەگەڕاین. هەڵبەتە ئەو کاتە، زۆر ساکاربووم، هەستم بە خراپی ئەو هەڵسوکەوتانە نەدەکرد، بە ئازادیم دادەنا!

## چیرۆکی یەکەمین خواردنەوە

بیرمدێ، یەکەمین ڕۆژی جێژنی قوربان بوو، (عارف)ی ئامۆزای دایکم، لە (بازیان)ەوە هاتبوو، ئەو کاتە لە قوتابخانەی (وەتەن) دەیخوێند. هەردووکمان بڕیارماندا، بخۆینەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ژیانمدا بیر لە خواردنەوە بکەمەوە.

دوای مشتومڕێکی زۆر، بوتڵێ بیرەی (فەریدە)مان لە (جەرجیس) کڕی. وا بزانم، بە سەد فلسی ئەو سەردەمە بوو. لەبەردەرکی سەراش، هێندێ مەزە و قەزوانی سوێرمان کڕی. دڵمان خۆشبوو، گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و ویستمان، بە دزی دایکمەوە بخۆینەوە. شتەکانم لە ژووری میوان دانا، دوو قاپ، دوو پەرداخ، دوو کەوچک و چەقۆیەکم هێنا، توند دەرگەکەم داخست.

ئێمە خەریکی ڕازاندنەوەی مەزە بووین، هێشتا سەری پیرەشووشەمان هەڵ نەپچڕیبوو، منداڵەکان لە پەنجەرەکەوە چاویان لێبوو، بە دایکمیان گوتبوو. ئەویش هات، لە دەرگەی

دا و کردی بە هەرا. هەرچی چۆتێبوو، بیرەکەم شاردەوە. بەڵام دایکم دۆزییەوە و سوێندی خوارد، گەر هەڵبیچڕین و بیخوێنەوە، لە سەرماندا دەیشکێنێ. ئیدی هەردووکمانی، بە شووشە بیرەکەوە دەرکرد. ئێمەش نەمانئەمزانی، چی لێ بکەین و بچین بۆ کوێ. لەبەرئەوە ناچاربووین، چووینەوە بۆ لای (جەرجیس) و گوتمان نامانەوێ. ئەویش سەری سووڕما بوو، چونکە هێشتا شتی وا ڕووی نەدابوو! گوتی: باشە بۆچی کڕیوتانە و بۆچی هێناوتانەتەوە؟! منیش هەموویم بۆ باسکرد. ئیدی ئەویش بە شتێ کەمتر، لێی وەرگرتینەوە، ئێمەش تێر پێکەنین و گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە!

سێ قلیشانەوە

<u>یەکەمین قلیشانەوە</u>: ساڵی (1965) بوو، ڕۆژێ لای سینەما (سیروان)ەوە، چەن برادەرێ لە چاخانەی (سۆلاف) دانیشتبووین و دۆمینەماندەکرد. لە پڕ تەقەیەکی زۆر دەسپێکرد، زیلە سەربازییەکان هاتوچۆیاندەکرد و سەربازێکی زۆریان، لەسەر جادەکان هەڵڕشت. کەس نەیدەزانی، چی ڕوویداوە و ئەو هەموو گوللانە لە کوێوە دەبارێن!
ئێمەش ناچاربووین، پولەکان فڕێدەین، لە ژێر کورسی و مێزەکاندا خۆمان ماتکەین. بەڵام تا دەهات، تەقەکان زیادیدەکرد. چاخانەکەش جمەیدەهات و خەڵکێکی زۆری تێدا بوو. ناچار نیوەی خەڵکەکە، لە ترساندا دەرپەڕین. گوتیان: ئەوەلە سەربازەکان دەمرێژ لە چاخانەکە بکەن. منیش هەر کە گوێم لە ئەو قسەیە بوو، هەستام و لەگەڵ ئەوان ڕام کرد. بەرانبەر چاخانەکە، کۆڵانێکی کورت و تەسک بوو، دەرنەدەچوو، دوو ماڵیان ڕووی لە جادەکە بوو، عەموودێ لەبەردەرگەی ماڵێکیاندا بوو، بە عەموودەکەدا سەرکەتم و لە سەریانەوە، خۆم هەڵدایە حەوشەکەوە. حەوشەکەش زۆر گەورەبوو. لە هەیوانەکەوە کچێکی گەنج هاواریکرد، گەر خەڵکی دیکە لە کۆڵان هەن، دەرگەکەیان بۆ بکەرەوە. منیش هەر هێندەی دەرگەم کردەوە، ئیدی خەڵکەکە بە گوژم خۆیان پێداکرد و هێرشیانهێنا.
کاتێ چووینە سەرەوە، ئینجا زانیم، ماڵی دایکی (شێخ شیتی شێخ عەزیز)ە. من زۆر نەمامەوە و لە ئەوێوە، بە سەریاندا چوومە ماڵەکەی دیکە، لەبەر ماڵی (شێخ قادری حەفید) هاتمەدەرەوە و گەیشتمەوە گەڕەکی خۆمان. دواتر زانیمان، سوپای (عێراق) هێرشی بۆ (ئەزمڕ) کردبوو، خراپ شکابوون، پێشمەرگەش دوو سەربازی کوشتبوو، چەکەکانیشیان فڕاندبوون. بەڵام لە ئەو تەقە و گوللەبارانەی بەردەرگی سەراندا، دوو کەس لە چاخانەی (حەمەڕەق) شەهیدبوون، یەکێکیان لە فەلەکانی (سولەیمانی) بوو، ناوی (بەشیر بێسۆن) بوو، خەڵکی دەیانگوت: دووشەش لە دەسیدا تۆپیبوو!

دووەمین قلّیشانەوە: دوای ئەو ڕۆژە، زۆری پیّ نەچوو، لە جادەی (کاوە) لای (قاوەی خەلیفە) دانیشتبووم، سەرەی سەرتاشینم گرتبوو. دەسرێژێکرا. پاشان بوو بە گرمە و هاڕە، دەسرێژیش درێژەیکێشا. ئیدی هەر خەڵك بوو، ڕایدەکرد. منیش هەر لە ئەو کۆڵانەدا، چەن ماڵێکی تێدابوو، لەگەڵ (حاجی تۆفیقی دەلاك)دا، خۆمان بە ماڵێکدا کرد. (حاجی) لە تەنیشت ماڵی باپیرمەوە بوو. دەمناسی. تا بڵێی، پیاوێکی بەڕێز و موسوڵمان بوو. لەبەر خۆیەوە هەر ویردی دەخوێند و نزایدەکرد. گیانێکم بە ئەوبوو. دڵخۆشی خەڵکەکەی دەدایەوە، بەڵام خۆشی لە ترساندا، هەموو گیانی وەك بێتی ئاو دەلەرزی! ماوەی دوو کاژێر لە ئەو ماڵەشدا گیرمانخوارد، پاشان تەواوبوو. لەگەڵ (حاجی)دا بەرەو ماڵەوە گەڕاینەوە. ئەو ماڵەش، ماڵی باوکی (شوانی ئۆسکار) بوو. ئەم جارەشیان گوتیان: پۆلیسێکیان کوشتووە.

سێیەمین قلّیشانەوە: شەوێ لەگەڵ کوڕانی گەڕەکدا، لە سینەمای (ڕەشید) بووین، فیلمێکی فەرەنسی نیشاندەکرد، باسی ڕزگارکردنی (پاریس)ی دەکرد و دژی ئەڵمانەکان دەجەنگان. لەناکاو خەڵکێکی زۆر، خۆیان کرد بە ژووری سینەماکەدا. ئێمەش چووبووینە نێو قووڵایی فیلمەکەوە و ئاگامان لە هیچ نەمابوو. خێرا گڵۆپەکانیان داگیرساند و گوتیان: هەر کەس لە شوێنی خۆی دانیشێ، هیچ نییە و کەس نەترسێ! منیش چاوم گێڕا، هێندێ کوڕی یەکییەکی گەڕەکی خۆمانی لێبوو، لە ئەوانە (ئەتەمی ئەحمەدە فەندی، برایمی حاجی کەریم) بوون، کە بە (بلەکەچەڵ) ناسرابوو، زۆر شلەژا بوون. دەمزانی، چەکیان پێیە و شتێکیان تەوماندووە، بۆیە خۆیان کردووە بە سینەماکەدا. باشبوو، زوو چەکەکانیان لێ وەرگرتن و لە ژوورەکەی (عەلی سینەما) شاردبوویانەوە. (عەلی) هاوڕێم بوو، لە قوتابخانەی سەرەتاییش پێکەوەبووین، هەر لە منالّییەوە لە ژووری سەرەوە، سینەماکەی نیشپێدەکرد.

زۆری پێ نەچوو، ئەفسەرێکی تەنگەزل، سێ ئەستێرەی لەسەر شان ڕیزکرابوو، لەگەڵ چەن سەربازێکدا هاتن، بە ڕوویەکی خۆش و بە دەنگێکی نەرمەوە گوتی: کەس نەترسێ و هیچ نییە، چەن گێرەشێوێنێ، تەقەیان لە ترومبێلێکی سەربازی کردووە و هەموویان گیراون. ئێوەش یەکەیەکە وەرنەدەرەوە و پێناسەکانتان دەربێنن، پاشان هەرکەس بچێتەوە ماڵی خۆی. باشبوو، ئەو شەوە کەس نەگیرا و منیش لەگەڵ کوڕانی گەڕەك، بەرەو ماڵ گەڕاینەوە!

### گەشتی (بەغدا)

پاییزی ساڵی (1965) بوو، باوکم لە (حەج) گەڕایەوە، هێشتا لە (بەغدا) بوو، من و مامە (بەکر)م چووین بە پیریەوە. یەکەمین جاربوو، (بەغدا) ببینم. من و مامم جلی کوردیمان لەبەردابوو. لە ئوتێل (سیروان) دابەزین و دوای دوو ڕۆژ باوکم گەڕایەوە.

(بەغدا)م زۆر لا خۆشبوو، خواردنەکانی بە تامبوون، هەموو ڕۆژێ، هەر لە بەیانییەوە دەڕۆشتین، تا ئێوارە بۆ ئوتێلەکە نەدەگەڕاینەوە، هەر دەگەڕاین و شتمانئەکڕی، سەردانی مەزاری پیر و پیاوچاکانی شارەکەمان ئەکرد. خەڵکیش تەماشایانئەکردین و لێمان وردئەبوونەوە. چونکە هەمووومان جلی کوردیمان لەبەردابوو!

ئێوارەیەکیان خۆم دزییەوە و بە تەنیا هاتمەدەرەوە، نیازم وابوو، سەری لە (جەمال ئەمین) بدەم. پێشتر لەگەڵ باوکم و مامەدا چووبووین. سواری پاس بووم و لە خۆمەوە لە (باب ئەلمعەزەم) دابەزیم. ئیدی نەمئەزانی، بەشی ئێوخۆیی خوێندکاران بدۆزمەوە. زمانیشم باش نەئەزانی، تا بپرسم. لەپڕ ئەفەندییەکی عەرەب هات و بە پێکەنینەوە گوتی: ها کاکە وێن؟ منیش وامزانی، یارمەتیمئەدا، گوتم: بۆ ئوتێل (سیروان). لەگەڵ خۆی سواری پاسێکی کردم و هەر بە عەرەبی قسەیئەکرد، زۆر لێی تێ نەئەگەیشتم. بەڵام هێندەم زانی، لەگەڵ دەوروپشتەکەیدا جنێویان بە (مەلامستەفا) دەدا و دەیانگوت: مەلا چی دەوێ؟ منیش لە ترساندا دەمگوت: نازانم. باشبوو، پاسەکە وەستا، هەلم بۆ هەڵکەوت و بە پەلە دابەزیم. کابراش لە پەنجەرەکەوە پێئەکەنی و هاواریئەکرد: بۆ کوێ؟ بۆ کوێ؟ ئیدی بە پرس ئوتێلەکەم دۆزییەوە و بڕیارمدا: بێ باوکم و مامم، یەک هەنگاو لە ئوتێلەکە دوور نەکەومەوە.

دوای سێ ڕۆژ بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە. کاتێ گەڕاینەوە، خەڵکێکی زۆر لە خزم و ئاسیاوی گەڕەک، بۆ خۆشهاتنەوەی باوکم هاتن، ماڵەکەمان جمەیدەهات. خواردنێکی زۆر ئامادەکرا و باوکم دوو ڕۆژ نیوەڕۆ و ئێوارە نانیدا. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، هەر زۆر بە ڕاستی، ڕووی لە خوای خۆی کرد، تا کۆچیدواییشیکرد، هەر خەریکی نوێژ و ڕۆژووی خۆی بوو!

### دوا لێدانی باوکم

ئێوارەیەکیان باوکم لە مزگەوت هاتەوە، من لەگەڵ هاوڕێکانمدا، لە کۆڵان دانیشتبووین و قسەمانئەکرد. هەر چاوم پێی کەوت، لە ترساندا ڕامکرد. دوای ماوەیە، (سەلاح)ی برام هات و گوتی: باوکم دەڵێ، بێتەوە، لێی نادەم. منیش هەر چوومەژوورەوە، یەکسەر

پەلاماریدام، بە شەق و زلە دایگرتمەوە و گوتی: من پێم نەگوتی، نابێ بچیتەدەرەوە، دەبێ خەریکی وانەکانت بی! کاک (مستەفا)ی دراوسێشمان، لە دەنگی هاوارهاواری من، لە هەیوانەکەوە هاواری لێ هەستا و گوتی: تو خوا حاجی، گەر لە ئەو منالە بدەی، خۆ کافرسانی نییە، دەلێی منالی خۆت نییە، وا تێیبەربووی، خۆ خۆشت منالبووی و لە کۆلان یاریتکردووە! منیش بە هەلم زانی، قیژاندم و گوتم: بۆ وام لێدەکەی، خۆ کۆیلەی تۆ نیم؟ ئەویش هەر لێیدەدام، لە پڕ پالێکم پێوەنا و لە خۆمم دووورخستەوە، دەرگەم ترازاند و ڕامکرد، بە ئەو شەوە چووم بۆ گەڕەکی (سابونکەران) و لە مالی پورە (مەلیح)م نووستم. بەیانی زوو باوکم هات و ئاشتیکردمەوە، گوتی: ئیدی لێت نادەم، وەرەوە بۆ مالەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ڕووی باوکمدا هەلگەڕێمەوە و قسەبکەم. ئاخر کورد ڕاستی فەرمووە، کە جام پڕبوو، لێی دەڕژێ، جامی لێدان و چەوساندنەوەی منیش، لە مێژە پڕبووبوو!

هەروەها، ئەوە دواجاری باوکیشم بوو، ئازارمبدا. دیارە بیریکردووەتەوە و بە ئەو باوەڕە گەیشتووە، کە کوڕەکەی گەورەبووە، گەر لە ئەمەودوا لێی بدا، لە ئەوانەیە لێم قەبووڵ نەکا، مالەکە بەجێبێلێ و لەکیسەچێ! ئیدی ئەو باوکە دلڕەقەی هێندە لێی دەترسام و هەر چاوی لێ بزکردمایەتەوە، هێندێ جار خۆم تەڕدەکرد، وەک فریشتەی ئاسمانی لێهات و جارێکی دیکە برایبێ، نەک هەر لێی نەدام و سووکایەتی پێ نەکردم، بەلکوو لێشم تووڕە نەبوو!

**ئاگرکردنەوە**

زستانی سالی (1965) زۆر ساردبوو، لە پۆلەکانی قوتابخانەکەماندا، زۆپای نەوتیان بۆ دانەدەگیرساندین و دەیانگوت: پارە نییە، نەوت بکڕین. پۆلەکەی ئێمەش هێندە گەورەبوو، تەختەڕەشەکەیان لە بەشێکی خوارەوەی ژوورەکەدا دانابوو، بە شێوەیە پۆلەکەی دابەشکردبوو، بە هیچ شتێکیش گەرممان نەدەبووەوە. قوتابییەکان دووەدوو لەسەر کورسییەکان دانیشتبوون، ئیدی سەرما ئیتی بۆ هێنابووین، بڕیارماندا، تا سەرماکە دەڕوا، سێسێ پێکەوە دانیشین، هەر ڕۆژەی کورسییەکیش بسووتێنین و خۆمانی پێ گەرمکەینەوە.

یەکەمین ڕۆژ، کورسییەکیان بە پێلەقە شکاند و ئاگریان تێبەردا. هەر زوو کلپەیکرد و بۆنی دووکەلْ، بە ئەو نێوەدا بلاوبووە. مامۆستا (شەوکەت)ی بەڕێوەبەر، بە دارەکەی بندەسییەوە، بە پەلە هات. لە دلی خۆمدا گوتم: هەر هیچ نەبێ، ئێستە یەک دووانێکمان لێ دارکاریدەکا، کەچی هەر چاوی بە ئاگرەکە کەوت، هاتە پێشەوە و گوتی: بە خوا کوڕەکانم، هەر ئێوە ئیشی خۆتان باش دەزانن! ئێمەش گوتمان: بە خوا مامۆستا، گەر

ئاگرمان بۆ دائەنێن، مارەیەکی دیکە کووڕسی تێدا نائێلێن و هەموومان لەسەر عەرز دادەنیشین! ئیدی دوای چەن ڕۆژێ، عەلانیینێکیان بۆ دانایین، بەڵام بریا هەر دایان نەنایە، چونکە لەبەر دووکەڵ، زۆربەی ڕۆژ قژێمانەدایە دەرەوە!

(شەوکەت)ە فەندی، پیاوێکی زۆر باشبوو، سەر و زمانی شیرین بوو، زۆر یارمەتی قوتابیانی دەدا، قوتابییەکانیش، زۆریان خۆشیاندەویست. کوردێکی دڵسۆز و نیشتمانپەروەریش بوو، بە شەو لەمەنەوە، لە ڕەشبگیرییەکەی ساڵی (1963)دا، لە سەربازگەی (سولەیمانی) گیرابوو، ئازارێکی زۆریان دابوو، بەڵام خۆڕاگربوو. هەمیشە دارخەیزەرانێکی پێبوو، بەڵام کەم جار، لە قوتابی دەدا. زمانی کەمێ لەواو نەبوو، پیتی (ش)ی پەسەردا زاڵبوو، کە قووڕەدەبوو، جێنێوییەدا، لەبری بڵێ: سەگی سەگباب، دەیگوت: شەگی شەگباب، هەر بە ئەو جنێوەش، لە نێو قوتابیاندا ناوی ڕۆشتبوو!

پەڕێوبەری نوێ

ئیمە لە قوتابخانەی ناوەندیی (شۆڕش)، جگە لە چەن مامۆستایەکی (میسری)، کۆمەڵێ مامۆستای بەڕێزی کوردی وەك (غەفووری مەلاعەلی مەلکەندی، جەمال عەبدول، لەتیفی میرزا مەحموود، لەتیف مەمەوەندی، خالید ساحێبقڕان، سەلاحی عەزیزئاغا، حەمەڕەشید قەرەداخی ...)مان هەبوو، هەریەکەیان وانەیەکی تایبەتییان پێ دەگوتین.

بەڵام دوای مارەیە، (شەوکەت)ە فەندی خانەنشینکرا، مامۆستا (لەتیفی میرزا مەحموود) جێیگرتەوە، هەم بەڕێوەبەرمان بوو، هەم وانەی زیندەوەرزانیشی پێ دەگوتین. ئەم بەڕێوەبەرە نوێیە، لە(شەوکەت)ە فەندی باشتربوو، بەڵام ئێستەش تێ نەگەیشتم، کاری ڕامیاری دەکرد، یا بێلایەنبوو، چونکە کەس نەیدەزانی، سەر بە چ لایەکە! لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر ترسنۆکبوو، تەنانەت لە هێندێ قوتابیش سڵیدەکردەوە!

ڕۆژێ تاقیکردنەوەی زیندەوەرزانیمان هەبوو، خوا هەڵناگرێ مامۆستا پرسیاری ئاسانیشی هێنابووەوە، بەڵام کەس هیچی نەدەزانی، چونکە بەرەڵاخانەیەکبوو، وێنەی نەبوو، کەس حەزی لە خوێندن نەدەکرد و خۆی ماندوو نەدەکرد. لەبەرئەوە بە ئاشکرا، دەفتەرەکانمان کردبووەوە، لەبەرمان دەنووسییەوە، کەس دەنگی لێوە نەدەهات و سەرمان هەڵ نەدەبڕی، ئاوبەتاویش تەماشایەکمانەدەکرد، سەیری یەکدیمان دەکرد و پزەیەك دەیگرتین! گەر یەکێکی نەشارەزا لە دوورەوە بیبینیایە، دوور نەبوو، بڵێ: ئەو قوتابیانە چەن زیرەك و ڕێکوپێکن، سەریان بەسەر کاغەزەکەی خۆیاندا شۆڕکردووەتەوە و

هەر دەنووسن! مامۆستا (لەتیف)یش لە دڵخاندا نەیدەزانی، چی بکا، زۆری پێ ناخۆش بوو، بەڵام دەسەڵاتی نەبوو، نەشیدەوێرا، هیچ بڵێ! من بە تەمەن و بە باڵاش، لە هەموویان بچووکتربووم، چونکە ئەوان مابوونەوە، بەڵام لە هەموویان بزێوتربووم! بۆیە لە پڕ مامۆستا هات و لەنێو هەموویاندا، گرگڕ بە منەوە نیشتەوە، بە دارەکەی دەستی، دەفتەرەکەی داخستم و گوتی: ئینجا فەرموو، بنووسە. منیش لە شوێنی خۆم چەقیم و سەرەواوی زیندەوەرزانیم لە مێشکدا نەبوو! دەستمکرد بە بۆڵەبۆڵ و گوتم: بۆ لەنێو هەموویاندا، هەر بە من دەوێری، بۆ هەر من دەفتەرم کردووەتەوە؟! گوتی: چەتەبازی مەکە و بنووسە، ئەوە نییە، هەموویان دەنووسن. گوتم: ئاخر هەموویان لەبەر دەفتەرەکانیان دەنووسن. ئینجا شەرمگرتی، هاواریکرد و گوتی: دەفتەر و پەرتووکەکانتان لابەن. بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، هەر وایانزانی، لەگەڵ ئەوانیشی نییە!
پاشان لە ئاواندا بە (ئەحمەد حوسێن)ی گوت: دەفتەرەکەت داخە. ئەویش سەرتا دایخست و دوای ماوەیە دیسان کردییەوە. ئەم جارە مامۆستا هات و دەفتەرەکەی لێ سەند. (ئەحمەد) کەوتووی پاربوو، بە تەمەن و قەڵافەت، پیاوێکی تەواوبوو، لە هەمووەمان گەورەتربوو، زۆری پێ ناخۆشبوو، لەبەرچاوی قوتابییەکان شکاندی. لەبەرئەوە تووڕە بوو، بە مامۆستای گوت: تۆ پاریش منت خست، باشە خۆت نەتگوت، ساڵی داهاتوو دەرتدەچێنم؟! ئێستە من چی بکەم؟ گوتی: قسەمەکە و بنووسە. (ئەحمە)ش هەستا، چوو دەفتەرەکەی هێنایەوە و دەستی بە نووسین کردەوە. ئەم جارەش مامۆستا لێی سەندەوە. (ئەحمە)ش هاواری لێ هەستا و گوتی: ئەوە بێ قیمەت بۆ نایەڵی، وەڵامبدەمەوە و بنووسم، بۆ ئیازت نییە، ئەم ساڵیش بمانخەی؟! مامۆستاش بە دارەوە بۆی هات و گوتی: هەتیو بێ دەنگبە، کاغەزەکەشی لێ سەند و گوتی: هەستە برۆ دەرەوە. (ئەحمە)ش بە کۆڵێ جنێوی ناشیرینەوە بۆی هەستا، یەک بۆکسی تێسرەواند، ڕاپێیدا و بە پشدا کەوت. مامۆستاش هەر هێندەی بۆ کرا، هەستایەوە و ڕایکرد. منیش هاوارمکرد، هێی کۆستەیە، هەر کەس بە مایەی خۆی دەرچوو، وەرەقەکانمان دڕاند و فڕێماندا!
ئیدی بە (ئەحمە)مان گوت: هەتیو ڕاکە، لە ئەوانەیە پۆلیست بۆ بانگکا. ئەویش بەسەر دیواری نێوان قوتابخانەکە و نەخۆشخانەکەدا سەرکەوت، بازیدا و بۆی دەرچوو. دوای ماوەیە مامۆستا (لەتیف)، لەگەڵ ئەفسەرێک و چەن پۆلیسێ هاتن، هەمووەمان گەڕان، بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە. بۆ بەیانی، فەرمانی دەرکردنی یەکجاری (ئەحە) لە قوتابخانە دەرچوو، ئیدی ئەویش نەهاتەوە و وازی لە خوێندن هێنا.

پاش ماوەیە لە بازاڕ (نەحە)م بینی، لە پۆست بە کرێکار دامەزرابوو، کەلێ جار بە ڕێککەوت دەمبینی، هەر جنێوی بە (لەتیف)ە فەتدی ئەدا و دەیگوت: ئەو گەوادە پیاو نییە، بەڵێنیدامێ دەرمچێنێ؛ کەچی دەرێیکرد، باشبوو، ڕزگارمبوو! سەیر ئەوەیە، هێشتا ئەو دەیگوت: باشبوو، ڕزگارمبوو، کەچی بیری لە ئاییندەی خۆی نەدەکردەوە!

ناوەندیی (شۆڕش)، زۆر خراپ ناوی ڕۆیشتبوو، هەرچی قوتابییەک خراپبووایە، لە هەموو قوتابخانەکانەوە بۆیان دەنارد. کەم قوتابی زیرەکی تێدابوو، هێندێ قوتابی هەبوون، زۆربەی ئەو سێ ساڵەیان، بە پێنج ساڵ دەبڕی، کەم قوتابیش هەبوو، خوێندن تەواوکا و شتێکی لێ دەرچێ؛ یا دەمانەوە و دەردەکران، یا خۆیان وازیاندەهێنا و کاریاندەکرد، یا دەبوون بە پێشمەرگە. مامۆستاکانیش تێیگەیشتبوون، زۆر خۆیان ماندوو نەدەکرد و گوێیان نەدەدایە، وانەی خۆیان دەگوتەوە و مانگانەش، مووچەی خۆیان وەردەگرت. سەری ساڵیش، پرسیاری قوورسیان دەهێنایەوە و تۆڵەیان لە قوتابییەکان دەکردەوە، ئیدی ئاوبێنە و دەسبشۆ، ئەوە قوتابخانەکەمان بوو!

گرفتی گەورەی ململانێ و ناکۆکی، نێوان هەواداراتی هەردوو پارتی (دیموکرات) و (کۆمۆنیست)یش، هێندەی دیکە کێشەکانی ئاڵۆز و سەختترکردبوو، قوتابخانەکەی بە تەواوی شێواندبوو، قوتابییەکانی هارکردبوو، تا لە ئەو بەرەڵایی، بێسەروبەری، هەرا و ئاژاوەیەدا، مامۆستا (جەمال عەبدول)مان بۆ هات و وانەی کیمیای پێ دەگوتین.

مامۆستا ( جەمال عەبدول )

ساڵی (1964– 1965)، ئەز لە پۆلی دووبووم، یەکەمین ڕۆژ، مامۆستا (جەمال) هاتە پۆلەوە، لەچاو مامۆستاکانی دیکەدا، زۆر چکۆلانە و منداڵ دیاربوو، وامانئەزانی، ئەمیش وەک مامۆستاکانی دیکە وایە و زۆر گوێ نادات!

سەرەتا، کاتێ وانەی بۆ باسدەکردین، زۆر گوێمان لێ نەدەگرت و هەر پێدەکەنین، چونکە وا ڕاهاتبووین، هەر قسەمانئەکرد و هیچمان نەدەنووسی. ئەویش زۆر لەسەرخۆ و بە هێمنی دەیویست، پێدەنگمانکا و ئامۆژگاریدەکردین، بەڵام کە تێگەیشت، ئەو شێوازە بۆ ئێمەی چەقاوەسوو، کەڵکی نییە، ئیدی لە ئەوە پتر ئارامی نەما، وردەوردە توندیکرد و لێمان تووڕەدەبوو، هێندێ جاریش قوتابی دەکردەدەرەوە. کاتێ تاقیکردنەوەی یەکەمین مانگیشی کردین، پرسیارەکان زۆر قووڕسبوون، کەسمان هیچمان نەدەزانی و زۆربەی هەرە زۆری قوتابییەکان دەرنەچووبوون، من پێنج لە سەدم وەرگرتبوو، هێندێکمان وەرەقەکانمان دڕاند و چوویندەرەوە!

ئەو کاتانەی، لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی (پارتی)دا کارماندەکرد، نەمانئەزانی، مامۆستا (جەمال) یەکێ لە کادیرە پێشکەوتووەکانی، هەردوو ڕێکخراوی (قوتابیان) و (پارتی)ە. بەڵام کاتێ پێیان ڕاگەیاندین و گوتیان: پێویستە، ڕێزی مامۆستا (جەمال) بگرن و لە وانەکاندا ئاژاوەنەنێنەوە، ئیدی زۆر شەرممان لێ دەکرد، هەرچەندە خۆی مامۆستا و مرۆڤێ بوو، هەموو کەس دەبوایە، شەرمی لێ بکا و ڕێزی لێ بگرێ!

بە کورتییەکەی، ئەو زۆر ڕێوپێك، بە دیسیپلین و توندبوو، زۆر بە کوڵوبڵەوە، کاری دەکرد و وانەیدەگوتەوە، زۆر دڵسۆزیشبوو. بەڵام ئێمە، بە ئەو جۆرە پرینسیپانە ڕانەهاتبووین و هەستمان پێ نەدەکرد، تا بە زۆر ڕایانهێناین!

لەبەرئەوە، ئەو ساڵە زۆربەمان لە وانەی کیمیادا کەوتین و ماینەوە، منیش یەکێ لە ئەو قوتابییانە بووم. خەمی ئەو دەرنەچوونەش زۆربوو، نەمدەزانی، چی بکەم. لە ناچاریدا چوومەماڵی باپیرم. پاشان باوکم هات و دڵنەواییکردم، بردمییەوە و گوتی: گوێ مەدەرێ، بەڵکوو ساڵێکی دیکە خۆت ماندووبکەی و دەرچی. بەڵام من ئەو دەرنەچوونەم، لە دڵ نەگرتووە، ئێستە مامۆستا (جەمال)، یەکێ لە دۆستە هەرە خۆشەویستەکانمە، بە شێوەیەکی بەردەوامیش، پێوەندیمان هەیە و سەری لێ دەدەم.



ماڵی مامۆستا (جەمال)، ئێوارەی ڕۆژی (20. 08. 1999)

**هاوینی (1965)**

وەك دەرنەچووم، حەزمدەکرد، هەم کەمێ کاربکەم و هەم دڵی باوکیشم بدەمەوە. لەبەرئەوە ئەو هاوینە، سەرەتا لەگەڵ (حەسەنی حەمەتەورێزی)دا بڕیارماندا، ئیشبکەین. لە مێژ

بوو؛ (حەسەن)م دەناسی، هەر لە منداڵییەوە لە یەک گەڕەکدا بووین و لە یەک قوتابخانەش دەمانخوێند. بەڵام زۆر پێکەوە نەماینەوە و چووە لای (عەلی) کاکی، ئەویش هەر میوەفرۆش بوو. دواتریش، لەگەڵ (کەمالی عەبە ڕادیۆ)دا بەردەوامبووین. لەبەر دووکانی باپیرم، بە فەردە خەیار و بە سندووق تەماتەمان دەکڕی و دەمانفرۆشتەوە. لەبەرئەوەی کرێ دووکانمان نەدەدا، لە نرخی بازاڕ کەمێ بە کەمتر دەمانفرۆشت، بۆیە زۆر لێدەبووینەوە، ڕۆژانە پارەیەکی باشمان دەستدەکەوت، بەڵام بۆ دوو کەس کەمبوو!

ڕۆژێکی هەینی بوو، لەگەڵ (کەمال) ڕێککەوتین، شت بکڕین و بچین بۆ (سەرچنار) بخۆینەوە. بە هەردووکمان چارەکێ عەرەقی مەستەکیمان کڕی، مەزەمان کۆکردەوە و ڕۆیشتین. ئەو سەردەمانە، ڕۆژانی پشوو، (سەرچنار) زۆر جەنجاڵبوو، هەم خێزان و هەم سەڵتیشی لێبوو. هەموو بنەوادەکان بە مەیخۆر گیرابوو، کەللەیان گەرمبووبوو و گۆرانییان دەگوت. ئێمەش بۆ ئەوەی کەس نەمانبینێ، لە خەڵکەکە دوورکەوتینەوە و مەزەمان ڕازاندەوە، سەرووو پێکی پووتمان تێکرد، ورده‌ورده بە دەم قسەکردنەوە فرمانکرد، کاتێکم زانی، چارەکەکە تەواوبوو. ئێمەش هەر وەک نەمانخواردبێتەوە، وابوو، هیچ کاری تێ نەکردین. بەڵام دانیشتنەکەی زۆر خۆشبوو. ئەوە یەکەمین جارمبوو، لە ژیانمدا عەرەق بخۆمەوە و زۆر چێژیشم لێ بینی. ئیدی چاومکرایەوە و ترسمشکا، لە ئەوەی سەرخۆشبم و باوکم پێ بزانێ!

**دووکانی (شێخ سەلام)**

زۆربەی شەو، لەبەردەم دوکانەکەی (شێخ سەلام)دا ڕادەوەستاین، بە تایبەتی، کاتێ (کەریم) لە ئەوێ بووایە، کوڕانی گەڕەک کۆدەبووینەوە، تا درەنگانێ دادەنیشتین، نوکتەمان دەگێڕایە و پێدەکەنین. کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەردەبرد.

ئەو کاتە، هەمووشمان بە دزییەوە جگەرەماندەکێشا. هەر لە دوورەوە (شێخ سەلام)یش دەرکەوتایە، لە ترساندا پێڵوەمان لێ دەکرد، (کەریم)یش هەر زوو دەیگوت: ئەرەوەڵڵا، ئەوا باوکم لە مزگەوت هاتەوە، بڕۆن، تا دەڕواتەوە بۆ ماڵەوە، دوایی وەرنەوە.

(شێخ سەلام) زۆر تووڕەبوو، دەریدەکردین و جنێویشی پێ دەداین. ئاخر ئەو سەردەمانە، وەک ئەم ڕۆژگارە نەبوو، گەورە و پچووکی هەبوو، منداڵان زۆر لە باوک و برای گەورەیان دەترسان و ڕێزیان لێ دەگرتن، بێ پرسی ئەوان، هیچیان نەدەکرد، مەگەر هێندێ جار، بە دزییەوە شتێکیان بکردایە!

شەوێکیان لای (کەریم) کۆببووبووینەوە، نوکتەمان دەگێڕایەوە، لەبەر پێکەنین ئاگامان لە کەس نەمابوو، لەپڕ پیاوێکی لادێیی هات، زۆر بە دەنگێکی بەرز و بە شێوەیەکی سەیر، ڕووی لە (کەریم) کرد و گوتی: حوبی ئیسپرۆتان هەیە؟ ئەویش گوتی: بۆچیت دەوێ؟ گوتی: سەرم دێشێ، ئیدی ئێمە تێگەیشتین، حەبی ئەسپرینی دەوێ، لەبەرئەوە خۆمان بۆ نەگیرا و زۆر پێکەنین. (حەمەی ڕەشەی شێلم)یش، هێندە پێکەنی، لە ناواندا تڕێکی زلی لێ بەربوو. کابراش هەلی بۆ هەڵکەوت، تۆڵەی ئەو پێکەنینە بکاتەوە، ڕووی تێکرد و گوتی: هەی دەرد، لێت دەرنەیەتەوە، داوەشێی ماکەر، لەشت ساغ نەبێ، لە ئەوە زلتر دەبی، هەستە ڕاکە، بڕۆ بۆ مزگەوت، تا خۆت پیس نەکردووە! ئیدی ئێمە هەر ئەوەبوو، لەبەر پێکەنین نەخنکاین، کابراش حوبی خۆی وەرگرت و ڕۆی! دوای ئەوە هەر (حەمە)مان دەبینی، دەمانگوت: کابرای لادێیی بە دواتدا دەگەڕێ، لای پۆلیس شکاتی لێ کردووی و دەڵێ: گوێم کەربووە!

**دووکانی (ناجی) و چاخانەکەی (ڕەشەی خولەستەیی)**

لە ئەوبەر ماڵی ئێمەوە، ڕیزێ دووکانی لێبوو، هی ماڵی (مەجیدبەگ) بوون. هێندێکیان چۆڵبوون و داخرابوون، ئەوانی دیکەشیان کرابوون و کرابوونەوە. یەکێکیان نانەواخانەکەی (فایەقی عارف قومەین) بوو، هەر زوو لێئەبووە و هەڵیدەگرت. لە ئەو دووکانانەی هەر لە بەیانییەوە، تا شەو درەنگانێ دەکرانەوە، دووکانی (ناجی) و چاخانەکەی (ڕەشەی خولەستەیی) بوون.

(ناجی) خەڵکی (بیارە) بوو، پیاوێکی زۆر قسەخۆش و باش بوو. چاخانەکەش هەر لە بەیانییەوە، خەڵکی بێ کاری لێ دادەنیشت، یاری دۆمینە، تاوڵە و کاغەزیان دەکرد. پاشنیوەڕوان و ئێوارانیش، لەبەردەمی دووکان و چاخانەکەدا، کوڕی گەڕەک و خەڵکێکی دیکەی زۆر کۆدەبوونەوە، لەسەر پارە موشێنیاندەکرد. ئەو کاتە هەرە زۆرەکەی دەفلس بوو، لەبری هەڵمات دایاندەکرد. ئێمە لە ئەو جۆرە یارییانەوە دووربووین. چونکە تەنیا کوڕە گەورەکانی گەڕەک، لە ئەوێ دادەنیشتن و یارییاندەکرد، ئێمەش تەنیا دەوەستاین و تەماشامانئەکرد.

کوڕانی گەڕەکی خۆمان، یەک لە یەکدی چاکتربوون، زۆربەی زۆریان، پێشمەرگەی نێو شار بوون، هێندێ لە ئەو کوڕە چاکانە، وەک (برایمی حاجی کەریم) بە (بلەکەچەڵ) ناسرابوو، (عومەری ڕەشەکوڕە، ئەتەمی ئەحمەدە فەندی، حەمەی عەتێ، عومەری سەییدعەلی ...)

بوون، گیانیان بەسەر مناڵێکی گەڕەکەکەدا دەردەچوو. جاروبار (عیززەت یەکپارچە)ش دەهات، حەزی لە یاری کاغەز و موشێن بوو، هەموو لێی کۆدەبووینەوە و گوێمان لە قسە خۆشەکانی دەگرت.

ڕۆژێکیان کوڕانی گەڕەک، لە چاخانەکە یاری کاغەزیانئەکرد، منیش لە پشت سەری (عیززەت یەکپارچە)وە وەستابووم، تەماشای دەستەکەیم دەکرد. ئەو ڕۆژە بۆی نەدەهات، هەر وەرەقەی ڕادەکێشا، یا مریدەکرد، یا بە کەڵکی نەدەهات. ئاوڕێکی لە من دایەوە و گوتی: بۆ زەحمەت ناچی، پیاسەیەکەی و هەوایە بگۆڕی؟! منیش لە مەبەستەکەی تێ نەگەیشتم و گوتم: تاقەتی پیاسەم نییە، حەزدەکەم، سەیری یارییەکە بکەم. گوتی: کەواتە لە پشت منەوە مەوەستە، سەیری دەستی یەکێکی دیکە بکە. گوتم: بۆ؟ گوتی: چونکە پێمەوە نایە و ئەوەتەی تۆ لە پشتمەوە وەستاوی، تەرەقەم تێدا نەکردووەتەوە!

( حەمەی عەبودی )

پیاوێکی سەرسپی چاکەتوپانتۆڵ لەبەری هەژار، لە ماڵە ڕووخاوەکەی بنەماڵەی (زێوەر)، لە تەنیشت مزگەوتی (پنتەبەق)ەوە دەژیا، کەمێ شێتۆکەبوو، قسەی زۆر دەکرد، دەیانگوت: سیخوڕە، ناوی (حەمەی عەبودی) بوو. کەس نەیدەزانی، خەڵکی کوێ بوو و لە کوێوە هاتبوو؟! هەمیشە لەسەر ئەو جادانە بۆڵەیدەهات و کەسیش لێی تێ نەدەگەی!

ئێوارەیەکیان، کەمێ دنیا تاریکبووبوو، (فوئادی حەمەی شێخەلی) و (فەرەوڵای ئەحمەد بەگ) هاتن و بە ئێمەیان گوت: بچنەژوورەوە. دووکانیان بە دوکاندارەکان داخست و ئەو ناوەیان، بە خەڵکەکە چۆڵکرد. ئێمەش کوڕانی گەڕەک، لەبەردەرگەی ماڵی خۆمان وەستا بووین، چاوەڕوانی شتێکمان دەکرد، ڕوویدا. لەپڕ لای مزارەکەکەی (شێخ جافر)ەوە، زرمەیان لە ئەو داماوە هەڵسان و کوشتیان. ئیدی هەموو ڕامانکردە ژوورەوە و دەرگەمان داخست.

دوای ماوەیە، پۆلیس و ترومبێلی فریاکەوتنی خێرای نەخۆشخانە هاتن، هەڵیانگرت و بردیان، بێ ئەوەی لە کەس بپرسن، یا کەس بگرن. دوایی تەرمەکەی (حەمە) شێت، شارەوانی ناشتی. ئێستەش کەس نەیزانی، بۆ کوشتیان؟!

باوەڕ ناکەم، ئەو پیاوە ئاگای لە هیچ بووبێ، بەڵام هێندێ جار سەری لێیەدا، جنێوی بە کورد دەدا و هوتافی بە ژیانی (عەبدولکەریم قاسم)دا دەکێشا، کە سێ ساڵبوو، کوژرا بوو. جا هەر بە ڕاستی نازانم، کۆمۆنیستبوو، یا هەر (عەبدولکەریم)ی خۆشدەویست؟!! ئاخۆ دەبێ، چەن کەسی دیکەی وەک ئەو (حەمە) شێتە، بە خۆڕایی کوژرابێ؟!!

**کۆمەک**

ئەو کاتە لە پۆلی دوو بووم، پلەی لایەنگرم لە (پارتی)دا بڕیبوو، بووبووم بە پاڵێوراو. لە قوتابخانە و گەڕەکەکەشماندا، چالاکیمان هەبوو. بۆ نموونە: لێپرسراوەکەمان (حسە کوێ) پێی ڕاگەیاندین، یارمەتی بۆ شۆڕش کۆکەینەوە. ئێمەش لە گەڕەکی خۆمان، ماڵ بە ماڵمان دەناسی، بەسەریاندا دەگەڕاین و یارمەتیمان لێ وەردەگرتن. یارمەتییەکەش، هەمووی جلوبەرگ و پێڵاوی کۆن بوو. ئەو ڕۆژە سەرنجمێکی زۆر سەیربوو، کەس نەیدەگوت، نییە و نیمانە، یا بە ئێمە بڵێن: ئێوە چین و کێ ڕایسپاردوون، ئەم کارەبکەن؟! ئەوەبوو، لە ماوەیەکی کەمدا، یارمەتییەکی زۆرمان کۆکردەوە.

**ئەدیبە ی سیخوڕ**

ڕۆژێ (حسەکوێ) کۆیکردینەوە، شانەکە لە (برایمی حەمەقەزاز، علی حەمەجەلیلی سویچگەرچی) و من پێکهاتبوو. گوتی: لە گەڕەکەکەماندا، ژنێکی خۆفرۆشی لەشفرۆش هەیە، ناوی (ئەدیبە)یە، سیخوڕێکی گەورەی میرییە و پۆلیسی عەرەبیش هاتوچۆیدەکەن. لێپرسراوانی (پارتی) فرمانیان پێ کردووین، چاودێرییەکی وردی بکەین، تا بزانین، کێ هاتوچۆیدەکا.

من و (برایم) بۆ ئەو کارە تەرخانکراین و دەبووایە، هەموو ڕۆژێ چاودێریمانبکردایە و ڕاپۆرتێکمان بۆ (حسە) بخوێندایەتەوە. ئەویش دەمانچەیەکی تۆپلی لوولەدرێژی پێ بوو، خەڵکی پێیان ڕادەبوارد و دەیانگوت: دەمانچەکەی فیشەکی یازدەتیر دەخوا! تا ئێستە لە ژیانمدا دەمانچەی وام نەدیوە. قەمەیەکیشی بۆ من هێنا، (بلە)ش بۆکسێکی ئاسنی وەرگرت. ئیدی مەفرەزەیەکی تایبەتمان دروستکردبوو، بکوژوبڕی خۆمان بووین! ئاخر ئێمەش هەرزەکاربووین، خۆمان بە پیاو دەزانی، بە گیان و بە دڵ کارماندەکرد، هەموو بیر و هۆشێکیشمان، هەر لای پێشمەرگە و شۆڕش بوو، هەرچییەکیشیان پێ بگوتینایە، بێ دڵەڕاوکە دەمانکرد!

ئەو ڕۆژەی (حسە)، ئەو فرمانەی پێ ڕاگەیاندین، لە خۆشیاندا خەریکبوو، شاەمەرگ دەبووم. (حسە) لە سەربانی ماڵەکەی خۆیان، چەن بلۆکێکی دانابوو، جیقێکیشی بە دەوردا گێڕابوو، زۆر جار لە نێو چیغەکەدا خۆی مەتدەدا و لە ئەوێوە، چاودێری کۆڵان و دەشتەکەی بەر ماڵی خۆیانی دەکرد، بۆیە ناویاننابوو، (حسەڕەبیعە). ئەو کاتە باوکیشی لە دەرەوە، کادیرێکی پێشکەوتووی (پارتی) بوو، زۆر هاوڕێی مامە (بەکر)م و (شێخ عوسمان) بوو. ماڵەکەشیان لە تەنیشت مەزارگەکەی (شێخ جافر)ەوە بوو.

ڕۆژێ ژنەکەی پیشاندایین و ناسیمان، ماڵەکەشیان نزیک ماڵی خۆیان بوو. چەن شەوێ من و (حسە)، لە نێو قسنەکەی (شێخ جافر)دا خۆمان شاردەوە، (بلە)ش بە ناو ئاوەدا پیاسەیدەکرد. پلانەکەشی وا دانابوو، هەر کە ژنەکە هاتەدەرەوە، یا بۆ ماڵەوە گەڕایەوە، ئێمە یەکسەر پەلاماربدەین و بیکوژین. بەڵام خوا بەزەیی بە ئێمە و ئەو ژنە بێ ئاگایەشدا هاتەوە، چونکە نە ژنەکەمان بینی و نە ئەو کارە خراپەشمان کرد!

دوای ماوەیە، شەوێ پۆلیس لە شەو ئاوە، (حسە) دەگرن و ئێری لێدەدەن. ڕانیشی پیشانی ئێمە دا، یەک دوو لەمەی پێوەبوو. ئیتجا (حسە) بە تەواوی بێ دەنگبوو، بە هیچ شێوەیە، باسی ژنەکەی نەدەکرد و بە ئێمەشی گوت: (پارتی) ئەو کارەی بە کۆمەڵێکی دیکە سپاردووە و لەبیر خۆتانی بەرنەوە!

ئێمە دوایی زانیمان، ئەو ژنە هیچ جۆرە پێوەندییەکی، بە فەرمانگەی (ئەمن)ەوە نەبوو، بەڵام ڕەوشتی خراپبوو، لە ئەوە دەچوو، (حسە) هەوڵی زۆر دابێ، تا پێبیگا، ئەویش قایل نەبووە و بە لێدانیدابوو، دەیویست، بە ئەو ئاوەوە، تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە و ئێمەش تووشی گرفت بکا!

* * *

**کەسوکاری دایکم**

ژیان هێندە سەختبوو، ڕەوشەکەش هێندە ناخۆشبوو، لە لایەکەوە، بە هۆی شۆڕشی (کوردستان) و لە لایەکی دیکەشەوە، خەڵکی بە دوای پارووی نانەوە ویڵبوون، دۆست و کەسوکار، لە یەکدی پچڕابوون، کەس سەر کەس نە دەپەڕژا، پێوەندی خزمایەتی و کۆمەڵایەتی، پێوەندی نێوان شار و لادێ، زۆر کزبووبوون. لەبەرئەوەی هەموو کەسوکاری دایکم، لە گوندەکان دەژیان، باوکیشم فەرمانبەری میریبوو، هەر ڕۆژەی لە شوێنێ دەگیرسایەوە و کاریدەکرد، بە تەواوی لێیان پچڕابووین. ئەوان، هێندێکیان لە (شارباژێڕ) و هێندێکی دیکەشیان، لە (بازیان) دەژیان. تەنانەت ئەوانیش، لە یەکدی دووربوون و هەواڵی یەکدیان نەدەزانی!

ئای چەندم پێ خۆشبوو، بۆ یەکەمین جار لە ژیانمدا و لە تەمەنی چواردە ساڵاندا، چاوم بە نەنە (پیرۆز)م کەوت. دایکم زۆر لە نەنەی دەکرد، هەر دەیگوت: سێوێکن و دوولەت کراون! خاڵە (ڕەحمان)یشم لە (قەشان) دەژیا. هەرچەند دەهات بۆ شار، لە ماڵی ئێمە دادەبەزی. زۆر بەزمی خۆشبوو، زۆر حەزی لە گاڵتەکردن دەکرد. کوژراوی سینەما بوو، هەر دەهات و نانی ئێوارەی دەخوارد، پەلی دەگرتم، یا لەگەڵ باوکم دەچوون بۆ سینەما. بەڵام تا ئەو کاتە، نە خاڵە (قادر)، نە خاڵە (ئەحمەد)، نە پورە (خونچە)م، بە چاوی خۆم نەدیبوو!

مامی دایکم (شێخ حوسێن)، چەن کوڕ و کچێکی هەبوو، ساڵی (1963) بوو، لەگەڵ (عوبێد) و (عارف)ی برایدا، یەکدیمان ناسی. بەرەبەرە خزمایەتی و دۆستایەتیمان پەرەیسەند و تا دەهات، خۆش و گەرمتر دەبوو. بە تایبەتی من و (عوبێد)، لە قوتابخانەی (شۆڕش) پێکەوە دەمانخوێند. هەر لە گەڕەکی (شێخان)یش، خانووەکیان بەکرێگرتبوو، لە ئێمەوە هەمووی دە خولەک دووربوون.

ئەوان لە (بازیان)، لە گوندی (دەرگەزێنی بابەعەلی) دەژیان. بۆ خوێندن هاتبوونە (سولەیمانی)، هەردووکیان، بە تەمەن لە من گەورەتربوون و دوو پۆلیش لە پێش منەوە بوون. بەهۆی ئەوانیشەوە، (عارف)ی کوڕە گەورەکەی خاڵە (قادر)م ناسی!

جگە لە ئەوەی برادەرێکیان هەبوو، خەڵکی (کەرکووک) بوو، باوکی لە گوندەکەی ئەوان مامۆستابوو، ناوی (ئەدیب) بوو، ئەویشم ناسی و ئیدی هەر چوارمان، هەمیشە پێکەوە بووین، دەگەڕاین و بە زۆریی، لە گەراجەکەی (سەعەتاکۆیی) لە چاخانەکان دۆمینەمان دەکرد. چونکە لە لایەکەوە، ئەو ناوە لە ماڵی خۆمانەوە دووربوو، باوکم نەیدەدۆزییەوە.

لە لایەکی دیکەشەوە، زۆربەیان ناسیاوی جووتەبرا (عوبێد) و (عارف) بوون، لەبەرئەوەی دانیشتووانی (بازیان)، بە شێوەیەکی بەردەوام، لەو گەراجەوە هاتوچۆیانئەکرد.
لەگەڵ (ئەدیم)دا، هێندە تێکەڵاوبووین، تەنانەت زۆربەی کات، هەر لە ماڵی ئێمە بوو. باوکیشی بۆ (سولەیمانی) گوێزرایەوە، پیاوێکی زۆر وریا، زیرەک، دنیادیدە، لە خواترس و نوێژکەر بوو، هەمیشە بە دزداشەیەکی سپی و سەر و مێزەرێکی (کەرکووکی)یانەوە، لە مزگەوتی گەورە کەوتبوو. ئیدی بەهۆی ئێمەشەوە، باوکمان یەکدییان ناسی و هاتوچۆ لە نێوانماندا پەیدابوو. ئەم پیاوە لای خۆی مامۆستابوو، کەچی هەمیشە ئامۆژگاری دەکردین و دەیگوت: ئا زووە لە شوێنێ دامەزرێن و بۆ خۆتان بژین، چیتان لە خوێندن داوە!

**لادێ، بەهەشتی گوردەواری و کانگەی هیوا**
من هەمیشە لە ژیانمدا، خەونم بە ژیانی لادێوە بینیوە، زۆر حەزمدەکرد، سەر لە گوندەکان بدەم، بە ئارەزووی دڵی خۆم بسووڕێمەوە، بە ئەو دەشتودەرانەدا بگەڕێم، بە ئەو کەژ و کێوانەدا هەڵگەڕێم، پڕ بە سییەکانم، هەوای خاوێن و سازگاری ئازادی هەڵمژم. لەبەرئەوە کاتێ پێوەندیمان لەگەڵ ماڵە خزمانی دایکمدا پەیداکرد، هاوینان زووزوو بەسەرمەدەکردنەوە، سەرم لە هەردوو گوندی (دەرگەزێنی: بابەعەلی و هەمەوەند) ئەدا. چونکە زۆربەی کەسوکارەکانی دایکم، لە ئەو دوو گوندە دەژیان. ماڵی نەنە (پیرۆز) و هەردوو خاڵەکەشم (رەحیم) و (ئەحمەد)، هەر لە گوندی یەکەم بوون، هێشتا ژنیان نەهێنابوو، پێکەوە دەژیان. هەروەها ماڵی مامی دایکم (حاجی شێخ حوسێن) و پووریشی خاتوو (ئامینە)، هەر لە ئەوێ بوون. ماڵی پوورێکی دیکەی دایکم (پوورە حەبی)ش، لە گوندی دووەم بوو.
بە کورتی، هەموو خزمەکانی دایکم، لە (شارباژێڕ)ەوە هاتبوون و لە ئەو دوو گوندە جێگیربووبوون. بە کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەوە خەریکبوون و ڕەوشی ئابوورییان باشبوو. ئیدی ڕێی هاتوچۆی لادێم بۆ کرایەوە، هەر دەرگەی قوتابخانە دادەخرا و پشووی هاوین دەستپێدەکرد، سواری پیکاپ دەبووم و لە (دەرگەزێنی بابەعەلی) دادەبەزیم. زۆر نزیک بوو، هەمووی نیوکاژێر ڕێگەبوو. هەردوو (دەرگەزێن)، دوو گوندی زۆر دڵگیربوون، لە تەختایی و لە بناری چیایەکی بەردینی بەرزدا هەڵکەتبوون، ڕێی هاتوچۆی گوندەکانی دیکەی ناوچەی (بازیان)یشی، زۆر بەسەرەوەبوو، هەمیشە ئەو ڕێیە جمەیدەهات. کانیی و ئاوێکی زۆر سارد، ڕوون و خاوێنی هەبوو، لە بەفراوی چیا بەرزەکانی دەوروپشتییەوە،

سەرچاوەی هەڵدەگرت. بێستانی گوندەکە، لە تەختاییەکی زۆر بەربڵاو و فراواندا بوو، تا چاو بڕیدەکرد، بە شەمامە، کاڵەک، شووتی، ئاروو، ترۆزی، تەماتە، بامێ و کوولەکە چێنرا بوو. ساڵانە گەنم و جۆ و برنجێکی زۆریشیان دەچاند، بەرهەمێکی باشیان دەدورییەوە. بەرهەمی سەرەکیشیان تووتن بوو، کاتێ میری لێی وەردەگرتن، بە تەواوی دەبووژانەوە. مەڕ و بزن و مانگا و پەلەوەرێکی زۆریان هەبوو. هەنگیان بەخێودەکرد و هەنگوینێکی خاوێنی بۆنخۆشیان هەبوو. بەیانیان ماست، کەرە، پەنیر و شیر ئامادەدەکرا. ئێواران بە برنجی بازیان و شلەی بامێی پڕ لە گۆشت، خوان دەڕازێنرایەوە. شەوانەش میوەی بێستانەکانی خۆیان دەهێنا و لێی تێر نەدەبووین. هەموو خواردنەکان سرووشتی و بە تام بوون، وەک خواردنەکانی ئێستە نەبوون، کەرەسەی کیمیایی پێوەکەن و تامی نەبێ!
ئەو دەشتودەرەی گوندی (دەرگەزێن)، کانگەی خۆشی و جوانی بوو. گیانی بەبەر مرۆدا دەکردەوە و بە ڕاستی، بەهەشتی کوردەواری بوو! چونکە خێر و فەڕێکی زۆری هەبوو، خەڵکەکە وەک شا دەژیان و خەمی هیچیان نەبوو. بەڵام ئەوەی هەبوو، ئاوی کەم بوو، بەشی ئەوەی نەدەکرد، بێستان و کێڵگەکانی خۆیانی پێ ئاودەن، لەبەرئەوە سەرەیان دەگرت و بە نۆرە بەروبوومەکانیان ئاودەدا. هێندێ جاریش لەسەر ئاو، جووتیارەکان لێیان دەبوو بە شەڕ. گوندەکە زۆر ڕووتبوو، دارودرەختی زۆر کەمبوو، تەنیا لە نزیک کانیی و ئاوەکەوە نەبێ، هێندێ دارتوو و سوورەچنار ڕوابوون، ئەوانیش هێندە بەرزهەڵچووبوون، لەگەڵ بەرزایی ئاسماندا شەڕیاندەکرد!
ئەو ئاوە، یەک خەسڵەتی باشی هەبوو، ئەویش گوندەکە لە جادەی سەرەکی نێوان (سولەیمانی) و (کەرکووک)ەوە، زۆر نزیکبوون. زۆر ڕۆژ لەگەڵ کوڕەکاندا، خۆمان کۆدەکردەوە و دەڕۆیشتین، لە ئەو چەمانەی ئەو بەر جادەکەوە مەلەماندەکرد، خۆمان هەڵدەخست و لەبەر ئەو خۆرە گەرمە دەسووتاین، چێشت و چامان لێدەنا، تا ئێوارەکانی دەمایینەوە. یا لە چاخانەکەی (کانیشەیتان) دۆمینەماندەکرد. هێندێ نیوەڕۆش، هەر لە ئەوێ نانماندەخوارد و ئینجا دەگەڕاینەوە. هەر لە منالییشەوە، زۆر حەزم لە سواری وڵاخی بەرز بوو، جارجار سواردەبووم و خەریکبوو، فێری سواریش دەبووم.
بۆ یەکەمین جاریشبوو، هێندێ شت لە نزیکەوە ببینم، تێگەیشتم، چۆن گوندنشینەکان ماندوودەبن. چۆن بە ئارەقی نێوچەوانی خۆیان، نان پەیدادەکەن. سەرەتا حەزمدەکرد، سواری جەنجەڕبم و بە دەوری خەرمانەکەدا بخولێمەوە، بەڵام دوایی لەبەرچاوەکەوت، چونکە هەموو لەش و جەستەم پڕبوو لە کا، شەو دەخورا و خەوم لێ نەدەکەوت، ئیدی

تۆخوێتی نەکەوتمەوە. هەروەها، زۆر سەرنجیشم لە کارەکانیان دەدا، بە تایبەتی مانگا دۆشین، گێرە، شەنوکەوکردنم بە لاوە سەیربوو، چونکە پێشتر ئەو شتانەم نەدیبوو.

جگە لە ئەوەی، هێندێ بەیانیش زوو، پێش ئەوەی هەتاوبکەوێ، لەگەڵیان دەچووم بۆ کێڵگە، ڤاوی تووتن و تەماتەمان دەدا. وردەوردە، فێری تووتن پێوەکردنیش بووم و پارمەتیمدەدان. پاشان بە پەتماتەوەدەکرد و شریتەکانمان، بە دارەوە هەڵدەواسی، تا بە تەواوی وشکدەبوونەوە، ئینجا لە چاڵێکی قووڵدا هەڵیاندەواسی، پێیاندەگوت: ساردا، بۆ ئەوەی کەمێ نەرمبێ، کاتێ لە کوتییان دەکرد، گەڵا تووتنەکان نەشکێن. هەروەها یەکەمین جاربوو، بزانم و بە چاوی خۆم بیبینم، جووتیارەکان گەنم و جۆکەیان، لە چاڵی گەورەی قووڵدا هەڵدەگرن.

ئەو کاتە، هەرچەندە لە (کوردستان) شەڕبوو، بەڵام ئەو ناوە زۆر هێمن و بێدەنگ بوو، جگە لە بنکەی پۆلیسی (گزبالە)، هیچ جۆرە بنکەیەکی سەربازی لێ نەبوو؛ ئەویش لەسەر گردێکی بەرزبوو، لە دوورەوە لە هێلانەی حاجیلەقلەق دەچوو، هێندە بەرزبوو، گەر پۆلیسەکان ئیشێکی تایبەتیان نەبووایە، دانەدەبەزین. ئیدی هیچ مەترسی نەبوو، بە ئارەزووی خۆمان دەسووڕاینەوە.

هێندێ شەویش، پێشمەرگە بە ئاشکرا دەهاتن، کەمێ پشوویاندەدا، نانیاندەخوارد و دەڕۆیشتن. یا بە کارێکی تایبەت دەهاتن، بۆ نموونە: بڵاوکراوەیان دەهێنا، یا مانگانەیان کۆدەکردەوە. گرنگ ئەوەبوو، ئەو ناوە خاوێنبوو؛ جاش و سیخوڕی میری تێدا نەبوو.

لە یەکێ لە ئەو سەردانانەمدا، بیرم لە ئەوە کردەوە، سەرێ لە (بەردەقارەمان) بدەم و لە نزیکەوە بیبینم، تا بزانم، (شێخ مەحموود)ی نەمر، لە پاڵ چ بەردێکدا، دژی سوپای ئینگلیز جەنگاوە، وا ئەو ناوە پیرۆزەی پێ دراوە! ئەوەبوو، لەگەڵ کۆمەڵێ خزمدا چووین. شوێنەکە زۆر نزیکبوو، بەپێ هەمووی پازدە خولەک بوو، کەمێ لە جادەوە دووربوو. ئەو کاتە بەردێکی زۆر گەورەبوو، بەڵام لە ئەوەدەچێ، هۆکارەکانی سرووشت، کەمێ کاریتێکردەبێ.

بە ڕاستی ژیانی لادێ بەهەشتێ بوو، خوا لەسەر زەوی بۆ جووتیارەکانی دروستکردبوو. خۆشیان پەپوولەیە بوون، بە دەوری چرای ئەمەك، میهرەبانی و خۆشەویستی خەڵکدا دەخولانەوە!



دەربەندی بازیان، بەردەقارەمان ڕۆژی (27. 05. 2005)

## ژیان و مردن

هێشتا، هەر لە گەڕەکی (شێخان) بووین، (سەبری) و باوکم جیابوونەوە، بەڵام کچێکی هەبوو، ناوی (ئاشتی) بوو. ئەو ژنە هێندە دایکێکی خراپبوو، وازی لە کۆرپە ساواکەی خۆی هێنا و لای خۆی گلی نەدایەوە، تا بەخێوییکا و ئاگای لێبێ. باوکیشم ناچاربوو، بە بێشکەکەوە بیهێنێ و بەسەر دایکمدا ساغیکاتەوە!

ئەو منداڵە داماوە چکۆلانەیە، تەواو نەبوو، پشتی کوڕیبوو، هەر خەبەری بووایەتەوە، شەو و ڕۆژ دەگریا، زۆر درەنگ ژێربەبووەوە. دیارە ئازاری هەبوو. لەبەرئەوە، هەمووی ماوەی دوو مانگ لای ئێمە ژیا، پاشان مرد و لە گردی (جۆگە) ئاشتمان.

هەر لە ماڵی (حاجی کەریم بێکراس)دا بووین، ساڵی (1963)، خوا برایەکی دیکەی پێ بەخشین و بە ناوی ڕەوانشاد (حەمید کاوانی)یەوە ناونرا (کاوان). هەروەها ساڵی (1964)یش، برایەکی دیکەمان زیادکرد، ناومان نا (سۆران).

## پشووی هاوین

ساڵی (1964)، هەموو هاوینەکەی خەریکی پارەپەیداکردن بووم. من و (کەمالی عەبە ڕادیۆ)، کارەکەمان کەمێ گەورەترکرد. دوای نیوەڕوان مامە (عومەر)م، دووکانەکەی سووک دەبوو، هێندە سەوزە و میوەی نەدەما. لەبەرئەوە، ئێمە لێمان دەکڕییەوە، تا درەنگانێ تەنکماندەکرد و بڕێکی باشمان لێ دەفرۆشت. پاشان ئەوەی دەمایەوە، لە دووکان هەڵمانـدەگرت، بۆ ڕۆژی دوایی لەبەردەم دووکانەکەدا، بە هەرزان دەمانفرۆشتەوە.

**قوتابخانەی نوێی شۆڕش (1965-1966)**

ئەو هاوینە، پارەیەکی زۆرمان دەستکەوت، سەرەتای دەسپێکی ساڵی نوێی خوێندن بوو، قوتابخانەکەمان بۆ گەڕەکی (کانیسکان) گواستییەوە. شوێنەکەی لەسەروو مەزارەگەکەی (شێخەرڵڵا)وە بوو. قوتابخانەیەکی نوێی دوو نهۆمیان دروستکردبوو، هەرچەندە خۆش بوو، بەڵام چکۆلانەبوو. ئەم ساڵیش لە پۆلی دوو دانیشتمەوە، بە ڕاستی دەرنەچوون، زۆر ناخۆشە، چونکە جگە لە ئەوەی، هەرچییە دەخوێنی، ساڵی پێشوو بیستووتە و شتێکی نوێی تێدا نییە، ساڵێکیشت بەخۆڕایی لەکیس دەچێ. بەڵام چار نییە، هەردەبێ ئامادەبی و گوێبگری، ئەگینا دەرناچی، کە دووساڵیش مایتەوە، بە یەکجاری دەردەکرێی!

لە ئەم قوتابخانە نوێیەماندا، گۆڕانکارییەکی زۆر گرنگی بنەڕەتی ڕوویدا. چەن مامۆستایەکی شارەزا، بە توانا و ناسراویان بۆ هێنابین، بۆ ئەوەی لە هەموو ڕوویەکەوە، قوتابخانەکە ڕێکوپێککەن و ئاستی خوێندنیشی بەرزکەنەوە. بەڕێوەبەری نوێ، ناوی (هادی مەحموودبەگ) بوو، بە (هادییە سوور) ناسرابوو، وانەی ئینگلیزیشی پێ دەگوتین. یاریدەدەری بەڕێوەبەر، ناوی مامۆستا (عومەر مستەفا) بوو، بە (عومەری میچە) بەناوبانگ بوو، وانەی مێژووشی پێ دەگوتین. مامۆستا (کەمال مکوریجی)یش، مامۆستای جوگرافیا بوو، (کەمالەڕەش)یان پێ دەگوت. ئیدی کۆمەڵێ مامۆستای زیرەک و باشی دیکەی وەک (عەبدولواحید سابیر، بەختیار جەلال و مستەفا شەریف)یان بۆ هێنابین، یەک لە یەکی باشتربوون. سەرەتا، هێندێ گرفت لە نێوان قوتابییەکان و مامۆستایان و بەڕێوەبەرایەتی نوێدا ڕوویدا، چونکە ئێمە بە ئەو سیستەمە ڕانەهاتبووین، کاتی دەویست، تا فێری سیستەمی نوێ بین و لە ئەو بەرەڵاخانەیەی (شۆڕش)ی کۆن ڕزگارمانبێ!

بەڵام ئەو مامۆستا بەڕێز و دڵسۆزانە، هەوڵێکی زۆریان دا، تا وردەوردە، بەسەر ئەو هەموو گۆسپ و گرفتانەدا سەرکەوتن. هێندێ جار بە ئامۆژگاری، هێندێ جاری دیکەش، بە لێدان و سزادان توانیان، ڕاستەڕێی شەقامی ڕاستەقینەی زانست و ڕەوشتی خوێندن، پیشانی قوتابییەکان بدەن. قوتابخانەکەش، لە کەسانی خراپ و گێرەشێوێن پاککەنەوە. ئەوانەی شەڕانی و دەمانچە لە باخەڵیش بوون، هەر زوو قەلەفریان لێ کرد و لە قوتابخانەی شەو، جێی خۆیان کردەوە.

مامۆستایەکمان هەبوو، ناوی (موحەممەد) و خەڵکی ناوچەی (بادینان) بوو، لە پۆلی دوودا، وانەی عەرەبی پێدەگوتین. خۆی لە مەلایییەوە پێگەیشتبوو، پاشان کۆلێژی شەریعەی تەواوکردبوو. پیاوێکی کورتیلەی چارپڕووبووشاری سووروسپی بوو، بە دەس (کەریمی شێخ سەلام)ەوە وێرانبوو، ناوی نابوو (حەمە چارقەیسی). کاتێ قسەی دەکرد، پێکەنینمان دەهات، بەڵام زۆر زیرەک، بێدەنگ و لەسەرخۆ بوو، تەنیا ئەوەبوو، لەگەڵ خەڵکی چەقاوەسووی گاڵتەبازی (سولەیمانی)دا، دەری نەدەبرد!

## دووکانی باپیرم

مامە (ساڵح)م برا بچووکیبوو، دوای سێ کوڕ و سێ کچ هاتبوو. باپیرم زۆری خۆشدەویست، هەر لە منداڵییەوە، لەگەڵ خۆیدا لە دووکان کاریدەکرد و فێری کاسبی دەکرد، بە شەویش دەیخوێند. بە ڕاستی زۆر گرنگبوو، بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی، خوێندنی تەواوکرد.

ساڵی (1966) بوو، لە زانکۆی (بەسرە) لە بەشی ئینگلیزی وەرگیرا و ماڵئاوایی لێ کردین. من و مامە (ساڵح)م، یەکدیمان زۆر خۆشدەویست، هەمیشە پێکەوە بووین و هەستمان بە ئەوە نەدەکرد، مام و برازاین، بەڵکوو وەک دوو هاوڕێ مامەڵەمانکرد. لە پشووی نیوەی ساڵ و هاوینەدا، ساڵی دوو جار دەهاتەوە، ئەو ماوەیە هەمووی پێکەوە بووین، بە زۆرییش لە ماڵی ئێمە بوو.

مامە (ساڵح)م بە ڕواڵەت، زۆر بێدەسەلات و داماو بوو، کەمدوویبوو، باپیرم زۆر جار پێی دەگوت: ساڵەگێژ! بەڵام لە ڕاستیدا وانەبوو، بەڵکوو بۆ ژیانی تایبەتی خۆی، زۆر باش بوو، وەک دەڵێن: سەرکزی دڵ ورپابوو، گورگی بوو، لە پێستی مەڕدا بوو! لەگەڵ ئەوەشدا ڕووی خۆشبوو، زمانی شیرینبوو، دەنگێکی خۆشیشی پێوەبوو. بەڵام زۆر ڕژدبوو، تەنانەت هاوڕێکانی ناویاننابوو، (ساڵە پارەپیس).

مامە (بەکر)م هیچ کارێکی نەدەکرد، هەر خەریکی سووڕانەوە و کوردایەتی بوو. خێزانیشی هەبوو، باپیرم بەخێویدەکردن. کاتێ مامە (ساڵح)م ڕۆی، ئەوی لەسەر دووکانەکە دانا. ئیدی بۆ خۆی دادوەری سەر زەوی و زەریا بوو، بە ئارەزوویی خۆی کاری دەکرد، خۆی و منداڵەکانی دەژیاند!

لە ئەو ئاڵوگۆڕەی بەڕێوەبردنی کاری دووکانەکەدا، هەرچی پارەیەکی باوکم مابوو، تێداچوو. باوکم نەخۆشکەوتبوو، لە ماڵ دەرنەدەچوو. ڕۆژی (7. 10. 2007)، من و دایکم و باوکم، لە حەوشە دانیشتبووین، مامە (ساڵح) هات و بە باوکمی گوت: (حاجی) گیان گەردنم ئازادکە، دەفتەری قەرزەکە (بەکر) دڕاندی و گوتی: قەرزی چی، کوڕمان بۆ بەخێوکردووە. باوکم ئاگای لە ئەو قسانە نەمابوو، منیش گوتم: تازە درەنگە و بۆ کاتی خۆی قسەت نەکرد؟! بەڵێ مامە (بەکر)م، ئەم ناپاکییەشی، بەرانبەر ئێمە کرد!

(سەرچنار)

ساڵی دووەمی پۆلی دووەمبوو، لە نیوەی ساڵدا، باوکمیان بۆ (سەرچنار) گواستەوە. خانووی ئەم جارەمان، G پلێی گەورە، خۆش و دڵگیر بوو. لەسەر گردێکی بەرز هەڵکەوتبوو، هەر چوارلای چۆڵبوو. ئەم خانووە، بۆ بەڕێوەبەری شارۆچکەکە دروستکرابوو، بەڵام لەبەرئەوەی، لە تەنیشت بنکەی پۆلیسی (سەرچنار)ەوە بوو، لە ترسی پێشمەرگە و لەبەر تەقە، تا ئەو کاتە، بە چۆڵبوو، هیچ بەڕێوەبەرێ نەیدەوێرا، وەریگرێ، باوکم وەریگرت.

خانووەکە دوو نهۆمبوو، حەوشێکی زۆر گەورەی خۆشی هەبوو، بە شێوەیەکی زۆر جوان دابەشکرابوو، هەر چواردەوری باخەکەش، بە درەختی بەرز دەورەدرابوو. لە نێوەڕاستیشدا، بە قەیفەی سەوزی چیمەن و گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ڕازابووەوە. نێوانی هەردوو بەشەکەش، بە ڕێیەکی کۆنکرێت جیاکرابووەوە. هەیوانێکی خنجیلانەشی هەبوو، هێندێ ئینجانەی جوانمان لێ دانابوو. هێندەمان ژوور هەبوو، هەر یەکێکمان ژوورێکمان بەردەکەوت، بگرە یۆشمان پڕ نەدەکرایەوە!

لە نهۆمی سەریشەوە، تەنیا یەك ژووری لێ بوو، ئەویشمان بۆ بەخێوکردنی قەل، مریشك و کەڵەشێر تەرخانکردبوو. لە حەوشە باریکەکەی پشتیشەوە، بە بلۆك کولانەیەکم دروستکرد بوو، کەروێشکم تێدا بەخێودەکرد. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە ژیانی خێزانەکەماندا، بە ئەو شێوەیە باڵندە و ئاژەڵ ڕاگرین و بەخێویکەین. زۆر حەزم لە بەخێوکردنی ئاژەڵ دەکرد، بە تایبەتی، کاتێ لەگەڵ کەروێشکەکاندا یاریماندەکرد و ڕاوماندەنان، چێژێکی تایبەتمان لێ دەبینی. ڕەنگە ئەوەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کاتێ منداڵبووم، بەرانبەر مزگەوتی گەورە، باخچەیەکی سارایانی لێبوو، هێندێ ئاژەڵ و پەلەوەری تێدابوو، تەیاندەهێشت، بچمە ژوورەوە و تەماشایانکەم، هەر لە دوورەوە تەماشامدەکردن، دیارە ئەوەش لە بیرەوەری و مێشکمدا مابووەوە، بۆئەوەی ئەو ڕەوشە بۆ خۆم دروستکەم و قەرەبووکەمەوە!

لای ڕاستی حەوشەکەشمان بە کەوەر و کەرەوز، بامێ و تەماتە چاندبوو. هێندە ماڵەکەمان خۆشبوو، بەهاران و هاوینان، هەرگیز لە ماڵەوە بێ تاقەت نەدەبووین، بە تایبەتی لە سەریانەوە، هەموو (سەرچنار)مان لێ دیاربوو، هەمیشەش میوانمان هەبوو. خۆشمان زۆر بووبووین، پێنج برا و خوشکێ بووین، لە چیمەنەکە پێکەوە یاریماندەکرد.



سەر ئاوەکەی (سەرچنار)، ساڵی (1960)

باوکم لە نەخۆشخانەی (سەرچنار)، لەگەڵ (حاجی جەمالی حاجی ئەمینی دەلاک)، پێکەوە کاریاندەکرد. سیستەرێکیشی لێ بوو، خوشکی (سدقی جەمیل) بوو، ناوی (ڤیکرەت) بوو. (رووناک)ی خوشکیشی، لەگەڵ مامە (ساڵح)م لە (بەسرە) ئینگلیزی دەخوێند.
لەبەرئەوەی ئەو کاتە (سەرچنار)، قوتابخانەی ناوەندیی و ئامادەیی لێ نەبوو، تەنیا هەر دوو قوتابخانەی سەرەتایی کوڕان و کچانی لێبوو، ئێمەی قوتابیانی کوڕ و کچ، لە ناوەندیی و ئامادەیی دەمانخوێند، دەبووایە، هەموو ڕۆژێ بەیانیان زوو هەستاینایە، کاژێری حەوتونیو، لەسەر جادەی سەرەکی بوەستاینایە و چاوەڕێی پاسمان بکردایە. کارگەی چیمەنتۆش، پاسێکی گەورەی بۆ تەرخانکردبووین، بەیانیان بە خۆڕایی دەیبردین و ئێوەڕوانیش دەیهێنایەنەوە، شۆفێرەکەشی کاک (مستەفا)ی دراوسێی کۆنی گەڕەکی (شێخان)مان بوو.

دووەمین گەشتی (بەغدا)
پشووی هاوینی (1966) بوو، لەگەڵ (نەدیم)دا بڕیارماندا، سەرێ لە (بەغدا) بدەین. هەر بە جلی کوردیشەوە چووین و لە ئوتێل (شەملا) دابەزین. ماوەی هەفتەیەک لە ئەوێ بووین، زۆر خۆشمان ڕابوارد. (نەدیم) شارەزابوو، هەر لە بەیانییەوە دەردەچووین، بە ئەو جادە و شەقامانەدا دەسووڕاینەوە، تا ماندوودەبووین، کە ماندووش دەبووین، لە شوێنێ دادەنیشتین، نانمانمانەدەخوارد، یا دەچووین بۆ سینەما.
ئەو کاتە، هێشتا فێری خواردنەوە نەبووبووین. لەبەرئەوە ئێواران دەگەڕاینەوە، لە ئەو ناوە دەگەڕاین، یا لە چاخانەی (کندی)، یاری تاوڵەمان دەکرد. بەڵام ڕۆژێ پێش ئەوەی بگەڕێینەوە، هەموو ئەو خۆشی و گەڕانەیان، لە کونەلووتمەوە دەرهێنایەوە. چۆن؟
بەیانی زووهەستاین، (نەدیم) گوتی: لەگەڵم وەرە، سەرێ لە ماڵی خاڵم دەدەم. منیش گوتم: نایەم و لێرە چاوەڕێتدەکەم. ئەو ڕۆیشت و هێندەی پێ نەچوو، من دەرپەڕیم. بە شەقامی (ڕەشید)دا شۆڕبوومەوە، هەمووی چەن خولەکێ ڕۆیشتم، لە دوورەوە کۆمەڵێ خەڵکم بینی. چوومەپێشەوە و تەماشامکرد، پیاوێ دانیشتووە، پارچەیە پەڕۆی داخستووە، سێ کاغەزی قوماری بە دەستەوەیە، دووانی سپیی و یەکێکیان سووربوون. ڕووی کاغەزەکانی پیشانی خەڵکەکە دەدا و بە عەرەبی هاواریدەکرد: (حومرە تەلەع، ئەبیەز خوسرە) واتە سوورەکە دەیباتەوە و سپییەکەش دەیدۆڕێنێ. ئیدی خێراخێرا، شوێنی کاغەزەکانی دەگۆڕی، لەسەر پەڕۆکە دایدەنانەوە و خەڵکیش پارەیان لەسەر کاغەزەکان دادەنا، گەر سوور دەرچووایە، چەندت دانایە، هێندەت دەبردەوە. گەر سپیش بووایە، ئەوا پارەکەت دەدۆڕاند و بۆیان دەکردی بە حوشتر!

کاتێ ئەو یارییەم بینی، زۆر سەیرم لێهات و لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەمانە کەرن، وا بە خۆڕایی ئەو پارە جوانانە بە خەڵك دەدۆڕێنن؟ چونکە هەموو جارێ دیاربوو، کاغەزە سوورەکە لە کوێ دادەنێ و بۆ خەڵکیش دەردەچوو! منیش گوتم: ئەی بۆچی بۆ منیش دەرنەچێ؟! ئیدی تەماع گرتمی، چارەکە دینارێکی ئەو سەردەمەم، لەسەر یەکێ لە کاغەزەکان دانا، کابرا کاغەزی هەڵگێڕایەوە، ڕووی سپیبوو، بۆم دەرنەچوو. جارێکی دیکە نیودینارم دانا، ئەویش ڕۆی. ئینجا ماوەیە ماتبووم و ڕاوەستام، هەر تەماشای جووڵەی دەستیم دەکرد، تا بزانم، چی دەکا؟ ئەو کاغەزانە چۆن دەجووڵێنێ و دایاندەنێتەوە؟! ئینجا لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم دینارە دادەنێم، گەر ئەم جارە بۆم دەرچوو، مایەکەی خۆم دەستدەکەوێتەوە، شەرتبێ ئیدی نەیکەم و بڕۆم. ئەم جارە سوور دەمزانی، کاغەزە سوورەکە لە کوێ دانراوە، کەچی کە هەڵیبڕی، سپی دەرچوو. ئێستەش تێ ناگەیشتم، چۆن چۆنی چاوبەستی لێ دەکردم؟ لێکمدەدایەوە و دەمگوت: تۆ بڵێی، هاوبەشی ئەمریەمن بێ و ئەو لە بنەوە بۆی بگۆڕێ! بە کوردییەکەی، پێنج دینارونیوم پێ مابوو، هەمووم دۆڕاند و یەك جاریش بۆم دەرنەچوو! ئینجا پیاوەکە زانی، پارەم پێ نەماوە، یەکێ قیژاندی: کاکە پۆلیس هات و ڕایکرد!

کاتێ ئاوڕمدایەوە، نە پۆلیس دیاربوو، نە کەسیشی لێبوو. ئینجا تێگەیشتم، ئەو چەن کەسە، هەموویان پێکەوە هاوبەشبوون، بۆ فڕوبەسەرێکی وەك من دانیشتبوون، گیرفانی هەڵتەکێنن! بە ڕاستی هێندەی شەرمەمکرد، هێندە مەراقم بۆ پارەکە نەخوارد، چونکە هێشتا پارەی ئوتێلم نەدابوو، پارەشم بۆ نانخواردن و ترۆمبێلیش دەویست، تا پێی بگەڕێمەوە. نەمدەزانی، چی بکەم؟ لە ناچاریدا، پاشەوپاش بەرەو ئوتێلەکە گەڕامەوە و لێی دانیشتم، چاوەڕێی (نەدیم)م دەکرد. کاتێ هاتەوە و بۆم باسکرد، گوتی: پێم نەگوتی، لەگەڵ من وەرە، بە قسەت نەکردم. منیش گوتم: ئێستە کاتی ئەو قسانە نییە، من هەڵەی خۆم دەزانم، تۆ چەندت پارە پێ ماوە؟ گوتی: پێمە، بەڵام بەشی هەردووکمان ناکا.

لە ئۆفیسی ئوتێلەکە، کوڕێکی خەڵکی (سولەیمانی) کاریدەکرد و دەمناسی، ناوی (عوسمانی حاجی غەریب) بوو، هەموو بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە. ئەویش گوتی: هەر تۆ وات بەسەرنەهاتووە، بەڵکوو زۆر کەسی دیکەشیان داخکردووە، ئەوانە هەموو پێکەوەن و خۆیان دەزانن، چی دەکەن.

ماڵی ئاوابێ، زۆر پیاوانە گوتی: گوێ مەدەرێ، لە (سولەیمانی) پارەکە لە دووکانی باوکم دانێ. ئیدی هەر ئەو ڕۆژە سواربووین و گەڕاینەوە. لە ئەو ڕۆژەوە بڕیارمدا، تا لە ژیاندابم، هیچ جۆرە قومارێ نەکەم. ئەمە بۆ گەشت چووین و کەسێ بای باڵی خۆمان بدەین، کەچی گەشتەکەیان لێ تێکداین!

**من و باپیرم**

پشووی هاوینبوو، مامە (سالّح)م لە (بەسرە) هاتبووەوە، ئەو شەوە لە مالّی باپیرم بووم. بەیانی زوو لە خەوهەستاین، وەک سیستەمی مالّی باپیرم دەبووایە، کەس نان نەخوا، تا ئەو لە مزگەوت دێتەوە. ئەوەبوو، ناشتاماندەخوارد، هێندەم زانی، باپیرم دەستیکرد بە بۆلّە بۆڵ، لە دەنکم تووڕەبوو و گوتی: من ڕۆژ تا ئێوارە ڕەنجدەدەم و ماندوودەبم، ئەم هەموو زەبەلاحەم پێ بەخێوناکرێ. ئیدی هەستم پێکرد، شتێ ڕوویداوە، ئەگینا چەن سالّە، من لە ئەوێ دەمێنمەوە، هەرگیز قسەیەکی وا ناخۆشی نەکردووە!

لەگەلّ مامدا هەستاین و چووینەژوورەکەی خۆی. گوتی: باوکم هەروا تووڕەیە، گوێ مەدەرێ، لە ئەمەودا کەمتر وەرە بۆ ئێرە، خۆم سەرت لێ دەدەم. کۆمەلّێ بەرهەمی (بیار ڕۆفایل)یشی دامێ و گوتی: ئەم چیرۆکانە زۆر خۆشن، خۆت بە خوێندنەوەیانەوە خەریک بکە، هەم کاتەکەی پێ دەکوژی، هەم عەرەبییەکەشت باشدەبێ. بە ڕاستی زۆرم پێ ناخۆشبوو، چونکە باپیرم منی خۆشدەویست، تێ نەگەیشتم، بۆ وای کرد و چی ڕووی داوە؟! ئیدی ئەو ڕۆشتنەی ڕۆیشتم، تا مالّمان لە (سەرچنار) بوو، جارێکی دیکە سەرم نە بە دووکان و نە بە مالّیدا نەکردەوە.

ڕۆژێ مامم هات و گوتی: تۆ لای (ڕەحمە)ی ژنی (بەکر)ی برام چیت گوتووە؟ منیش وەک لە بانێ بەرمدەنەوە، گوتم: مەبەستت چییە؟ گوتی: گوایە تۆ گوتووتە، منەتی تێدا نییە، من لێرەم، چونکە باپیرم، بە پارەی باوکم دەولەمەندبووە و بووە بە ئەو پیاوە! ئینجا تێگەیشتم، بۆچی باپیرم ئەو بەیانییە گرێگرتبوو! گوتم: باوەڕبکە، هەرگیز شتی وام لای ئەو باس نەکردووە، هەرچەندە، باوکم زۆر یارمەتی باپیرمی دابوو!

لەگەلّ ئەوەشدا، ئەو ژنە زۆر ڕووی خۆشبوو، هەمیشە دەم بە پێکەنینبوو، گالّتەی لەگەلّ دەکردین و ئێمەی خۆشدەویست، بەلاّم وەک چۆلەکەی باپیرم وابوو، هەمیشە بە گوێیدا دەیچرپواند، کەسێ زمانی خراپبوو، زۆر شتی بۆ باپیرم باسدەکرد و دەگێڕایەوە، خوا لە گوناهەکانی خۆشبێ!

**ڕەوشی (کوردستان)**

سالّ سالّی (1966) بوو. ڕەوشێکی زۆر سەیر، سەراپای (کوردستان)ی گرتبووەوە. نە جەنگ و نە ئاشتی بوو. هێندێ جار شەڕێکی پچکۆلانە، لە نێوان پێشمەرگە و سوپای (عێراق)دا ڕوویدەدا، ئەویش زوو چارەسەردەکرا و دەوستا. بەلاّم ڕێکخستنەکانی (پارتی) و شۆڕش، لە شارەکاندا زۆر لاوازبوون. تەنیا بالّی جەلالی چالاکبوو.

تا ئەوان لە (ئێران) بوون و خۆیان بە بارەشی گەرمەگوڕی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) نەفرۆشتبوو، بە دڵ و بە گیان لەگەڵیانبووم. بەڵام کاتێ گەڕانەوە، لە (سولەیمانی) و (بەکرەجۆ)، بنکە و بارەگایان دانا، شانبەشانی سوپای دەوڵەتی داگیرکەر، دژی هێزی پێشمەرگەی (کوردستان) دەجەنگان، یەکسەر وازمهێنا.

من و (کەریمی شێخ سەلام) و (نەدیم) و کۆمەڵێکی دیکەش لە قوتابخانە، زۆر دژایەتی جەلالییەکانمان دەکرد. بەڵام هاوڕێ هەرە نزیکەکانمان (سەباحی غالب، ئازادی مەلا موحەممەد ...)، ئەوان جەلالی بوون. ئێمە هەوڵماندەدا، ڕێکخستنێ دروستکەین، بەڵام بە هیچ جۆرێ، سەرکەوتوو نەبووین و سەرەداوێکمان دەس نەکەوت. لە ئەوە دەچوو، هەڤاڵانی سەرکردایەتی شۆڕش، دووکان و بازاڕی ڕێخستنە تایبەتەکانی خۆیان، لە شارەکاندا داخستبێ و نەیانمابێ، یا زۆر لاواز و نهێنی بووبێ!

لە ڕاستیدا، ئەو قسانەی جەلالییەکان، دژی ژەنەراڵ (بارزانی) و شۆڕشەکە دەیانکرد، زۆریەیان ڕاستبوون. چونکە (بارزانی)، باوەڕی بە پارتپارتێنە نەبوو، خەڵکانێکی بوودەڵە، هەلپەرست و خراپیان، لە دەور کۆببوویووەوە، پتر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان کۆیکردەبوونەوە! بەڵام هەرچۆنێ لێکمدەدایەوە و لەگەڵ برادەرەکانی خۆمدا باسمان دەکرد، هەر دەبووایە، لایەنی (بارزانی) و پشتی شۆڕش بگرین، چونکە شێوازی خەباتەکەیانمان پێ خراپبوو، ئەو ڕێیەی گرتبوویان، هەڵەبوو، وەک دوای چەندین ساڵ (مام جەلال) خۆی دانی بە ئەو هەڵەیەدا نا. باڵەکەی (بارزانی)ش، بە ناپاکیان دانان و ناوی جاشی (66)یان بەسەردابڕیبوون. لەبەرئەوە لێیان دوورکەوتینەوە و ساردیبیەك، لە نێوانماندا پەیدابوو. ئەگینا باڵەکەی (بارزانی)، لەنێو شارەکاندا هیچ نەبوون، تەنیا هێندە هەبوو، ئەوان لە ئەو پێدەشت و شاخانە پێشمەرگەبوون، دژی سوپای داگیرکەری وڵاتەکەمان دەجەنگان، داوای مافە ڕەواکانی گەلەکەمانیان دەکرد، ئەوەش خۆی لە خۆیدا، لە ئەو قۆناغەدا، هەموو شتێ بوو!

ئەم ناکۆکی و دووبەرەکییەش، هەر بە ئەوەوە نەوەستا، جەلالییەکان لەنێو شارەکان بارەگابکەنەوە و خۆیان ڕێکخەنەوە، بەڵکوو چەکێکی زۆریان، لە دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) وەرگرت، هێزێکی چەکداریان پێکەوەنا، بە پشتیوانی هێزەکانی سوپاش، پەلاماری چەن نێوچەیەکی دەوروبەری شارەکانی (کوردستان)یان دا، لە هێندێ نێوچە شکان و لە هێندێکی دیکەش سەرکەوتن. ئیدی بە ئەو شێوەیە، جەنگی نێوخۆ گەرمبوو.

لە هەمووشی سەیرتر ئەوەبوو، ڕۆژێ لە گەڕەکی (شێخان) بووم، لەگەڵ برادەرەکانمدا، لە دووکانی (شێخ سەلام) وەستابووین. لە پڕ چەن ترومبێلێ هات و لەبەردەمی مزگەوتی

(پێنتەبەق)دا وەستان، هێزێکی چەکداری جەلالییشیان لەگەڵ بوو. تەرمی مردووییەکیان داگرت و بردیانەژوورەوە. ئێمەش چووین، تا بزانین، چی ڕوویداوە و کێ مردووە؟!

پاشان بۆمان دەرکەوت، تەرمی (حەسەن قامیشی) بوو، لە شەڕی نێوخۆ لەگەڵ پێشمەرگەدا بەرکەوتووە و کوژراوە. دوای ئەوەی شتیان و کفنیان تێوە پێچا، یەکێ لە لێپرسراوی جەلالییەکان گوتی: خوێنی هەڤاڵ شەهید (حەسەن)، هەروا بە خۆڕایی ناڕوا، تۆڵە لە بەکرێگیراوەکانی (مەلامستەفا) دەکەینەوە. پیاوێکی پیری ڕیشسپیش دانیشت بوو، پاڵی بە دیواری مزگەوتەکەوە دابوو، دارجگەرەیەکی درێژیشی بەدەستەوەبوو، جگەرەی دەکێشا، خۆی بۆ نەگیرا و گوتی: وەڵڵا گەر ئەوە شەهیدبێ، دۆزەخ لەبەر شەهید بەرتاکەوێ! بە ڕاستی ئەو قسەیە زۆر بە هێزبوو، زۆربەی ئەوانەی لە ئەوێش بوون، گوێیان لێبوو، بەڵام هیچ قسەیان نەکرد و تەنیا سەریانبادا!

قوتابخانەی (شۆڕش)ی نوێ و چەند ڕووداوێ

ڕۆژی (1. 9. 1966)، پشووی هاوین تەواوبوو. جارێکی دیکە، دەرگەی قوتابخانەکان کرانەوە. ئەو کاتە لە پۆلی (3) بووم. ئەو ساڵە من و (کەریمی شێخ سەلام، سەباح غالب و ئازادی مەلامحەممەد)، لە یەک گرووپ بووین. هەر لە سەرەتاوە، ئەم قۆناغەمان زۆر بە توندی گرت و دەمانویست، هەرچی چۆنێبێ، لە دەس قۆناغی ناوەندیی ڕزگارمانبێ و دەس بە قۆناغێکی دیکەی نوێی خوێندن بکەین.

لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریی تۆقیبووین، جگە لە ئەوەی بە عەرەبی دەمانخوێند، وەڵامدانەوەش هەر بە عەرەبی بوو، ئێمەش عەرەبیمان باش نەدەزانی، هەرچەند بیرم لێ دەکردەوە، بۆچی دەبێ، پۆلەکانی کورد، بە زمانی زگماکی خۆیان نەخوێنن، لە داخاندا خەریکبوو، دڵم بتەقێ؟!!

لەبەرئەوە خۆم دابووە خوێندن و زۆر خۆم ماندووردەکرد، هەر بۆئەوەی خولی یەکەم دەرچم و شوێنێکی باشم بەرکەوێ. (تەدیم)یش هەر لە ناوەندیی شۆڕش بوو، بەڵام ئەو لە پۆلی دوویبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، هێشتا هەڵسوکەوتمان بە تەواوی باش نەبووبوو، هێشتا ڕەگێکی هاری و ئازاردانەوەی قوتابخانە کۆنەکەی (شۆڕش)، لە بیر و هۆشماندا دەژیا و لە دەمارەکانماندا لێیدەدا!

مامۆستا (سەلاح)

هێندێ جار بە یادی ئەو ڕۆژانەوە، لە پۆلدا قسەماندەکرد و پێدەکەنین، بە تایبەتی گەر مامۆستا (سەلاح)ی وەرزش بهاتایە، باسی یارییەکانی ئەکرۆباتی بۆ بکردینایە، ئیدی

لەبەر پێکەنین، دەسڕەکانمان لە دەممان دەناخنی. چونکە ئێمە تەنێ هەر ئەو یارییەمان نەدیبوو، بەڵکوو هەر نەشمانبیستبوو. لەبەرئەوە وامان دەزانی درۆمان بۆ دەکا، بۆئەوەی گوێبگرین و بێدەنگبین! زووزووش یەکێ لە دواوە، بە دەنگێکی نزم دەیگوت: دەک ماڵی درۆت بە قوڕگیری، ئەم درۆیانەت لە کوێوە هێناوە؟!

مامۆستا (سەلاح) خەڵکی (کەرکووک) بوو، بە ئەو شێوە زارەی خۆی، شتەکانی بۆ باس دەکردین، هێندەی دیکە پێکەنین دەیگرتین. جا وەرە یەکێ خەڵکی نێوچەیەکی دیکەی (کوردستان) بێ، قسە بۆ بێچووە ئەهریمەنەکانی شاری (سولەیمانی) بکا، دەبێ چۆن سەرشێتی نەکەن! بەڵام ئەو زۆر نەرم و بەرێز بوو، گوێی بە ئەو شتانە نەدەدا، لە کەس توورە نەدەبوو، لەسەر باسەکەی خۆی بەردەوامدەبوو!

**مامۆستا (مستەفا شەریف)**

مامۆستا (مستەفا شەریف)، وانەی عەرەبیی پێ دەگوتین. ئەویش هەر دەهاتەژوورەوە، وازی لە بابەتی نێو پەرتووکەکە دەهێنا و ئەو چیرۆکانەی بۆ دەگێڕاینەوە، کە خۆی خوێندبوونییەوە و حەزی لێ دەکردن. بە ڕاستی وا خۆشی دەگێڕایەوە، جاری وا هەبوو، وەنەوزمانئەدا!

(ئەشرەف)ە کەچەڵێکی هەورامیمان هەبوو، کڵاوێکی لەسەردابوو، لای (کەریم)ەوە دادەنیشت، گەلێ لە کچ جوانتر بوو. هەر جارێ عەرەبیمان هەبووایە، لە پەنجەرەکەوە مامۆستا (مستەفا)ی دەبینی، دەیگوت: ئەوا (مەلاسمایل)ی حیکایەتخوانیش هات!

**مامۆستا (نازم عەبدولجەبار)**

مامۆستا (نازم عەبدولجەبار)ێکیشمان هەبوو، عەرەبی (موسڵاوی) بوو، پیاوێکی زۆر موسوڵمان و نوێژکەر بوو. مێژووی پێ دەگوتین، تا بڵێی، لە بابەتەکەی خۆیدا شارەزا بوو. جگە لە ئەو زانیارییانەی، لە پەرتووکی مێژوودا نووسرابوون، هێندێ زانیاری دیکەشی، بە درێژی بۆ باسدەکردین.

ڕۆژێ باسی شەڕی (ئوحود)ی بۆ کردین، زۆر درێژەیدایە، لە گوتاربێژێکی مزگەوت باشتری دەزانی! دوایی گوتی: لە ئەم شەڕەدا، ددانێکی پەیامبەر شەهیدبوو. (کەریمی شێخ سەلام)یش، لە دوای منەوە دانیشتبوو، سیخورمەیەکی لێدام و گوتی: ئەوا ددانێکی پەیامبەریشیان شەهیدکرد، ئاخر ددان شەهیددەبێ؟! منیش خۆم بۆ نەگیرا، دامە پرمەی

پێکەنین. مامۆستاش وایزانی، بە ئەو پێدەکەنم، ڕەمەزانیش بوو، هێزی لەبەڕبڕابوو، چیکڵدانەی تەسکبووبووە، باسەکەش باسی پەیامبەربوو، ئیدی بە تووڕەییەوە هات و ویستی، بە دار لێمدا. منیش دارەکەیم گرت و پاڵێکی توندم پێوەنا، دام بە تەختە ڕەشەکەدا. ئەویش یەکسەر پۆلەکەی بەجێهێشت و ڕۆی.

لە پۆلەکەدا بوو بە هەرا، یەکێ دەیگوت: بۆ پێدەکەنی، ئەو باسی پەیامبەر دەکا، یەکێکی دیکە دەیگوت: هەق نەبوو، پاڵی پێوەنێی، ئیدی هەر یەکە قسەیەکی دەکرد. (کەریم)یش گوتی: خێراکە، هەستە ڕاکە، بە خوا ئێستە (هادی)یە سوور و (عومەری مچە) بێن، بە لەقە دەتکوژن. منیش هەستام، لە دیواری حەوشەکەوە سەرکەوتم و بازمدا بۆ کۆڵان.

ڕەنگە ئەو کارەی (ئەحمەد حوسێن) و مامۆستا (لەتیف)ی بەڕێوەبەری کۆنی (شۆڕش)، هەر لە بیر و هۆشمدا مابووبێتەوە، بۆیە بە هەمان شێوە، هەڵسوکەوتمکرد و بە گژ مامۆستاکەمدا چوومەوە!

دوایی (کەریم)م بینی، گوتی: باشبوو، ڕۆیشتی، ئەگینا وا هاتبوون، لەبەرچاوی قوتابییەکان بتشکێنن! منیش زانیم، تازە قەوماوە و بێ سزا دەرناچم، ئەشمەوێرا، بۆ باوکمی باسکەم، یەکسەر هانام بۆ (شێخ عوسمان) برد. شتەکەم بۆ ڕوونکردەوە و داوام لێ کرد، یارمەتیمبدا. ئەویش گوتی: باشە، بەیانی پێکەوە دەچین. من دەمزانی، (هادی مەحموود بەگ) لە دایکەوە خزمی (شێخ عوسمان)ە، (جەلالی)یشبوو، دەسی زۆر دەڕۆی و خەڵکیش خۆشیاندەویست.

بەیانی چووین و گوتی: تۆ لەبەردەرگە بوەستە. خۆی چووەژوورەوە و زۆری پێچوو، زۆر نیگەرانبووم، هەر لێکمدەدایەوە، تۆ بڵێی بڕیاری دەرکردنی یەکجاریم، یا گواستنەوەم بۆ قوتابخانەی شەو دەرچووبێ؟!

لە پڕ لەگەڵ (هادی)ە قەندی هاتەدەرەوە و گوتی: سوارپە. ڕۆیشتین و هیچ قسەی نەکرد. پاش کەمێ لە بازاڕ دایبەزاندم و گوتی: ئەمە دواجارە، گەر جارێکی دیکە شتی وا بکەی، بە یەکجاری لە خوێندن بێبەشتدەکەن. بەڵام لەبەر خاتری من، تەنیا یەک هەفتەیان سزا دای، ئەگینا دەریاندەکردی. منیش زۆر سوپاسمکرد و لە خۆشیاندا نەمدەزانی، چی بکەم، کە بە ئەو سزا کەمە شکایەوە! هەرچی چۆنێبوو، باوکمان دامرکاندەوە و پەڵێنم دایە، خۆم لە ماڵەوە وانەکانم بخوێنم.

بە ڕاستی تا ماوم، قەرزاری کاکە (شێخ عوسمان)م، ئەگینا لە ئەوانەیە، خوێندنم تەواو نەکردایە و ئەم پیاوەی ئێستەم، لێ دەر نەچووایە! هەزاران درووود لە گیانی پاکی بێ و جێی بەهەشتی بەرین بێ!

سەیر ئەوەبوو، هەر دوای دوو ڕۆژ، لە مزگەوتی گەورە، نوێژی ڕۆژی هەینیم دەکرد، کاتێ سڵاومدایەوە، یەکێ لە دواوە، دەستی خستە سەرشانم، ئاوڕمدایەوە، مامۆستا (نازم) بوو. پێکەوە چووینەدەرەوە، چۆنی و چاکی لەگەڵ کردم. منیش زۆر شەرمەزار بووم و داوای لێبووردنم لێ کرد. گوتی: بە داخەوە، من دژی ئەو بڕیارە بووم، بەڵام بەڕێوەبەر گوتی: هەر دەبێ، سزای خۆی وەرگرێ. گوێ مەدەرێ، کە هاتیتەوە، هەرچیت پێویستبوو، یارمەتیتدەدەم. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، تەنیا هەر مامۆستا و قوتابی نەبووین، بەڵکوو دوو برابووین، بە ڕاستی بە ئەو هەڵوێستە جوامێرانەیەی، شەرمەزار و قەرزاریاری کردم، جگە لە ئەوەی وانەیەکی فێرکردم، تا ماوم بیرم نەچێتەوە، ئەویش لێبووردن و دڵپاکی بوو، لە هەر کوێ بێ، یادی بەخێر!

ئێستە، بیر لە ئەو ڕووداوە دەکەمەوە و لێکیدەدەمەوە، هەرچەندە خەتای من نەبوو، کەچی هێشتا مامۆستا دڵخۆشیدامەوە و ئاشتیکردمەوە. بۆ؟ چونکە تۆڵەسەندنەوە لای هێندێ کەسی بە ویژدان، بە ڕەوشت و لە خواترس، هێندە کارێکی ئاسان و خۆش نییە، تا جێبەجێیکا! ئاخر تۆڵەسەندنەوە، وەک چەکێکی دوودەم وایە. لە لایەکەوە، مرۆ دەس لە دوژمنەکەی دەوەشێنێ و تۆڵەی لێ دەکاتەوە. لە لایەکی دیکەشەوە، گەر ئەو مرۆڤە ویژدانی هەبێ، دوایی پەشیماندەبێتەوە، برینێکی قووڵ لە دڵ و دەروونیدا بەجێدێڵێ و ئازاریدەدا.

دیارە مامۆستا (نازم)یش، ئەو کاتە لە ئەو کاردانەوەیەی من تووڕەبووبوو، بەڵام کاتێ ساردبووەتەوە، زانیویەتی، قوتابییەکی لەسەر هەڵەیەکی بچووک، بە سزاگەیاندووە، پێی ناخۆشبووە و پەشیمانبووەتەوە! بۆیە کاتێ لە مزگەوت بینیمی، بە ئەو شێوەیە، هەستی خاوێنی خۆی دەربڕی. ئیدی دوای ئەو بەزمە، لە ئاوەندیی (شۆڕش)، خۆشەویسترین مامۆستام بوو، تا خوێندنیشم تەواوکرد، وەک دوو هاوڕێمان لێهاتبوو، عەرەب گوتەنی: (یەعنە لعەداوە، حەلاوە!)

دوای ئەوەی، ماوەی سزاکەم تەواوبوو. گەڕامەوە. ئیدی زۆر بە کوڵودڵەوە دەمخوێند، هەرگیز لە وانەکانم دوانەدەکەوتم. برادەرێکیش هەبوو، ناوی (شەوکەت) بوو، زۆر ئامۆژگاریکردم و هانیدام، واز لە هەرا و بەزم بێنم و بخوێنم. وەک دەڵێن، ئەو گرفتەم لەگەڵ مامۆستا (نازم) و ئەو سزادانەم، خێری پێوەبوو، بە تەواوی ڕایچڵەکاندم، زوو هۆشم بەبەرخۆمداهاتەوە و ڕێی ڕاستم گرت. هەرچی چۆنێ بوو، کاتێ نمرەمان وەرگرت، لە وانەی بیرکاریدا کەتبووم و لە تاقیکردنەوەی بەکەلۆریا قەبووڵیانکردم. ئەو دوو مانگەی پێش تاقیکردنەوەکەش، لەگەڵ (عارف ناسراو)دا، لە باخەکەی (سەرچنار) زۆر خۆمان ماندووکرد، کە ئێستە باخی (نەورۆز)ی پێ دەڵێن.

من لە کەلەشەقی و گێرەشێوێنی گەڕامەوە و خوای گەورەش یارمەتیدام، ڕەنجەکەم بە فیڕۆ نەڕۆی و لە خولی یەکەمدا دەرچووم. بە ڕاستی هەر قوتابییەک لە ئەو ڕۆژەدا، پۆلی سێی بڕیایە، بە ئەو بارودۆخە ناخۆشە، بە ئەو بەرەڵای و هەراوهاژاوەیە، وای دەزانی، بیتاقەی بۆ دەرچووە!

**شەوانی (سەرچنار)**

هێندێ شەو، پێشمەرگە دەهاتن، تەقەیان لە بنکەکانی پۆلیس و جاشەکان دەکرد. سەراکەی تەنیشت ئێمەش، هەر گوێیان لە دەنگی تەقە بووایە، لە ترسی خۆیان، تا دەرەنگانێ فیشەکیان بە تاریکەشەوەوە دەنا! ئێمەش تا تەواودەبوو، لەگەڵ پۆلیسەکانی نێو سەراکەدا، ئێشکمانیدەگرت و خەو لە چاوانمان دەتۆرا!

یەک دوو جاریش، پێشمەرگە ویستیان، خۆفرۆش (حەمەی حەمەتالیب) بکوژن. ئەو کاتە لە (سەرچنار) مەئمورەبوو، لە خانووە دووقەوزەمەکانی لای مەلەوانگەکەوە بوو. هەر لە دووتووانەوە، ماڵەکەیان بەر قازیفە دەدا و دەبوو بە ڕۆژی حەشر، بەڵام هیچ زیانی لێ نەدەکەوت!

زستانان، (سەرچنار) زۆر ناخۆشبوو، زۆر چۆڵ و کشومات بوو، جگە لە بازاڕێکی چکۆلە و چاخانەکەی (فەخری)، هیچی دیکەی تێدا نەبوو، هیچ شوێنێکی واشی لێ نەبوو، مرۆ کاتێکی خۆشی تێدا بەسەربەرێ. چاخانەکەش، لەبەر یاری کاغەز و دۆمینە بەرنەدەکەوت، جێ نەبوو، لێی دانیشی. ناچاردەبووین، لە ماڵەوە کات بەسەربەرین، بخوێنینەوە و ئەرکەکانی قوتابخانە جێبەجێکەین. بەڵام هاوینانی تا دڵ بخوازێ دڵگیر و خۆش بوو، هەمیشە جمیەمەات، خەڵکێکی زۆر ڕووی تێ دەکرد، بە تایبەتی نێو باخەکە، ڕۆژانی هەینی، لەبەر سەیرانکەر بەرنەدەکەوت.

**پورە نەسرین**

زستانی ساڵی (1996) بوو، پورە (نەسرین)م شووی بە ڕەوانشاد (شێخ موحەممەدی شێخ سەعیدی باراوی) کرد. ئەو کاتە لە (بەغدا)، لە فەرمانگەی تێلیفۆنات کاریدەکرد، لەبەرئەوە بردی بۆ ئەوێ.

(نەسرین)م زۆر خۆشدەویست، نزیکە تەمەنی خۆم بوو، زۆر جار سەری لێدەداین و لامان دەمایەوە، زۆر حەزی لە گاڵتە و پێکەنین بوو. هێندێ جار تووڕەیدەکردم و شەرمانئەبوو، منیش بە ئەو تووڕەی و شەڕانییەی خۆمەوە، لێم قەبووڵ نەدەکرد، پەلامارمەدا و

تێمدەسرەواند، چەن جارێ لووتیم پڕکردبووە لە خوێن. بەڵام ئەو هێندە دڵی پاک و لێبووردە بوو. زوویر نەدەبوو، زوو ئاشتدەبووەوە، هەر پێدەکەنی و لەسەر بەزمی خۆی بەردەوامبوو!

## مەیخۆری

زۆرزوو سەرم لە گەڕەکی (شێخان) دەدا و هاورێ کۆنەکانم دەبینی. هێندێ ئێوەڕۆش، (سەمەی پلەسووری) هاوڕێم نەیدەهێشت، بڕۆمەوە، لە ماڵی ئەوان نانمدەخوارد. نزیکی جێژنی قوربانبوو، من و (سەمە) و (هێرش) ڕێککەوتین، بەیانی زوو یەکدی ببینین و لە دەشتەکەی گەڕەکی خۆمان بخۆینەوە، کە ئێستە نەخۆشخانەی فێرکاری و زانکۆی (سولەیمانی) لێ دروستکراوە.

ئەو کاتە ئەو ناوە، هەمووی بە بەرووومی کێڵگە و باخداری چێنرابوو. لە نێوەڕاستیدا گەستێلکێکی لێ بوو، ئاوی باراناوی تێدا کۆدەکرایەوە. ئەو ناوە چۆڵبوو، مەگەر خەڵک دەمەوئێواران پیاسەیان لێ بکردایە، یا مەیخۆرەکان لە ئەوێ بیانخواردایەتەوە. ئێمەش بە شوێنێکی باشمان زانی، چونکە کەس نەیدەبینین و بۆ ماڵەوەیان نەدەگێڕایەوە.

ڕۆژەکەی زۆر خۆشبوو، خۆرەتاوێکی گەرمبوو، بێ تاقەتیکردبووین، هەر بە ئەو بەیانییە زووە، دەستمان بە جگەرەکێشان و خواردنەوە کرد، سێ قاپ شەرابی سوورمان کڕیبوو، هەر هێندە سەرمان گەرمبوو، ئیدی گۆرانیمانئەگوت و پێدەکەنین. بە پەلە دەمانخواردەوە و هەر زوو تەواومانکرد. کاتێکم زانی، هەرسێکمان لاڵوپاڵ لێی کەوتووین، لە دەنگی پرخەپرخی خۆمان خەبەرمانبووەوە، عارەقێکی زۆرمان کردبووەوە و لە تاو گەرما سەرمان دێشا. بە دەوری خۆمدا ڕوانیم، (هێرش) کەوتبوو، ئاگای لە خۆی نەبوو. (سەمە)ش مراخانییەکەی داکەندبوو، بە بەرد پیسایی خاوێندەکردەوە. گوتم: ئەوە چییە؟ گوتی: نازانم، کامەمان لێرەدا دانیشتووین و گوومانکردووە، منیش ئاگام لە خۆم نەبووە، لەسەری پاڵکەوتووم، هەموو جلەکانم پیسبووە!

هەرچی چۆنێبوو، خۆمان کۆکردەوە، بە لارەلارە و بە ماندوویی، بە جادەی (شێخان)دا بەرەوخواربووینەوە. هەرسێکمان بە تەواوی سەرخۆشبووین، باش قسەمان بۆ نەدەکرا، بەڵام هێندە ئاگامان لە خۆمان بوو، کە بەرەو بەردەرکی سەرا دەڕۆین، ئیدی نازانین، بۆچی دەچین! ئەوەبوو، تووشی دوو برادەری گەڕەکی خۆمان بووین، گوتیان: ئێوە زۆر ماندوون، با کەمێ لە چاخانە دانیشین و کەمێ بحەوێینەوە.



ئەم وێنەیە ڕۆژی (6 ـ 12 ـ 1966) لەسەر سووچەکەی چاخانەی (حەمەڕەق) گیراوە. لە ڕاستەوە: سمەی پلەسوور، عەبدوڵڵای عارف، خۆم، هێرشی حەمەی ئێخەلی و خوالێخۆشبوو کەریمی وەستا وەهاب.

**شەڕ و هەرای (سەرچنار)**

دوای ئەوەی، کەمێ لە چاخانەی (حەمەڕەق) دانیشتین، من گوتم: دەڕۆمەوە. هەرچەندە گوتیان: جارێ دانیشە، با کەمێ بەرتبدا، ئینجا بڕۆرەوە، من گوێم لێ نەگرتن و ڕۆیشتم. ئەوان هەر بانگیاندەکردم و منیش وەڵامم نەدەدانەوە، هێندەش سەرخۆشبووم، ئاگام لە خۆم نەبوو، بەڵام هێندەم دەزانی، لەبەردەمی مزگەوتی گەورە، سواری پاسی (سەرچنار) بم و بڕۆمەوە.

کاتێ لە پاسەکە دابەزیم، لە نێو بازاڕەکە، تووشی (حەمەی حەمەتالیب) بووم، ئەو کاتە کێ دەیویڕا، سەیری نێوچەوانی بکا، گوێی گونداری دەردێنا! منیش هەرزەکارێکی تەمەن شازدە حەڤدە ساڵانی لەخۆبای بووم، دەسێ جلی شرواڵ و مرادخانیم لەبەردا بوو، بە گژ داروبەردا دەچووم. ئەویش دوژمندار و لە خۆی دەترسا، تەماشایەکی کردم، وەک نەمناسێ، مۆڕبووەوە. منیش هاوارکرد و گوتم: بۆ تەماشادەکەی، نامانناسی؟ یەکسەر بەرەوڕووم هات و گوتی: زۆر خواردووەتەوە؟ گوتم: بەڵێ. گوتی: وەرە، با بڕۆین. چووین لە نێو چیمەنی باخی ئوتێلەکەی نێو ماڵەکان دانیشتین، من زۆرم برسیبوو، برنج و شلەی بۆ بانگکردم. ئیدی بەدەم خواردنەوە، پرسیاری لێ دەکردم و دەیویست، بزانێ، من کێم و لە کوێوە هاتووم. منیش بە خەیاڵی خۆم، چیرۆکی پێشمەرگایەتی خۆمانم بۆ دەگێڕایەوە، گوایە، لە شەڕەکەی (قەیوان)دا، من و ئەو لە سەنگەری ژمارە (13)دا پێکەوە بووین و بە پێوە شەڕمانەکرد. ئەویش قاقاپێدەکەنی، ڕەنگە سەرخۆشێکی وەک منی دەسکەوتایە، بە هەزاران دینار بەکرێی بگرتایە، ئەو قسانەی بۆ بکا و ئەویش پێیکەنێ!

ئینجا گوتی: تۆ چکارەی و لە کوێ دەژی؟ گوتم: قوتابیم و لێرە دەژیم. گوتی: بۆ تۆ کوڕی کێی؟ گوتم: کوڕی (حاجی شێخ موحەممەد)ی بریتیێنچم. ئەو باوکمی باش دەناسی، ئیدی کەمێ دڵی ئاوی خواردەوە و گوتی: باشە بۆ وات لە خۆت کردووە؟ گوتم: جێژنە و هەموو کەسێ دەخواتەوە، منیش لەگەڵ هاوڕێکانمدا، حەزمان لێ کرد و خواردمانەوە. ئیدی کەمێ ئامۆژگاریکردم و گوتی: بڕۆ ماڵەوە، بۆ خۆت بنوو. بەڵام ماڵەوەی چی و خەوی چی!

هەر لە ئەو جیابوومەوە، یەکسەر بەرەو باخەکە ڕۆیشتم، دەمزانی، زۆر جەنجاڵە و بەرناکەوێ، حەزمکرد، منیش وەک ئەو خەڵکە ڕابوێرم. بەڵام هێشتا بەری نەدابووم. هەر هاتمەدەرەوە، تووشی (نەدیم)ی هاوڕێم و (حەسەن)ی برام و دوو هاوڕێی دیکە بووم، گوتیان: با بچین بۆ باخەکە، ئیدی هەموو پێکەوە ڕۆیشتین.

بەڵام هەر لە ڕێوە، لە سەرگردەکەی شوێنی بارەکانی ئێستە بینیم، سێ پیاو وەستابوون، تەماشای پەردەکەی سەر ئاوەکەی (سەرچنار)یان دەکرد، تەنیا (حەمەی رەشە کۆیی)م ناسی، ئیدی بێ ئەوەی سڵاویان لێ بکەم و هیچ بڵێم، لە دواوە پاڵێکم پێوەنان، دووانیان تلبوونەوە و منیش ڕۆیشتم، وەک هیچم نەکردبێ، وابوو!

لە پردی سەرئاوەکە پەڕیمەوە، هەرچیم دەبینی، بە شەق و بۆکس دامدەگرتەوە، لە سێ چوارلاوە شەڕم هەڵگیرساند و ئەوانیش هەر حەپەسابوون، نەیاندەزانی، من کێم و بۆ وا دەکەم! چەن شەڕێکی دیکەم کرد، خەریکبوو، هەر بمکوژن، بەڵام چانسم هەبوو، (نەدیم) و (حەسەن) لە دراوەبوون، دڵی خەڵکەکەیان دەدایەوە و دەیانگوت: سەرخۆشە و وازی لێ بێنن! ئیدی بە ئەو شێوەیە، منیان لە ئەو بارەناڵەبارە ڕزگارکرد و نەیانهێشت، تێم هەڵدەن، ئەگینا یەک دووانێ بە دارەوە بۆم هاتن، چاویان ئاگری دەکردەوە، هەر ئەوە نەبوو، نەمکوژن!

من نەمزانیبوو، هەر زوو (حەمەی رەشە کۆیی)، لە سەرا شکاتیکردبوو و پۆلیسیش بە دوامدا دەگەڕا. کەمێ هۆشم بەبەردا هاتبوومەوە، ویستم، بڕۆمەوە، لەپڕ چەن پۆلیسێ بەڕاکردن هاتن، گرتیانم و بە ترومبیل بردیانم بۆ سەرا. لە ئەوێ عەریف (شێخ موحەممەدی شێخ رەشید)م بینی، خۆی بە خزم دەزانی، زۆر سەرزەنشتیکردم و نەیهێشت، لە ژوورەوە حەپسمکەن، هەر لە حەوشەکە مامەوە. خێرا سەرم دایە بەر بەلوعەکە و دەموچاوم شت، ئینجا هەستمکرد، باشتربووم. دوای ماوەیە، بە تەواوی تێگەیشتم، چیم کردووە، زۆر شەرمەزاربووم!

ئێوارە درەنگانێ بەریاندام و لە ترسی باوکم، یەکسەر تێمتەقاند بۆ (سولەیمانی). ئەو شەوە لە ماڵی پورە (مطیع)م نووستم، بەیانی زوو، لە دەنگی باوکم خەبەرمبووەوە، قسەی زۆر پێ گوتم. (شێخ عوسمان) ئەبووایە، لێشیدەدام و گوتی: قەیچێکە جێژنە، کەمێکی خواردووەتەوە، ئێمەش لە ئەو تەمەنەدا، لە ئەوە خراپترمانکردووە، ئیدی وازیلێهێنام و ڕۆیشت.

## هاوڕێکانی سەرچنار

لە (سەرچنار)، ژیانێکی زۆر هێمن و خۆشمان هەبوو. کۆمەڵێ برادەری بەڕێز و خۆشەویستی لێ بوو، پێشتر لە (سولەیمانی)، هێندێکیانم دەناسی، بەڵام لێرە، پتر لە یەکدی نزیکبووینەوە و پێوەندییەکەمان تۆختربووەوە.

پتر لەگەڵ (تالەسووری ئەحمەسەرسپی) دەگەڕام و هاتوچۆمان هەبوو، چونکە هەر لە منداڵییەوە دەمناسی و کوڕی گەڕەکی خۆمان بوو. (مارق مام کەریم ـ مارف ناسراو)یشم، هەر لە کۆنەوە دەناسی و لە نێوەندیی (شۆڕش)یش پێکەوەبووین. بەڵام (سەرکەوتی عوسمان بەگ)م، لە ئەوێ ناسی. ئیدی ئەم پێنجە، زۆربەی کات پێکەوەبووین. (نەدیم)ی هاوڕێم و (عارف)ی خزمیشم، زووزوو سەرییان لێ ئەدام، منیش هێندێ جار، لە پشووی هاوینندا، سەرم لە ماڵی (نەدیم) دەدا و دەچووم بۆ (کەرکووک).

ئەو کاتە، ماڵەکەیان لە گەڕەکی (ئیمام قاسم) بوو، زۆربەی زۆری کوردبوو. ئەویش لەگەڵ مامۆستا (کەریم)ی برایدا، بە نێو شاری (کەرکووک)دا دەیانگێڕام و باسی ئەو شوێنانەیان بۆ دەکردم، هەموو شەوێکیش دەچووین بۆ سینەما.



ئەم وێنەیە ڕۆژی (14. 5. 1967)، لە باخەکەی (سەرچنار) گیراوە.

لە ڕاستەوە: خۆم، خوالێخۆشبوو تالەسوور، مارف ناسراو، ئەوراد سدیق و جەمال مستەفا.

گەشتی (بەسرە)

(عوبێد) زۆر دەبەنگبوو، خوێندنی بۆ تەواو نەکرا و چەن ساڵێ لە پۆلی سێ مایەوە، لە ئەنجامدا دەرکرا. ماوەیە لە (عەمارە) سەربازبوو، مامە (عومەر)یشم هەر لە ئەوێ بوو. پشووی هاوینی ساڵی (1967) بوو، لەگەڵ (عارف)دا بڕیارماندا، سەرێکیان لێ بدەین. ئەوە سێیەمین جارم بوو، (بەغدا) ببینم. کەمێ شارەزابووبووم، زۆر دڵم پێی دەکرایەوە، شارێکی گەورە و خۆش بوو، ئێمەش وەك گەنجێ ئازادبووین، بۆ کوێ دەچین و چی دەکەین. کوردیش هەر هێندە بە شوێنێ فێربوو، ئیدی سەری تێدەکا و خایەومایەی تێدەنێ!

شەوێ لە (بەغدا) ماینەوە، بەیانی زوو سواری پاس بووین و بەرەو (عەمارە) بەڕێکەوتین. ئەو ڕێگە درێژەی نێوان (بەغدا) و (عەمارە)، هەر نەدەبڕایەوە. کۆتایی مانگی حەوتبوو، زۆر گەرمبوو، لە هەر شوێنێکیش بۆ حەواندنەوە دەوەستاین، لەبەر تۆز و خۆڵبارین، کەڵکمان لێ نەدەبینی.

گەیشتینە جێ و لە ئوتێلێکی باش دابەزین. خۆمان شت و کەمێ حەواینەوە. ئینجا تەکسییەکمان گرت و چووین بۆ سەربازگە. هەواڵی مامم و (عوبێد)مان پرسی، هیچیان لە ئەوێ نەبوون. مامم مۆڵەتی وەرگرتبوو، لە (سولەیمانی) بوو. (عوبێد)یش بەکاری سەربازگە، چووبوو بۆ (بەسرە). ناونیشانی ئوتێلەکەیمان وەرگرت و دیسانەوە، بەیانی زوو سواری پاس بووین و بەرەو (بەسرە) ڕۆیشتین.

ئەو لە بەری (عەشتار) و لە ئوتێل (سەلاحەددین) دابەزیبوو. ئەو شوێنەی ئێمە لێی دابەزین، لە ئوتێلەکەوە زۆر نزیکبوو، هەر چووینەسەرەوە و جێمان وەرگرت، زۆری پێ نەچوو، (عوبێد) هاتەوە. کە ئێمەی بینی، سەرسووڕما، چونکە باوەڕی نەدەکرد، ئێمە لە ئەو شارە ببینێ. چوار ڕۆژ ماینەوە و زۆر خۆشمان ڕابوارد. بە پێ، بە پاس و بەلەم، زۆربەی شوێنە خۆشەکانی نێو شارەکەمان بینی. هەرچەندە گەشتەکەمان زۆر خۆشبوو، هەر خەریکی خواردن و گەڕان و پێکەنین بووین، لەگەڵ ئەوەشدا، زۆر گەرم و شێدار بوو. خەڵکەکەی زۆر هەژار و باش بوون، بەڵام تا بڵێی، دواکەوتووبوون. زۆربەی هەرە زۆریان شیعەبوون. ئینجا تێگەیشتم، عەرەبەکان بۆچی بە ئێمە دەڵێن: (شیمال چەنە!)

کاتێ گەڕاینەوە، لە ئوتێل (سیروان) دابەزین، تێلیفۆنم بۆ (شێخ موحەممەد)ی زاوام کرد و ئەویش هات. ئێوارە لەگەڵ خۆی چووینەوە بۆ ماڵەوە، ماڵەکەیان لە گەڕەکی (ئەعزەمیە) و نزیك مزگەوتەکەی (ئەبوحەنیفە) بوو. گەڕەکێکی زۆر جوانبوو، لە خانوویەکی زۆر

گەورە و خۆشدا بوون، حەوشێکی هێندە گەورە و دووروودرێژیان هەبوو، غارغارێنی تێدا دەکرا، هەر لە خانووە کۆنەکانی (سولەیمانی) دەچوو! لە نێوەڕاستی حەوشەکەدا، چەن دارخورمایەکی لێ ڕوابوو، دەتکووت مێرگێکە و لە نێوەڕاستی بیاباندا قووتکراوەتەوە، ئیدی بە هەر چواردەوری حەوشەکەدا ژووربوو. جگە لە ماڵی پورم، دوو ماڵە کوردی دیکەی خەڵکی (سولەیمانی)شی تێدابوو، هەر دووکیان برابوون و لە سوپای (عێراق)دا کاریاندەکرد.

ئەوەتەی پورە (نەسرین)م شوویکردبوو، ئەوە یەکەمین جاربوو، چاومان بە یەکدی بکەوێ و ببینم. تێرتێر یەکدیمان ماچکرد، زۆر بۆ کەسوکار و (سولەیمانی) گریا. وایدەزانی، لە چۆڵی قولفە کەری خواردووە!

بەڵام دەڵێی چی، خوا مرۆی وا دروستکردووە، کە لە زێدی خۆی دوورکەوتەوە، لە هەر کوێ بێ، بیری نیشتمانەکەی دەکا، ئاموزییش هەر ئاموزییە! ئەو شەوە لە ئەوێ مایەوە، زۆر بە دەورووپشتماندا هاتن، کاتێ بەیانی گەڕاینەوە، هەر لە (قاسلوجە)وە سەرکەوتین و (سولەیمانی) دەرکەوت، وامدەزانی، هەزار ساڵە نەمدیوە!

## سەرۆکی برینپێچان

هەر ئەو ساڵە، باوکم ناونیشانی کارەکەی گۆڕا، بوو بە سەرۆکی برینپێچان، بە ئەو بۆنەیەوە، لە ماڵی (شێخ عوسمان)، ئاهەنگێکی سازکرد، (فەوزی ڕەشید ئامیق، دوکتۆر ئەحمەد شاڵی، کەمال شاڵی ...) بانگکردبوو، چونکە ئەو سیانە، زۆر هاوڕێی (شێخ عوسمان) بوون. هەروەها (مەحمودەی تۆفیق شلە) و تیپی مۆزیکیش هاتبوون، (عەزۆڵە)ش بە تەپڵەکەیەوە لە ئەوێ بوو. گەلێ گۆرانی خۆشیان گوت، (شێخ ڕەووف باراوی) پێڵاوفرۆشیش، گۆرانییەکانی تۆماردەکرد. جگە لە باوکم، ئەوان هەموو دەیانخواردەوە و لە هەرای خۆیاندا بوون، ئێمەش لە ژوورەکەی ئەو دیو دانیشتبووین، دەرگەی نێوان هەردوو ژوورەکەمان کردبووەوە، گوێمان لێ گرتبوون.

شەوێکی زستانی سایەقەبوو، (شێخ ڕەووف) هەر زووزوو دەچووەدەرەوە و دەهاتەوە، منیش کێچ کەوتە کەوڵمەوە و گوتم: دەبێ بزانم، ئەم پیاوە چی دەکا، وا هێندە هاتوچۆ دەکا! چوومە دەرەوە، تەماشادەکەم، لە پاڵ دەرگەکەدا، لەسەر تەپڵەکێ خواردنەوە و مەزەی داناوە. سەیرێکی شووشەکەیم کرد، لێی نووسرابوو (جن). خێرا قوومێکم لێدا و لە شوێنی خۆی دامنایەوە، ئەخێر کار بە ئەوەوە ئەوەستا، چونکە شتێکی نوێبوو،

هێشتا نەدیبووم و نە تاممکردبوو، ئیدی پێی فێربووم و هەموو جارێ دوای ئەو دەچووم، چەندم لێ بخواردایەتەوە، غەدرم لێ نەدەکرد، بگرە خاتریشم دەگرت، کەمێ زیاتریش ئاوم بۆ تێدەکردەوە!

وامان لێهاتبوو، هەر ئەو خۆی بە ژووردادەکرد، من دوای ئەو دەچوومەدەرەوە و بۆم ئۆش دەکرد، تا تۆزێ کەیفم پەیداکرد، خەریکبوو، تەقە لە بنی شووشەکەوە بێ، ئیدی وازم لێ هێنا. هێندێ جار سەرم لێ ئەدان، تا بزانم، چییان پێویستە. سەیر ئەوەبوو، (شێخ ڕەووف) گوتی: ئەرێ نازانم، ئەم جتە سەگبابە، هەر هیچ تێیە، تا ئێستە بە خۆم نەزانیوە، هەر دەڵێی ئاودەخۆمەوە، هیچ تامی نییە! منیش بزەیەك گرتمی و نەموێرا، بڵێم: جا کێ دەڵێ، ئاو ناخۆیتەوە؟! (شێخ عوسمان)یش سەیرێکی منی کرد و پێکەنی، لە ئەوە دەچوو، هەستی پێ کردبێ!

دوا هەوار ( سولەیمانی )

باوکم جارێکی دیکە لە (سەرچنار)ەوە، بۆ (سولەیمانی) گوێزرایەوە. لە گەڕەکی (کانیسکان) لە پشت مزگەوتی (قامیشان)، خانوویەکمان بەکرێگرت. لە کۆڵانێکدا بوو، دەرنەدەچووو، تەنیا دوو ماڵی تێدا بوو، ماڵی مامە (عومەر) بەرانبەرمانبوو، لای ڕاستمانەوە ماڵی (عەبەگۆجی تەنەکەچی) بوو. لای چەپیشمان هێشتا کەلاوەبوو. پشتیشمان بە ماڵی (جەمالی حەمەنوقڵە)وە نووسابوو.

ئەم خانووەمان، لە ماڵی باپیرم و پورە (شەمسە)شەوە، هەمووی دە خولەك دووربوو. بە تەواوی گەڕاینەوە بۆ (سولەیمانی) و هەر لە گەڕەکە کۆنەکەی منداڵیم جێگیربووینەوە. ئەو گەڕەکەی هەر لە منداڵییەوە، چاوم تێیدا کرابووەوە، هەموو کۆڵانەکانی شارەزابووم و هەموو ماڵەکانیشم دەناسی. زۆربەی هاوڕێکانی منداڵیم، هەر لە ئەم ناوەبوون، لەبەرئەوە زۆرم پێ خۆشبوو.

خولی مفەوەزی

ساڵی (1967) بوو، پۆلی سێی ناوەندیم تەواوکردبوو، نەمدەزانی، چی بکەم و لە کوێ بخوێنم. هەر لە منداڵیشەوە حەزمدەکرد، لە ڕیزەکانی پۆلیس یا سوپادا کاربکەم. ڕۆژێ هاوڕێکانم پێیان ڕاگەیاندم، کەوا خولی مفەوەزی لە (بەغدا) کراوەتەوە، بۆ هەموومان پێکەوە ئەچین. ئیدی ئومێدم پەیداکرد و بە هیوایەکی گەشەوە، لەگەڵ خوالێخۆشبوو

(حەمەسەعی جۆلا، سیروانی ئەسعەدە گۆچ ...) خۆمان کۆکردەوە و چووین بۆ (بەغدا). باوکم زۆری پێ ناخۆشبوو، حەزیدەکرد، ئامادەیی تەواوکەم و کۆلێژ بخوێنم. بەڵام هەرچی چۆنێ بوو، قایلمکرد.
لە ئوتێل (سیروان) دابەزین، لە (سولەیمانی)ەوە خەڵکێکی زۆر هاتبوون، هەبوو بۆ خولی (عەریف میهەنی)، هەبوو بۆ خولی مفەوەزی، هەشبوو، بۆ کۆلێژی سەربازی و پۆلیسی هاتبوون. لە ئەوانە زۆریانم ئەناسی. وەك (نووری دەروێش، مارف ئاسراو، جەمالی فاتە) و گەلێکی دیکەش.
شەوێ یەکمانگرت و چووین بۆ خواردنەوە. ئەوە یەکەمین جاربوو، لە (بەغدا) بخۆمەوە. ئەوان شارەزاتربوون، لە شەقامی (ئەبونەواس)، مەیخانەیەکی میللی لێ بوو، ناوی (بەلقیس) بوو، لە سەربانەکەی لە باڵکۆنێکدا دانیشتین. مەیخانەیەکی زۆر هەرزانبوو، هەمیشە جمەیدەهات، کوردیش زۆر لە ئەوێ دادەنیشتن. هێندەمان خواردەوە، هەموومان سەرخۆشبووبووین. من و (نووری دەروێش، مارف ئاسراو)، بە خەیاڵی سەرخۆشی، برادەرەکانی دیکەمان بەجێهێشت و لە ئەوێوە بەپێ بۆ ئوتێلەکە گەڕاینەوە. ڕێگەکە زۆر دووربوو، بە تەواوی ماندووبووین.
بەیانی زوو چووین بۆ کۆلێژی پۆلیس، ئەو کاتە فەرمانگەکەیان لە گەڕەکی (بەتاوین) بوو. هەرچی پێویستبوو، جێبەجێمانکرد. هەر ئەو ڕۆژە (24. 7. 1967)، ڕەگەزنامەی (عێراق)یم دەرهێنا و تا ئێستەش ئەمگۆڕیوە. گوتیان دوای هەفتەیەك وەرنەوە، تا نامەتان بۆ شارەکانی خۆتان بۆ بنووسین، بۆئەوەی کەفالەت و ڕۆتینیاتی وەرگرتن تەواوکەن. ئەو ساڵە (250) کەسیان دەویست، من (175)یەمین ناوبووم. سەیر ئەوە بوو، خەڵك باسی بەرتیل و (واسیتە)یان دەکرد، من لە خوا زیاتر کەسی دیکەم نەبوو!
ئەو هەفتەیەشمان لە (بەغدا) بەسەربرد، هێندێ جار، سەرم لە (نووری پورەخانم) دەدا، ئەو کاتە لە کۆلێژی یاسا دەیخوێند و لە ئوتێل (شمعلا) دەژیا. ڕۆژێ لەگەڵ خۆی، بۆ شایی کوڕێکی کورد بردمی، کچێکی هاوڕێی عەرەبی خەڵکی (بەغدا)ی هێنابوو، پێکەوە لە زانکۆ دەیانخوێند. من زۆر سەیرم لێدەهات، چۆن ئەو کوڕە کوردە، کچێکی عەرەبی هێناوە، چونکە لە ئەو سەردەمانەدا، زۆر بەدەگمەن شتی والەبوو!
دوای هەفتەکە چووینەوە، هەموومانیان لە گۆڕەپانێکی گەورەدا کۆکردەوە، عەریفێکی ڕەشتاڵەی تێکسمڕاوی کەتە هات و گوتی: لەبەرئەوەی دوێنێ لە شالیارگەی ئێوخۆوە، وەڵاممان بۆ هاتووە، ئەم ساڵ ئەو ژمارەیە زۆرە و ناتوانین، هەمووی وەرگرین، بڕیارماندەوە، تەنیا (150) کەس وەرگرین. لەبەرئەوە لە یەکەوە تا (150)، وەرنە ئەم لاوە، ئەوانی دیکەش بۆ جارێکی دیکە و خواتان لەگەڵ بێ!

هەڵبەتە خوای گەورە، ئەوەی پێ ڕەوانەبینیم و ئاواتەکەم بەدی نەهات. هەرچەندە پرسیارمانکرد و ئاڕەزایماندەربڕی، تازە هیچ کەڵکی نەبوو. منیش بە پەلە چووم بۆ لای (شێخ موحەممەد)ی زاوام، بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە و گوتم: گەر یەکێ دەناسی، هەوڵێکم بۆ بدە. گوتی: بەیانی پێکەوە دەچین بۆ لای فەرماندەی پۆلیس. کاتێ چووین و گرفتەکەمان بۆ باسکرد، گوتی: تازە هیچ ناکرێ و بە دەس ئێمە نییە، گەر پێش ئەوەی ناوەکان دەرچێ، بهاتنایە، دەمانتوانی، شتێ بکەین. ئیدی بە نائومێدی، بە ڕەنجەڕۆیی و دڵشکاوی، بەرەو (سولەیمانی) گەڕامەوە. لە هاوڕێکانیشم تەنیا خوالێخۆشبوو (سیروان ئەسعەد) وەرگیرا.

**بەرەو (سولەیمانی)**

من خۆم خەفەتێکی زۆرم خوارد و ژانێکی بێ ئەندازە بە دڵمدا چوو، هێشتا دەبووایە، پۆڵەبۆڵ و قسەی ماڵەوەشم قەبووڵکردایە، هێندەی دیکەش ئازاری دەدام. نزیکی کۆتایی مانگی (10)بوو، نەمدەزانی، چی بکەم و سەر بە چ کونێکدا بکەم. چونکە کاتێ لە (بەغدا) گەڕامەوە، قوتابییان لە ئامادەییەکان ماوەیەکی زۆربوو، دەسیان بە خوێندن کردبوو، تازە درەنگبوو، لە ئامادەیی بخوێنم، هیچ شوێنێکیش وەری نەدەگرتم و دەیانگوت: دەبێ ساڵێکی دیکە بێی.

نازانم، کێ بە باوکمی گوتبوو، هاتەوە و گوتی: دەبێ، ئەم جارە بە قسەی من بکەی، لە ئامادەیی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ) بخوێنی، هەمووی سێ ساڵە و تەواودەبێ، بۆ خۆت دادەمەزرێی و کۆڵێ پارە وەردەگری. منیش هیچ چارێکم نەبوو، گورزی خۆم وەشاند بوو، کاڵی هێنابوو، ئیدی ئۆرە گورزی باوکم بوو، بەڵکوو ئەمە خوایە، ئەم جارە گورزەکەی باوکم پەمووبێنێ!

ئەوەبوو، نامەیەکم لە خاتوو (بەدریە)ی هاوسەری (حەمەسالح عەتیەر)، بۆ بەڕێوەبەری ئامادەیی کشتوکاڵ خوالێخۆشبوو (عەبدوڵڵا سەراج) وەرگرت، کە مامۆستا (سەراج) خوشکی (عەنبەر)ی لە باخەڵدا بوو، ئەویش ماڵی ئاوابێ، گوتی: بەیانی وەرە، دەوامبکە. ئیدی بە ئەو شێوەیە، مەلی بازی چارەنووسی دوایڕۆژم، بەسەر ئامادەیی کشتوکاڵەوە نیشتەوە، هەرچەندە حەزم لێ نەدەکرد، بەڵام لە ئەو ڕۆژەدا، ئەوە یەکێ لە باشترین خراپەکان بوو، پێوەی نیشتمەوە!

**قوتابخانەی ئامادەیی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ)**

کاتێ بەیانی چووم بۆ قوتابخانەی ئامادەیی کشتوکاڵ، بەڕێوەبەر لە پۆلێ دایئام، زۆربەی هاوڕێ کۆنەکانی ناوەندیی (شۆڕش) و گەڕەکی خۆمان، لە هەرێ دەیانخوێند. هەر باش بوو، ئاهێکم پێدادایەوە، خوالێخۆشبوو (حەمەساڵحی عەبەپشی)، بەرەوپیرم هات و گوتی: خێرە ئەوە تۆش هاتی؟ گوتم: هیچ چارێکی دیکەم نەبوو. گوتی: کاک (برایمی حەمەخورشە) هەوڵی بۆ داوە، بە ئەم زووانە لێرە نامێنم، لە خانەی مامۆستایان دەخوێنم، ئیدی دوای هەفتەیەک، لە (بەکرەجۆ) ڕزگاریبوو. (برایمی حەمەعەلی وەستا حەبیب) و (حەمەی قالە)، کە لە ناوەندیی (شۆڕش) پێکەوەبووین و لە دوورەوە یەکدیمان دەناسی، (برایم) هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، بوو بە هاوڕێیەکی زۆر نزیکم و هەمیشە پێکەوە بووین!

(ڕەفعەتی حەمەی بەگ، بەکری خەلەفەرەشی کەبابچی، بەکری سدیقەگوڵ، ڕەزای بابە گوورروون و جەمال محێدین)، کوڕی گەڕەکی خۆمان بوون و پێشتر دەمناسین. هەروەها (سەرکەوت تۆفیق، شەماڵی ئەحمەدی مەحموولیەگی جەڕاح، ڕەزای عەلی کاتب )یشم، هەر ئەو ساڵە ناسی. ئەوانەم بینی، دەردی دڵەی غەمبارم، کەمێ ئاسانتبوو. من وام دەزانی، کە دەڵێن ئامادەیی کشتوکاڵ، ئیدی تەنیا هەر کوڕە جووتیاری گوندەکانی (کوردستان) وەردەگرێ، لە هەموو لایەکەوە کۆیانەکەنەوە و دەخوێنن. کەچی ئەمزانی، زۆربەی زۆریان خەڵکی شار و شارۆچکەکانن!

دواتریش لەگەڵ (حەمەعەلی ئەحمەدی حەمەمراد، حەمەی شێخ کەریم باخەوان، شێخ ئەکرەم عەولانی و لەتیف چەرمەگایی (کە پێیان دەگوت: ترەکوێرووت یا لەتیف هەشایەی)، یەکدیمان ناسی، کۆمەڵێکی تێکەڵاوی زۆر خۆش لێ دەرچوو، دۆستایەتی و برایەتیشمان، زۆر باش و ڕێکوپێک بوو.

مامۆستاکانیشمان، جگە لە (عەبدوڵڵا سەڕاج) بە ڕێوەبەرمان بوو، وانەی زانستی ڕووەکی گشتیشی پێ دەگوتین، پەرتووکەکەش هەر خۆی نووسیبووی. مامۆستا (کەمال ڕەمزی) یاریدەدەری بەڕێوەبەر بوو، وانەی پەلەوەریشی دەگوتەوە. (سەردار عەبدولواحید) مێژووزانی و (خەسرەو شەفیق)یش، بەربوومی کێڵگەیان پێ دەگوتین. سێ مامۆستای هەرەبیشمان هەبوو، یەکێکیان (عۆنە فنێخەر دلێمی)، وانەی شیرەمەنی و پیشەسازی خۆراک، دووەمیان (موحەممەد عەبادە) باخداری و سێیەمیشیان (عەبدولسادە)، وانەی (سەوزەمەنی)یان پێ دەگوتینەوە.

کۆمەڵێ مامۆستای دیکەشی لێ بوو، ئامادەیی کشتوکاڵیان تەواوکردبوو، بۆیان نەبوو، وانەی تیۆری بڵێنەوە، بەڵام لە وانەکانی پراکتیکدا، یارمەتی مامۆستاکانیان دەدا، وەک (ئەنوەری مام سادق، حەسەن گەرمیانی، مەلاعیززەت، عومەر عەمەلی)، زۆر کوڕی باش و بەڕێز بوون، وەک هاوڕێمان وابوون. (عۆدە)ش مامۆستایەکی زۆر بە ڕێز و زیرەک، لەسەرخۆ و هێمن بوو، هەموو شەرممان لێ دەکرد، هەر لە کۆنیشەوە کادێرێکی پێشکەوتووی (بەعس) بوو.

## ڕەوشی قوتابیان و قوتابخانە

ئەوەی لە هەموو شتێ ناخۆشتربوو، هاتوچۆکەی بوو، دەبووایە، بەیانیان زوو لە خەو هەستامایە و فریای پاس بکەوتمایە، بۆئەوەی لە وانەی یەکەم دوانەکەوم. بە تایبەتی زستانان ساردوسەرمابوو، وەک ئێستە نەبوو، بەفر و بارانێکی زۆر دەباری، پاسیش هەر نیوکاژێر جارێ هەبوو. لەبەرئەوە ناچاربووین، کۆمەڵێ برادەر پێکەوە ڕێککەوین و تەکسی بگرین، تەنیا بەیانیان بمانبا، لە ئێوارێشەوە بە پاس دەگەڕاینەوە. ئەوە بوو، تەکسییەکمان گرت، بەیانیان هەر یەکەمانی لەسەر جادەیەکی سەرەکی هەڵدەگرت و تا (یەکرەجێ)، بە گۆرانیگوتن دەیبردین!

ئامادەیی کشتوکاڵ، گەر لە ئارەندیی (شۆڕش)ی جاران خراپتر نەبووبێ، هەرگیز چاکتر نەبوو. هەرچەندە بەڕێوەبەر و جێگرەکەی، دوو مامۆستای زیرەک، دڵسۆز و ڕێکوپێک بوون، بەڵام هێندێ لە مامۆستاکانی دیکە، بە ئەو شێوەیە نەبوون، زۆربەی زۆری قوتابیانیش، بە زۆری لە ئەوانە پێکهاتبوون، کە لە هیچ شوێنێکی دیکە وەرنەگیرابوون، یا لە ناچاریدا دەیانخوێند، یا دەیانویست، بە هەر شێوەیەبێ، کات بەسەربەرن، زوو تەواوبکەن، لە شوێنێ دامەزرێن و بە نانی خۆیان بگەن. بە واتایەکی دیکە، هیچ جۆرە ئامانجێکی دیاریکراو و زانستانەیان نەبوو. جگە لە ئەوەی، هەر یەکە لە شوێنێکەوە هاتبوو و تێکەڵاوبووبوون، تەنیا بادیتیمان لەگەڵ نەبوو، ئەگینا نوێنەری هەموو ناوچەکانی باشووری (کوردستان)ی لێبوو، دەتگوت ئەنجوومەنی پیرانی کوردە و لە (یەکرەجێ) کۆبوونەتەوە!

بە کورتییەکەی، ئامادەییەکی کشتوکاڵمان هەبوو، لە هەموو شتێکی دەکرد، تەنیا هەر لە قوتابخانەی نەدەکردا لە ئەو تێکەڵە پڕ لە سەیر و سەمەرەیەش، هەر ئەوەی لێ دەربەچێ!

جا تا ئەو کاتەی مامۆستا (عەبدوڵڵا سەراج) بەڕێوەبەربوو، هەر باشتربوو، بەڵام ساڵی دووەمم بوو، ئەو ڕۆژی بۆ (سعوودیە) و (قادر ئەمێریکی) هات، ئیدی بە جارێ، شێوازەی ڕێکخستنی قوتابخانەکە تێکچوو!

جگە لە ئەوەی بەیانیان تا دەگەیشتین، زۆر ناخۆشبوو، پۆلەکانیش زۆر ساردبوون، چونکە هەر چوارلای قوتابخانەکە دەشتبوو، تەنیا یەک عەلادینیشیان دادەنا، زۆربەی کاتیش دووکەڵیەدەکرد و ناچارەدەبووین، بیبەینەدەرەوە. کاتی پشوووەکانیش، لەبەر بەفر و باران و سەرما، شوێنێکی وا نەبوو، لێی دانیشین، چونکە هەر لە پۆل دەردەچووین، تارمەیەکی درێژبوو، جامخانەشی پێوە نەبوو، ئیدی یەکسەر دەرەوەبوو. گۆڕەپانێکی زۆر گەورەی هەبوو، تەنانەت، هێندێ لە بەشەکانی خوێندن و ژووری فەرمانبەران، لە بەرێکی دیکە بوون، دەبووایە، بە ڕاکردن بۆی بچووینایە!

گەورەترین گرفتیش ئەوەبوو، قوتابخانەکە گەرماو و دووشی تێدا نەبوو، بەڵکوو مانگی چوار بلیتیان، بە قوتابیانی بەشی نێوخۆیی دەدا، لە گەرماوێکی دیاریکراوی (سولەیمانی)، خۆیان بشۆن. جگە لە ئەوەی، سەرتاشێکی تایبەتیشیان بۆ دیاریکرد بوون، لە هەفتەیەکدا چەن ڕۆژێ دەهات و بە نۆرە، قژی قوتابییەکانی دەتاشی. ئەویش سەرەکەی هێندە گەورەبوو، کە کەس تاقەتی ئەوەی نەبوو، سەری لا بتاشێ!

هەروەها سابوون، تاید، گۆشت و ماسی قوتوو، شیر و پەنیریشیان بەسەردا دابەش دەکردین. بەڵام تا بڵێی، قوتابخانەکەمان دڵگیربوو، لە هەموو لایەکەوە بە چیمەن و گوڵ ڕازابووەوە، نیوەڕوانیش نەماندەتوانی، بڕۆینەوە، لە ئەوێش هیچی لێ نەبوو، بیخۆین، ناچارەدەبووین، لە ماڵەوە خواردنمان دەبرد و ئەوەش زۆر ناخۆشبوو. زۆر جار وای لە قوتابییەکان دەکرد، دوای وانەی چوارەم، شانی پێداکەن و بەرەو (سولەیمانی) بیقوچێنن!

بەشێکی نێوخۆیی قوتابیانیشی لێبوو، بۆ ئەو قوتابیانە تەرخانکرابوو، کە لە شوێنە دوورەکانەوە هاتبوون. خواردنگەیەکی گەورە و خاوێنیان هەبوو، سێ ژەمە خواردنیان بۆ ئامادەدەکردن، هەر لە ئەوێش دەژیان. هەرچەندە جێی نووستنەکەیان، هەر لە هۆڵەکانی سەربازگەی کۆنی (سولەیمانی) دەچوو، چونکە لە سێ هۆڵی دووروودرێژ پێکهاتبوو، سەرەکانیان بە جەمالۆن گیرابوو، هۆڵەکان بەشبەشکرابوون، نێوان بەشەکانیش، بە دۆلاب و دیوارێکی تەنک جیاکرابوونەوە، هەر هۆڵێ دە ڕیزبوو، لە ئەم سەری هۆڵەکەوە بۆ ئەو سەری هۆڵەکەش، لە نێوەڕاستدا ڕێڕەوێکی درێژبوو، بە تواڵێت و دەرگەی دەرەوە

کۆتاییدەهات. لە ئەم بەر و ئەو بەری هۆڵەکەکان، فەرەوێڵە ڕیزکرابوو، هەر هەشت قوتابی لە بەشێکدا بوون، هەر قوتابییەکیش مۆڵایێکی کۆنی شکاوی هەبوو، کەلوپەل و پەرتووکەکانی خۆی تێدەخست. ئیدی گەرەلاوژێیە بوو، ئەوپەڕی دیار نەبوو، هەر یەکێ لە ئەو سەری هۆڵەکەوە قسەیبکردایە، لە سەرەکەی دیکەوە گوێیان لێبوو. یا شەوانە لە کاتی نووستندا، یەکێ خەوی لێ بزڕایە، خەویشی لە ئەوانی دیکە تێکدەدا.

جگە لە ئەوەی کاتێ باراندەباری، لەبەر تەقەتەقی جەمالۆنەکان، کەس خەوی لێ نەدەکەوت. بەڵام هیچ چار نەبوو، بۆ ئەو قوتابیانەی، لە شوێنە دوورەکانەوە هاتبوون، زۆر باشبوو، هەر دەبووایە، بە ئەو شێوەیە بژیانایە و بە ئەو شێوەیەش، باجی خوێندنەکەیان بدایە، ئەگینا نەیاندەتوانی، هاتوچۆیکەن و خوێندن تەواوکەن!

هێندێ قوتابی دەوروبەری ئێوچەی (سولەیمانی)ش، ئەو ڕەوشەیان لا باش نەبوو، ئەیان دەتوانی، بە ئەو شێوەیە بژین، لە ناچاریدا، لە گوندەکە ژووریان گرتبوو، دیسانەوە، ئەویش هەر خاڵی ئەرێنی و نەرێنی خۆی هەبوو!

**کێشەی جەلالی و مەلایی لە قوتابخانەکەدا**

ئینجا کێشە و گرفتی جەلالی و مەلاییش، لە ئەو لاوە بوەستێ، چونکە (بەکرەجۆ)، نەک هەر ئێوچەرگەی جەلالییەکان بوو، بەڵکوو بەرەگەی سەرەکی (مام جەلال)یش بوو. ئەو کاتە لە قوتابخانەکەماندا، تەنیا هەر ئەوان بە ئاشکرا و بە فەرمی، بە ناوی قوتابیانەوە قسەیاندەکرد. بە هەموو تواناشیانەوە، دژی ڕێکخستنەکانی مەلایی و کۆمۆنیستەکان بوون، بەربەرەکانییاندەکردن، هێندێ جاریش، لە ئەوە تێپەڕیدەکرد و تەمێکردنیشی تێدەکەوت!

سەرەتا، ئێمە هێندە هەستمان، بە ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە نەدەکرد، تا ماوەیە تێپەڕی و قوتابییەکان، بە تەواوی جێگیربوون، یەکبیان ناسی و چاویانکرایەوە. ئینجا، جەلالییەکان ڕێکخستنەکانی خۆیان ڕێکخست و بە تەواوی زانیان، کێ لەگەڵیانە و کێش کار لەگەڵ ئەوان ناکا. ئیدی وردەوردە، دەڵاڵەکانیان دەسیانپێکرد، پێوەندییان بە قوتابیانەوە دەکرد و دەیانویست، ڕایانکێشن و لە ڕیزەکانی خۆیاندا ڕێکیانخەن. بەڵام زۆربەی زۆری قوتابییەکان، قایل نەدەبوون و کاریان لەگەڵ نەدەکردن. لەبەرئەوە لە هەموو شتێکدا دژایەتییاندەکردن. سەیر ئەوەبوو، ئەوان کەمینەبوون، قوتابییە مەلایی، کۆمۆنیست و بێلایەنەکانیش زۆرینەبوون. ڕاستە تا ئەو کاتە، جگە لە ڕێکخستنی جەلالییەکان، تەنیا هەر کۆمۆنیستەکان، ڕێکخستنی جیای خۆیان هەبوو، بەڵام ئێمەی مەلایی، هیچ جۆرە ڕێکخستنێکمان نەبوو!

جەلالییەکانیش باشیان دەزانی، ئێمە لەگەڵ ئەوان نین، لەگەڵ بەرەی پێشمەرگە و شۆڕشی کوردداین، بەڵام ئەوەشیان دەزانی، هیچ جۆرە جموجۆڵێکمان نییە. تەنیا ئەوانەی خۆیان بە مەلایی دەزانی، هەر بە دەمی دەنگوباسیان دەگۆڕییەوە، بە تایبەتی ئەوانەی لە گوندەکانەوە هاتبوون، کاتێ بۆ ماڵەوە دەگەڕانەوە و دەهاتنەوە، دەنگوباسی شۆڕشیان بۆ باسدەکردین. خوا هەڵ ناگرێ لەبەرئەوەی زۆربەیان خەڵکی شارەکە و ناسیاوبوون، لە ئێمەوە دووربوون و ڕێزیان لێ دەگرتین، چونکە ئێمە ڕێزی خۆمان دەگرت و قسەی خراپمان نەدەکرد. جگە لە ئەوەی لێپرسراوی قوتابخانەکە، (ڕەزای بابە گوڕوڕوون) بوو، هەم کوڕی گەڕەك و هەم زۆر هاوڕێشم بوو. هەرچەندە زیانی بۆ ئێمە نەبوو، بەڵام زۆر دژی کۆمۆنیستەکان بوو، سوکایەتییپێدەکردن. لەگەڵ ئەوشدا، خۆشی کوڕێکی هەلپەرست و بەرژەوەندپەرست بوو، هەر بۆ ئەوە کاری دەکرد، تا دەسپیرا و کارەکانی خۆی ڕاپەڕێنێ. هەموو جارێکیش ئێمە بە گوێیماندا دەدا و دەمانگوت: بۆ خۆت ئیشت باشە، ئەویش پێدەکەنی و قسەی نەدەکرد!

(ڕەزا) برای شەهید (شێخ عەبدول) بوو، لە (کانیسکان) دووکانی هەبوو، یەکێ لە ئەو کوڕە قارەمانە کوردانەی (پارتی) بوو، لەسەر ئەوەی جنێوی بە (بارزانی) نەدا، لە ڕەشبگیرییەکەی ڕۆژی (9. 6. 1963)، لە سەربازگەی (سولەیمانی) گوللەبارانکرا. (برایمی حەمەعلی) کە نزیکترین هاوڕێمبوو، سۆز و مەیلێکی تایبەتی، بۆ جەلالییەکان هەبوو، بەڵام کاری لەگەڵ نەدەکردن.

لە نێو مامۆستاکانیشدا، جگە لە عەرەبەکان، تەك هەر یەك کوردیان لەگەڵ نەبوو، بەڵکوو دژایەتیشیاندەکردن. بە تایبەتی مامۆستا (کەمال ڕەمزی)، بە ئاشکرا قسەیدەکرد، ئەوانیش خۆشیان نەدەویست و لە گۆڤاری (ئامانج)ی (یەکێتی مامۆستایان)یشدا لەسەریان نووسی! لەگەڵ مامۆستا (عۆدە)شدا تەواو نەبوون، ئەویش خۆشی نەدەویستن، چونکە ئەویش هەرلێیەدا، لایەنگیر بۆ (بەعس) پەیداکا. تەنانەت جارێکیان دەمەقاڵەیان بوو، سواری ترومبێلەکەی بوو، لای (مام جەلال) شکاتی لێ کردن. هەرچی چۆنێبوو، ئەو ساڵەمان لە (بەکرەجۆ) بەسەربرد، هەر زوو تاقیکردنەوەی کۆتایی ساڵی خوێندنی (1967–1968)مان، بە باشی و سەرکەوتوویی تەواوکرد و پۆلی یەکمان بڕی.



ئەم وێنەیە بە بۆنەی تەواوبوونی تاقیکردنەی کۆتایی پۆلی یەکەوە، ڕۆژی (25. 6. 1968) گیراوە.

**خولی هاوینە**

هەموو ساڵێ لە ئامادەیی کشتوکاڵ، دوای ئەوەی تاقیکردنەوەی سەری ساڵ تەواو دەبوو، قوتابیان کەمێ پشوویاندەدا، پاشان خولی هاوینە دەستپێدەکرد و (40) ڕۆژی دەخایاند. لە خولەکەدا چەن مامۆستایەک دەمانەوە، سەرپەرشتی کارەکانیان دەکرد و قوتابیانیان فێری پرۆسە جیاوازەکانی کشتوکاڵ دەکرد. دوو چاودێریش لە قوتابیان دادەنران، یەکێکیان یەکێتی قوتابیان و ئەوی دیکەشیان بەڕێوەبەری قوتابخانەکە دایاندەنان. ئەو ساڵە (ڕەزای بابەگوڕوون) نوێنەری قوتابیان بوو، منیش بەڕێوەبەر دایینام، ئیدی پێکەوە کارماندەکرد، بەڵام (ڕەزا) بەدەگمەن دەهات و هەموو ئیشەکان، بەسەر مندا کەوتبوو. ئەرکی سەرشانی ئەم دوو چاودێرە ئەوەبوو، سەرپەرشتی بەشەکانی ناوخۆیی خوێندکاران، خواردنگە، کاری کارگێڕی خولەکە بکەن و لەگەڵ مامۆستاکانیشدا هاوکاریبکەن.

چاودێر بەیانیان زوو، قوتابییەکانی لە خەوهەڵدەستان و یەکسەر دەچوون بۆ کێڵگە، بەپێی بەرنامەیەکی زانستانە کاریاندەکرد و هەر گرووپێکیش، پێشتر کاری ئەو هەفتەیەی بۆ دیاریکرابوو. ئەم خولە، لە وانە تیۆرییەکانی سەر کۆورسی ڕەقوتەقی نێو پۆلەکان، گەلێ باشتر و بەکەڵکتر بوو، چونکە قوتابییان نەک هەموو پرۆسە

کشتوکاڵییەکانیان، بە چاوی خۆیان دەبینی، بەڵکوو هەر بە دەستی خۆشیان دەیانکرد. لەبەرئەوە، زۆربەی پرۆسەکان وەك کێڵانی زەوی، وردکردن و تەختکردن، ڕێکخستن و دابەشکردنی زەوی، دووکان و دێراو دروووستکردن، چاندن، بژارکردن، پاچەکۆڵە، ئاودان، پەینکردن، قەلاچۆکردنی نەخۆشی و مێروو، نیشانەکانی پێگەیشتن، دروێنە، بارکردن، ناردنی بۆ بازاڕەکان و فرۆشتنی، یا عەمبارکردنی بەروبوومەکانی کێڵگە وەك (گەنم، جۆ، برنج، تووتن و گەنمەشامی)، بە ئاسانی فێردەبوون.

بێگومان، هەر کۆمەڵە قوتابییەك، لە بەشێکی تایبەتی و لەسەر بەروبوومێکی دیاریکراو کاریاندەکرد. مامۆستایەکیش سەرپەرشتیدەکردن، هەر خۆشیان لە سەرکەوتن و پێشکەوتنی پرۆژەکەیان بەرپرسیاربوون. بۆئەوەی قوتابیان کارەکانیان پشگوێ نەخەن، زۆر بەکوڵوبڵەوە کاربکەن و بە تەواوی فێربن، بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانە بڕیاریدابوو، لە (25٪)ی قازانجی داهاتی ساڵانەی خولەکە، بۆ قوتابیان بێ. لەبەرئەوە پێشبڕکێیەکی باش، لە نێوان گرووپەکاندا دروووستدەبوو، تا پتر کاربکەن و بەرهەمیشیان زیاترببێ. هەموو قوتابییەکیش بەدلە، جزمە و شەپقەیان وەردەگرت، بێڵ و خاکەناز و ئامێرەکانی دیکەی کشتوکاڵیشیان، بۆ دابیندەکردن.



ئەم وێنەیە ڕۆژی (29. 6. 1968)، لە خولی هاوینە گیراوە

ڕۆژانە، سێ جار کارماندەکرد: بەیانیان زوو، لە کاژێری پێنجەوە هەڵدەستاین و دەسمانپێیەدەکرد، تا کەمێ هەتاو گەرمدەبوو، ئیدی کاژێری هەشت دەگەڕاینەوە، لە خواردنگە نانی بەیانیمان دەخوارد. پاشان، کەمێ پشوومانئەدا و لە کاژێری (11)ەوە تا

(13)، دەستمان بە کارکردن دەکردەوە. هەمدیسان جارێکی دیکە، پشوومان وەردەگرتەوە و کاژێری دوو ناني نیوەڕۆمان دەخوارد. ئینجا لە کاژێری (16)ەوە بۆ (18) دەستمانپێدەکردەوە، کاژێری (19)ش، نانی ئێوارەمان دەخوارد. واتە ڕۆژانە، هەمووی (8) کاژێر کارماندەکرد، ئیدی دوای ئەوە، تا ڕۆژی دوایی ئازادبووین.

لە کاتی خولەکەدا، زۆربەی خوێندکاران، لە بەشی ناوخۆیی دەمانەوە، چونکە جێیەکی زۆر هەبوو، قوتابییەکانی قۆناغی دوو و سێ پشوویان هەبوو، هێندێکیش نەدەمانەوە و بەیانی زوو، بە تەکسی دەهاتن. پرینسیپی ئامادەبوون و کارکردن، بایەخێکی زۆری پێ درابوو، هەر قوتابییەک لە (25٪)ی ڕۆژەکانی خولەکە ئامادە نەبووایە، دەبووایە، ساڵی داهاتوو دووبارەیکردایەتەوە.

لە ئەو سەردەمەشدا ماوەیەبوو، لەگەڵ باوکم تێکچووبووم. منیش ئەو خولەم بە هەل زانی، چیم پێویستبوو، پێچامەوە و لەگەڵ خۆم بردم، هەر لە یەکەمین ڕۆژەوە، لە بەشی ناوخۆیی جێم وەرگرت و ماوەیەکی زۆر، لە دوورەوە نەبێ، (سولەیمانی)م نەبینی!

کاری سەرەکی ئێمە ئەوەبوو، کاژێری (10)ی شەو، کارەبا بکوژێنینەوە، تا قوتابییەکان بخەون و نەهێڵین، کەس دەنگەدەنگبکا و خەو لە هاوەڵەکانی دیکەیان بزڕێنێ. بەیانیانیش زوو خەبەریانکەینەوە، تا لە کارەکانیان دوانەکەون. شەوی واش هەبوو، یەکێ بە قایم هاواریدەکرد و دەیگوت: ئاخر خەوم نایە، بۆ بە زۆر دەمنوێنن؟! ئیدی دەبوو بە پێکەنین.

هەر ئاگادرای و گۆڕانکارییەکی کتوپڕیش هەبووایە، مامۆستاکان لەڕێی ئێمەوە، بە قوتابییەکانیان ڕادەگەیاند. ڕۆژانەش، سەرپەرشتی خواردنگەمان دەکرد، گوێمان لە گرفتەکانی خواردنئامادەکردن و پێشنیازەکانی کارمەندەکان دەگرت، بە بەڕێوەبەری خولەکەمان ڕادەگەیاند، چونکە خۆشیان دەیانزانی، ئەوان باشتر گوێ لە ئێمە دەگرن.

ئێمە پێنجێکی زۆر خۆشبووین، بە شێوەیە لەگەڵ ئەو هاتوچۆ و سەرما و برسێتییەدا ڕاهاتبووین، هەر پێمانەوە دیار نەبوو. هەمیشە بە قسەی خۆش و پێکەنینەوە ڕامان دەبوارد. شەوانی هەینیش، مەزەمان دروستدەکرد و لە نێو چیمەنەکەدا، تا درەنگانێ دادەنیشتین و دەمانخواردەوە. من وام لێهاتبوو، ڕۆژانی هەینیش دانەدەبەزیم و هەر لە (بەکرەجۆ) دەمامەوە. هەر لە دوورەوە، تەماشای گڵۆپە داگیرساوەکانی شارە دەرەوشاوە جوانەکەم دەکرد و دەبریسکانەوە!

بەهۆی (حەمەعەلی) هاوڕێمەوە، لە هاوینی (1967)دا، لەگەڵ (وریا براخاس) یەکدیمان ناسی. کوڕێکی هێمن و باش بوو، لە ماوەیەکی کەمدا، زۆر لە یەکدی نزیکبووینەوە. ئەو کاتە ئەویش، لە فەرمانگەی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ) کاریدەکرد، فەرمانگەکەیان لە ئێمەوە زۆر نزیکبوو. زووزوو سەری لێ دەداین.



لە ڕاستەوە: خۆم، وریا و حەمەعەلی، ڕۆژی (29. 6. 1968)



لە یەکەمین ڕۆژی خولەکەوە، هەر زوو فێری کارەکان بووم، زمانێکی هاوبەشم، لەگەڵ قوتابییەکاندا دۆزییەوە، زۆر ڕێزمان لە یەکدی دەگرت. ماوەی (40) ڕۆژ پێکەوە بووین، هیچ جۆرە گرفتێ لە نێوانماندا ڕووی نەدا. بە ڕۆژ کارماندەکرد و بە شەویش، دەستە دەستە کۆدەبووینەوە، لەنێو ئەو چیمەنانەدا دادەنیشتین و یاریماندەکرد، گۆرانیمان دەگوت و هێندێ جاریش لە شارەوە، مەیان بۆ دەهێناین و دەمانخواردەوە.

لەگەڵ مامۆستاکانیشدا، پێوەندیم زۆر باشبوو، بە تایبەتی (حەسەن گەرمیانی) و (ئەنوەری مام سادق)، وەك هاوڕێ وابووین و زۆربەی کاتیش پێکەوەبووین. چونکە ئەوانیش، شەوانە لە (بەکرەجۆ) دەمانەوە. ئەو کاتە کەس نەیدەزانی، (گەرمیانی) دەنگی خۆشە، جاروبار لەبەرخۆیەوە ورتەورتێکی دەکرد، منیش بە دڵ گوێم لێ دەگرت. وەك گوتم، قوتابخانەکەمان دووشی تێدانەبوو، بە ڕۆژ کارماندەکرد، عەرەقێکی زۆرمان دەکردەوە، بە ناچاری بە ئاوی سارد، لە توالێتەکان خۆمان فێنکدەکردەوە.

نیوەڕۆیەکیان من و (حەمەعەلی) ویستمان، لە توالێتی مامۆستاکان خۆمان بشۆین، لە تەنکی سەریانەوە ئاوێکی گەرمی خاوێنیان، بە سۆندە بۆ ڕاکێشابوو، دووشێکیان بە سەری سۆندەکەوە بەستبوو، لە ئەو بێ گەرماوی و بێ دەسەڵاتییەدا، هەزار گەرماوی

دەرەوەی دەهێنا! کاتێ نزیکبووینەوە، دەرگەی توالێتەکە داخرابوو، گوێمان لێبوو، یەکێ لە ژوورەوە بە دەنگێکی نزم و زۆر خۆش، گۆرانی هێندی دەگوت. ئیدی بە دیاریەوە وەستاین، تا هاتەدەرەوە، مامۆستا (حەسەن) بوو. (حەمە عەلی)ش زۆر چەقاوەسوویوو، گوتی: بە خوا دەیڵێی، دەی تەواویکە! ئەویش پێکەنی و گوتی: جارێ کاتی نییە، بۆ جارێکی دیکەی هەڵگرە!
شەوێکیان من و (حەمەعەلی) و (رەزا) کۆبووینەوە، بە ڕێکۆرەدەرێکەوە چووین بۆ لای مامۆستا (حەسەن) و تکامان لێ کرد، هێندێ گۆرانیمان بۆ بڵێ و منیش تۆماریکەم. ئەو شەوە زۆر خۆشمان ڕابوارد، هەرگیز دووبارەنەبووەوە و دووبارەش نابێتەوە!
دانیشتبووین، وردەوردە دەمانخواردەوە و مامۆستاش، بە ئەو دەنگە پڕ بە سۆزەی خۆی، بە هەر سێ زمانی کوردی، فارسی و عەرەبی، گۆرانی دەگوت. مامۆستا (ئەنوەر)یش، بە مێزەکە تەپڵی لێدەدا، شریتێکی شەست خولەکی بۆ تۆمارکردم، زۆربەی کات گوێم لێ دەگرت و زۆربەی گۆرانییەکانیشیم لەبەرکردبوو، هەر کەسێکیش گوێی لێ بووایە، باوەڕی نەدەکرد، ئەویش! بە داخێکی زۆرەوە، بەکرەکە ونبوو، نەمزانی، چی لێهات و نەمدۆزییەوە.
تازە تێلێڤیزیۆنی (کەرکووک) کرابووەوە، من زۆر هاتمەدا، لەگەڵ تیپی مۆزیکی (سولەیمانی) کاریکا و گۆرانی بڵێ. بەڵام ئەو کاتە قایل نەبوو، تا کەمێ دواتر دەسپێکرد، بە دەنگە خۆشەکەی، دڵی هەزاران ڕۆڵەی کوردی خۆشکرد و هێندەی دیکەش، مۆزیک و هونەری کوردی دەوڵەمەندترکرد!
خولەکە تەواوبوو، کەمێ حەواینەوە، پاشان دووەمین ساڵی خوێندن دەسپێکردەوە. ئەم ساڵ هێندێ مامۆستای نوێمان بۆ هاتبوو، وەک مامۆستایان (موحەممەد) و (سەردار عەبدولواحید)ی برای هونەرمەند (ئەحمەد سالار)، یەکەمیان ئینگلیزی و دووەمیشیان مێژووزانیان پێ دەگوتینەوە.



ئەم وێنەیە، ڕۆژی (18 . 7 . 1968) مامۆستا (حەسەن عەبدوڵڵا موحەممەد ئاغا) بۆ یادگار پێشکەشیکردووم

**هێندێ بەسەرهاتی خۆشی کارەندانی قوتابخانەکەمان**

**مامۆستا ( خەسرەو شەفیق )**

مامۆستا (خەسرەو) برای (تۆفیق شەفیق) بوو، قوتابییەکانی ئامادەیی (سولەیمانی)، چەندین نوکتەیان لەسەر دانابوو، کوڕی مامی (رەفعەتی حەمدی بەگ)یش بوو. لە خولەکەدا لەگەڵمانبوو. سەرەتا زۆر ڕێزمان لێ دەگرت، بەڵام سەیرمانکەین، (رەفعەت) خۆی پێی ڕادەبوێرێ و لە هەموو مامۆستاکان پتر، خومان دابوویە. ئیدی قوتابییەکان، بۆ ئەویشیان کردەوە، چونکە خۆی هێندێ قسەی وای دەکرد، مرۆ خۆی بۆ تەدەگیرا.

زمانی فەرمی خوێندن عەرەبی بوو. مامۆستا وانەی پەروەردەی کێڵگەی پێ دەگوتین، هێندێ جار، لە پۆلدا شتی بۆ باسدەکردین، داڵغەیلیدەدا و نەڕۆی، هەر شتی دەگوت و هیچ قری بەسەر بابەتەکەوە نەبوو!

کاتێ باسی ئاووهەوای (کوردستان)ی دەکرد، دەیگوت: لە ئاووهەوای زەریای سپی نێوەڕاست دەچێ. دوور نییە، ئەو ساڵە ئەم ڕستەیەی دەیان جار دووبارەکردبێتەوە: (حار جاف صیفا، بارد ممطر شتاء) واتە لە هاویندا گەرم و وشکە، لە زستانیشدا باراناویی و ساردە!

ئێمەش کاتێ ئەوەی دەگوت: شانمان بۆ هەڵدەتەکان، بۆمان دەسەتەوە و پێدەکەنین. ئەویش زۆری پێ خۆشبوو، وایدەزانی، هێندە بە باشی گوێی لێ دەگرین، هەموو بابەتەکانمان لەبەرکردووە! بەڵام لەگەڵ من و (حەمەعەلی) و (برایم)دا، بە هیچ شێوەیە دانووی نەدەکوڵا، وای لێ هاتبوو، نەیدەوێرا، پشتمان تێکا! کەچی ئێستە یەکێ لە دۆستە خۆشەویستەکانمە!

ڕۆژێکیان گەنمەشامی پێگەیشتبوو، لە کێڵگە کۆمانئەکردەوە، هێنامانەوە بۆ قوتابخانە، لە سەربانی بەشی پەلەوەر هەڵمانخست، تا کەمێ ووشکبێتەوە. ئەویش لە نێو قوتابییەکاندا وەستابوو، تەماشایدەکردین و داڵغەیلێدابوو. ئێمە لە سەربان دابەزین، گوتی: ئەو پەیژەیەش داگرن، با چۆلەکە نەچێتە سەربان! ئێمەش پێکەنین و گوتمان: مامۆستا چۆلەکە پەیژەی بۆ چییە، چۆلەکە دەفڕێ؟! ئەویش گوتی: ئا ڕاستدەکەن، گوێی مەدەنێ! ئیدی ئەو قسەیەی مامۆستا (خەسرەو) بووبوو بە نوکتە، دەم بە دەم و خول بە خول دەگێڕرایەوە، هەر کەسێکیش دەیگێڕایەوە، درۆیەکیدەکرد و دەیگوت: خۆم لە ئەوێ وەستابووم!

ڕۆژێ لە وانەی پراکتیدا بووین، مامۆستا (خەسرەو) بە من و (برایم)ی گوت، ئەمڕۆ ئێوە لە نێو ئەو گۆڵەمەرەزەیەدا ئیشبکەن و بژاریکەن، گەر بە باشی کاریکەن، ئەوا نمرەیەکی

باشتان بۆ دادەنێم. ئێمەش پێڵاومان داکەند، دەرلنگی پانتۆڵەکانمان هەڵکرد و بەپێی پەتی، لەنێو ئەو ئاو و قوڕاوەدا، زۆر بە کوڵودڵەوە کارمانئەکرد. ئەویش بە دیارمانەوە وەستابوو، هەر سەیریدەکردین. ماوەیە کارێکی باشمان کرد، دوایی تەماشایەکی مامۆستام کرد، سەیریدەکردین و پێدەکەنی. منیش گوتم: دیارە ئیشەکەمانت بە دڵە؟ ئەویش گوتی: زۆر بە دڵم نییە و دەریشتان ناچێنم. کەوای گوت: هەردووکمان خاکەنازەکەمان فڕێدا و من گوتم: هەر دەرمان ناچێنی، ئەوا ئێمە کار ناکەین و فەرموو خۆت تەواویکە، ئیدی لێماندا و ڕۆیشتین!

**مامۆستا (عەتا)**

مامۆستایەکی عەرەبی ڕەشی گەڕی دەموچاو قرنجاومان هەبوو، ناوی (عەتا) بوو. وانەی دارتاشی دەگوتەوە. دەعبایەکی زۆر سەیربوو، وەک دەڵێن، لەگەڵ تری خۆیدا شەڕی دەکرد و لە سێبەرەکەی خۆشی دەسڵەمییەوە! هەمیشە تووڕەوتڕۆبوو، هەر مۆڕدەبوورەوە، نازانم، پێی شەرمبوو، تەماشای قوتابی بکا، یا دەرووتی نەخۆشبوو. یا هەر ڕقی لە کورد بوو، تێی نەدەگەیشتین. تەنانەت تێکەڵاوی مامۆستاکانیش نەدەبوو! خۆش ئەوەبوو، (لەتیف هەشایەر) هەر بە (ئاللەعەتا) بانگیدەکرد و ئەویش دەموچاوی دەترشا، مۆڕەیەکی لێ دەکرد و هیچی نەدەگوت.
جارێکیان، فەریکە گوێزێکی سەوزمان بۆ برد و لێمان پرسی: مامۆستا ئەمە چییە؟ (ئاللە عەتا)ش کەمێ سەیریکرد، ئای بە گوێیەوە و کەمێ ڕایوەشاند، سەرێکی بادا و گوتی: (أعتقد طماطة غیر ناضجة) واتە: لە ئەو باوەڕەدام، تەماتەیەکی پێنەگەیشتووە! ئیدی هەموو دەستمانکرد بە پێکەنین. (ئەحەی فەتەلیرە) خەڵکی (هەڵەبجە) بوو، بە کورەی پێی گوت: هەی کوو لێ وارێ، ئەم هەتیوە دەڵێی، گیای بە کێوەوە خواردووە! ئیدی (ئاللەعەتا)ش، هێندەی دیکە قوشقیبوو، بە پەلەپڕۆزێ ڕۆی و جاروباریش ئاوڕیدەدایەوە، بە ئەو چاوانەی دەتگوت قاقلەجنۆکەیە، هەر مۆڕدەبووە و هەڕەشەیدەکرد. وای لێهاتبوو، پێڕەکەی ئێمەی دەبینی، سەریدادەخست و لێمان دووردەکەوتەوە، بە پەلە خۆی دەربازدەکرد!
ڕۆژێ لە (سولەیمانی)، من و (حەمەعەلی) و (رەزای بابەگوڕوون) بووین، نزیک باخی گشتی پیاسەمانئەکرد، لە دوورەوە (ئاللەعەتا)مان بینی، ئەویش ئێمەی بینی. ویستمان، بەرەو ڕووی بچین، ئەو لایدا و بۆ ئەو بەر جادەکە پەڕییەوە. ئێمەش دوایکەوتین و پێی گەیشتین، گوتمان: مامۆستا (عەتا) چۆنی؟ مۆڕەیەکی لێ کردین، وەڵامی نەدایەوە و بە پەلە ڕۆی.

بۆ بەیانی، وانەی ئەومان هەبوو، هەموو بەدلەی شیتمان لەبەرکردبوو، لە کارگەکە چارەڕێی (لالەعەتا)مان دەکرد. هەر لە دوورەوە هات و چارێکی گێڕا، بێ ئەوەی سڵاو بکا، خۆی کرد بە ژوورە پچووکەکەیدا. ئێمەش خوا بۆی دابووین، دەستمانکرد بە پێکەنین. ئینجا هاتەدەرەوە و گوتی: هەر کەسێ ئیشی خۆی بکا. پاشان پرسیارێکم لێ کرد، وەڵامی نەدامەوە. جارێکی دیکە بانگمکرد، هیچ کەڵکی نەبوو. لە ئەوە دەچوو، لەگەڵ مندا بەعزیووبێ و من نەمزانیبێ! (لەتیفەتڕە)ش لە ئەو سەرەوە، بە دەنگێکی بەرز هاواریکرد: کورە بابە گوێی مەدەنێ، وازی لێ بێنن، کەی ئەوە پیاوە، ئێوە دەم دەخەنە دەمیەوە! (لالەعەتا)ش هەر خێراخێرا، سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکرد، لە خوای دەویست، کاتەکە زوو بڕوا، وانەکە تەواوبێ و لە دەس ئەم بەڵایانەی خەڵکی شارە عەنتیکەکە ڕزگاربێ!

ڕۆژێکی دیکە (لالەعەتا)، باسی شتێکی دەکرد، ئێمەش یەک دووانێ بووین، لە دواوە دانیشتبووین، فیلمێکی سینەمامان دەگێڕایەوە. لەپڕ ئاوڕیدایەوە و لەنێو هەموویاندا، هاواری لە من کرد. (ئەحمەی فەتە) گوتی: ئەرەوەڵاڵ زمانی پڕا، یا خوا خێربێ! گوتم: فەرموو. گوتی: بۆ گوێ ناگری؟ منیش گوتم: جا باشە، تۆ چیت باسکردووە، تا گوێت لێ بگرم؟! تووڕەبوو، چاوی زەقکردەوە، ڕەندەیەکی بەدەستەوەبوو، بەرزیکردەوە و ویستی، بیکێشێ بە سەرما. هەر خێرا یەک دوو قوتابی قۆشمەچی دەسیانگرت و پێیان گوت: مامۆستا عەیبە شەرمەکەن، ئێمە هەموو براین! ئەویش تێ نەدەگەیی، خەریکبوو، لەتاواندا شێتدەبوو. بە منی گوت: ولله انت ما تستحي؟ واتە: کورە تۆ شەرم ناکەی؟ منیش ویستم، هێندەی دیکە شێتیبکەم، گوتم: لا ما استحي، زین. واتە: نەخێر شەرم ناکەم، باشە! ئەویش قوڕگی پڕبووبوو لە گریان، بە دەنگێکی تووڕەڵەوە گوتی: اذا انت ماتستحي، لعد اني شسویلك!؟ واتە: گەر تۆ شەرم ناکەی، ئیدی من چیت لێ بکەم؟ ئەوە بوو، شتەکانی بەجێهێشت، شەقێکی لە قونی خۆی هەڵدا و ڕۆی!

ئیدی خۆ لێپرسینەوە نەبوو، گەر لای بەڕێوەبەریش شکاتیبکردایە، نە گوێیان دەدایە، نە کەسیشیان بۆ لێپێچینەوە بانگدەکرد. لەبەرئەوە (لالەعەتا)، وای بە باش زانی، واز لە گرووپەکەی ئێمە بێنێ و بڕوا. ئەوەبوو، گرووپەکەی ئێمەی، لەگەڵ مامۆستا (عادل) کەرکووکیدا گۆڕییەوە. ئەویش هیچی نەدەزانی و شتێکی لە (لالەعەتا) کەرابووەوە. بەڵام ئەم زۆر زۆڵبوو، تووڕە نەدەبوو، گوێی نەدەدایە، هەر پێدەکەنی و ددانە زلە سپییەکانی پیشاندەداین! ئیدی تا ئێمە، لە ئەو قوتابخانەیە بووین، لە هەر کوێیەک (لالەعەتا)مان بدیبایە، بەگێکی دادەنا و پاشەپاش دەگەڕایەوە!

( تۆفیقی حەمەی باوە )

لێپرسراوی دابینکردنی پێویستییەکانی قوتابخانە و قوتابیان، بەشەکانی نێوخۆ، خواردنگە و دابینکردنی خۆراک، (تۆفیقی حەمەی باوە) بوو. ئەم پیاوە خەڵکی (هەڵەبجە) بوو، هەر لە خانووەکانی مامۆستایانی قوتابخانەشدا دەژیا. پیاوێکی زۆر خۆشبوو، هەر زۆر حەزی لە گاڵتەوگەپ و پێکەنین بوو، دنیای بە فشە گرتبوو، زۆربەی کات، هەر خەریکی بەزم و خواردنەوە بوو، بە هەموو شێوەیە هەر دەیماشیەوە، ورگزلێکی تەنگە ئەستووری کەتەی لچشۆڕ بوو، هەمیشە دەمی دەجوڵا، زۆر جار پاشمارەی پەتیری کراقت، بە ددانەکانیەوە دیاربوو، خۆی و خێزانەکەشی لە ئێمە زیاتر، خواردنی قوتابخانەکەیان دەخوارد!

ئێمەش بە هۆی قوتابییەکانی خەڵکی (هەڵەبجە)وە، پەیوەندیمان لەگەڵی خۆشبوو، زووزوو سەرمان لێ دەدا و داوای خواردنی قتوومان لێ دەکرد، ئەویش دەیگوت: نابێ و نییە، ئەوە هی قوتابیانی بەشی نێوخۆیی قوتابخانەکەمانە. (حەمەعەلی)ش دەیگوت: من ئەمانە نازانم، ئەی خۆت بۆ دەیخۆی، بەشی ئێمەش بدە!

جاری وابوو، سوعبەتمان لەگەڵ دەکرد، بە زۆر کارتۆنێکمان لێ دەسەند و لە نێوخۆماندا بەشمانئەکرد، یا یەکێ شتێکی دروستدەکرد، سەرقاڵیدەکرد و ئاگای لە خۆی نەدەما، یەکێکی دیکەش خۆی دادەتەپاند و بەبەردەم مێزەکەیدا، خۆی بە ژووردا دەکرد، کارتۆنێکی دەمبینا و ئێمەش لێمان وەردەگرت، ئیدی کە کارەکەمان تەواودەبوو، پێمان دەگوت: گوێ مەدەرێ، دونیا ئەوە ناهێنێ، خۆت زویرکەی، منیش خێرا نوکتەیەکم بۆ دەگێڕایەوە، ئەویش لەبەر پێکەنین، ئاگای لە هیچ نەدەما.

ڕۆژێکیان (ڕەفعەتی حەمەدی بەگ) سەرقاڵیکرد، (حەمەعەلی) و (ئەحەی فەتاحیرە)ش، خۆیان پێداکرد، دوو کارتۆن پەتیری کراقت و گۆشتی قتووی (دانیمارک)یان، بە پاڵ هێنا، بە پەلە لە نێوخۆماندا بەشمانکرد و وێنەیەکیشمان، بە ئەو بۆنەیەوە گرت.

هەمووی هەفتەیەکی پێ نەچوو، گەنجینەکەی خاڵە (تۆفیق) ئاگری تێبەربوو. زۆربەی چەرچەف، پەتانی، بەرگەسەرین، کارتۆنەسابوون و خواردنەکان سووتان، بە پەلە ئاگرکوژێنەوە هات و کوژاندیانەوە. ئەو دەمە (کەریمی قەرەنی) پارێزگاری (سولەیمانی) بوو، هەر زوو گەیشتە قوتابخانە و لیژنەیەکی کۆڵینەوەی پێکهێنا. کاکە (تۆفیق) لەرزی لێهاتبوو، چونکە دەیزانی، چی کردووە. دەتگوت، خۆڵی مردووی بەسەردا کراوە! زەوقی نەمابوو، زۆر دەترسا.

ئێمەش لەلایەوە وەستابووین، خێراخێرا پرسیارمان لێ دەکرد و پێمان دەگوت: دەسی خۆت وەشان و لێدا، کەموکورییەکی زۆرت هەبوو، ئاگرت لە گەنجینەکە بەردا و خۆت قوتارکرد!

(حەمە عەلی)ش پێی دەگوت: تو خوا کاک (تۆفیق)، پێم بڵێ، چۆن سووتاند؟ ئەویش تووڕەبووبوو، گوتی: بڕو هەتیو، بێدەنگبە، ئەوەک یەکێ گوێی لێبێ، وا بزانێ، ڕاستەکەی و من سووتاندوومە!



لە ڕاستەوە: ڕەوانشاد شەمالی ئەحمەدی مەحموودبەگی جەڕاح، ڕەوانشاد ڕەفعەتی حەمەدی بەگ، ڕەوانشاد حەمەی شێخ کەریم، حوسێن (خۆم)، سەرکەوت تۆفیق و حەمەعەلی حەمەمراد.

(عەلیٚ فەندی)

(عەلی) فەندی، پیاوێکی گرگنەی ورگنەی چکۆلەی سەرپرووتاوە بوو، خەڵکی (سولەیمانی) بوو، کاروباری مەخزەنەکەی ڕادەپەڕاند. پیشەیەکی خراپی هەبوو، حەزی لە کوڕی جوان و متاڵبازی دەکرد. ئێمەش سەرمان تێ کردبوو، زووزوو قوتابییە جوانەکانمان دەنارد و پێمان دەگوتن: بڕۆن، داوای فلان شتی لێ بکەن.

مەخزەنەکە زۆر گەورە و بەرز بوو، لە سوچێکەوە بە تەختە، تەزمێکی دیکە دروستکرا بوو. زۆربەی ئەو شتانەی ڕۆژانە پێویستبوون، لە سەرەوە دایتابوون. هەر یەکێ داوای شتێکی لێ بکردایە، خۆی پەیژەکەی بۆ دەگرت و دەیگوت: کوڕم فەرموو سەرکەوە، شتەکان لە ئەوێیە و دایگرە. ئیدی بۆ خۆی ئێر نیگای سمتوکەقەڵی دەکرد و ئاسوودە دەبوو. دەرەی هەولێرییەکان دەڵێن: دەڵێی ڕۆن سەگیان لە قنبی دەدا!

ئێمەش لێمان دەپرسی: باشە تۆ بۆ ئەو شتانەت، لە سەرەوە داناوە، بۆ لە خوارەوە نەبێ، ئەو هەموو شەڕەشەقەی بۆ چییە؟! ئەویش دەیگوت: ئاخر ئێوە زۆڵن، ئەوە بۆ ئێوە تییە، هەقی ئەو جۆرە شتانەتان نەبێ، من خۆم ئیشی خۆم باش دەزانم. (ڕەزا)ش پێی دەگوت: دەیا ئێمەش جارێ سەرکەوین، بزانین، چی لێ هەیە! ئەویش بە پێکەنینەوە دەیگوت: ئاخر ئەوەی ئێوە بە کەڵک نایە!

مالی (شێخ لەتیفی حەفید)

هاتوچۆمان لەگەڵ ماڵی (شێخ)دا، هەر زۆر لە کۆنەوە گەرمبوو. بە تایبەتی، لە ئەو کاتەی بۆ (سولەیمانی) گەڕابووینەوە، ماڵەکانمان هەمووی، دە خولەک لە یەکدییەوە دووربوون. من لە ئامادەیی (پەکرەجۆ) و (کاوە)ش، لە قوتابخانەیەکی ناوەندیی لە (سابونکەران) دەمانخوێند.

ساڵی (1967– 1968) بوو، دوای ئەوەی لە خوێندن دەبووینەوە، مەگەر لە شار نەبووایە، ئەگینا زۆربەی ڕۆژ پێکەوەبووین. سەردانی ماڵانمان دەکرد، دەچووین بۆ سینەما و دەگەڕاین. یا لە دیوەخانەکەیان دادەنیشتین، خەڵکی هەمەچەشنەی لێ کۆدەبووەوە و قسەماندەکرد. بە ڕۆژیش هێندێ جار، لەگەڵ (بەکر)ی شۆفێریاندا، بە دوایدا دەچووین بۆ قوتابخانە، بیاتوویەکمان دەدۆزیەوە، مۆڵەتمان بۆ وەردەگرت و دەمانهێنایەوە، چونکە حەزی لە خوێندن نەدەکرد. گەلێ جاریش بە ترومبیلەکەی، بەبەر ئامادەیی کچاندا دەگەڕاینەوە، چونکە ئەو کاتە، تازە (چنووری ئایەر بابان)ی دیبوو، شێتی بووبوو، بەڵام (چنوور) ئاگای لە هیچ نەبوو! هێندێ جاریش ئەو دەمات و لە ماڵی خۆمان، تا درەنگانێ یاری کاغەزمان دەکرد. جاری واشبوو، شتی وا سەیر و سەمەرەی دەکرد، مرۆ هەر سەری سووڕدەما! بۆ نموونە:

گوندی (قوشقایە)

ئێوارەیە پیاوێکی نارد بە دوامدا، منیش هەر لێکمدەدایەوە، ئاخۆ چی ڕوویدابێ، چونکە نیوەڕۆ پێکەوەبووین! بە پەلە چووم، گوتی: بەیانی خۆت ڕێکخە، دوای نیوەڕۆ من و تۆ و (لەتیفی حەمەخورشەی ئاڵیەند) دەچین بۆ (بازیان). ئەو کاتە، پاییزێکی درەنگی ساڵی (1968) بوو. دنیا ساردیکردبوو، بەر ڕۆژای لادێ خۆشبووبوو، پاشنیوەڕۆ (شێخ کاوە) لە قوتابخانە هاتەوە، بە (لەتیف)ی گوت: لەگەڵ (عەلی بەرزنجی)دا بڕۆن، قاپێ شەرابی حەمبا، قاپێ عەرەقی مەستەکی و سێ بوتڵ بیرەی فەریدەش بکڕن. ئیدی نانمانخوارد و بە جێبەشەڕەکەی (مامەسەعە) بەڕێکەوتین. دوای ماوەیە لە (تاسڵوجە) لاماندا و لە گوندی (قوشقایە) دابەزین.

(قوشقایە) تورکیە و ئەو ناوە، لەسەردەمی عوسمانییەکاندا پەیدابووە، بە کوردی قوش چۆلەکەیە و قایەش بەردە، جا ئیدی لە چییەوە هاتووە و مەبەستیان چی بووە، نازانم! بەڵام گوندێکی چکۆلانەی خنجیلانە بوو، لە دامێنی ڕیزە چیاکانی (تاسڵوجە)دا هەڵکەتبوو. دابەزین و کەمێ حەواینەوە، دوایی هەرسێکمان بەپێ، بە چیاکەدا هەڵگەڕاین، لە دواشەوە، چەن پیاوێکی ئاوایی دوامانکەوتبوون. بە ڕاستی، تا گەیشتینە سەر لوتکەی چیاکە، زۆر ماندووبووم، بەڵام هەوایەکی زۆر خاوێن و سازگاری هەبوو، هەموو ماندوێتییەکەم لە بیرچووەوە. لە دوورەوە (سولەیمانی) دیاربوو، زۆر جوانبوو، هەر دەدرەوشایەوە.

(شێخ کاوە) تفەنگێکی برنەوەی پێبوو، چەن نیشانێکی دانا و یەک لە دوای یەک، هەموویانی شکاند. پاشان بە منی گوت: ئەو بەردە گەورەیە دەبینی، بڕۆ، ئەم نیشانەیەی لەسەر دانێ. منیش ڕۆیشتم و لە پڕ گوتی: ئاگات لە خۆت بێ، کە ئاوڕمدایەوە، لوولەی تفەنگەکەی لە من کردبوو، قەرەوڵی لێ گرتبووم. منیش گوێم نەدایە و بە دەم پێکەنینەوە هەر دەڕۆیشتم، بۆ ئەو شوێنەی بۆی دیاریکردبووم. ئینجا هاواریکرد و گوتی: کوڕە لەگەڵ کێمە، ئاگات لە خۆت بێ، بە گۆڕی (شێخ مەحموود) بە ڕاستمە. کە تەماشامکرد، (لەتیف)ی هاوڕێم پێی دەگوت: (شێخ کاوە) مەکە، تفەنگ ئامانی نییە. منیش، خێرا نیشانەکەم لەسەر بەردەکە دانا و ئەم جارەش هاواریکردەوە، ئاگات لە خۆت بێ. ئیدی دەمزانی، شتێ وای لەدەسدێ، لەبەرئەوە ترسام و بە پەلەپڕوزێ، هێندەی بۆم کرا، خۆم هەڵدا و لە پەنا بەردەکەدا خۆم گرموڵەکرد. هەر هێندەم زانی، شەقەی لە بەردە پچووکەکە هێنا، وردوخاشیکرد و هەر پارچەیەکیشی، بە لایەکدا بڵاوبووەوە. منیش توندتوند،

هەربۆیە دەسم بە سەرمەوە گرتبوو، بە تەواوی خۆم لوولکردبوو، پارچەیەکی چکۆلانەی بەردەکەش، بەر پشتم کەوت، بەڵام هیچ ئازارم پێ نەگەی و بە ئانقەست خۆم بێدەنگکرد، گوتم بزانم، چی دەکا! ئەویش هەر هاواری لێ دەکردم و منیش وەڵامم نەدەدایەوە، تا خۆی و (لەتیف) بە ڕاکردن هاتن، ئیدی لە پڕ بەرزبوومەوە و لە قاقای پێکەنینم دا. بەڵام (کاوە) ڕەنگی سپیبووبوو، زۆر شپرەزە دیاربوو!

دەمەوئێوارە چووینەخوارەوە، نان ئامادەکرابوو، بەڵام چ قوبووڵی و شلەیەکیان لێنابوو، دەسوەدەمی پێوە دەخورا! مریشکیان بە ڕۆنی کوردەی سوورکردبووەوە، دەتگوت دەنووکی کەوە. بڕواناکەم، تەوەتەی هەم، لە هیچ شوێنێ خواردنی وا بە تام و خۆشم خواردبێ. پاشان (شێخ کاوە)، بە خانەوادەکەی گوت: هێندێ ئاوی مریشك و گۆشتمان بۆ دانێن، دوایی دەیخۆین.

دوای نانخواردن پیاوانی ئاوایی هاتن و دیوەخان پڕبوو، جگەرەکێشان و چەرەدوکەڵێ بوو، چاوچاوی نەدەبیتی و بە دووکەڵ قاشیادابووین. (شێخ کاوە) خۆی لە هەموویان خراپتربوو، جگەرەی بە جگەرە دادەگیرسان و بە دەمیشیەوە، یەك لە دوای یەك چای دشلەمەی دەخواردەوە، دەتگوت، هەزار ساڵە لاینییە!

پاشان، ئاردی بە دوای پیاوێکدا و هات، پێی گوت: دەی (کەلە) گۆرانیمان بۆ بڵێ. (کەلە)ش پیاوێکی سەر و ڕیش سپی چکۆلانەی ورگن بوو، لەتەجامانێیەکی شڕی بە سەریەوە بەستبوو، کراس و دەرپێیەکی سپی درێژی لەبەردابوو، چەن مەترێ پشتێنیشی لە نێوقەدییەوە ئاڵانبوو، لەسەرێشەوە، پەستەکێکی لەبەرکردبوو، هەرچەندە تەماشام دەکرد، هەرگیز لە ئەوە نەدەچوو، ئەك هەر دەنگی خۆشبێ، بەڵکوو هیچ گۆرانیەکیش بزانێ! بەڵام کە دەسی خستە بناگوێی و چریکانی، بە قەتار و ئەڵڵاوەیسی دایگرتینەوە، بڕواناکەم، هیچ کەسێکم دیبێ، ئەو گۆرانیە خۆشەی، بە ئەو چەشنە چڕیبێ. سەیر ئەوە بوو، بە ئەو تەمەنەوە ماندوو نەدەبوو، بە ڕاستی دەنگێکی هەبوو، تا بڵێی خۆشبوو، حەزم نەدەکرد، وا زوو تەواوبێ!

دوایی (شێخ کاوە)، گۆرانیبێژەکەی گلدایەوە و ئەوانی دیکە ماڵاواییانکرد. ئینجا خوان ڕازایەوە و گوتی: ئەم شەو خۆم ساقی دەبم و دەبێ، هەرچییەکم بۆ تێکردن، بیخۆنەوە. هێندەم زانی، سێ پەرداخی گەورەی ڕیزکرد، پێشەکی تا نیوەی بە عەرەق پڕکرد، پاشان هێندێ بیرەی بەسەرداکرد، تێکیهەڵدا و تێکەڵاویکرد. ئینجا پڕیکرد لە شەراب. ئیدی هەمووی بە جارێ ڕەشبوو. سەر و پەرداخی بۆ من و (لەتیف) دانا و گوتی: فەرموون،

بەڵام پەلەمەکان. منیش قومێکم لێدا، خواردنەوەی چی، لە ژاری مار دەچوو، دەموچاوم هەڵقرچاند و بە پەلە کەوچکێ ئاوی مریشکم خواردەوە. (شێخ کاوە)ش پێکەنی و گوتی: چۆنە؟ منیش گوتم: دەستخۆشبێ، هەر یەشێ ئەم شەومان بکا و لێمان نەبڕێ، زۆر باشە، ئەویش تێگەیی و پێکەنی!

(کەلە)ش تا درەنگانێ، ئەوەی دەیگوت، نەیدەگوتەوە، نازانم، ئەو هەموو گۆرانیە خۆشانەی چۆن دەزانی و لە کوێ فێربووبوو؟! ئێمەش هەرسێکمان، بە دیار (کەلە)وە مەستبووبووین، دواچۆڕمان خواردەوە و تەقەمان لە بنی هەموو شووشەکان هەڵسان، وا مەبووبووین، لە گوێی ژۆپاکە، تا بەیانی لالۆپاڵ لێی کەوتین. وا بزانم، تا ئێستە لە ژیانمدا، هەرگیز خەوی وا خۆشم لێ نەکەوتووە، بەیانیش دوای بەرچایی گەڕاینەوە!

**کاری رامیاری**

هاوینی ساڵی (1968) بوو، ئێوارەیە لە (بەکرەجۆ)، من و (حەمەعەلی) و (وریا) دانیشتبووین، باسی ڕەوشی کورد و شۆڕشمان دەکرد. بڕیارماندا، هەرچی چۆنێبێ، پێوەندی بە شۆڕشەوە بکەینەوە و هێڵێکی ڕێکخستن لە قوتابخانەکەمان دروستکەین. بەڵام کاتێ هەردووکیان زانیان، من بە ڕاستمە، لەسەر ئەوە سووردم و باوەڕی تەواویان پێ دەکەم، ئینجا (وریا) خۆی لێ ئاشکراکردم و گوتی: ئێمە پێوەندیمان هەیە و لە ڕێکخستنەکانی (پارتی)دا کاردەکەین، داواش لە تۆ دەکەین، کارمان لەگەڵ بکەی.

ئیدی لەبەرئەوەی بڕوایەکی تەواوم پێیان هەبوو، بێ دڵەڕاوکە، یەکسەر قایلبووم و نامەیەکم بۆ هێڵی ڕێکخستنەکەیان نووسی، هەمووی دوو هەفتەی پێ نەچوو، لە لیژنەی ئێوچەی (سولەیمانی)یەوە وەڵامهاتەوە و بە ئەندام وەرگیرامەوە. یەکەمین کۆبوونەوەشمان، ڕۆژێکی هەینی بوو، من و (وریا) لە بازاڕ یەکدیمان بینی و بەرەو ماڵەکە ڕۆیشتین.

کە چوومەژوورەوە و سەیرمکرد، ماڵی (زاهیری مەلا عەلی) هاوڕێمە، (حەمەعەلی)ش لە ئەوێ دانیشتووە. واتە بووین بە چوار کەس و گوتیان: ئێستە لێپرسراوەکەشمان دێ. زۆری پێ نەچوو، ڕەوانشاد (جەمالی حەمەتۆقڵە) هات و هەر وەلە لە پاشێ بەرەدەتەوە، وابوو. لەبەری هەستام، یەکدیمان ماچکرد و دانیشتین. سەیرێکیکردم و گوتی: لە چی دای؟ گوتم: باشم.

(جەمال) هاوڕێی منالی و کوڕی گەڕەک بوو، دیوارێکیشمان لە نێواندا بوو، کەچی ئەم دەزانی، کاردەکا! بەڵام بۆچی، ئەو ماوە دووردورێژە، هیچی لای من نەدرکاندووە، نازانم؟ خۆ ئەو سوور دەیزانی، من لەگەڵ شۆڕش و باڵەکەی (بارزانی) دام! دوایی ئەو مەتەڵەشی

بۆ هەڵهێنام و گوتی: لەبەرئەوەی باوکت جەلالییە، سڵمان لێ دەکردیتەوە. سەیرم لێدەهات، منیش لەسەر ئەو کێشەیە، لەگەڵ باوکمدا دانووم نەدەکولا، ئەوانیش سڵیان لە من دەکردەوە! تەنانەت، دواجار بە باوکم گوت: یا نابێ، ئەو جاشانە بێنە ماڵی ئێمە و کۆبوونەوەبکەن، یا من لە ئەم ماڵەدا نابم! ئیدی بە ئەو شێوەیە تێهەڵچووینەوە!

هەرچی چۆنێبوو، دەستمان بە کارکردن کرد و هێندێ چالاکیمان نواند، ڕێکخستنێکی پتەومان بە ناوی لیژنەی (پۆلا)ەوە، لە نێو قوتابییەکان و خەڵکی دەرەوەش دامەزراند. ڕۆژانە دەنگوباسێکی زۆرمان، سەبارەت بە جەلالییەکان، بۆ شۆڕش کۆدەکردەوە. لە ماوەیەکی کەمدا، هێڵەکانی ڕێکخستنەکە فراوانبوون، بڵاوکراوەکانی (پارتی) و شۆڕشمان بۆ دەهات، ئێمەش لە نێو کۆمەڵانی خەڵکدا بڵاوماندەکردنەوە. ڕێکخستنەکە وای لێهات، ڕۆژبەڕۆژ فراوانتردەبوو، لەگەڵ هێندێ مامۆستاشدا، وەک (کەمال ڕەمزی)، بە ناوی (ی. ق. ک.)ەوە قسەماندەکرد. لیژنەی نێوچە و لقی (سولەیمانی)ش، بایەخێکی زۆریان بە هێڵی ڕێکخستنەکانی لیژنەی (پۆلا) ئەدا، چونکە لە نێو جەرگەی دەسەڵاتی جەلالییەکاندا کارماندەکرد. دوای ماوەیە، جەلالییەکانیش هەستیان بە جموجوڵێ کرد.

ڕۆژێ (ڕەزا) بە من و (حەمەعەلی) گوت: ڕاپۆرتمان بۆ هاتووە، کە جموجوڵێکی زۆر لە ئامادەیی کشتوکاڵ هەیە، دەزگەیەکی تایبەتی دیاریکراوە، تا ئەو کەسانە بدۆزنەوە. گەر شتێ هەیە، دوایی من ناتوانم، داکۆکیتان لێ بکەم، خۆتانی لێ دووربخەنەوە. هێندێ جاریش، بە پێکەنینەوە دەیگوت: هەمووی قسەیە، باوەڕ بە من بکەن، گەر مەلایین و کاردەکەن، بە منیش بڵێن، تا کارتان لەگەڵ بکەم. ئێمەش بە پێکەنینەوە پێمان دەگوت: ئێمە برایین، جا گەر شتێکی وا گرنگ هەبێ، بە تۆ نەڵێین، بە کێ دەڵێین، باوەڕبکە، بێ تۆ پەنجە بە ئاودا ناکەین!



(جەمالی حەمەتۆفیق)، ئەندامی (سۆسیالیست) بوو. ڕۆژی (11. 10. 1989)، لە ئەمنی (سولەیمانی) شەهیدکرا

## پارتی سمێڵ

هێندێ برادەری قۆشمەی وەك (جەمال محێدین، حەمەی شێخ كەریمی باخەوان، رەفعەتی حەمدی بەگ ...) هەبوون، هەر بۆ خۆشی، پارتی سمێڵیان دامەزراندبوو، وەك چۆن (عوسمانی حەمەنایەر) لە (سولەیمانی)، پارتی كەرانی دروستكردبوو!

مەرجی ئەندامەتی ئەوەبوو، ئەندامەكان سمێڵ بهێڵنەوە، بەگوێرەی گەورەیی، پاتوپۆڕیی و درێژی سمێڵەكەش، لە پلەكانی ئەو پارتەدا پێشدەكەوتن و بە پەیژەی دەسەڵاتدا سەردەكەوتن. ئەوەی بیویستایە، كاریان لەگەڵ بكا، دەبووایە، نامەی بنووسیایە و داوای مافی ئەندامێتی بكردبایە، گەر وەڵامی نەدرایەتەوە، واتە وەرنەگیراوە، گەر وەریشگیرایە، ئەوا وەڵامیاندەدایەوە و پیرۆزباییان لێ دەكرد. لیژنەی نهێنیشیان هەبوو، سەبارەت بە سمێڵی ئەندامان، ڕاپۆرتی بۆ سەركردایەتی دەنووسی. گەر هەر ئەندامێ لە مەرجەكانی ئەندامێتی لایبدایە، ئەوا سەرنجیانڕادەكێشا و ئاگاداریاندەكردەوە!

سەیر ئەوەبوو، من خۆم لە پارتی سمێڵدا ئەندامبووم، هیچ جۆرە بیر و ڕێبازێكی ڕامیاری و نهێنییەكیان نەبوو، تەنیا هەر بۆ پێكەنین و گاڵتەوگەپ دامەزرابوو. كەچی جەلالییەكان وایاندەزانی، ئەمە تەنیا ڕووپۆشە و مەلاییەكان دروستیانكردووە، لە پاڵ ئەم ناوەشدا، ڕێكخستنەكانی خۆیان حەشارداوە! ئەنانەت، كار بە ئەوە گەیشت، هێندێ لە ئەندامە دیارەكانی ئەو پارتە، ئاگاداركرانەوە و داوایان لێ كردن، واز لە ئەو كارە بێنن. ئیدی هەر زوو كپبوو، دەنگ و ڕەنگی نەما، بەڵام ئێمە، هەر خەریكی ڕێكخستنی خۆمان بووین!

## توندڕەوی و پەرگیری

یەكێ لە خەسڵەتە دزێوەكانی نەتەوەی كورد ئەوەیە، بە تایبەتی خەڵكی (سولەیمانی)، شت زۆر بە توندی دەگرن و پەرگیری تێدا دەكەن. واتە هەر كارێ بكەن، باش یا خراپ بێ، نیشتمانپەروەر یا نیشتمانفرۆش بن، زۆر بە دڵسۆزی و بە كوڵوبڵێكی بێ وانتاوە دەیكەن و زیادەڕۆی تێدا دەكەن.

لە (یەكرەچۆ) كەس نەبوو، هێندەی (موحەممەد) ناوێ، لەگەڵ خەڵكدا خراپبێ. ئەو پیاوە سەرۆكی چێشتكەرەكانی خواردنگەی قوتابیان بوو، ئەوانیشی زۆر ئازاردەدا. جەلالییەك بوو، لە (مام جەلال) جەلالیتر بوو! جارێكیان جەلالییەكان لە شەڕێكدا، هێندێ چریكی (ئێران)یان گرتبوو، بە نێو شاردا دەیانگێڕان، (حەمەموفتی) پێشیانكەوتبوو، هاواریدەكرد و دەیشیڕاند، كە گەیشتە ئاستی ئێمە و ئێمەی بینی، هێندەی دیكە شادەماری ملی

هەڵتۆقی و وەک بەرییتی بۆق لێیدەدا، بە هەموو هێزی خۆی دەیقیڕاند: بمری (مەلا مستەفا)، نۆکەری (ئێران) و ئیمپریالیزم، ئامانج حوکمی زاتییە، هیچ حیزبێکی تر نییە!
بە ڕاستی، زۆرم بەزەیی پێدا دەهاتەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: تۆ بڵێی، کەسێ هەبێ، هێندەی ئەم گێلە پیاوە، دژی گەل و نیشتمانی خۆی و هێندەش دڵسۆزی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) بێ؟! بە هاوڕێکانم گوت: تەماشاکەن، سەرانی جەلالی چۆن مێشکی ئەم جۆرە کەسانەیان شتووەتەوە و تێکیانداون، تووشی چ جۆرە نەخۆشییەکی دەروونییان کردوون و چ جۆرە تۆوێکی خراپی دوژمنایەتییان، لەنێو ڕیزەکانی گەلی کورددا چاندووە! چی بکەین، لە داخان و لە ناچاریدا ڕۆیشتین.
هەر یەکێ بە لای (حەمەرەفعەتی)دا بڕۆشتایە و بیزانیایە، هەر بە خوێنی چێشتیش، کەسێکی مەلایی بووایە، خۆی بۆ نەدەگیرا و دەبووایە، پلارێکی تێ گرتایە، ئەگینا خۆی پیسدەکردا! ڕۆژێ وا بڵاوبووەوە، سەرکردایەتی شۆڕش و دەوڵەتی (بەعس)، لە (بەغدا) گفتوگۆیان دەستپێکردووە و خەریکن ڕێکدەکەون. ئێمەش لەبەردەمی خوارنگەکەدا وەستابووین، دەیزانی، ئێمە جەلالی نین، ڕووی تێ کردین و گوتی: هەر سێبەسێ تەڵاقم کەوتبێ، گەر مەلا (چۆمبی) سەرکەوێ و (کوردستان)یش ڕزگارکا، من نامەوێ و لە ئەم وڵاتە دەڕۆم. منیش خۆم بۆ نەگیرا و گوتم: باشە گەر ڕزگاریکرد، چی دەکەی؟! گوتی: ماڵ و منداڵم هەڵدەگرم و لە (کوردستان) نامێنم!
دوو چێشتکەری دیکە هەبوون، (شێخ مستەفا) و (شێخ جەراد)، چاویان لە من داگرت و دوایی پێیان گوتم: بابە ئەوە تۆ لەگەڵ کێ دەدوێ و باسی چی دەکەی، ئەو پیاوە، تەنانەت دوژمنی گیانی خۆشێتی، وازی لێ بێنە!
کەچی هەر ئەو (حەمەرەفعەتی)یە بوو، دوای ڕێککەوتننامەکەی (11. 3. 1970)، هەردوو باڵەکەی مەلایی و جەلالی یەکیانگرتەوە، جنێوەکانی خۆی، (مەلاچۆمبی) و بەڵێنەکەی، لە بیر خۆی بردەوە، ئینجا خێراخێرا دەیگوت: سەرۆکە (بارزانی)!
دوای ماوەیەکیش، ڕووبەڕوو سەری لە لیژنەی ئێرچەی (سولەیمانی) دەدا، ئەو کاتە من لە ئەوێ کارمدەکرد. ڕۆژێکیان هێندەی ئەمابوو، بانگیبکەم و پێی بڵێم: کاکە (حەمە) لە ئەوە دەچێ، ژنەکەت بە جاش مارەکردبێتەوە، وا (بارزانی) سەرکەوت و کەچی تۆ هەر لە (کوردستان) ماوی؟! بەڵام لە دڵی خۆمدا گوتم: پیاو لەگەڵ یەکێتی ڕیزەکانی کورددا بێ و باشتر وایە، گوێ نەداتێ!

**پەڕگیری ئایینی**

زۆر جێی خۆیەتی، لێرەدا شتێ لەسەر خۆشم باسکەم. ساڵی (1967– 1968) بوو، نوێژم دەکرد و لە گەرمەی خواپەرستییەکی خەستوخۆڵدا بووم، وەک دەڵێن: سەرم بچووایە، نوێژم نەدەچوو! هەموو ڕۆژێکی هەینیی بەڕۆژوودەبووم، لەگەڵ هێندێ هاوڕێی موسوڵمانی نوێژکەردا، سەردانی پیر و پیاوچاکانی شارەکەمان دەکرد. هێندێ شەویش لە مزگەوتی (تەوقاف) یا (خانەقای مەولاناخالید) تا درەنگانێ، لەگەڵ موسوڵمانەکانی ڕێبازی (نەقشبەندی)دا زکرمانئەکرد. وام لێهاتبوو، زۆر شەویش تا بەیانی، هەر خەریکی نوێژکردن، قورئانخوێندن و تەزبیحات بووم. تەنانەت لەسەر دۆشەکیش نەدەنووستم. ماوەی (6) مانگ بە ئەو شێوەیە بەردەوامبووم، پاشان هەرچییەکم کرد و کۆشام، نەمتوانی، تا سەر لەسەر ئەو ڕێبازە پیرۆزە بڕۆم، ئیدی وردەوردە لێی تەکیمەوە! ئەوەش نموونەیەکی بێ تام و چێژی پەڕگیری نەبێ، هیچی دیکە نییە، چونکە گەر وەک موسوڵمانێکی ئاسایی، ئەرکە ئایینییەکانی سەرشانی خۆم جێبەجێکردایە، دوور نەبوو، تا ئەوڕۆش هەر بەردەوامبوومایە!

ئاخر پەیامبەری موسوڵمانانیش فەرموویەتی: هێندە کار بۆ ژیانی ئەم دونیایە بکە، وا بزانە، هەرگیز نامری، هێندەش کار بۆ ژیانی ئەو دونیا بکە، وا بزانە، سبەینێ دەمری!

ئەز پێم وایە، موسوڵمانی ڕاستەقینە دەبێ، لەگەڵ ئارەزووی دەروون و ویستی ناپەوای خۆیدا بجەنگێ. بە ڕاستی ئەو مرۆیانە زۆر ئازان، کە بەسەر ئارەزوو و داواکارییەکانی دڵ و دەروونی خۆیاندا زاڵدەبن. من زۆر هەوڵمدا، بەڵام نەمتوانی، ئەو کارەبکەم، بۆیە وازم لە ئەو نیوە خەڵوەتەش هێنا! بەڵام ڕەگی باوەڕی خواپەرستی، هێندە بە قووڵی، بە ناخ و بیر و هۆشمدا ڕاچووە، هەرگیز دەستبەرداری نەبووم!

**تێلیڤیزیۆنی (کەرکووک)**

ساڵی (1968) بوو، وێستگەی تێلیڤیزیۆنی (کەرکووک) دامەزرا. لەگەڵ ئەوەشدا سەرەتا، هەموو بەرنامەکانی بە زمانی عەرەبی بوو، ڕۆژانە هێندێ بەرنامەشی، بە زمانی کوردی بڵاودەکردەوە.

بە ڕاستی، کردنەوەی تێلیڤیزیۆن، کارێکی زۆر گەورە و گرنگی، لە بیر و هۆشی ڕۆڵەکانی شارەکەمان کرد. کۆمەڵانی خەڵک زۆر بایەخیان پێ دەدا، چاوەڕێیاندەکرد و تەماشای بەرنامەکانیان دەکرد. ئێستەش بیرمە، هەر ئێوارەمان لێدەهات، چاوەڕێی زنجیرە درامای میسری (ڕەحیل)مان دەکرد، هەموو بێدەنگ دادەنیشتین و زۆر بە تامە و پەرۆشەوە

تەماشامانده‌کرد. یەکەمین جاریشبوو، لە تێلیڤیزیۆندا گۆرانییەکی (عەبدولحەلیم حافز) ببینم، کە هەر زۆر لە زووەوە، شەیدای دەنگی ئەو هونەرمەندە گەورەیەی عەرەب بووم.
سەیر ئەوەبوو، هەموو ئێوارەیە، لە تێلیڤیزیۆنی (کەرکووک)ەوە، کوردێکی خۆفرۆش کاریکاتێرێکی ژەنەراڵ (بارزانی) دروستکردبوو، (بارزانی) بە پێوە ڕاوەستابوو، پیاوێکی (ئەمێریکایی)ش لە دواوە، پاڵتۆیەکی لەبەردەکرد، لەژێریشەوە نووسرابوو: (رداء العمالة، هقیه یا ملا!) واتە: ئافەرین مەلا، بۆ پۆشاکی بەکرێگیراویت! هەرچەندە ئەوەم دەبینی، هێندەی دیکە ڕقم لە جەلالی و دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) دەبووەوە، بەڵام دەسەڵاتم نەبوو!
هەر ساڵی (1968) بوو، دووبەرەکی لە نێوان ڕیزەکانی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)دا دروستببوو. (عەزیز حاج) لێپرسراوی یەکەمی بەرەی (قیادە مەرکەزی) بوو، (بەعس) گرتی و لەسەر تێلیڤیزیۆن دانیشتبوو، بە تەواوی ڕووخابوو، دانی بە هەموو شتێکدا نا و هێندێ لە هاوڕێ تێکۆشەرەکانی خۆی بەگرتدا، بە نرخێکی زۆر هەرزانیش، خۆی لە مردن ڕزگارکرد!

## ئاشتبوونەوە

مانگێ پتر بەسەر خولەکەماندا تێپەڕیووبوو، سەردانی (سولەیمانی)م نەکردبوو. ڕۆژێکیان مامە (ساڵح) و (سەلاح)ی برام هاتن و گوتیان: هەر دەبێ، بێیتەوە و ماڵەوە زۆر بیرتدەکەن. مامم گوتی: ماڵی کابراش بوون بە دراوسێتان. ئیدی هێندەی دیکە هانیدام، بگەڕێمەوە و گوتم: پاشنیوەڕۆی پێنجشەممە دێمەوە.


(یادگاریی – 1. 8. 1968) خوالێخۆشبوو مامە (ساڵح)، خۆم و (سەلاح)ی برام

هەرچی چۆنێ بوو، کارەکانم جێبەجێکرد و لەسەر بەڵێنەکەی خۆم، ڕۆژی پێنجشەممە دابەزیم و لەناکاو خۆم کرد بە ماڵدا. هەرگیز لە ژیانمدا، هێندە لە ماڵەوە دانەبڕابووم و زوویرنەبووم. دەتگوت: حاجی لە (حەج) هاتووەتەوە، دایکە بەسۆزەکەم، خواردنێکی زۆری ئامادەکردبوو، هەموو پێکەوە دانیشتین، نانمانخوارد، گەلێ ڕازوخولازمان کرد و کۆتایی بە هەموو شتێ هات.

## دووەمین خورپەی دڵ

ساڵی (1966)، ئەو کاتەی ماڵمان لە شارۆکەی (سەرچنار) بوو، تازە خوێندنی ساڵی نوێ دەستپێکردبوو، لە پۆلی سێی ناوەندیی بووم. هەموو ڕۆژێ لە (سەرچنار)ەوە، بە پاس دەهاتم و لەبەرمزگەوتی گەورە دادەبەزیم. بە جادەکەی گەرمکی (شێخان)دا هەڵدەگەڕام، بە دوای (کەریمی شێخ سەلام)دا دەچووم و پێکەوە دەڕۆیشتین بۆ قوتابخانە. هەموو ڕۆژێکیش لەبەرمزگەوتی گەورە و لە هەمان کاتدا، تووشی دوو کیژۆڵەی نەشمیلەی جوان دەبووم، بە پۆشاکی خوێندنەوە، بەرەوبەرتەرکی سەرا دەڕۆیشتن. هەر لە یەکەمین نیگاوە، یەکێکیان سەرنجی ڕاکێشام. ماوەیە ئەو بینینە دووبارەبووەوە، هەرچەندە کاتێ دەمبینی، دەشڵەژام و خۆم بە شتێکەوە خەریکدەکرد، دڵیشم لەسەر (120) لێیدەدا! بەڵام ئەو هەر دەتگوت، مێشیش میوانی نییە! لە ئەوە دەچوو، هەستی پێ نەکردبێ. زۆر هەوڵمدا، بزانم، ناوی چییە؟ کچی کێیە؟ ماڵیان لە کوێیە؟ لە کوێ دەخوێنێ؟ بەڵام کەڵکی نەبوو.

دوای ماوەیە، ئەو هاتوچۆیەش بە تەواوی نەما و چەری ئەندێشەم، بە یەکجاری لێ ونبوو. نەمدەزانی، چی بەسەرهاتووە؟! لە دڵی خۆمدا هەر لێکمدەدایەوە و دەمگوت: ڕەنگە وازی لە خوێندن هێنابێ! دوور نییە، لە ئەو گەڕەکە گواستبێتیانەوە! لە ئەوانەیە قوتابخانەکەی گۆڕیبێ! ئیدی چەندین شتی دیکەم لێکدەدایەوە و ئارامی لێ بڕیبووم.

سەیر ئەوەیە، هێشتا من سەری خۆمم پێوە دێشان، خەفەتمدەخوارد، هەر لێکمدەدایەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: ڕەنگە نەخۆشبێ، ئینجا نزای چاکبوونەوەم بۆ دەکرد. هەرچییشم دەکرد، ڕوخساری شیرینی لەبەرچاوم ون نەدەبوو، هەمیشە لە یاد و لەبەرچاوم بوو. تیفی تیژی خۆشەویستی ئەو، دڵی منی هەژاری، وەك ئاروو دەچنی. کەچی ئەویش ئاگای لە هیچ شتێ نەبوو، ئەوەی بیریشی لێ نەدەکردەوە، من بووم!

دوای ئەوەی، خوێندنی ناوەندییم تەواوکرد و لە ئامادەیی کشتوکاڵ وەرگیرام، بەیانیان زوو لە ماڵەوە دەردەچووم، بە جادەی (کانیسکان)دا، بەرەوباخی گشتی شۆڕدەبوومەوە،

لە ئەوێشەوە سواری پاسی (بەکرەجۆ) دەبووم. هەموو بەیانییەکیش بە بەرئەم دووکانەکەی (شێخەی هەلاج)دا تێپەڕدەبووم، کە لەسەر سووچی فولکەی ئاسکەکان بوو. بێ ئەوەی هەست بە هیچ شتێ بکەم.
بەیانییەکیان، لە تەنیشت دووکانەکەی (شێخە)وە، دەرگەیەك کرایەوە و دەرزێکی لێکەوت، یەك دوو کچی منالێ جوان هاتنەدەرەوە، یەکێکیش بە دەنگێکی بەرز هاواریکرد: ئاگاتان لە خۆتان بێ، تەماشای ئەم لا و ئەو لای جادەکە بکەن، ئینجا بپەڕنەوە. بێگومان، ئەو دەنگەم تەدەناسی و هەرگیز گوێشم لێی نەبووبوو، بەڵام دەنگێکی هێندە بە سۆز و خۆش بوو، دەتگوت، ئاوازی شمشاڵەکەی (قالەمەڕە)یە و هەزار ساڵە، بە گیانم ئاشنایە! هەروا بێ ئەوەی، هیچم لە دڵدابێ، ئاوڕمدایەوە، تا بزانم، خاوەنی ئەو دەنگە ناسکە خۆشە کێیە؟ سەیرمکرد، ئەوبوو، ئەو، دەنگی ئەو پەریزادەبوو، کە ماوەی ساڵێ پتربوو، دڵی فڕاندبووم، خەوی لە چاوان تەراندبووم، بیر و هۆشی تاساندبووم. سەیرێکمکرد و بە پەلە بە ڕێکەوتم. دوای دوو کیژەکە کەوتم و پێکەوە بەرەوخواربووینەوە. من هەر تەماشای ئەوانم دەکرد، ئەوانیش هەر سەیری یەکدیان دەکرد و پێدەکەنین. هەر دووکیان یەك لە یەکدی جوانتر و ڕووخۆشتر بوون. ئیدی ئەوان لایاندا و کۆڵانێ قووتیدان، منیش بە دەم بیر و ئەندێشەیەکی خۆشەوە، بە هیوایەکی گەش و نوێوە، بەرەو ئیسگەی پاسەکە هەنگاومنا و تێگەیشتم، لە گەڕەکی (شێخان) دەماون و ئێستە، لە ئەم ماڵەدا دەژین، لەبەرخۆمەوە دەمگوت: ئۆخەی خوایە، کە دۆزیمەوە، ئەم جارە نایەڵم، لێم وندبێتەوە!
ماڵەکەیان لە ماڵی ئێمەوە بەپێ، هەمووی پێنج خولەك دووربوو. ڕێی بەرماڵەکەیان رای لێهات، بۆ هەر شوێنێ بچوومایە، هەر لە ئەوێوە دەڕۆیشتم و لە هەر شوێنێکیشەوە بۆ ماڵەوە بگەڕامایەتەوە، هەر لە ئەوێوە دەهاتمەوە، تەنیا هەر بۆ ئەوەی، جارێ بە ڕێککەوت بیبینم! تا دوایی وام لێهات، ئەو کاتەی بەیانیان، دوو خوشکەکەی بۆ قوتابخانە بەڕێ دەکرد، هەموو ڕۆژێ لە ئەو کاتەدا، بەرەوخواردەبوومەوە، وەك کاتژمێری (سویسری)م لێهاتبوو، بە چرکە و خولەك دراندەمکەوتم!
بەڵام، هێندێ جار دەمبینی و هێندێ جاری دیکەش، وشکەساڵی بوو، بارانی بەسۆزی یەزدان نەدەباری و نەمدەبینی! ئەی خودایە! ئەمە گەر تامی دڵداری نەبێ، دەبێ چی دیکە وا لە مرۆ بکا، هێندە ڕێکوپێکبێ و دوانەکەوێ! بە ڕاستی، تامی دڵداری ڕاستەقینە، لە حەڵوا و گەزۆی کوردی شیرین و خۆشترە، (هەردی) هۆنەر گوتەنی، خۆشەویستی نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران!

ماڵی (ڕەزای بابەگوڕوڕن)ی هاوڕێم، لە ئەو ئاوەبوو، هێندە مێبازیش بوو، نەک هەر هەموو کچی گەڕەکی دەناسی، بەڵکوو کچەجوانە بەنێوبانگەکانی گەڕەکەکانی دیکەشی دەناسی! ڕۆژێ پێکەوە، لە ئەو ئاوە پیاسەماندەکرد، بەڕێککەوت دەرگەکرایەوە و مانگ لە گۆشەی دەرگەکەوە سەریدەرهێنا! من و (ڕەزا)ی بینی، سەیرماندەکرد، یەکسەر دەرگەکەی داخست. (ڕەزا)ش گوتی: ئەوە ئەو کچی گەوانە، بۆ وا بە توندی دەرگەکەی بەپیەکدادا و دایخست؟ منیش گوتم: لە ئەوە دەچێ، بیناسی؟ گوتی: ئەی چۆن، کچی وەستا (برایم)ە. ئیدی لێی چوومە پێشەوە و وردەوردە، هەموو زانیارییەکم لێ دەرهێنا. بەڵام کاتێ ئاوڕمدایەوە، لە پەنجەرە چکۆلانەکەی سەرجادەکەوە،* سەیری ئێمەی دەکرد، هەر پێی زانی، من دیومە، وەک شتێ شەرمگرتی، یەکسەر لاچوو و پەردەی دادایەوە. من دوایی تێگەیشتم، لەبەر من نەبوو، رایکرد و دەرگەکەی داخست، بەڵکوو لەبەر (ڕەزا) بوو، چونکە هاوڕێی دەزگیرانەکەی بوو!

پاش نیوەڕۆیەک بوو، لە (بەکرەجۆ) هاتمەوە، گەیشتمە بەر ماڵی ئەوان و (حەسەن)ی برام هاتەدەرەوە. بە ڕاستی دڵم داخورپا و وەک لە باتێ بەرمدەنەوە، وابوو! لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەم هەتیوە لە ئەم ماڵە چی دەکا؟! بە پەلە لێم پرسی: ئەوە ماڵی کێیە و لە ئەوێ چیت دەکرد؟ ئەویش هەمووی بۆ باسکردم و ئینجا تێگەیشتم، باوکی لە قوتابخانە دەریهێناوە، تا یارمەتی دایکی بدا و ماڵەکە بەڕێوەبەرێ.

ئەو کاتە (حەسەن)، نیمچەوەستایەکی کەلارسازی بوو، باوکی ئەویش وەستای خانوو درووستکردن بوو، هەر لە زووەوە یەکدیان دەناسی، هێندێ جاریش، پێکەوە کاریان دەکرد و هاتوچۆی ماڵیشیانی دەکرد. ئیدی زۆرم پێ خۆشبوو، کە بە ئەو شێوەیە شکایەوە و جۆرە ئاسیاوییەک، لە نێوانیدا هەیە.

دوای ماوەیە، بە تەواوی هەستم بە ئەوە کرد، ئەو کیژەی خەوی لە چاوانم فڕاندووە، خواردنی لێ حەرامکردووم، هەستیپێکردووە. چونکە، هاتوچۆکەی من بەبەرماڵی ئەواندا، لە ڕێککەوت و تام دەرچووبوو، بە شێوەیە هاتوچۆمدەکرد، چانسی ئەوەی نەدامێ، بە لاتی کەمەوە، ڕۆژێ جارێ بیبینم. ئیدی ئەویش خۆی نەدەشاردەوە. ئاخر، نەک هەر دڵی ئەو لە گۆشت بێ، بەڵکوو گەر لە بەردیش بووایە، بە ئەو هەموو هاتوچۆ و تەماشاکردنە، هەر نەرمدەبوو!

بۆیە هەر دوای ماوەیە بڕیارمدا، نامەیەکی بۆ بنووسم و ئەم خەمە گەورەیە یەکلایی کەمەوە؛ لە هەستی دڵ و دەروونی خاوێنی خۆم، ئاگاداریکەم. نامەیەکی زۆر جوانم بۆ

---

* تا ئێستەش (1- 8- 2018)، ئەو ماڵە کڵێتە کۆنە، بە چۆڵی هەر ماوە.

نووسی، پتر لە هەفتەیەك لە گیرفانمدا بوو، یا ڕێك نەدەكەوت: بیدەمێ؟ یا كە دەمبینی، ئەك هەر نەمدەوێرا، بیدەمێ، بەڵكوو وا دەشڵەژام، سەریشم هەڵنەدەبڕی! ئەی خوایە، ئەم ترس و لەرزەی بۆ چییە؟! ئەم هەموو شەرمە چییە، دوو خۆشەویست و ئەڤیندار، لە یەكدی دەكەن؟ ئاخر ئەوەیە، خۆشەویستی ڕاستەقینە، بۆیە وا بە سامە، ئەگینا گەر تەنیا هەر، دەستگەرمكردنەوە و ڕابواردن بێ، كێ شەرم لە ئەو جۆرە كچ و ژنانە دەكا؟!!

بیرمكردەوە، نامەكە بە (حەسەن)ی برامدا بنێرم. بۆ ئا، ئەو هاتوچۆیانەدەكا و لە منیش پتر چاوقایم و ڕووكراوەترە، هەر گوێ بە هیچ شتێ نادا و شەرمیش لە كەس ناكا. هەرچی چۆنێبوو، بە (حەسەن)م گوت، ئەویش یەكسەر گوتی: باشە. ڕۆژی دوایی، نامەی برد و چاوم لێ بوو، چوورەژوورەوە. منیش لە سوچێكدا چاودێری ماڵەكەیانم دەكرد. پاش ماوەیە هاتەدەرەوە و دوایكەوتم. گوتم: چیت كرد؟ گوتی: برۆ، لە ئەم ئاوە مەرەستە، كچەكە تووڕەبووە و گوتوویەتی: ئەمە بۆیە هەراسانیكردووین، هەرچەندە سەر دەردێنم، وەك مووی لووت، لەبەردەممدا قووتدەبێتەوە. ئەویش نامەكەی بۆ دانابوو، یەكسەر هاتبوودەرەوە.

بۆ سبەی بەیانی، وەك هیچ ڕووی نەدابێ و وەك هەموو ڕۆژێكی دیكە، بە ئەوێدا ڕۆیشتم و بەرەوخواربوومەوە، بەڵام ئەم بەیانییە، دەرگەكە بە تەواوی جووتكرابوو، هەراشی پێدا نەدەچوو! تا دووریشكەوتمەوە، جارجار هەر ئاوڕمدەدایەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: بەڵكوو بەزەیی پێمدا بێتەوە و پیرەدەرگە بكاتەوە، پێش ئەوەی برۆم، بیبینم. بەڵام، هەستی سۆز و بەزەیی ئەو نەتلیسایەوە، پیرەدەرگەش هەر نەكرایەوە، نەكرایەوە و نەكرایەوە!

ماوەیە بە ئەو شێوەیە ڕۆیبوو، دوای چەن ڕۆژێ، تكام لە (حەسەن) كرد، هەواڵێكم بۆ بزانێ. ئەویش وای لێهاتبوو، نەیدەوێرا، هاتوچۆیانیكا. هەرچی چۆنێبوو، قایلمكرد و چوو. مێندەم زانی، بەپەلەپڕووزێ هاتەدەرەوە و گوتی: لەبیر خۆتی بەرەوە. گوتم: بۆ؟ گوتی: هەر ئەو ڕۆژە، نامەكەی پیشانی دایك و باوكی داوە، بەزمێكیان پێكردووم، با بە دەواری ئەوی نەكردووە، هەر بە پەلە خۆم ڕزگاركرد. منیش كە ئەوەم بیست، بە جارێ وەك كۆتری باڵشكاوم لێهات، تەمێكی ڕەشی نائومێدی، سەراپای بیر و هۆشمی داگیركرد، ئیدی بڕیارمدا، پلانەكەم بگۆڕم، ماوەیە بە ئەو ئاوەدا نەڕۆم، تا تۆوی خۆشەویستی من، لە ئینجانەی دڵە سركەكەیدا دەڕوێ. بۆیە بڕایەوە، بە ئەو ئاوەشدا نەدەڕۆیشتم.

بە ڕاستی زۆر كاریتێكردم، لە ئەوەش دەترسام، باوكی بانگمكا، یا بە باوكم بڵێ، چونكە یەكدیان دەناسی و جۆرە ئێكەڵاوییەك، لە نێوان هەردوو خێزانەكەدا هەبوو. جگە لە

ئەوەی، سێ مامیشی هەبوو، دووانیان زۆر برادەرم بوون. سەرتا ویستم، لەبیر خۆمی بەرمەوە، بەڵام هەرچیەکم کرد، نەمتوانی و بیرم نەدەچووەوە. هەمیشە ڕوخساری شیرینی لەبەرچاوم بوو. پاشان بڕیارمدا، هێندە بیری لێ نەکەمەوە و تازە قسەی خۆم کردووە، وا باشترە، بەرەوڕووی چارەنووس و ڕووداوەکانی ڕۆژگاری بکەمەوە! لە ئەو ماوەیەدا، هێندێ جار بە ڕێککەوت دەمبینی، بەڵام نەمدەهێشت، ئەو من ببینێ!

ئیدی کاتێ مامە (ساڵح)، هات بە دوامدا بۆ (بەکرەجۆ) و پێی گوتم: ماڵی کابراش بوون بە دراوسێتان، هەموو ئەو چیرۆکە ڕۆمانسییەی خۆمم بیرکەوتەوە و زۆر هانیدام، بۆ ماڵەوە بگەڕێمەوە.

ماڵی مامە (عومەر)م، بەرانبەر ماڵی ئێمە بوو. ماڵی ئەوانیش لە ئەو دیو ماڵی مامەمەوە بوو، دیوارێکیان لە نێواندا بوو، چونکە دوو خانووبوو، هی یەک کەسبوون، وەک یەک دروستکرابوون و دەرگایەکیشیان لە نێواندا بوو. پێپلیکانە و سەربانەکەی ئەوان، لە ماڵی ئێمە بەرزتربوو، بەسەر ماڵی ئێمەدا دەیڕوانی. نازانم، چۆنی زانیبوو، من گەڕاومەتەوە، هەر ئەو ڕۆژەی گەڕامەوە، بینیم، لەسەر پێپلیکانەکانەوە تەماشای ماڵی ئێمەی دەکرد. لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا پلانەکەم سەریگرتووە، من پشکوێنەخست و ئێستە ئەو بە دوامدا وێڵە، لە ئەوەدەچێ، نامەکەم لە دووشتە بەهێزتربووبێ و کاری خۆی کردبێ، بۆیە وا سەرەتاتکێ دەکا!

لە (شەونم)ی خوشکم پرسی، خانووەکەی ئەو دیو ماڵی مامم، کێ گرتوویەتی؟ ئەویش گوتی: ماڵی وەستا (برایم)، ناسیاوی مامم و بارکەمە. گوتم: کەی هاتوون؟ گوتی: هەموری دوو هەفتە دەبێ. گوتم: تۆ دەیانناسی؟ گوتی: بەڵێ. هەموو ڕۆژێ، لە نێو دەرگەکەی نێوان ماڵی مامم و ئەواندا دادەنیشین، لەگەڵ دایکی و کچەکانیدا پێکەوە دەدوێین و گوتیشی: ڕۆژێ هەواڵی تۆی پرسیوە و گوتوویەتی: ئەی برا گەورەکەتان لە کوێیە؟!
ئیدی من لە ئەوە دڵنیابووم، کە تۆوی خۆشەویستی من، لە نێو خاکی بەپیتی کێڵگەی دڵیدا چەکەرەیکردووە، دەبێ، پتر هەوڵبدەم، زوو گەشەبکا، تا گوڵی ئەڤینی ڕەنگینی ڕاستەقینە بگرێ و بەری هەبێ!

خولی هاوینە تەواربوو، بەشی نێوخۆیی قوتابیانی (بەکرەجۆ)م بەجێهێشت، بە یەکجاری گەڕامەوە، لە ماڵی خۆمان، ژوورەکەی بەرانبەر سەربانەکەی ئەوانم کرد بە سەنگەر و خۆمم تێدا حەشاردا، قەرەوڵم لە پێپلیکانەکانیان گرتەوە، هەر بە مەو دەرکەوتایە، لە دەمم دەرنەدەچوو، بەر ڕێژنەی تەماشاکردنم دەدا! ئەویش، هەر زوو هەستییێکرد، کە

من لە ئەو ژوورەدا دەژیم و تەماشایدەکەم، بۆیە هەر دەرکەوتایە، یەکسەر تەماشای ژوورەکەی منی دەکرد و چاوی بۆ دەگێڕام. منیش وەک چاوشارکێی لەگەڵ بکەم، لە پەنا پایەکەدا خۆم دەشاردەوە، بە کامی دڵی خۆم تەماشامدەکرد و هێندەی دیکە، وێنەی ڕوخساری مانگی ڕووی، لە ئاوێنەی دڵ و دەروونمدا دەدرەوشایەوە. هەموو جارێ کەمێ دەوەستا، کە منی نەدەبینی، نائومێدەبوو، وای دەزانی، لە ماڵ نیم و دەڕۆی. ڕۆژێ زانیبووی، من لە ماڵەوەم، چاوم لێبوو، لەسەر پێپلیکانەکان وەستابوو. بەڵام من هەر خۆم دەرنەخست. دوایی وتبوو. من وامزانی، ڕۆیشتووە، لەبەرئەوە چوومە هەیوانەکە، لە پڕ بەرزبووەوە، تەماشایەکیکردم و پێکەنی، وەک ئەوەی بڵێ: ئاوا دەتگرم و لە ئەو سەنگەرە دەرتدەپەڕێنم! وتوومەس نەڕۆیبوو، بەڵکوو لەسەر پێپلیکەکان دانیشتبوو، چاوەڕێی منی کردبووە، ئەو چاوی لە من بووە و من نەمدیوە، هەر کە دەرکەوتووم، یەکسەر بۆم هەستاوە!

ئیدی، لە دوای ئەو ڕۆژەوە بڕیارمدا، خۆمی لێ نەشارمەوە. چونکە یەکەمین قۆناغی پلانەکەم سەریگرت و بە سەرکەوتوویی تەواوبوو. لەبەرئەوە دەبێ دووەمین پلان دەسپێبکەم. بۆیە بڕیارمدا، لەبری ئەوەی لە ژوورەکەمەوە، بە دزییەوە تەماشایکەم، لە هەیوانەکە دانیشم و بە ئاشکرا تەماشایکەم، بزانم، ئەم جارەیان چی دەکا؟! ئەوەبوو، سەرەتا کەمێ شەرمیدەکرد، سووکە چاوێکی دەگێڕا، خۆی وا پیشاندەدا، وەک تەماشای هەر شوێنێکی دیکە بکا، هەر ئاواش تەماشای ماڵی ئێمە دەکا! منیش باش لە فێڵەکەی ئەو تێگەیشتبووم، چونکە دەمزانی، (یەکەم هەنگاو هی کوڕبووە و نازی کچی هەڵگرتووە!) ئینجا هەر دەرکەوتایە، زۆر بە کوڵوودڵەوە سەیرمدەکرد و چاوم لێ نەدەترووکاند. ئەویش ئەوەی پێخۆشبوو، بە پێکەنین وەڵامیدەدامەوە. بەڵێ، وای لێهات، پتر دەردەکەوت و لەسەر پێپلیکەکان دەوەستا، ئینجا واش دەیبڕوانی، تا تێبگەم، ئەم جۆرە تەماشاکردنە، لەگەڵ تەماشاکردنە ئاساییە دەسکردەکانی پێشوودا جیاوازە. چونکە زۆربەی کات، بە ڕوویەکی خۆش و دەم بە پێکەنینەوە، تەماشای یەکدیمان دەکرد. پاشان ڕۆژگار هات و ڕۆی، ڕۆژبەڕۆژ تا دەهات، کۆرپەی ساوای خۆشەویستییە کەم و لاڵەکەمان، پتر ڕەگی قووڵی خۆی، لە نێو دڵماندا دادەکوتا. لەبەرئەوە زۆر پێویستبوو، سێیەمین هەنگاوبنێم، بیدوێنم و جارێکی دیکەش، هەموو شتێکی بە ڕووشی و ڕاشکاوی پێ بڵێم.

بۆیە نامەیەکی دیکەی جوانی، پڕ لە هەستی ناسکی خۆشەویستی ڕاستەقینەم بۆ نووسی، داوام لە ئامۆژنم کرد، بیداتێ. چونکە ماڵی ئێمە و مامم، ئاگایان لە هەموو شتێ

بوو. نامەکەی لێ وەرگرتبوو، دوای ماوەیەکیش، بە پۆستی خێرا و بە پۆستەبەری نامۆژنەدا، وەڵامێکی زۆر دڵخۆشکەرانەی دامەوە. ئیدی هەر نامەبوو، لە نێوانماندا دەڕۆی و دەهات، بەڵام هێشتا، لە نامە و تەماشاکردن پتر، هیچی دیکەمان لە نێواندا نەبوو، تەنانەت یەک وشەشمان، بە دەمی نەگۆڕیبووەوە!

پێوەندییەکە تا دەهات، ڕۆژبەڕۆژ ڕادیەدەسەند و گڕیدەگرت. هاتوچۆ لە نێوان هەردوو خێزانەکەدا پەیدابوو، ئەوان دەهاتن و ئێمەش دەچووینەوە، بەڵام لە تەماشاکردن زیاتر، ڕوومان نەدەهات، قسە لەگەڵ یەکدی بکەین، مەگە هەر خۆشهاتنمان لە یەکدی بکردایە.

شەوێکیان لە ماڵی خۆمان دانیشتبووین، لەگەڵ باوکی کۆنکەنمان دەکرد، لە پڕ (شێخ کاوە) هات، یارییەکەمان بوو بە سێ قۆڵی. بڕیاربوو، لەسەر داوەتێ بێ، بەڵام (شێخ) دۆڕانی و خۆی لێ گێلکرد! هەموو جارێ وەستا (براییم)یش دەیگوت: ئەرێ (شێخ کاوە)، کەی داوەتەکەمان بۆ دەکا؟ منیش دەمگوت: گەر بە تەمای ئەو بی، بێ شێو سەردەنێینەوە!

ماوەیەکی زۆر بە ئەو شێوەیە، پێوەندییمان بەردەوامبوو، بێ ئەوەی ڕۆژێ لە یەکدی زوویربین. من دەمزانی، ئەو چارەڕێی ئەوە دەکا، داوایکەم، چونکە جگە لە ئەوەی، کچی ماڵبوو، تۆبەرەی دایە و بابە بوو، پێنج خوشک و سێ براشی هەبوو، خۆ هەر دەبووایە، خوشکی گەورە شوویکا، ئینجا ئەوانی دیکە شوویکەن. هەروەها، هەموو کچێکیش حەزدەکا، لەگەڵ خۆشەویستەکەی خۆیدا، خێزانێکی بەختیار پێکەوەنێ؟ ئیدی تا کەی چاوەڕێبکا؟ ئەی ئەنجامی ئەم خۆشەویستی و نامەگۆڕینەوەیە چییە و تا کەی بەردەوام دەبی؟!!

من ئەم ڕاستییانەم باش دەزانی: هەموو ئاواتیشم ئەوەبوو، بیخوازم و خێزانێکی چکۆلانەی پڕ لە خۆشی و خۆشەویستی پێکەوەنێین، چونکە بە ڕاستی خۆشم دەویست، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوەشم زۆر باش دەزانی، چۆن داوایکەم و بە چی بژین؟! چونکە ئەو کاتە تەمەنم (19) ساڵانبوو، هێشتا ئامادەیی کشتوکاڵیشم تەواو نەکردبوو. ئیدی چۆن داوامکردایە؟! بە چی ماڵمان پێکەوەنایە و بژیاینایە؟!!

لەبەرئەوە تێدامابووم و نەمدەتوانی، بڕیاربدەم. هەرچەندە ڕاوێژم بە مامە (ساڵح)م دەکرد، ئەویش وەڵامێکی بنەبڕی و چارەسەرێکی تەواوی پێ نەبوو، هەر دەیگوت: پەلەمەکە، جارێ خوێندنەکەت تەواوکە، ئینجا بڕیاربدە، وەڵامی بۆ بنێرە، با چاوەڕێ بکا. منیش دەمگوت: وەڵامی چی بۆ بنێرم؟! خۆ ئەو داوای لێ نەکردووم، داوایکەم، بەڵام خۆم هەستدەکەم، ئەو ئەوەی دەوێ و لە ئەوە پتر ناتوانێ، پاشەڕۆژ و چارەنووسی خۆی، لەسەر لەپی دێوی ڕۆژگار دانێ و خۆی بە خۆشەویستی منەوە ببەستێتەوە، چونکە کاروانی تەمەن دەڕوا و ژیانیش هێندە درێژ نییە، تا فریای هەموو شتێ بکەوین و ئاواتەکانمان بەدیبێنین!

ئیدی وامان لێهاتبوو، خەریکبوو، بە تەواوی بێزارەبووین و پێوەندییەکەی نێوانمان سارددەبووەوە، دەنگدرەنگ نامەمان بۆ یەکدی دەنارد، چونکە هیچ شتێ نەمابوو، باسی بکەین، بەڵام هێشتا من نائومێد نەبووم.

کەچی لە پڕ شتێ ڕوویدا، خراپ لە من تێگەیشتن، ناکۆکی و ڕووبەڕووبوونی لێکەوتەوە، ناخۆشی لە نێوانماندا دروستبوو. لەبەرئەوە لەگەڵ (ژیان)دا، ماوەیە لە یەکدی زویربووین، پێوەندی نێوانمان بە تەواوی پچڕا، نامەشمان بۆ یەکدی نەدەنووسی. چونکە کەسێکی گێرەشێوێن و ئاژاوەچی، نامەیەکی هەڵدابووە ماڵەکەیانەوە، هەڕەشەی لێ کردبوون، گوایە گەر خراپەکاری بکەن، ئەوا لە ئەم گەڕەکە دەرتانئەکەین. باوکیشی هێندە ساویلکە بوو، وایدەزانی، ئەو نامەیە من نووسیوومە و بەرەڕوو پێی گوتم: ناوی تۆ لە نێو ئاوان دایە و خەڵکی قسەدەکەن، جامیش بشکێ، ئەوە بزرینگێتەوە! ئیدی هێندەی دیکە نێوانمان تێکچوو. تەنانەت ماڵی هەردوولاشمان قسەیانپڕی، دەرگەی هاتوچۆیان بە ڕووی یەکدیدا داخست و هیچ پێوەندییەکیان نەما. باوکی بە براکانیشی گوتبوو، منیش لەگەڵ هەردوو براکەی (ئەحمەد) و (موحەممەد)دا تێکچووم، چونکە باوەڕیان پێ نەدەکردم و وایان دەزانی، ئەو نامەیە من نووسیومە! بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت، ئەو نامەیە دروستکرا بوو، لە ملی منیانەوە ئاڵاندبوو، بۆئەوەی بڵێم: باشە، با قسەی خەڵک بڕین، من داوای دەکەم. چونکە بە (حەسەن)ی برامیان گوتبوو، ئەو کچەی بەتەماکردەووە و ئێستەش نامەمان بۆ هەڵدەدا. ئەویش چووبوو، بۆ باپیرمی گێڕابووەوە، گوایە من دەمی کچەکەم بڕیوە و لە نێو خەڵکدا ئابڕوویچووە! *

ڕۆژێکی زووی سەرلەبەیانی بوو، (حەسەن) هات و گوتی: باپیرم داواتدەکا و دەڵێ: با بێ، کەمێ ئیشم پێی هەیە. گوتم: چییە؟ درۆیکرد و گوتی: نازانم. کە چووم، مامە (عومەر)یشم دانیشتبوو. بابەگەورە گوتی: تۆ چیت لەگەڵ کچی وەستا (برایم)دا هەیە؟ ئینجا بە تەواوی تێگەیشتم، ئەم پیلانە کێ دایناوە و چۆن دارێژراوە؟! سوێندم بۆ خوارد و گوتم: هیچ شتێکم نییە و ئاگام لە ئەو نامەیەش نییە. گوتی: دەڵێن، کەتنتکردووە! گوتم: بە ئەو خوایەی تۆ دەیپەرستی، ئەوە هەر دەستم بەردەستی نەکەوتووە، بەڵکوو لە ژیانمدا، قسەشم لەگەڵ نەکردووە. گوتی: کوڕم، گەر شتێ هەیە، با بۆت داواکەم، ئابڕووی خەڵک گاڵتە نییە و گوناهە. گوتم: هیچ شتێ نییە و ناشمەوێ داوایکەم. ئینجا (حەسەن) هەڵیدایە و گوتی: ئەی ئەوان درۆدەکەن؟ گوتم: با بێنە بەرەوڕوو، ئەو قسانە بە خۆم بڵێن.

---

* هەر لە یەکەمین نامەوە، ناوی خۆمان نەدەنووسی، من (ژیان)م بۆ دانا، ئەویش (ئاوات)ی بۆ دانام.

ئیدی باپیرم باوەڕی پێ کردم و کۆتایی بە ئەو باسە هات. پێوەندی ئێمەی دڵداریش، لە تونێلێکی داخراوی تاریکدا مایەوە! بەڵام جاروبار هەر دەهاتە سەریان و لە دوورەوە، بە تێکاکانی گللەی دەکرد، وەک ئەوەی من ئاگام لە هەموو شتێ بێ و تاوانبارییم، یا خەتای من بێ!

لە ڕاستیدا، زۆرم پێ ناخۆشبوو، نەمدەزانی، چی بکەم و چۆن بڕوام پێ بکەن، ئەو کارە من نەمکردووە. چۆن ئەو پیلانە پوچەڵکەمەوە و تاوانباری ڕاستەقینە بدۆزمەوە. تا (ژیان) خۆی دەستپێشخەریکرد، بە دەزگیرانەکەی (ڕەزا)ی هاوڕێمدا، وەڵامی بۆ ناردم و گوتبووی: ئەگەر وەک جاران لەسەر پەیمان و خۆشەویستییەکەی خۆی ماوە، دەتوانین، پێکبێینەوە و ئاشتببینەوە. منیش ئەو پێشنیازەم زۆر پێ خۆشبوو، یەکسەر قایلبووم.

ڕۆژێ لە ماڵی پوری لە گەڕەکی (تووی مەلیک) یەکدیمانبینی، ئەوە یەکەمین و دوایەمین جاربوو، لە نزیکەوە بیبینم، پێکەوە دانیشین و بدوێین. هەموو گرفتەکانمان باسکرد و بڕیارماندا، سەرەتا هەوڵبدەین، ماڵەوەمان ئاشتکەینەوە و پاشان، کە خوێندنم تەواو کرد، هەنگاوی نوێ بنێین. ئیدی من وامزانی، سەرلەنوێ لەدایکبوومەتەوە و هەموو دونیا هی خۆمە، چونکە زۆرم خۆشدەویست! باشبوو، وردەوردە هەموو لایە ئاشتبوونەوە، وەک جاران هاتوچۆ دەستپێکرایەوە و دەرگەی بەهەشتی خۆشەویستی، بە ڕووەمدا کرایەوە!

**دووەمین (حەج)**

باوکم، موسوڵمانێتییەکەی زۆر بە توندی گرتبوو، دڵی لە ئەو (حەجە)ی پێشووی، کرمێ بووبوو، دەیگوت: لەسەر حسابی خۆم نەچووم، دەبێ جارێکی دیکە بچمەوە. ئەوە بوو، ساڵی (1968) لەگەڵ خوالێخۆشبووان (حاجی مەلاشەریفی سەعاتچی، حاجی موحەممەدە پچکۆلە و شێخ حوسێن)ی مامی دایکم، چوون بۆ (حەج). ئێمەش کۆمەڵێ بووین، تا (بەغدا) ڕەوانەمانکردن.

ئەو کاتە منیش تووێژەدەکرد و لە گەرمەی خواپەرستییەکی خەستوخۆڵدا بووم. لەگەڵ باوکم و ئەواندا، سەرمان لە پیاوچاکەکانی (بەغدا) دەدا. ڕۆژێ سەرمان لە (شێخ جونێدی بەغدادی) دا، ڕێگەکەی زۆر دووربوو، مامە (شێخ حوسێن)، بە تەواوی ماندووبووبوو، هەر بۆڵەیدەهات و گوتی: تو خوا ئەم کابرایە، بۆ لێرە خۆی مراندووە، ئەو هەموو شوێنە لە نێوشاردا هەبوو، ئاخر بڵێ: وەک (شێخ عەبدولقادری گەیلانی)، بۆ لە پەنایەکدا لێی نەکەوتی، ئەم خەڵکە تووشی ئەرک و ئازار نەکەی! بە خوا ئەمە دوا جارە، سەرت لێ دەدەم. ئێمەش لەبەر پێکەنین، خۆمان بۆ نەدەگیرا و گوتمان: هێشتا لە ئەو لاشەوە،

شێخێکی دیکە ماوە، پێمانوایە، سەرێکی ئەویش بدەین. ئەویش تووڕەبوو، گوتی: کەیفی خۆیەتی، من بۆ (حەج) هاتووم، گەر ئێوە نەبوونایە، سەری کەسم نەدەدا، هیچ ئیشێکیشم بە ئەم هەموو پیر و پەککەوتانە نییە، هەر یەکێ لە شوێنێ لاتوپالێ لێی کەوتووە!

## هەڵمەتی مەلاریا

پۆلی دووشمان تەواوکرد، پشووی هاوین دەستیپێکرد. ئەو ساڵە (1969)، لەگەڵ (برایمی حەمەعەلی)، لە فەرمانگەی مەلاریا بە چاودێر دامەزراین. من بۆ بەری (قەراخ) و ئەویش بۆ ناوچەی (سورداش) دانراین. بە ڕاستی یەکەمین جارمبوو، سەر لە (قەراخ) و (قۆپی) بدەم، گوندەکانی (تیمار، گەڕەزێل، دەریانی سەروو و خواروو، جافەران، دیلێژە ...) ببینم. گەشتێکی زۆر خۆشبوو، ڕۆژانە هێندە بەپێ دەڕۆیشتین، زۆر ماندووەبووین، بەڵام کاتێ لە کارکردن دەبووینەوە، ئێواران لە ماڵان دادەمەزراین و نانمانەدەخوارد، چا لەسەر چا بۆیان تێدەکردین و گفتوگۆمان لەگەڵ خاوەن ماڵەکاندا دەکرد، ئیدی بە تەواوی، ماندووبوونەکەم بیردەچووەوە و جەستەم دەحەوایەوە، زۆر چێژم لە ئەو گەشتە بینی، گەلێ شوێنی جوان گەڕام و گەلێ شتیش فێربووم!

ئەو ساڵە، تازە سوپای (عێراق) و چەکدارەکانی جەلالی، بەری (قەراخ)یان لە شۆڕش سەندبوووەوە، سەربازە عەرەبەکان، ڕێگەی تایبەتی خۆیان، لەسەر ڕێگەکان دانابوو، ڕایاندەگرتین و داوای ناسنامەیان لێ دەکردین، دیمەنێکی زۆر ناشیرین و کارێکی زۆر دزێو بوو، وەرە لە وڵات و شاری خۆتدا بی، دوژمنی داگیرکەر، داوای ناسنامەت لێ بکا! ئاخر لە نێوشارەکان خواخوامانبوو، لە دەس سەرباز و پۆلیسی مەی ڕزگارمانبێ، کەچی لە گوندەکانیش، وەک شەڵی شەو بەرۆکیان دەگرتین!

بەڵام هەرچی چۆنێبوو، ماوەیە لەگەڵ گوندنشینەکاندا، کاتێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد، چاومان بە دیمەنە ڕەنگینە دڵفرێنەکانی بەشێکی نیشتمانەکەمان گەشایەوە. لەوای ئەوەی لێشبووینەوە، پارەیەکی موفتی باشمان وەرگرت، بۆ ئەو ڕۆژەی ئێمە زۆربوو، کەلێنێکمان پێ دەگرت!

## دووەمین کۆدەتای (بەعس)

ڕۆژی (17. 7. 1968) دەنگیلاویبوووەوە، گوایە لە (بەغدا) کۆدەتابووە، جارێکی دیکەش (بەعس) گەڕایەوە، بۆ خۆڕاییەکردن و لەخشتەبردنی کوردیش، بۆ ماوەیەکی کاتی،

جەنگ لە (کوردستان) وەستا. ئێمە هەموو هیوامان وابوو، میری و (بارزانی) ڕێککەون، ئیدی شەڕنامێنێ و جەلالییەکانیش چەکدەکرێن. کەچی هەر زوو جەلالییەکان بلاًویان کردەوە، کە پێوەندییان لەگەڵ دەستەی کۆدەتاچییەکان باشە و مەترسی بۆ ئەوان نییە!

ئەوی ڕاستیبێ، سەرەتا بەعسییەکان، هێندێ داواکارییان بۆ دەستەی جەلالییەکان جێبەجێکرد. بۆ نموونە: زانکۆی (سولەیمانی) دامەزرا، تێلیڤیزیۆنی (کەرکووک) کرایەوە و ڕۆژانە ماوەیە، هێندێ بەرنامەی بە کوردی بلاًوبەکردەوە، دانیان بە جێژنی (نەورۆز)دا نا و وەک جێژنێکی نەتەوەیی کورد ناسرا. ساڵی (1968–1969)ش، لە هەموو ئامادەیی، پەیمانگە، زانکۆکانی (کوردستان) و (عێراق)یش، ڕۆژی (17. 11. 1969)، هەڵبژاردنی قوتابیان کرا. لە ئامادەیی کشتوکاڵیش، (ی. ق. ك.)ی جەلالییەکان، خۆیان بۆ ئەو هەڵبژاردنە ئامادەکرد. سەیر ئەوەبوو، تەنیا هەر یەك لیستیش دابەزی، ئەویش لیستی خۆیان بوو!

ئەو ڕۆژە برادەرانی خۆمان بڕیارماندا، خۆمان بدزینەوە و دەوام نەکەین. لەبەرئەوە سەرێکمان لە زانکۆ دا و بۆ یەکەمین جاریشبوو، زانکۆ ببینم، تا بزانین، هەڵبژاردن لە ئەوێ چۆن دەکرێ. لە ئەوێش هەر ئاهەنگی هەڵبژاردن بوو، قوتابیانی (بەعس) و جەلالی دەرچوون. (حەمەجەزا)ی گۆرانیبێژیان هێنابوو، گۆرانی دەگوت، خوێندکارە کوڕ و کچەکانی سەر بە خۆشیان هەڵدەپەڕین. دوکتۆر (کەمال خۆشناو)یش گوتارێکی بە ناوی زانکۆوە خوێندەوە و پیرۆزبایی لە دەرچووان کرد.



لە ڕاستەوە: حەمەعەلی، خۆم، سیروان شەریف، ئەنوەر عەنبەر و ڕەوانشاد کەمالی ئەحمەدی مەحموود بەگی چەراخ. ڕۆژی (17. 11. 1969) لە زانکۆ گیراوە.

بە ڕاستی، زانکۆم زۆر لا خۆشبوو، خۆزگەم دەخواست، ڕۆژێ بێ، منیش وەك ئەو هەموو خوێندکارە کوردانە، لە زانکۆ بخوێنم، کەچی نەمدەزانی، ئەو ڕۆژە وا نزیکە و بە ئامانجی دڵی خۆم دەگەم!

هێندێ جار لە زانکۆ، گرفت لە نێوان خوێندکارە جەلالی و مەلاییەکاندا ڕوویدەدا و بەیەکیاندا دەدا. لە ئەوە دەچوو، لە کۆتایی ساڵی (1969)دا، چالاکی خوێندکاراتی شۆڕش دەسپێکردبێتەوە، بۆیە جەلالییەکان زۆر بە وردی، چاویان بۆ دەگێڕان و بە دوای ڕێکخستنەکانیاندا ویڵبوون!

هەر ئەو ساڵەشبوو، لە یاریگەی (سولەیمانی)، گەورەترین یادی جێژنی (نەورۆز)یان کردەوە و جەماوەرێکی زۆریش، بەشدارییان تێدا کرد، دەیانویست، بە ئەو ئاهەنگە، وا لە دانیشتووانی شار و دەسەڵاتیش بگەیەنن، کە زۆربەی خەڵکی شارەکە لەگەڵ ئەوان دان. ئێمە دیسانەوە بەشدارییمان نەکرد، کەسیش نەیدەزانی، ئەوە دوا جێژنی (نەورۆز)یان دەبێ و (نەورۆز)ی داهاتوو، خۆمان لە هەموو (کوردستان) دەیکەینەوە!

یەکەمین گەشتی (سیتەك)

(شێخ کاوە)، چەن جارێ داوەتیکردم، سەرێ لە (سیتەك) بدەم، بەڵام هەر ڕێك نەدەکەوت. ڕۆژێکیان تووشی (عەلی حەمەپیلووت) بووم، گوتی: پاشنیوەڕۆ دەچم بۆ (سیتەك)، بۆ نایەی پێکەوە بچین، (شێخ کاوە)ش دەبینین. منیش دوو ڕۆژ پشووم هەبوو، بە باشم زانی، ئەو هەلە لە کیس خۆم نەدەم.

ئەوەبوو، دوای نیوەڕۆ سواری گەلابەکەی کاکە (عەلی) بووین، بەڵام گەلابەی چی؟! دەرگە و جامی پێشەوەی پێوە نەبوو، کاتێ بەڕێکەوتین و بە چیای (ئەزمڕ)دا سەرکەوت، وات دەزانی، لە یەکێ لە لووتکە بەرزەکانی چیای هاوینەهەوارەکان دانیشتووی، هەوایەکی هێندە سازگار و فێنك و خۆشی هەبوو!

(عەلی)، ئەمنەکەیە سەمۆڵاوی لەگەڵ خۆی هێنابوو، هێندێ میوە و قاپێ عەرەقی زەحلەشی تێ کردبوو، سارد‌سارد‌ببوو‌بوون. لە سەر کانییەکەی (ئەزمڕ) لاماندا و گوتی: هێشتا زووە، با سەروو پێك بخۆینەوە. کەمێ دانیشتین، کاتێکمان زانی، نیوەی قاپەکەمان زیاتر خواردووەتەوە، ئیدی هەستاین و بەڕێکەوتین. کاتێ گەیشتینە (سیتەك)، تاریکیگردبوو.

دوای ئەوەی چوویینەژوورەوە ، هەواڵی (شێخ کاوە)مان پرسی، گوتیان: لە ڕاوە و دوو ڕۆژە ڕۆیشتووە، بەیانی دێتەوە. ئێوارە دوای نانخواردن، (شێخ لەتیف) هات و لەسەر

دۆشەكێ لە حەوشە دانیشت، بە پیاوێكی گوت: ئەمڕۆ كەس لە شارەوە هاتووە؟ گوتی: كاك (عەلی) و كوڕەكەی (حاجی شێخ موحەممەد)ی خۆمان هاتوون. گوتی: بابێن. ئێمەش چووین و دەستیمان ماچكرد. منی لە تەنیشت خۆیەوە دانا، منیش خواخوام بوو، لێی دووركەومەوە، چونكە بۆنی عەرەقم لێدەهات، هەرچەندە هەر یەكسەر هەستیپێكرد، بەڵام هیچ قسەی نەكرد. پاشان هەواڵی ماڵەوە و شار و جەلالییەكانی لێ پرسیم.
(شێخ) پیاوێكی زۆر ڕووخۆش، قسەخۆش و دڵپاك بوو، حەزی زۆر لە گاڵتەوگەپ دەكرد، لەگەڵ هەموو كەسێكدا، وەك هاوڕێ رابوو، كەم پیاوی وا گەورەم دیوە، هێندە بێفێز، ساكار و ئاسایی بێ، بایەخی بە ماڵی دونیا نەدەدا و هێندە بە گرنگی نەگرتبوو، لە ئاستی لێقەوماواندا ماڵی نەبوو، ماڵەكەی هەمیشە جمەیدەهات، هەموو جۆرە خەڵكێ لە دیوەخانەكەیدا دەحەوانەوە، كوردی ئەم دیو و ئەو دیوی لێ بوو، توركمان و عەرەبی لە دەوربوو، پارتی و كۆمۆنیست، سەربازی هەڵاتوو و دەوڵەمەندار، لە پەنا (شێخ)دا جێیان دەبووەوە، خەڵكەكەش خۆشیاندەویست، بەڵام هەمیشە، گیرفانی بەتاڵ و نەمكیشی كەمێ سوێربوو!
بەیانی (شێخ كاوە) هاتەوە، یەكدیمان ماچكرد و یەكسەر گوتی: ئەم هاوینە نایەڵم، بڕۆیتەوە، فێری ڕاو و سواریت دەكەم. منیش گوتم: دوو ڕۆژی دیكە دەبێ بگەڕێمەوە و بڕۆم بۆ بەری (قەرەداغ). گوتی: بۆ؟ گوتم: لە مەلاریا كاردەكەم. ئەو دوو ڕۆژەی پێكەوە بووین، لە ئەو نێوەدا، لە نێو ئەو داروبەرەخت و سەرئاوەدا، كاتێكی زۆر خۆشمان ڕابووارد، دوایی گەڕامەوە. ئیدی ولم لێهاتبوو، دڵم بۆ (سیتەك) لێیدەدا!
ئەوە یەكەمین جاربوو، (سیتەك) ببینم. ماڵی (شێخ) خانوویەكی گەورەبوو، هەر چوارلای بە حەوشێكی گەورە دەورەدرابوو، كارەبای تێدابوو، ئاویان لە كانییەكەوە، بە بۆڕی ڕاكێشابوو، هەر دەتگوت، لە (سولەیمانی) دانیشتووی! (حەلاوە) خان گوڵ و سەوزەیەكی زۆری لێ چاندبوو، هێندە خۆشبوو، دڵی مرۆی دەكردەوە و دەروونی ئاسوودەدەكرد، بە تایبەتی، كەمێ لە خوار خانووەكەوە بە چەن مەترێ، سەكۆیەكی دروستكرابوو، بە كەپرێكی جوان سەریگرتبوو، پەلكەمێوی ئاسكیش، سەری كەپرەكەی چنیبوو، ئێشكی خۆریش، لە نێوان گەڵای سەر كەپرەكەوە، چاوشاركێی لەگەڵ دانیشتوواندا دەكرد. تا لە ئەو شوێنە دڵفڕێنەی بەسەر دەشت و چەم و سەوزایی ئەو ناوەدا دەیڕوانی، ڕێكۆردەری كردبووە و گۆرانی هەمەچەشنەی كوردی لێدەدا، جێ داخرابوو، نانی نیوەڕۆشمان هەر لە ئەوێ خوارد!

## دووەمین گەشت

تام و چێژی یەکەمین گەشتم، هێشتا لەبیرنەچووبوومەوە، لەبەرئەوە هەر دوای ئەوەی ئیشەکەم لە (قەرەداغ) تەواوبوو، جارێکی دیکە لەگەڵ (شێخ کاوە) چووینەوە بۆ (سیتەك)، ئەم جارەیان بە جێبەکەی (مامە سەعە)، لە (دووکانیان)ەوە ڕۆیشتین، چونکە ئەو کاتە لە قەراغ شار و نزیکی (دەباشان)، ڕانگەی سەربازی لێ بوو، بێ مۆڵەت ڕێیان نەدەدا، تێپەڕین، ئێمەش مۆڵەتمان وەرنەگرتبوو!

ئەم جارە نزیکەی دە ڕۆژێکمان پێ چوو، بەڵام گەشتێکی زۆر خۆشترمان کرد، (شێخ لەتیف) بێ تاقەتبوو، حەزی لە گەڕانبوو. (شێخ بابەتایەری حەفید، شێخ مەحموودی باراوی، حەمەتەجیبی خاڵی کاوە، شێخ مەجی هۆتەر ـ تەدیم) و کەسێکی دیکەش بوون.

گەشتەکە لە (سیتەك)ەکەوە دەستپێکرد، بەرەو (گووڕگەیەر) و گوندەکانی ئەو ناوە بەڕێکەوتین. پاشان سەرمان لە (تۆدێ) و (چنارە) دا و بە (تەگەران)دا گەڕاینەوە. لە هەر گوندێ شەوێ یا دوو شەو مایەوە، ڕاژەیەکی زۆریان کردین. ئەم گەشتە دووروودرێژە بۆ من، شتێکی نوێبوو، هەرچەندە هێندێ جار بەپێ و هێندێ جاری دیکەش بە سواری، بە تەواوی ماندووبووبووم، چونکە منی شلەشاری، فێری ئەوە نەبووبووم، بە ئەو هەموو دەشت و شاخانەدا بڕۆم، بەڵام خەوی شەوی زۆر خۆش و بێ وێنەبوو، هەموو گەرما و ماندووبوونی ڕێی، لە بیردەبردمەوە و بە تەواوی دەحەوامەوە.

خۆشترین شت لای من و ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، ئەوەبوو، لە گوندی (تۆدێ)، ئەو مزگەوتەم بینی، کە کاتی خۆی (شێخ مارف تۆدێیی)، نزیکەی پێش (200) ساڵ دروستی کردبوو و پێشنوێژی تێداکردبوو، چەندین فەقێشی تێدا پێگەیاندبوو، پێش ئەوەی بچێ بەرەو (قەڵاچوالان) و (سولەیمانی) بچووڵێ. هەرچەندە مزگەوتەکە زۆر کۆن بوو، بەڵام لە ڕووی هونەری تەلارسازی و ڕووکەشیشەوە، بایەخێکی مێژوویی و تایبەتی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، مزگەوتێکی چکۆلانە و خنجیلانە بوو، کۆڵەکەی هێندە گەورە و ئەستووری لەژێردابوو، هێشتا بەبەریەوە مابوو، چەندین ساڵی دیکەش بەپێوەبوەستێ، بەڵام کێ دەیزانی، ڕۆژێ دێ، دەستی ڕەشی چەپەڵی سوپای دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، دەگاتە ئەوێش و نەك هەر مزگەوتەکە، بەڵکوو گوندەکەش لەگەڵ زەویدا تەختدەکا و داروبەردی بەسەریەکەوە ناهێڵێ! ئەگینا گەر ئەو مزگەوتە، لە وڵاتانی دیکەی پێشکەوتوو بووایە، نۆژەندەکرایەوە و وەك هونەرێکی تەلارسازی مێژوویی بایەخیان پێدەدا، وەك ئەو هەزاران کەنیسانەی لە وڵاتی فەلەکان هەن، دانیشتووانەکانیشیان بە شانازییەوە باسیاندەکەن!

(چناره) گوندێکی چکۆلانەبوو، لە خوار (چوارتا)وەبوو. ئەو شەوەی لە ماڵی کاک (محیدین چنارەیی) بووین، لە هەموو شەوەکانی گەشتەکە خۆشتربوو. هاوینێکی درەنگبوو، شەو فێنکیکردبوو، من و (شێخ کاوە)، لەسەر بانیژەکەی سەردەرگەی حەوشە دانیشتبووین، گوێمان لە گۆرانی دەگرت، جگەرەماندەکێشا و قسەمانەدەکرد. زیاتر باس هەر باسی یار (چنوور) بوو. را بزانم، ئەو کاتە داواشیکردبوو، بەڵام چارەڕێی وەڵام بووین. لە حەوشەکەی خوارەوەش، چەن کیژۆڵەیەکی ناسک و نازدار دانیشتبوون، چرایەکی گزیان داگیرساندبوو، هەموو پێکەوە قسەیاندەکرد، بە بزە و خەندەیەکی شیرینیشەوە، هەر تەماشای بانیژەکەیان دەکرد و چاوبڕکێیان لەگەڵ (کاوە) دەکرد، بەڵام ئەو ڕۆیشتبوو، ئاگای لە هیچ نەبوو، لە بیری خۆشەویستی یاردا بوو!

(شێخ لەتیف) و ئەوانی دیکەش، لە هەیوانەکەی تەنیشتمانەوە دانیشتبوون، بە دەم خواردنەوەوە، یاری کاغەزیان دەکرد. منیش جارویار سەرێکم لێدەدان، بە دزییەوە دوو جگەرەم لە (حەمەنەجیب) وەردەگرت. (شێخ)یش زووزوو ڕایدەکێشا و دەیگوت: لە چاوی حاجی باوکە، سەیر ئەوەبوو، هەرچەندە کاغەزەکەی هەڵدەدایەوە، هەر کچی بۆ دەهات! ئەویش پێدەکەنی و دەیگوت: جا حاجی هیچی پێماوە، وا لە چانسی ئەو، هەر کچ دێنم؟! زووزووش دەیگوت: جگەرەیەکی ئینگلیسیم بۆ داگیرسێنن. ئاخ بۆ ئەو سەردەم و شەو و ئەو پیاوانە!

ڕۆژێ چووین بۆ ڕاو. لە دەوری (کانی قوتی) لاماندا و کەمێ حەوایینەوە. دوایی بەرەو دەشتەکەی (بازەگیر) ڕۆیشتین، (شێخ) حەزی لە ڕاوە کەروێشك بوو، دوو تانجی لاوازیان هێنابوو، لەگەڵ ڕەشەبادا گرێویانبکردایە و ڕایانکردایە، پێشیەکەوتن و دەیانبردەوە!

(شێخ) و کوڕە تاقانەکەی، بە سواری ئەسپەکانیانەوە ڕاوەستابوون، پیاوەکانیشی بە ڕیز بڵاوبووبوونەوە و دەڕۆیشتن، هەر یەکەیان تانجییەکیان ڕستکردبوو، سەری قایشەکەی ملیان، بە دەسەوە گرتبوو، ئەو بن دەوەن و نێو دارانە، بە دوای کەروێشکدا دەگەڕان، منیش لە دوورەوە ڕاوەستابووم و تەماشای ئەو فیلمە خۆشەم دەکرد.

لە پڕ جووتێ کەروێشك، لە لانەکەی خۆیان دەرپەڕین، یەکێ لە پیاوەکان هاواریکرد: بە خوڵامی سەری (شێخ) بم! ئیدی بوو بە دەنگەدەنگ و هەرا، تانجیان تێ بەردان، هێندەی بڵێی یەك و دوو، کەڵبەی تیژیان، لە گەردنی ناسکی جووتە کەروێشك گیرکرد و ژیکەیان لێ هەستاندن، هەر زووش گەیشتنە سەریان و بە چەقۆیەك ملیان هەڵهێنانەوە. دەسکەوتی ئەو ڕۆژەمان، تەنیا ئەو دوو کەروێشکە ناسك و نازدارە بوو، کە ناویان لە دەفتەری ژیاندا کوژایەوە!

پاشان وردەوردە، بەرەو ئاوایی گەڕاینەوە. ئێوارە کەروێشکی سوورەوەکراویان، لەسەر برنجی کوردی دانابوو، بە سینی بۆیان هێناین و خواردمان، تامێکی هێندە خۆشی هەبوو، لە دڵی خۆمدا دەمگوت: (شێخ) ئاهەقی نییە، ئەم هەموو پیاوەی بە ڕاوە کەروێشکەوە خەریککردووە!

بۆ ڕۆژی دوایی، (حەلاوە) خان (شێخ رەشی شێخەلی) و (فووادی حەمەی شێخەلی)، بە دوای (شێخ کاوە)دا ناردبوو، بە پەلە بگەڕێنەوە، چونکە ماڵی (تایەربابان)، وەڵامیان لێ گێڕابوونەوە و قایلبووبوون. ئەوەبوو، دیسانەوە بە (دووکانییان)دا گەڕاینەوە. هەرچەندە هەر لە سەرەتاوە، من ئاگام لە چیرۆکەکە بوو، بەڵام نازانم، باسی داواکردن و قایلبوونی کەسوکاری بووکێ، چۆن بوو، هەر هێندە دەزانم، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، (شێخ کاوە) حەزی لێ کرد و داوایکرد، ئەوانیش دایانێ. هەر دوای ئەو ڕۆژەی گەڕاینەوە، کۆمەڵێ خزم و ئاسیاوی ماڵی (شێخ)، چوون بۆ ماڵی (تایەربابان) و دەس ماچکرا، باوکیشم یەکێ لە ئەو نزیکانەی ماڵی (شێخ) بوو، بانگکرابوو، منیش لەگەڵ کۆمەڵێکی دیکە، هەر لە ئەوێ بووم، سەرپەرشتی بۆنەکەمان دەکرد.

**بەڵای لابەلا**

دوای ئەوەی گەشتەکەی (سیتەک)مان تەواوبوو، (کاوە) داوای (چتووڕ)ی کرد و دایانێ، ئیدی لە نێو شاردا زۆر نەمایەوە. چونکە کێشەیەکی لاوەکی ڕوویدا، هیچ پێوەندییەکی بە ئەویشەوە نەبوو، بەڵام خزمەکانی تێوەیانگلاند و منیش لە ئەو خراپتر تێوەگلام!

کۆتایی مانگی دەی ساڵی (1968) بوو، ئێوارەیەکیان لە سینەما بووم، بەرەو ماڵەوە دەگەڕامەوە و ئاگام لە هیچ نەبوو. بە بەردەم ماڵی (شێخ)دا تێپەڕیم و ویستم، بڕۆمەوە. هەستمکرد، ماڵی (شێخ) جەنجاڵە و دەنگەدەنگێکی زۆری لێدێ. منیش گوتم، با سەری بدەم، تا بزانم، چییە!؟

هەر چوومە ژوورەوە، بینیم، خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە. کوڕانی (شێخ قادری حەفید: بێباک، لاوچاک و بورهان) و (شێخ مەنسووری شێخ کەریم)ی ئامۆزایان، هەموویان لەنێو چیمەنەکەدا دانیشتبوون، پیاوەکانیش دەورەیاندابوون، هەر ورتەیاندەهات. بەڵام (شێخ کاوە)ی لێ نەبوو. گوتیان: لەسەرەوەیە. منیش سڵاوەکرد و دانیشتم. هەرچەندە گوێم هەڵخست، هیچ تێ نەگەیشتم. هێندەم زانی، یەکێ لە دەرەوەهات و گوتی: با بڕۆین. گوتم: چییە؟ (شێخ مەنسوور) گوتی: ئەوڕۆ لە پاریکەی (سولەیمانی)، مامۆستا (یاسین)ی برای (عومەری مچە)، لە (لاوچاک)ی مامی داوە. ئەوان و سێ چوار پیاوی (شێخ کاوە)، بە پەلە ڕۆیشتن.

بە ڕاستی من نەمویست، هیچ ڕوویدا، لەبەرئەوەی (عومەری مچە) مامۆستام بوو، گوتم: باشە، ئێوە هیچ مەکەن، من قسەی لەگەڵ دەکەم. گوتیان باشە. لەبەر قوتابخانەی (کانیسکان)ی سەرەتایی کۆن گرتمانەوە و بانگمکرد. ویستم، بە قسەی خۆش بیدوێنم و بڵێم: داوای لێبوردن بکە، با گرفتەکە گەورەتر نەبێ. (یاسین) ڕایکرد و پەلاماری دەرگاکەی ماڵی دادوەر (بەکر)ی دا، کە ئێستە مەڵبەندی ڕۆشنبیری زانکۆیە و هاواری کرد: فریامکەون، پیاوەکانی (کاوەی شێخ لەتیف) دەمکوژن. ئیدی من لە شوێنی خۆم چەقیم، ئەوانیش پەلاماریاندا، بە هەموویان چینێکی باشیان کوتا و ڕایانکرد. منیش زانیم، شتەکە زۆر قووڵدەبێتەوە، پاشەوپاش گەڕامەوە.
خێرا چوومەژوورەوە، تەماشامکرد، (شێخ کاوە) و چەند کەسێ لە نێو چیمەنەکەدا دانیشتوون. بانگیکردم و چوومە لایەکەوە، چی ڕوویدابوو، هەمووی بۆ گێڕایەوە. ڕەنگی زەردبوو، زۆر ترسا، چونکە هەم تاقەتی ئەو کارانەی نەبوو، هەم دەیزانی، (یاسین) جەلالییە و ئەمانیش لەگەڵ ئەواندا نێوانیان باش نییە. گوتی: بچۆ بۆ لای (مام جەلال) و پێی بڵێ: (کاوە) سڵاوت لێ دەکا، دەڵێ: من ئاگام لە هیچ شتێ نییە. منیش بە تەنیا ڕۆیشتم. کاتێ گەیشتمە بارەگەی جەلالییەکان، ئەو کاتە، لە ماڵی (ئەحمەد غەفوور) و بەرانبەر مزگەوتی (مەولەوی) بوو، کەسی لێ نەبوو. چوومە دەرەوە و لەبەردەمی مزگەوتەکە چاوەڕێمدەکرد. هێندەم زانی، وەستا (سدیق)ی بەنا و چەند کەسێکی دیکە، لەگەڵ (یاسین)دا پەیدابوون. هەر گەیشتنە بەردەمی من، (یاسین) یەکسەر پەلاماریدام، بۆکسێکی پێدا کێشام و گوتی: ئەم سەگبابەشیان لەگەڵ بوو! منیش گوتم: ئاپیاو، گەر ئێرە نەبێ، تۆ دەتوانی، بۆکس بهاوێژی! ویستم، لەگەڵ وەستا (سدیق) قسەبکەم و تێی بگەیەنم، هیچ کەڵکی نەبوو، بە پاڵ منیان لە ژوورێکی چکۆلانەدا بەندکرد. دوای ماوەیە جووتەبرا مامۆستا (بێباک) و دوکتۆر (لاوچاک)یشیان هێنا، تەماشایەکی منیان کرد، بە ماتی دانیشتن و هیچیان نەگوت. هەرسێکمان دانیشتبووین، بێ ئەوەی هیچ بڵێین، ئەشمان دەزانی، چاوەڕێی کێ دەکەین، چییان بڕیارداوە و چیمان لێ دەکەن. لە پڕ دەنگێ پەیدابوو، گوتیان (مام جەلال) هات.

سێیەمین دیداری (مام جەلال)

وەک دوایی بیستم، ئەو ئێوارەیە (مام جەلال)، لە ماڵی (بلەی حەمەخورشە)، داوەتی گیپە بوو، دیارە پێکێکیشی خواردبوومەوە! زۆری پێ نەچوو، (مام) هات و ئێمەیان بردەدەرەوە. خەڵکێکی زۆر کۆبووبوونەوە و لە حەوشەکەدا، بوو بە دەنگەدەنگ و هەرا. دایکی (بێباک)

بە (مام)ی گوت: من خوشکی (مستەفا قەرەداخی)م. ئیدی بێ ئەوەی لە کوڕەکانی بپرسێتەوە، تا بزانن، چی ڕوویداوە و بۆچی لە هەقاڵ (یاسین)یان داوە، هەر زوو بە ڕێزەوە، ئەوانیان بەردا و ڕۆیشتن!

ئینجا (مام جەلال) لە منی پرسی: تۆ ئەندامی پارتیت، گوتم: نەخێر، هیچ نیم. خەریک بوو، دەمبکەمەوە و بۆی باسکەم، ڕاسپاردەکەی (شێخ کاوە)ی پێ بڵێم، ئەیهێشت و گوتی: ملت ئەبڕیکە. منیش ئەمزانی، چی دەکا و بە قسەمکرد. تاکە کڵاشەکەی داکەن و تێمکەوت. نە جارێ نە دووان و نە سیان، باوکیشم وەستابوو، نەیدەوێرا، بەرانبەر ئەو پیاوە شێتە هیچ بڵێ. ئینجا کە ماندووبوو، هاواریکرد، لێیدەن. دوو جاشی خرت و چڵکاوخۆر، بە قۆناغە تفەنگ تێمبەربوون. تا باوکم تکای لێ کرد و وازیان لێ هێنام. منیش لە دڵی خۆمدا دەمگوت: دەوەرە، ئاگات لە هیچ ئەبێ و بتەوێ، ئیوێڕۆیبکەی، کەچی پیاوخراپی و لێدانەکەش هەر بۆ من بمێنێتەوە، تاوانبارەکانیش وەک بەرزەکی یانان بۆی دەرچن! عەرەب ڕاستی گوتووە: لە شەڕ دوورکەوە و گۆرانی بۆ بڵێ!

ئیدی هەرچەندە لێکمدەدایەوە، دەگەیشتمە ئەو باوەڕە، ئەو پیاوە ڕۆژێ لە ڕۆژان، کۆلێژی یاسای نەخوێندووە، ئەگینا وەک تۆمەتبارێ پرسیاری لێ دەکردم و گوێی لێ دەگرتم. ئینجا تێگەیشتم، پیاوی ئەوە نییە، نەک سەرکردایەتی گەلێ بکا، بەڵکوو ناتوانێ، پارتێکی دیاریکراویش بەڕێوەبەرێ! ئاوا بێ لێپرسینەوە و لەبەرچاوی ئەو خەڵکە، بە دەستی خۆی لێمبدا!

ڕەنگە گەر تڕۆمبکردایەوە و بمگوتایە: بەڵێ، ئەندامی پارتیم، کە لە هەموو ژیانمدا جەلالی نەبووم، شتەکە بگۆڕایە! تۆ بڵێی، ئەو پیاوە وەک یاساناسێ، تەنیا هەر ئەوەی بە لاوە گرنگ بووبێ، لە پارتەکەی ئەودا کاردەکەم، یا کارناکەم؟!

نازانم، باوکم چۆن پێی زانیبوو؟! لە کوێوە پەیدابوو؟! چونکە ئەو کاتە، ئەو لە ماڵی (شێخ) نەبوو. ئاگای لە هیچ نەبوو. دوایی چوونەدەرەوە، بۆی گێڕامەوە و گوتی: پێشمەرگە پەلاماری ماڵی (شێخ لەتیف)یان داوە و تەقەیان لێ کردوون، بۆ (کاوە) گەڕاون و نەیاندۆزیوەتەوە. ئینجا تێگەیشتم، ئەوەی من لێی دەترسام، ڕوویدا و تازە قەوما، بە هیچ شتێکیش چاک نابێتەوە! ویستم، بڕۆینەوە، باوکم گوتی: دایکت لە ماڵی (شێخ)ە، با بڕۆین، بیبەینەوە.

هەڵوێستی (شێخ کاوە)

لەگەڵ باوکم چووینەژوورەوە، دایکم و (حەلاوە)خان، لە هەیوانەکە دانیشتبوون، گڵۆپی ژوورەکەی (حەلاوە) خان کوژابووەوە، کە هەمیشە داگیرسابوو. هەواڵی (شێخ کاوە)م پرسی، دایکی گوتی: لێرە نییە.

من وامزانی، لە تەلەفکردنەکەدا لە سەربانەوە ڕایکردووە. دوایی (حەلاوە)خان لێی پرسیم و گوتی: ئا دەی بۆم بگێڕەرەوە، تا بزانم، چی ڕوویداوە؟ منیش چی ڕوویدابوو، هەر بە ئەو شێوەیە بۆم گێڕایەوە. کاتێ گوتم: (شێخ کاوە) منی بۆ لای (مام جەلال) ناردووە، (کاوە) لە ژوورە تاریکەکەوە هاواریکرد و گوتی: درۆدەکەی، من ئەم ناردووی! منیش پێم گوت: ئەی گەر تۆ نەتناردبووم، من ئیشم بە ئەو شوێنە چی بوو؟! ئیدی بێدەنگبوو!

دوای ماوەیە، لە ژوورەکە هاتەدەرە و تەماشایەکی کردم، وەک بڵێ: بۆ بە دایکم دەڵێی، ئەو ناردوومی؟ چونکە (کاوە)، زۆر لە دایکی دەترسا و تەنانەت لەبەردەمیشیدا، جگەرەی نەدەکێشا!

گوتی: وەرە، ئیشم پێتە. چووینە نێو چیمەنەکەوە و دانیشتین. ئینجا پێکەنی و گوتی: زۆریان لێدای؟ منیش گوتم: لێدانەکە گرنگ نییە، بەڵام پێکەنینەکەی تۆ ناخۆشە! باشە، بۆ نکوڵی لێ دەکەی و دەڵێی، درۆدەکا و من ئاگام لێ نییە، ئەی تۆ منت نەنارد؟! گوتی: ئەوە لەبەر دایکم وام گوت. پاشان گوتم: ئەی کوا خزمەکانت، ئەوەتەی من تۆ دەناسم، تەنیا جارێکیش لێرە نەمدیون و تەنانەت نەهاتوون، سەرێکیشت لێ بدەن، گەر بۆ بەڵایەکی وا نەبێ، ئیشیان بە تۆ چییە؟! ئەوەتە ئەو بەزمەیان بۆ نایەوە و خۆشیان، وەک بەرزەکی باتان بۆی دەرچوون!

ئەویش گوتی: ئاخر من چی بکەم؟ ئاگام لێیانە؟ ناردوومە بە دوایاندا؟ خۆیان بە خۆیان دەزانن، سەرۆکایەتیان بە (لاوچاک) کردووە و لێیانداوە، ئەوانیش پەنایان بۆ من هێناوە، تۆ لە جێی من بوویتایە، چیت دەکرد. من بێدەنگبووم و هیچم نەگوت.

پاشان گوتی: ئێمە بڕیارماندا، بەیانی زوو لێرە دەڕۆین، ماوەیە لە نێوشار دەبین و دوایی دەچینەدەرەوە. گەر لەگەڵمان دێی، ئەوا دەبێ، بەیانی کازێوە لێرە بی. گوتم: باشە، بەجێت ناهێڵم و دێم. ئیدی جیابووینەوە و ڕۆیشتینەوە.

باوکم بۆنی شتێکی کرد بوو، هەر لە ڕێ پێی گوتم: ئەوە باسی چیتان دەکرد؟ گوتم: هیچ، هەر ئەو شتانەم بۆ دەگێڕایەوە. گوتی: کوڕم لە گەلی ئەمریمەن وەرەخوارەوە، بە قسەی (کاوە) مەکە، تۆ هیچ جۆرە دوژمنایەتییەک، لەگەڵ کەسدا نییە، خوێندنەکەت لەکیس خۆت مەدە و ئەو کوڕی (شێخ لەتیفی شێخ مەحموود)ە، پێویستی بە خوێندن نییە و پەکی لە

هیچ شتێ ناکەوێ؛ بەڵام گەر تۆ بڕۆی، بە دەستی خۆت ماڵی خۆت وێراندەکەی و پاشەڕۆژی خۆت کوێرەکەیتەوە. من هیچ دەنگم نەکرد، چونکە هەموو قسەکانی ڕاستبوون، بە تایبەتی دوای ئەوەی، ئەو هەڵوێستەی (کاوە)م بینی و گوێم لە قسەکانی بوو!

هەرچی چۆنێبوو، ئەو شەوە نووستم و لەسەر بەڵێنەکەی خۆم، بەیانی کازێوەی تۆ هەستام و چووم بۆ ماڵی (شێخ). لەبەردەرگە تەماشای شوێنی گوللەکانم دەکرد، کە جەلالییەکان بە دیوار و دەرگەکەیانەوە نابوو. تەماشامکرد، دەنگی کەس نایە و چۆڵە. لە (ئەحمەڕەق)ی پیاویانم پرسی: کوان، لە کوێن؟ ئەویش گوتی: هەر شەوێ دوای ئێوە، ترومبیلێ بە شوێنیاندا هات و ڕۆیشتن. گوتم: ئەی (شێخ کاوە) هیچی نەگوت؟ گوتی: نەخێر. ئیدی تێگەیشتم، دوێنێ شەو هەرچی گوتووە، هەمووی درۆبوو! منیش قسەکانی باوکم بیرکەوتەوە و لە دڵی خۆمدا گوتم: بە خوا باشبوو، هێندە پیاوبوو، چاوەڕێی منی نەکرد و منیش دواڕۆژی خۆم، بۆ ئەو پیاوە نەفەوتاند!

ئەوە بوو، دوای ماوەیەکی کەم، (چنوور)ی دەزگیرانیان بۆ گواستەوە و بۆیان برد بۆ (سیتەک). ئیدی تا ڕۆژی ڕێککەوتننامەکەی (11. 3. 1970) خوێنرایەوە، نە بینیمەوە و نە هەواڵیشیم دەزانی!

لیژنەی ( پۆڵا )

بەیانییەکی زووی زستانی (1969) بوو، لە پڕ (حەمەعەلی) هات و گوتی: دوێنێ شەو جەلالییەکان، (نەجات عەبدولستار)یان گرتووە. ئەویش ناوی (جەمالی حەمەنوقڵێ) و (وریا)ی داوە، ئێستە هەردووکیان گیراون. ئەو هەواڵە زۆر ناخۆشبوو، چاوەڕوانمان نەدەکرد، بماندۆزنەوە و دەستمان لێ بووەشێنن. ئەو ڕۆژە بە ناوی نەخۆشییەوە، قوتابخانەمان بەجێهێشت و گەڕاینەوە. من هەر زوو سەرم لە ماڵی (جەمال) دا و هەواڵم زانی. سەرەتا ونیانکردبوو؛ بەڵام لەبەرئەوەی، سووکە خزمایەتی و ناسیاوییەکیان، لەگەڵ ماڵی (حاجی برایمی چەرمەگا)دا هەبوو، بۆی تێکەوتن و دوای هەفتەیەک بەریاندا.

بۆ بەیانی سەرم لە (وریا) دا، لە بەنگەڵەکانی (بەکرەجۆ) گیرابوو؛ لەگەڵ (رەزاقی عارف فیتلە)، لە ژوورێکدا بوون. بەڵام (وریا)، بەهۆی (قالە کوێکوێی)ەوە، هەر زوو بەربوو. کاتێکیش ئەوان بەرەڵابوون، هەوڵماندا، ڕێکخستنەکە بەگەڕخەینەوە، بەڵام (جەمال) قایل نەبوو، گوتی : پێویستە، ماوەیە چالاکی خۆمان بووەستێنین، ئیدی چالاکی لیژنەی (پۆڵا) بە تەواوی وەستا!

دوای ماوەیەک، (جەمال) هۆکەی بۆ باسکردم و گوتی: چەن مانگێ لە ئەمەوبەر، سەرێکم لە دەرەوە دا، لە ئەوێ لەگەڵ هێندێ لێپرسراودا کۆبوومەوە و وێنەمانگرت. یەکێ لە ئەو وێنانە و ناوە نهێنییەکەم، دەس جەلالییەکان کەوتبوو، لەبەرئەوە ئاشکرابووم و گیرام. بە ڕاستی ئامەقی نەبوو، باوەڕی بە کەس نەمێنێ. جگە لە ئەوەی جەلالییەکان، ئامەیان بە (جەمال) و (وریا) نووسیبوو، کەچی دیکە لەگەڵ مەلایی کارنەکەن.
پاشان هەوڵێکی زۆرم دا، پێوەندیی دروستکەمەوە، هیچ نەبێ، ئەو شانانەی لای من بوون، بە تایبەتی ئەو شانانەی لە دەرەوەی قوتابخانە هەمانبوون، بەڕێوەیانبەرم. هەرچەندە تا ماوەیەکیش، ڕاستیم پێ نەگوتن، هەر سەرم لێ دەدان و دەنگوباسم پێ دەگەیاندن. بەڵام کۆبوونەوەمان نەدەکرد و پێم گوتبوون، جەلالییەکان زۆر بە پەرۆشەوە، بە دوامانەوە دەگەڕێن و دەیانەوێ ڕێکخستنەکەمان بدۆزنەوە. چەن مانگێ بە ئەو شێوەیە کارەکانم بەڕێوەبرد، بەڵام کەڵکی نەبوو!
کوڕێکی ئاشنام لابوو، خەڵکی (چوارتا) بوو. ناوی (جەمال عەزیز) بوو. ڕۆژێ پێی گوتم: لە (چوارتا) هەڤاڵ (عەلی سنجاری)م دیوە و باسی کارەکانی خۆمانم بۆ کردووە. ئەویش گوتی: با بە زووترین کات، سەرێکمان لێ بدا. ئەو کاتە (سنجاری)، فەرماندەی هێزی ڕزگاری بوو، لە لقی چواریش کاریدەکرد. منیش گوتم: لە کوێیە؟ گوتی: لە (پێنجوێن) چاوەڕێتدەکا.
ئەوی ڕاستیبێ، ترسام و دڵم بڕوایی نەدا، بچم. هەرچەندە ئەو ڕووداوەی (جەمال)م بیرنەکەوتەوە، بڕوام بە کەس نەدەکرد، بێ ئەوەی کەسێ بناسم و کارم لەگەڵ کردبێ، هەر لە خۆمەوە سەری لێ بدەم و دەستی هاوکاری بۆ ڕاکێشم، ئەوە هەر نابێ! ئیدی ئێمە لە ئەو کاتەوە، لە ڕێکخستنی مەلایی پچڕاین.
سەیر ئەوەبوو، لە دواییدا (جەمال) پێی ڕاگەیاندم، ئەو ڕێکخستنەی ئێمە (لیژنەی پۆلا)، لە (سولەیمانی) هەمانبوو، تاکە ڕێکخستنی مەلایی بوو، کاتێ وەستاش، ئیدی جەلالییەکان بە تەواوی، پشتێنی دڵنیاییان لێ کردەوە و پاڵیان لێ دایەوە!

**وەرچەرخانێکی کتوپڕی**

لە ئەو ماوەیەدا، جەنگ لە هەموو (کوردستان) گەرمببووبوو، پێشمەرگە قارەمانەکانی کورد، لە هەموو بەرەکانی جەنگ، دەستی مەردانەیان، لە سوپای (عێراق) و جاشەکان دەوەشاند. جەلالییەکان، لە بەرەکانی دەشتی (گەرمیان، قەلادزێ، سورداش و زێوێ)، بە تەواوی شکان و ورەیان ڕوخا. شەهیدی بیری نەتەوەیی، (عومەری سالح مەنسوور) و

پێشمەرگەکانی، گەلێ شەو دەهاتنە نێو شار و سزای جەلالییەکانیان دەدا، ترس و لەرزێکی وایان لە دڵیاندا چاندبوو، وایان لێهاتبوو، هەر ئێوارەیان لێدەهات، لێپرسراوە گەورەکانیان، شەو لە ماڵی خۆیان نەدەنووستن، بەڵکوو بەرەو (بەکرەجۆ) دەڕۆیشتن و شەویان لە ئەوێ ڕۆژدەکردەوە. تەنانەت شەوێکیان، دەستێکی کوشتەیان لێ وەشاندن، هێندێکیان لێ کوشتن و چەن کەسێکیشیان، لەنێو ئاولەسەکانی مزگەوتی (حاجی مەلاشەریف)دا خۆیان شاردبوووەوە! ئەو دەستوەشاندنانە، لە لایەکەوە هێندێ کەسی لێ ترساندن و وازیانهێنا. لە لایەکی دیکەشەوە، گوڕ و توانا و هێزێکی دەروونی مەزنی، بە هەموو نیشتمانپەروەران بەخشی و وزەی بەرزکردنەوە.

لە ئەو ساڵەدا، مامە (سالح)م خوێندنی تەواوکرد و گەڕایەوە. مامم پێشتر لەگەڵ جەلالییەکان کاریدەکرد، بەڵام کاتێ هاتەوە، وازیلێهێنان. (نوری عومەر)یش لە (بەغدا)، خوێندنی تەواوکردبوو، لە زانکۆی (سولەیمانی) دامەزرابوو، تا بڵێی، جەلالییەکی توند و تۆخ بوو، گەلێ شەو لە (بەکرەجۆ) لای (مام جەلال) دەمایەوە. لە ڕووی بیر و هەڵوێستی ڕامیارییەوە، زۆر ناکۆکبووین. ئەو کاتە مامم و (نوری)، هەردووکیان پێکەوە لە ماڵی باپیرم دەژیان. منیش ڕووژوو سەرم لێ دەدان و زۆربەی شەواتی هەیینی، شەرابی سپی فەرەنسیمان دەخواردەوە و گوێمان، لە دەنگە بەسۆزەکەی (سالح دیلان) دەگرت. ڕۆژانەش لە گازینۆی (جمهوری) کۆدەبووینەوە و یاری تاوڵەمان دەکرد.

زۆر جار لەگەڵ شەهیدی ئەمر (حەمەی حاجی سالح) و (عەلەخرە)دا، باسی بارودۆخی (کوردستان) و شۆڕشمان دەکرد. لە ناکاو کاک (عەلی) ڕایکرد و جەلالییەکانیش، کاکە (حەمە)یان گرت و هەمووی چەن ڕۆژێکی نەبرد، پێش ڕێککەوتننامەکەی (11)ی مارس، لە (بەکرەجۆ) گولەبارانیانکرد. زۆر جێی داخبوو، شوێنەکەی پڕ نەدەبووەوە.

ئیدی ڕۆژبەڕۆژ تادەهات، ڕەوشی ڕامیاری (سولەیمانی) خراپتردەبوو. جەلالییەکان شێتگیربووبوون، دەستیان نەدەپاراست، بە تایبەتی زانیبوویان، سووکە پێوەندییەک لە نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و (بەعس)دا هەیە.

**دەنگۆی گفتوگۆ**

دوای ئەوەی ڕێکخستنەکەمان نەما و (شێخ کاوە)ش (سولەیمانی) بەجێهێشت، ئیدی جگە لە خوێندن و چاخانەی (جمهوری)، شتێکی وا نەبوو، خۆمی پێوە خەریککەم. لەبەرئەوە بە تەواوی، خۆم دایە خوێندن و دەمویست، هەرچی چۆنێبێ، ئەو ساڵە پۆلی سێ تەواوکەم و ئەو کاتە، بڕیاری چارەنووس و پاشەڕۆژی خۆم بدەم.

لە کۆتایی ساڵی (1969)دا، ڕۆژبەڕۆژ تادەهات، گلۆڵەی چانسی جەلالییەکان، بەرەو لێژی دەڕۆی. پێشمەرگە لە هەموو بەرەکانی جەنگ، بە دەستێکی پۆڵایین، لە هێزەکانی دوژمنیان دەدا و سەرکەوتن دوای سەرکەوتن بەدەستیاندەهێنا. جەلالییەکان لەنێو شارەکاندا هاریووبوون، ئەوەی لەگەڵیان نەبووایە، پەلاماریاندەدا، دەیانگرت و ئازاریان دەدا. لە قوتابخانەکان، قوتابییەکانیان هەراسانکردبوو، کۆمەڵێ قوتابیاتی ئامادەیی و زانکۆیان گرت، بەڵام ئەوانە هیچیان کەڵکیان نەبوو، زامی تێکشکانەکانیانی بۆ ساڕێژ نەدەکردنەوە!

ئەوەبوو، لە سەرەتای مانگی دووی ساڵی (1970)دا، دەنگی وتووێژی نێوان سەرکردایەتی شۆڕش و (بەعس) بلاوبووەوە. هێشتا ڕێککەوتننامەکە ئاشکرا نەکرابوو، نوێنەرەکانی (بارزانی) و ئەندامانی پەلیتبیرۆ (حەبیب موحەممەد کەریم، نووری شاوەیس) و چەن کەسێکی دیکەش، لە (بەغدا) بوون. میری لە شارەکاندا، ئاهەنگی ئاشتی دەگێڕا. تیپێکی موزیک و گۆرانی (میسری)یان هێنابوو، لە سینەمای (ڕەشید) بەرنامەیان پێشکەشدەکرد و چوونە ژوورەوەش بە خۆڕایبوو. هەرچی چۆنێبوو، ئەو ئێوارەیە من و مامە (ساڵح) و (مستەفای سەییدمەجید)ی بەرگدرووی هاوڕێم توانیمان، بە شەڕەشەق بچینەژوورەوە. لەگەڵ بەرنامەکانی (میسری)یەکانیشدا، تیپی موزیکی (سولەیمانی)ش بەشدارییانکرد بوو، شەوێکی زۆر خۆشبوو. ئیدی شاری (سولەیمانی)، کەشێکی زۆر خۆشی هەبوو، هیچ مەترسی نەمابوو، کەس لە کەس نەدەکەوت.

بەیانییەکی زوو لە دەرگە درا، باوکم کردییەوە، (عوسمانی قالەمنەوەر) بوو. دەستێ جلی پێشمەرگەی لەبەردابوو، کلاشینکۆفێکی بە شانەوە بوو، خۆی کرد بەژوورا و لەگەڵ باوکمدا یەکدیان ماچکرد. منیش لە ژوورەوە دەرپەڕیم، بارەشم پێداکرد و تێرتێر یەکدیمان ماچکرد. بەڵام راقم ورمابوو، گوتم: ئەوە چی دەکەی، وا بە چەکەوە بێ ترس دەسووڕێیتەوە؟! گوتی: ئازە هەموو شتێ تەواوبوو، گفتوگۆمان هەیە و بە ئەو زووانە سەردەکەوین. هاتووم بۆ دەرمان بۆ کاک (عومەری ساڵح مەتسوور). ئەو کاتە (عوسمان) لای شەهید (عومەر) پێشمەرگەبوو. ئیدی باوکم هێندێ دەرمانی بۆ پێچایەوە و ڕۆی.

هەرچەندە باوکم جەلالی بوو، بەڵام هەرگیز گوێی نەدەدایە، هەر ناسیاوێ وەڵامی بۆ بناردایە و داوای شتێکی لێ بکردایە، بۆی دەکرد. ئاگام لێ بوو، چەن جارێ، دەرمانی بۆ (نووری حەمەعەلی) و (قالەی کولەشێ) دەنارد!

هێندەی پێ نەچوو، گوتیان: ئێوارە سەرۆک کۆمار (ئەحمەد حەسەن بەکر) قسەدەکا، ڕادیۆ و تێلیڤیزیۆنەکان ڕاستەخۆ ڕایدەگوێزنەوە. ئەوە بوو، سەر لە ئێوارەی ڕۆژی (10–11. 3. 1970)، خاڵە (بەکر) خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکەی خوێندەوە. لە ڕێککەوتننامەکەدا، گەلێ خاڵی باشی تێدابوو، بەڵام هەر ئەو ڕۆژانە هەستدەکرا، هێندێ کەموکووڕیشی تێدا هەیە، وەک بۆمبێکی چێنراو وابوون، هەر کاتێ بیانەوێ، بیتەقێننەوە، دەیتەقێننەوە و دیسانەوە جەنگ، لە (کوردستان) دەستپێدەکاتەوە!

ئەوەی بە لای ئەوەی ئێمەوە زۆر گرنگبوو، ئەوەبوو، ڕیزەکانی گەل یەکیگرتەوە و جەنگی چەپەڵی نێوخۆ کۆڕکرا. چونکە ژەنەراڵ (بارزانی) داوایکردبوو، هەموو هێزە چەکدارە ناڤەرمییەکان چەککرێن، هەر زووش (ئەلبەکر)، ئەوەی ڕاگەیاند و گوتی: جگە لە هێزەکانی پێشمەرگە، هەموو هێزە چەکدارەکانی دیکە، بە هێزێکی نایاسایی دادنرێن و دەبێ، هەڵبوەشێنرێنەوە! لە کۆتایی بڵاوکراوەکەشیدا گوتی: (ویعتبر غدا عطلة رسمیه في کافة انحاء العراق) واتە: سبەینێ لە هەموو (عێراق)دا، پشووی فەرمییە. هەر ئەو ڕۆژە (شێخ مەنسووری حەفید)م بینی، سەبارەت بە نێوەڕۆکی ڕێککەوتنەکە گوتی: هەر ئەوەی ڕاست تێدابوو، کە خاڵە (بەکر) گوتی: سبەینێ لە هەموو (عێراق) پشووی فەرمییە و ئەوانی دیکە هەمووی درۆیە! کەچی هەر واش دەرچوو، قسەکەی ڕاستبوو، چونکە ورتەورتە، دەسەکەیان ئاشکرابوو، ڕۆژگار سەلماندی، بۆچی ئەو ڕێککەوتننامەیەیان واژۆکردووە!





دوای ئەوەی ڕێککەوتننامەکە خوێنرایەوە، سەرۆک (بارزانی) برووسکەی پشتگیری و پیرۆزبایی لێدا. لەهەمان کاتیشدا، گەورەیی و ژیری خۆی نواند، لێبووردنێکی گشتی، بۆ هەموو نەیارەکانی خۆی بڵاوکردەوە، ئیدی کورد خواخوای بیانوویەکی بوو، بۆئەوەی تەقەبکا، ئەو ئێوارەیەش، یەکێ لە ئەو ئێوارانەبوو، لە شاری (سولەیمانی)، تەقەیەکی زۆری بێ وێنە کرا و پێشیان دەگوت: تەقەی خۆشی!

بەیانی زوو هەستام، چوومەدەرەوە و تەماشامکرد، بە جارێ شارەکەمان خرۆشاوە، جەماوەرێکی یەکجار زۆر، لەبەردەرکی سەرا خڕبوونەتەوە. بەڵام، چونکە مەلاییەکان ڕێکخستنێکی ڕێکوپێك و یەکگرتوویان نەبوو، بەرەلاییەکی تەواوی پێوە دیاربوو، هەر کەسێ بۆ خۆی گەورەیە بوو، کەس نامەی کەسی نەدەخوێندەوە، بەڵکوو هەمووان دەیانویست، لە لایەکەوە: کەڵك لە ئەو جێچۆڵی ڕێکخستنە وەرگرن و دەس بەسەر کاروبارەکانی نێوشاردا بگرن. لە لایەکی دیکەوە: خۆشی و پشتگیری خۆیان، بۆ سەرکردایەتی شۆڕش و (بارزانی) دەربڕن! لە لایەکی دیکەشەوە: دژی جەلالییەکان بوەستن و تۆڵەیان لێ بکەنەوە! لەبەرئەوە هێندەی نەمابوو، هەردوو ڕەوانشاد (جەلالی حسەکەلۆش) و (رەزاقی عارق فیتك)، لەبەردەرکی سەرا پەلاماری یەکدی بدەن و نێوانیان تێکچێ، چونکە هەردووکیان، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، پێوەندییان هەبووە، کاتی خۆشی جەلالییەکان، هەردووکیشیانی لە (بەکرەجۆ) گرتبوو!

بەڵام دوایی هەموو لایەنەکان، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، خۆپیشاندانێکی گەورەی جەماوەری، لە نێو شاردا بکرێ و بە شێوەیەکی جوان ڕێکخرێ، پشتگیری خۆیان بۆ

نێوەڕۆکی ڕێککەوتننامەکە و سەرۆك (بارزانی) لەرێن، بێ ئەوەی جنێو، بە هیچ کەس و لایەنێ بدرێ و سوکایەتییان پێ بکرێ! کەچی لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەو ڕۆژە گرنگە بێ سەروبەری و ئاژاوە گەورەیەشدا، ڕۆژی (12. 3. 1970)، گەورەترین خۆپیشاندانی جەماوەری، لە مێژووی شاری (سولەیمانی)دا ڕێکخرا. سەرێکی لای مزگەوتی گەورەبوو، سەرەکەی دیکەشی، لای باخی گشتی بوو. هەرچی مەلایی، کۆمۆنیست، دژە جەلالیی و بێلایەنیش هەبوو، هەرچی کەسوکاری شەهیدان هەبوو، لە ئەو ماوە کورتەدا، درووشمیان نووسی و زۆر بە خۆشییەوە، بەشدارییانکرد.

خۆپیشاندەران تا سەرەتای شەقامی (سالم)ی ئێستە ڕۆیشتن، لە ئەوێوە گەڕانەوە و بە جادەی (سەرشەقام)دا سەرکەوتن، بە بەردەرکی سەردا تێپەڕین و بە تووی مەلیکدا هەلگەڕان، بە هەر شوێنێکیشدا تێپەڕدەبوون، هێندەی دیکە خەڵکیان پێوە دەنیشتەوە و جەنجاڵتردەبوو! تەنانەت هێندێ خەڵکی ترسنۆك و هەلپەرستیش، خۆیان پێدا هەڵواسی، کە تا دوێنێ بوو، دژی شۆڕش و (بارزانی) بوون! پاشان خۆپیشاندەران، لە بەردەرکی سەرا کۆبوونەوە و لیژنەیەك پێکهاتبوو، سەرپەرشتی ئاهەنگەکە بکا.

دوایی (تۆفیقی نوری بەگ)، بە ناوی (لیژنەی نێوچەی سولەیمانی پ. د. ك.) و (ڕەفعەتی حەمدی بەگ)یش، بە ناوی لقی (ی. ق. ك.)ەوە، لەسەر نوتێلەکەی (نوری عەلی)، سەروو گوتاریان خوێندەوە، پاشان کۆتایی بە خۆپیشاندانەکە هات!



کەسوکاری ڕەوانشاد (حەمەی حاجی سالح)، بەشداری خۆپیشاندانەکایان کرد و وێنەکەیان بەرزکردەوە.



وێنەی بەشێ لە خۆپیشاندانەکە، ئێمە سەرپەرشتیماندەکرد

**پەلەقاژەی مەرگ**

کاتێ جەلالییەکان، ئەو جەماوەرە گەورەیە و ئەو سەرکەوتنە مەزنەی شۆڕشیان بینی، هەر بە تەواوی تووشی هیستریا بوون. هەرچەندە سەرەتا وایان پیشاندەدا، ئەوانیش لە ئەو سەرکەوتنەدا بەشدارن، بەڵام لە ڕاستیدا، زۆریان پێ ناخۆشبوو، هەر بە جارێ کۆستیانکەوتبوو! لەگەڵ ئەوەشدا، هیچ چارێکیان نەبوو، چونکە لە کوردەکەی هەردوو جێژن بووبوون! لەبەرئەوە هەر وا بەهێمنی و بێ کاردانەوە دانەنیشتن، بەڵکوو چەن لێبڕسراوێکی گێرەشێوێن و ئاژاوەچی، لە دەوری یەکدی کۆبوونەوە، کەوتنە خۆیان و دەیانویست، نیشتمانپەروەران بترسێنن، بەر بە لێشاوی جەماوەر بگرن و خۆپیشاندانەکە تێکدەن. بۆیە لەپڕ پیکابە سەریەتاڵەکانی (بەکرەجۆ)، لە جادەی (کاوە)وە هاتن و بەرەو بەردەرکی سەرا سەرکەوتن، بە دۆشکە، تەقەیەکی زۆریان بە ئاسمانا کرد و دەیانقیڕان، بەڵام ئەوە لە پەلەقاژەی مەرگ دەچوو، تازە کارلەکارترازابوو، هیچ شتێ دادی نەدەدان، جەماوەری نیشتمانپەروەری کوردیش، گوێیان نەدایە و بڵاوەیان لێ نەکرد!

گەر ئەم خۆپیشاندان و جەنجاڵییەی لە نێوشاردا بینرا، شتێکی کەیاندبێ، هەمووی تەنیا نیشانەی ئەوەبوو، لە لایەکەوە، تا چ ئەندازەیەک جەماوەری کورد، دژی جەنگ و لەگەڵ ئاشتی ڕاستەقینەی سەرانسەریدا بوون. لە لایەکی دیکەشەوە، هێز و توانای شۆڕش، جەماوەی (پارتی) و کەسایەتی بەهێزی (بارزانی) پیشاندەدا. چونکە جەلالییەکان ماوەی

(4) ساڵ بوو، دەسەڵاتێکی گەورەیان لە نێوشاری (سولەیمانی)دا هەبوو، سەرەڕای ئەو هەموو هەڕەشەوگوڕەشەیە، ڕاونان و گرتن، لێدان و کوشتن، نەک هەر نەیانتوانی، هێزەکانی شۆڕش و (پارتی) لەنێوبەرن، بەڵکوو هێشتا جەماوەری (پارتی) و شۆڕش، لە جەماوەری ئەوان زیاتربوو، لەسەر خەباتی ڕەوای خۆشیان سووورتربوون!
ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، بنچینەی کوردایەتی، تێکۆشانی باڵەکەی (پارتی) و (بارزانی)، لەسەر بناغەیەکی پتەوی ڕێکوپێکی نیشتمانپەروەری هەڵچنرابوو. بەڵام قسە کوردایەتی باڵەکەی جەلالی، بنچینەیەکی بۆشی نانیشتمانپەروەرانەی هەبوو، بە فەرمانی ئاغاکانی (بەغدا)یان بەڕێوەدەچوو، هەموو شتێکیشیان دژی شۆڕشی کورد دەکرد، تەنیا هەر بۆئەوەی، کوەو لە (بارزانی) بەرنەوە، وەک کەری دێزیان لێ هاتبوو، تۆپینی خۆیان و زیانی گەلەکەیان دەویست! بۆیە، هەر بە یەک بلاڤۆکی میری و فەرمانی (ئەلبەکر)، هێزەکانیان هەڵوەشانەوە و وەک بەفرەکەی پار توانەوە!
لەبەرئەوە، لە ناو ئەو تێکشکانە گەورەیەی بەسەریانهاتبوو، لە ناو ئەو سەرکەوتنە مەزنەی (بارزانی) بەدەستیهێنابوو، لە ناو ئەو جەماوەرە گەورەیەی، لە خۆپیشاندانەکەدا بینیبوویان، پەلاماری قوتابخانەی ئامادەیی کچانیان دا، بۆمبێکیان تێ هاویشت، بەڵام باشبوو، کەسی نەکوشت، تەنیا چەن کەسێ بریندارببوون، وەک ئەوەی بۆمبیان، لە چەمێکی خڕی هاویشتبێ و ڕاوەماسی بکەن! تاوانباری قوربانییەکەش، (جەمالی ئەحمە خورشە) بوو، سەرۆک (بارزانی) داوای لە میری کرد، لەبەردەرەکی سەرا هەڵیواسن و بە سزای گەل گەیەنرا. ئەوانەی ناردبوویشیان و ئەو کارە قێزەونەیان پێ کرد، بۆ خۆیان بێ هەرەقکردنەوە بۆی دەرچوون!

ڕێکخستنەوەی هێڵەکانی ڕێکخستنی (پارتی)
هەفتەیەک بەسەر ڕێککەوتننامەکەدا تێپەڕیوو، تووشی (جەمالی حەمەنوقڵە) بووم. گوتی: وا ڕێکخستنەکانمان نوێدەکەینەوە، دەبێ کارمان لەگەڵ بکەیتەوە
دوای هێندێ گفتوگۆکردنە قایلبووم، ئیدی پێکەوە چووین بۆ لای (ڕەسووڵ مەمەند)، ئەو کاتە یەکەمین کادێری (پارتی) و لێپرسراوی لیژنەی نێوچە بوو، لە (سولەیمانی) دەستبەکاربوو. (جەمال)، باسی ڕۆژانی تێکۆشانی لیژنەی (پۆلا)ی بۆ کرد و ئەویش گوتی: کەسانی وەک ئێوە، هەرچەن لە ڕێکخستنیش بپچڕێن، هەر دەبێ بگەڕێنەوە و شانازیتان پێوە دەکەین. منیش ناوی ئەو هەڤاڵانەی لام بوون، هەموویانم دایە، ئیدی وەک دەڵێن، جارێکی دیکەش بە (پارتی)ەوە لەحیمکرایەوە!

### بیرەتیژەکەی (عەبدوڵڵا جەوهەر)

هەمووی دوو هەفتە، بەسەر دەرچوونی ڕێککەوتننامەکەدا ڕاتەبووربوو، لە چاخانەکەی (عەبەی عەلی ئەکبەر)ی تەنیشت دەروازەی سینەما (رەشید)ی کۆن و (ڕەشەموڵی) ئێستە دانیشتبووین، لەگەڵ خوالێخۆشبووان ماموستا (عەبدوڵڵا جەوهەر، شێخ ئەنوەر)ی هۆنەر و (مارف ئاسراو)دا چامانئەخواردەوە و سەبارەت بە ڕێککەوتننامەکە ئەمەتەقێمانئەکرد. ئەو کاتە ئەندامی (پارتی) بووم و باسی خاڵە چاکەکانی ڕێککەوتننامەکەم بۆدەکردن. (شێخ ئەنوەر) گوتی: هەموو خاڵەکانی باشن، بەڵام گرنگ ئەوەیە، جێبەجێبکرێن. منیش گوتم: ماوەی چوار ساڵیان بۆ جێبەجێکردنەکەی داناوە. هەرچەندە ماموستا (عەبدوڵڵا)، تا بڵێی، کەمدوو و دوورەپەرێزبوو، زۆر کەم تێکەڵی خەڵک دەبوو، کاتێ تێکەڵیشدەبوو، پتر گوێی دەگرت و کەمتر قسەیدەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەڵیدایە و گوتی: ئەی دوای چوار ساڵەکە؟ گوتم: نازانم. ئیدی ئەویش بزەیەك گرتی و بێدەنگبوو.

هەموو کاتێ، ئەو پرسیارەی ماموستام بیردەکەوتەوە، ئینجا تێگەیشتم، ئەو لە ئەو سەری هاتبووەوە، باش لە مەبەستە گڵاوەکەی (بەعس) تێگەیشتبوو، خاڵە لاوازەکانی ڕێککەوتننامەکەی چاك دەزانی، بۆیە ئەو پرسیارەی لە من کرد و گاڵتەی پێ دەهات! کورد ڕاستی فەرمووە: ئەوەی گەنج لە ئاوێنەدا دەیبینێ، پیر لە خشتی کاڵدا دەیبینێ!

### دواسەردانی (سیتەك)

هەرچەندە (شێخ کاوە)، بێ ماڵاوایی منی بەجێهێشت، کە ڕۆیشتیش، نە یەکدیمان بینییەوە، نە دەنگیشمان بە یەکدی گەیشت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیرمدەکرد، چونکە تەمەنێکمان پێکەوە بەسەربردبوو.

ماوەیەبوو، لەگەڵ (ئەوزادی شێخ جەلالی حەفید)دا، پێوەندییەکی دۆستانەی خۆشمان هەبوو، هات بۆ ماڵەوە و گوتی: بەیانی خۆت ئامادەکە، پێکەوە دەچین بۆ (سیتەك). ئەو ڕۆژە (14. 3. 1970) بوو. بارانێکی یەکجار زۆر دەباری، جێبێکمان گرت و ڕۆیشتین. بەڵام بریا هەر نەچووینایە. دوای ئەوەی دەستی (شێخ لەتیف) ماچکرا و ئاخنورا، (شێخ کاوە) لە ڕاو هاتەوە، هەموو جلەکانی تەڕبووبوو. چاوی بە من کەوت، زۆر بە ساردییەوە، تەوقەی لەگەڵ کردم و یەکدیمان ماچکرد. منیش هیچم شك نەدەبرد و زۆرم پێ ناخۆش بوو، لێم پرسی: هیچ ڕوویداوە، وا ساردی؟! گوتی: گلەییم زۆرە و تۆ خۆت لە من شاردەوە، ئەم ماوە دوورودرێژە دەنگت نەبوو، ئێستە دەزانی، جادەکەی پانە، بۆیە

هاتووی بۆ لام. منیش گوتم: ئەی بڕیار نەبوو، سبەی ڕۆژ یەکدی ببینین و پێکەوە بڕۆین، من هاتم و (ئەحمەق) گوتی: هەر شەوێ دوای ئێوە ڕۆیشتوون! تەماشامکرد، ڕووی خۆی گرژکردووە و لچی بە یەکداداوە. منیش هەستام و گوتم: داوای لێبووردن دەکەم، من بە هەڵە هاتووم، چونکە جگە لە برایەتی و هاوڕێیەتی تۆ، پێویستم بە هیچ شتێکی دیکە نییە. کەچی هیچ قسەی نەکرد. منیش چوومەدەرەوە. (شێخ ئەوزاد) هات و گوتی: تۆ لەگەڵ من هاتووی، ئێستە پێکەوە دەڕۆین، ئەم شەو لە ماڵی کاک (مەلاقادرە کوێرە) دەبین، بەیانیش زوو سەرێ لە (شێخ بابەتایەر) دەدەین و دەگەڕێینەوە!
ئەو شەوە لە ئەوێ بووین، هەمووییم بۆ (شێخ ئەوزاد) گێڕایەوە، ئەویش گوتی: گوێ مەدەرێ، (کاوە) هەر وایە، حولحولییە. بەڵام من ئەو قسانەم لە دڵ دەرنەدەچوو، سەرەڕای ئەو هەموو تێکەڵاوی و دۆستایەتییە، سەرەڕای ئەو هەموو لێدانەی لەسەر ئەو، بە دەستی جەلالییەکان خواردم، هێشتا ئەوە هەڵوێستی بێ! ئیدی من هاوڕێی وام بۆ چییە؟ خۆ من پیاوی ئەو نیم، تا بە ئارەزووی دڵی خۆی بمجوڵێنێ! لە هەموو ژیانیشمدا، قسەم لێ قەبووڵ نەکردووە و وەک ئەوانەی دەوروبەری، بە درۆ لە گەردنی خۆمم نەداوە، قسەیەکم بە دڵ نەبووبێ و مێشکم وەری نەگرتبێ، ڕێک پێم گوتووە و وەڵامدراوەتەوە. لەبەرئەوە زۆر جار دەمبینی، تووڕەدەبوو، بەڵام زوو خاوئەبووەوە. بۆیە بڕیرمدا، تا لە ئەو هەڵوێستەی پەشیمان نەبێتەوە، جارێکی دیکە سەر بە ماڵیاندا ناکەمەوە و نایبینمەوە.
ئەو ڕۆژە هەر خۆشی نەکردەوە، بارانێکی وا باری، بە هیچ شێوەیە، کەس ڕێی هاتوچۆی دەرەوەی نەبوو. دووشەو لە ماڵی (مەلاقادر) بووین و گیرماننخواردبوو، شەو و ڕۆژ خەریکی یاری کاغەز بووین.
بۆ بەیانی کەمێ خۆشیکردەوە و ئاسمان ڕووتبووەوە، پێکەوە چووین بۆ (گەڕەدێ)، دوو ڕۆژیش لە ئەوێ ماینەوە. ئیدی زۆرم پێ خۆشبوو، لە ژوورە تاریکەکەی ماڵی (مەلاقادر) و لە دەس دووکەڵی جگەرەی زەل ڕزگارمبوو. هەرچەندە خواەهەڵناگرێ، یارمەتییەکی زۆریان کردبین. بەڵام چونکە دڵم تەنگبوو، بارانیشبوو، ڕێی چوونەدەرەوە نەبوو، هەر وەک لە زیندانیدا بم، وابوو!
لە گوندی (گەڕەدێ)، کۆمەڵێ پیاوی پیاوانەی لێ بوو. (شێخ بابەتایەر) و (شێخ مەحموودەی بارلوی) لە دیوەخانەکە دانیشتبوون. دوای ئەوەی کەمێ دانیشتین، (شێخ ئەوزاد) هەموو شتێکی بۆ گێڕانەوە. ئیدی (بابەتایەر) کەمێ لە من تووڕەبوو، گوتی: تۆ ئیشت بە ئەوێ چییە، بۆ خەریکی خوێندنی خۆت نابی، چیت لە ئەو سەرێشەیە داوە؟!

منیش هیچ قسەم نەکرد، دەمزانی، قسەکانی هەموو ڕاستن و بە دڵەوە دەتووسێن. ئەو دوو ڕۆژەی لە ئەویٚ بووین، زۆر بە خۆشی و پێکەنین بەسەرمانبرد، پاشان جێیەکە بە دوامانادا هاتەوە و گەڕایتەوە.

ئیدی من بە تەواوی، پێم لە (کاوە) بڕی و هاتوچۆی ماڵی (شێخ)یشم نەدەکرد، هەرچەندە هێندێ جار، باوکم لە ئەویٚ دەهاتەوە و دەیگوت: (کاوە) هەواڵتدەپرسیٚ و دەڵیٚ: خەریکی چییە و چی دەکا؟! بەڵام من لەسەر قسەکەی خۆم سووربووم و تا (شێخ لەتیف)یش کۆچیدوایی نەکرد، نەمبینییەوە!



من و خوالێخۆشبوو (شێخ باباتایەری شێخ جەلالی حەفید) ڕۆژی (28. 1. 2013) لە ماڵی خۆیان گیراوە

بەرەگەی لقی چوار

دوای ماوەیەکی کەم، (پارتی) لەسەر شەقامی (مەولەوی)، خانووەکەی (ڕەشەجەنجەڕ)ی بەکرێگرت، بارەگەی لیژنەی ناوچە و لقی چواریان لیٚ کردەوە. ئەندامانی لقی (سولەیمانی) ئەمانەبوون: خوالێخۆشبووان (عەبدولی سووران) لێپرسراوی لق بوو، (سدیق ئەمین) ناوی بە (سدیقە فەنی) ڕۆیشتبوو، (حەمەی مەلا عەبدوڵڵا، فەرەج سەعید، قادر جەباری و مەلاخدر)، هەر زوو گەیشتن و دەسیان بەکارکردن کرد.

دوو ڕۆژی پێچوو، (عەبدولوەهاب ئەترووشی)ش، بە خۆی و پێشمەرگەیەکی زۆرەوە هاتن. بە ئەو بۆنەیەوە، ئێوارە لە بارەگەی لق، تیپی مۆزیکی (سولەیمانی) بانگکران و ئاهەنگێکی خنجیلانەیان سازکرد. دوای ماوەیەکیش، ئاهەنگێکی دیکەیان لە چیمەنە گەورەکەی یانەی فەرمانبەران گێڕا، گەلێ هونەرمەندی کورد و عەرەب بەشدارییان تێدا کرد، تا درەنگانێ مۆزیک و گۆرانی بوو. ئاغای (ئەترووشی)ش لە پێشەوە دانیشتبوو، دەتگوت بەرازە، ئاوڕی بۆ ئەمدرایەوە، هەر مۆڕەببووەوە، کەس بزەیەکی شیرینی، لەسەر لێوەکانی نەبینی! ئیدی وردەوردە و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، ڕێکخستنەکانی (پارتی) لە (سولەیمانی)، گەشەیانئەکرد و جەلالییەکانیش دەپووکانەوە!

**چارەنووسی جەلالییەکان**

هەر سێ چوار ڕۆژ دوای ڕێککەوتننامەکە، جەلالییەکان لە ناچاریدا، پشکێری خۆیان دەربڕی و برووسکەیان بۆ میری لێدا. ئینجا (مام جەلال) لە (بەکرەجۆ)، کۆمەڵەکەی خۆی کۆکردەوە و لە نێوان قسەکانیدا گوتبووی: هەر کەس بچێتەوە ماڵی خۆی و لەمەودا، خەباتی ڕامیاری دەکەین. بە کوردییەکەی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق)، ئیشی پێیان نەمابوو، ئەو بارکەیان مرد، تا دژی بەرەی شۆڕش و (بارزانی) بجەنگن و خەباتی چەکداری بکەن! لەبەرئەوە ناشبەتاڵیانکرد و زۆربەی چەکدارەکانیشیان، چەکەکانیان بۆ خۆیان برد و لە ماڵی خۆیان دانیشتن.

ئیدی لە ماوەیەکی کەمدا، ئەو هەموو بارەگایانەی لە (بەکرەجۆ) هەیانبوو، چۆڵکران و گسکیان لێدرا، فڕانفڕان، تاڵانی و چەکفرۆشتنێ بوو، وێنەی نەبوو. ئەو جەلالییانەی لە خۆشیان دەترسان و خراپەیان بەرانبەر ڕۆڵەکانی گەل کردبوو، خۆیان شاردەوە، یا بەرەو (بەغدا)ی پایتەختی داگیرکەر هەڵاتن!

**ڕەوشی قوتابخانە و (بەکرەجۆ) دوای (11)ی مارس**

دوای ئەوەی جەلالییەکان بنکەکانیان چۆڵکرد، ئێمە کۆمەڵێ بووین، چووین و سەرمان لێ دان، تا بزانین، چییان لێ بەجێماوە و چی دەبینین. گەر بڵێم، تەنانەت گلۆپی ژوورەکانیشیان دەرهێنابوو، لە ئەوانەیە خوێنەرانی بەڕێز باوەڕم پێ نەکەن. هەموو ئەو هۆڵە زلانەی کاتی خۆی، بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و پەلەوەر دروستکرابوون، جەلالییەکان لە ئیسگەی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ) و زانکۆیان سەندبوو، بارەگایان تێدا دامەزراندبوو، چۆڵ و تاریک بوون!

لە قوتابخانەش، هێندێ قوتابی دەسوپێ سپی، لیژنەیەکیان دامەزراندبوو، کاروباری قوتابییانیان بەڕێوەدەبرد. بەڵام ئێمە (ئەوانەی لە ڕۆژە ناخۆشەکاندا کامانیەکرد) تێکەڵیان نەبووین. سەرەتا قوتابییە جەلالییەکان نەیاندەوێرا، بێنەوە و لە (بەکرەجۆ) بمێننەوە. بەڵام دوایی زانییان، کەس دەسیان بۆ نابا، وردەوردە پەیدابوونەوە. (ڕەزای بابەگوڕوون) بە من و (حەمەعەلی) گوت: هەرچی قسەیەکم پێ بڵێ، لە چاوی ئێوەی دەناسم و قسەش، لە کەس قەبوڵ ناکەم. ئێمەش دڵنیامانکرد و گوتمان: هەر کەسێ قسەیەکی خراپی پێ گوتی، لێی قەبوڵ مەکە و بڵێ: سەرۆک (بارزانی) لێبووردنی گشتی دەرکردووە. هەرچەندە قوتابییە مەلاییەکان، زۆر داخ لە دڵ بوون، هاتایان بۆ ئێمە دەمێنا، پارەتییانبدەین، تا تۆڵەی خۆیانیان لێ بکەنەوە. بەڵام لە هەمان کاتدا، خۆیان بە ڕێنمای و داواکارییەکانی (پارتی) و سەرۆک (بارزانی)ەوە بەستبووەوە، تەنیا کۆمۆنیستەکان نەبێ، دەیانویست، ئەو هەقە بقۆزنەوە و تۆڵەی خۆیانیان لێ بکەنەوە. تەنانەت ڕۆژێ کۆمۆنیستێکی ناسراوی وەک (عوسمان غەریب)، قسەی بە (ڕەزا) گوتبوو، ئەویش هات بۆ لای ئێمە و گوتی: من (پارتی) هەرچییەکم لێ بکا، گوێ نادەمێ و هەقی خۆیانە، بەڵام لە کۆمۆنیستەکانی قەبوڵ ناکەم، سوکایەتیم پێ بکەن. ئێمەش گوتمان: چی بووە و چیت لە ئێمە دەوێ؟ گوتی: لەگەڵمدا وەرن، با تۆڵەی خۆم بکەمەوە. (ڕەزا) زۆری بەسەر ئێمەوە هەبوو، لەبەرئەوە لەگەڵی چووین، (عوسمان)ی بانگکرد و تێری کوتا. ئەویش جگە لە ئەوەی دەرەقەتی (ڕەزا) زلەی نەدەدا، بینیشی، ئێمە وەستاوین و هیچ قسەناکەین، هەر هەڵسایەوە و یەکسەر ڕایکرد. ئیدی کۆمۆنیستەکان نەیانوێرا، تەماشای نێوچەوانی کەسی دیکە بکەن!

(حەمەوەفەتی) سەرۆکی چێشتکەرەکان، سەرەتا نەیدەوێرا، دەرامبکا، بەڵام پاشان زانی، کەس قسەی پێ نالێ، ئەویش گەڕایەوە، هەر دەتگوت، کۆستێکی گەورە و گرانی کەوتووە، سەرەڕای ئەوەی ئەو سەرکەوتنە گەورەیەش بەدەسهاتبوو، کەچی هێشتا چاوی بە مەلایی هەڵ نەدەهات، هەمیشە بۆ خۆی مات و بێدەنگ دانیشتبوو، دەتگوت: ماڵ و منداڵی لافاو بردوونی!

سەیرانی (ئەحماوا)

بەبۆنەی سەرکەوتنی کورد و نەمانی ناکۆکی و دووبەرەکییەوە، دەستەی بەڕێوەبەری قوتابخانە و (ی. ق. ک.) بڕیاریاندا، سەیرانێکی هاوینەش، بۆ قوتابییان و مامۆستایان، بۆ هاوینەهەواری (ئەحماوا) ڕێکخەن. پێشەکی، پێوەندییان بە (ی. ق. ک.)ی شارۆچکەی

(هەڵەبجە)وە کرد و پێیان ڕاگەیاندن، ڕۆژی پێنجشەممە دێن و شەویش لە ئەوێ دەمێننەوە، بۆئەوەی جێی مانەوەمان بۆ دابینبکەن و بەیانییەکەشی بەرەو (ئەحمەداوا) بڕۆین. جگە لە ترومبێلی تایبەتی مامۆستاکان، سێ لۆری گەورەیان بۆ گرتبووین.

مانگی چواربوو، ئاو و هەوایەکی زۆر خۆشی هەبوو. ئێمە کۆمەڵێ بووین، (حەمەعەلی) نەیهێشت، بە هیچ لایەکدا بڕۆین، یەکسەر لە ماڵی ئەوان دابەزین. (ئەبیلی ئووری مەتی) و (مونەیەد قوستەنتین)یشمان داوەتکردبوو، هەردووکیان لە تیپی موزیکی (سولەیمانی) بوون، ئامێرەکانیشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

دوای ئەوەی لە (هەڵەبجە)، قوتابییەکانمان دامەزراند، ئێمە جیابووینەوە و چووین بۆ ماڵی (حەمەعەلی)، ئەو ئێوارەیە لەگەڵ مامۆستا (حەمە فەرەج) و خوالێخۆشبوو (جەزا)ی براشیدا، یەکدیمان ناسی. خواردنێکی زۆریان ئامادەکردبوو، ئێمەش نزیکەی حەوت کەس دەبووین. پاشان چووین بۆ یانەی فەرمانبەران و دانیشتین، ئیدی ئەو شەوە، بە دەم خواردنەوە و گۆرانی و موزیکەوە، کاتێکی زۆر خۆشمان ڕابوارد، بە تایبەتی (برایمی حەمەعەلی)، دەنگێکی خۆشی پێوەبوو، چونکە بەڵاشبوو، هەر هەڵیەدا، بە تەواوی کەڵلەی گەرمببووبوو، ئەوەی دەیگوت، نەیدەگوتەوە!

بەیانی زوو هەستاین، قوتابییەکانمان کۆکردەوە و بەرەو (ئەحمەداوا) بەڕێکەوتین. هەر گەیشتین، چێشتکەرەکانی قوتابخانە، مەنجەڵیان ڕیزکرد، خواردنی نیوەڕۆیان ئامادەکرد و پاشان نانی نیوەڕۆمان خوارد.

ئەو ڕۆژە، (ئەحمەداوا) زۆر جەنجاڵبوو، لە هەموو لایەکەوە، خەڵک هاتبوو، ڕێ بەر ڕێبوار نەدەکەوت! هێندێ مامۆستا خواردبوویانەوە و مەستبووبوون، وایان لێهاتبوو، خەریک بوو، خۆیان بیردەچووەوە! (تۆفیقی حەمەی باوە)ش، لە لایەکەوە دانیشتبوو، قوتابیان لێی کۆبووبوونەوە، خەریکی خواردنەوە و شەڕەجنێو بوو. بێ ئەوەی هیچ جۆرە گرفتێکمان تووشبێ، کاتێکی زۆر خۆشمان ڕابووارد، ئێوارە بە خۆشی و گۆرانیگوتن گەڕاینەوە!



وێنەی کۆمەڵێ خوێندکار و هێندێ مامۆستا، لەگەڵ (قادر ئەمیریکی) بەڕێوەبەری قوتابخانە



وێنەی کۆمەڵێ خوێندکار لەگەڵ خوالێخۆشبوو (کەمال ڕەمزی)



لە ڕاستەوە: حەمەعەلی، حوسێن موحەممەد، ئامار عومەر، ڕەفعەتی حەمدی بەگ، برایمی حەمەعەلی، مەریوان جۆرج



**ڕۆژانی بارەگەی لقی چوار**

کاتێ بارەگە کرایەوە، داوایان لێ کردم، وەک پێشمەرگەیەک لە لقی چوار کاربکەم. ئەو کاتە، سەرلقی بارەگە (بەکری حاجی فەرەج) بوو. من و خوالێخۆشبوو (لەتیفی قادرە فەندی) برازای، لە ئامادەیی کشتوکاڵ پێکەوە دەمانخوێند و چووین. ڕۆژانە سەرپەرشتی

نیشی نێو بارەگاکەمان دەکرد و شەوانەش بە نۆرە، لە سەریان نێشکماندەگرت. بۆ من هەم کاتێکی خۆش و سەیر بوو، هەم ئەزموونێکی نوێشبوو. بە تایبەتی، زۆربەمان برادەر و ئاسیاو بووین، پێکەوە وەك برا، کارەکانمان لەنێو خۆماندا دابەشکردبوو. لە ئەو پێشمەرگانەی ئەو کاتە لە ئەوێ بوون، خوالێخۆشبوو (عەبەی فارس، عومەری جەیران، غەفووری حەسەن، جەمالی حاجی فەرەجی سووسێ ...) بوون.

یەکێ لە خاڵەکانی ڕێککەوتننامەی (11)ی مارسی ئەوەبوو، قوتابییە دەرکراوەکان بۆ سەر خوێندنی خۆیان بگەڕێنەوە، بێ ئەوەی، گوێ بە تەمەن بدرێ. منیش بە هەلم زانی، (برایمی حەمەعەلی) هاوڕێم بانگرد، تا هەرچی چۆنێبێ، نامەیەکی لە لقەوە بۆ وەرگرم و لە ئامادەیی کشتوکاڵ وەرگیرێنەوە.

(حەسەنی شیرین) لە لق بوو، (برایم)ی بینیبوو، قسەی خراپی کردبوو، نامەکەیان نەدایە. پاشبوو، لە ئەو کاتەدا مامۆستا (فەرەیدوون عەلی ئەمین) هات، (برایم)ی دەناسی. لێی پرسی: ئەوە لێرە چی دەکەی؟ ئەویش هەموو شتێکی بۆ باسکرد.

مامۆستاش، نامەیەکی بۆ خوالێخۆشبوو (عەبدوڵی سۆزان) نووسی و منیش بێ ئەوەی کەس بزانێ، بۆ ئەوەی گرفتی بۆ درووست نەکەن، بۆ کاك (عەبدوڵ)م برد. هەر ناوی مامۆستا (فەرەیدوون)ی بینی، یەکسەر واژۆیکرد. پاشان بردم بۆ چاپ و نامەکە مۆری لقی لێدرا. کاکە (یلە)ی بێ ئەمەك و سپڵە، بۆ قوتابخانە گەڕایەوە، ئەو ساڵە لەگەڵ ئێمەدا، تاقیکردنەوەی بەکولۆری دا و دەرچوو. ئیدی دوای ئەوە، من بۆ ماوەی دوو مانگ مۆڵەتم وەرگرت، بۆئەوەی بخوێنمەوە و دوا تاقیکردنەوەی، بەکەلۆری ئامادەیی کشتوکاڵ بدەم!

هەر لە ئەو ماوەیەدا بوو، لق و ئێوچەی (ی. ق. ك.) دامەزرا و لە هەموو قوتابخانە و زانکۆی (سولەیمانی) هەڵبژاردنکرا. ئێمەش بەشداریمان تێدا کرد، بەڵام خۆمان بۆ هیچ لیژنەیەك هەڵنەبژارد، هەرچەندە دوای ماوەیەکی کەم، کارەکانیان بۆ بەڕێوە نەدەچوو، لەبەرئەوە منیان لە لیژنەی هەڵبژاردنی قوتابخانەکاندا دانا، بەڵام زۆر گوێم نەدەدایە، چونکە زۆربەی ئەندامەکانی نەزان و ناشارەزابوون!

**هەرای (سەرچنار)**

(شێخ عوسمان باراوی)، لە (سەرچنار) لێپرسراوی جەلالییەکان بوو. هەڵبەتە، هەر کەسێ کاری رامیاری و پارتایەتی بکا، کۆمەڵێ خەڵکی هەر لێ زویردەبێ و خۆشیان ناوێ، بە

تایبەتی، گەر ئەو کەسە خۆی تووڕە و توندبێ. هەرچەندە لە ئەو دواییانەدا، لەگەڵ (شێخ عوسمان) نێوانمان زۆر باش نەبوو، بەڵام هەر بیستم، کۆمەڵێ خەڵک بە ناوی (پارتی)ەوە، شەو چوونەتە سەری، لەبەرچاوی پورم و منداڵەکانی لێیانداوە، زۆرم پێ ناخۆشبوو. چونکە ئەو پیاوە هی ئەوە نەبوو، بە ئەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ. یەکەم: پاڵپشتەکی زۆری کوردەی کردبوو. دووەم: (بارزانی) لێبووردنی گشتی بڵاوکردبووەوە. سێیەم: نەخۆشبوو. چوارەم: گەر هەر بڕیاریشیاندابێ، سزاییدەن، ئایا کەس بە شەو دەچێتە سەر ماڵ و لەبەرچاوی منداڵەکانی، بە چوار پێنج کەس سووکایەتی پێ بکەن؟! سەیر ئەوەبوو، هەموو پیاوەکەشیان ئەوەبوو، گوایە جنێوی بە (ئەحمەد حەسەن بەکر) داوە! وەک ئەوان سەپانی ماڵی بابی (ئەلبەکر) بێ!

بەیانی زووبوو، ئەو هەواڵەم بیست، یەکسەر سواربووم و چووم بۆ (سەرچنار)، بینیم، هەموویان دەگریان و گوتیان: هەر دوای ئەوەی شەو هاتوونەتە سەرمان و ئەو بەزمەیان پێ کردووین، پۆلیس هاتن و بردیان بۆ سەرا. منیش بە پەلە چووم بۆ بنکەی پۆلیس و داوامکرد، چاوم پێی بکەوێ. یەکەم کەس من بینیم. چوومە لای و تەماشامکرد، بە بێ دەنگی و کەساسی، بە تەنیا لە ژوورێکدا دانیشتووە، هەموو سەروچاوی خوێنبوو، خوێنەکە بە دەموچاوییەوە ووشکبووبووە، کەسێکیش بە لایدا نەهاتبوو، تا تیماریکا. خۆشی لە داخاندا و بە ئانقەست نەیسڕیبوو. ئیدی بێدەنگ لە تەنیشتییەوە دانیشتم، بێ ئەوەی هیچی لێ بپرسم، کەمێ تەماشای یەکدیمان کرد و پاشان گوتم: کوێ مەمرێ، ئەو شتانە بەسەر پیاو دێ. ئەویش گوتی: هەی دڵەکەت دەگێم کاکەمەلا، ئاخر لێبووردن و یەکێتی ڕیزەکانی گەل وادەبێ؟!

ئێوارە لە لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی) و بارەگەی لق، (شێخ تەیبی گوڵانی)م بینی و بۆم باسکرد. ئەویش گوتی: کاتی خۆی جەلالییەکان سووکایەتیان بە من کرد، ئەو هیچی نەکرد. بە (بەکری حاجی فەرەج)یشم گوت، ئەویش گوتی: ئەوە پێوەندی بە (پارتی)ەوە نییە، ناکۆکی نێوان خۆیانە. ئیدی تێگەیشتم، ئەمان ئاگایان لێبووە، بۆیە ئەو قسانە دەکەن!

### جێژنی کرێکارانی جیهان

یەکی مانگی پێنجی هەموو ساڵێ، جێژنی کرێکارانە و لە هەموو جیهاندا، هێزە پێشکەوتووخوازەکان یادیدەکەنەوە. یەکەمین یادی ئەو جێژنە، دوای ڕێککەوتننامەی (11)ی مارسی (1970) بەڕێوەچوو. ئەوە یەکەمین جاربوو، خۆپیشاندانێکی گەورەی بێ

وێنەی جەماوەری، بە ئەو شێوەیە لە (سولەیمانی) سازکرێ. بەڵام ئەو ڕۆژە، بارانێکی زۆر بە خوڕ دەباری، دەتگوت لە ئاسمانەوە، بە کوندە ئاو دەکەنەخوارەوە، بە شێوەیەبوو، خۆشکردنەوەی نەبوو، گەر کەمێکی دیکەی بەدەمەوەبووایە، لە (100٪) لاقار هەڵبەستا! ئێمە هەموو وەك چۆلەکەی بەر بارانمان لێهاتبوو، وا تەڕبووبووین، هەموو گیانمان لە ناو هەڵکێشرابوو. لەبەرئەوە لە داخاندا بڕیارمدا، تا لە ژیاندابم، جارێکی دیکە، لە هیچ جۆرە خۆپیشاندانێکی زستان و بەهاردا، بەشداری نەکەم، بۆئەوەی تووشی بارانی وا نەبمەوە!

هەر ئەو ئێوارەیە، (یەکێتی سەندیکاکانی کوردستان)، لە هۆڵی قوتابخانەی ئامادەیی (سولەیمانی)، ئاهەنگێکی گوتارخوێندنەوەیان سازکرد، گوتاری کرێکاران (محێدینی ڕەحیم سمێل) پێشکەشیکرد، کە بە هەڤاڵ (ڕیشۆڵە) ناسرابوو، بە زمانێکی ڕەوان، بە کوردییەکی پاراو و لەبەر، ماوەی چارەکەکاژێرێ قسەیکرد. ئەوە یەکەمین جاربوو، دوای (11)ی مارس، (محێدین) دەرکەوێ. خوالێخۆشبوو (شێخ ڕەووف شێخ عارف) لێپرسراوی (یەکێتی جووتیارانی کوردستان) لقی (سولەیمانی) و کارگێڕی لیژنەی ناوچەی (پارتی)ش بوو، ڕووی لە ئێمە کرد و گوتی: ئەمە برای (حەمەڕەحیم)ە و ئەویش هەڤاڵ (جووجەڵە)ی پێ دەڵێن، گەر (ڕیشۆڵە) وابێ، دەبێ، (جووجەڵە)ی برای چۆن بێ؟!

شەوانی (یەکرەجۆ)

نزیکی ئەوە بووبووینەوە، بۆ تاقیکردنەوەی یەکەلۆری خۆمان ئامادەکەین. دوای ئەوەی بەڕێوەبەری قوتابخانە، مامۆستا (قادر ئەمیریکی)، مژدەی بەشداربوونی تاقیکردنەوەی سەری ساڵی دایێ، ئیدی من و (حەمەعەلی) بڕیارماندا، تا ئەو دوو مانگە، لە تاقیکردنەوەکان دەبینەوە، لە بەشی ناوخۆیی بمێنینەوە، بۆئەوەی لە هەموو شتێ دوورکەوینەوە و خوێندنەکەمان تەواوکەین. چونکە لە (سولەیمانی) نەماندەتوانی، بخوێنین. ئەوەبوو، زۆر بە توندی گرتمان و تەنانەت بۆ شاریش دانەدەبەزین. بەڵام خەریکبوو، شێتدەبووین، چونکە هەموو ڕۆژێ، ئەو بەهارە خۆشەی (سولەیمانی)، لەبەر سەیران و ئاهەنگێڕان، دەشتودەر بەرنەدەکەوت. ئێمەش لە ئەو (یەکرەجۆ) گەرمە رشکە چۆڵە پیسەدا، بە دەس مێشوولە و کۆششکردنەوە گیرمانخواردبوو. هەر گەرما سووتاندبووینی، مێشوولە خواردبووینی و خوێنی دەمژین. بەڵام باشبوو، هێندێ جار، برادەران دەهاتن و سەریان لێ دەداین، جارێکیشیان دایکم و باوکم هاتن، خواردنێکی زۆریان بۆ هێنابووین، لەگەڵ (حەمەعەلی) و ئەواندا، لە باخەکەی (یەکرەجۆ) دانیشتین، وا بزانم، هەر ئەو جارە، تێر بە سکی خۆمان، نانێکی پوخت و بەتامەمان خوارد!

**لیژنەی کوتەک**

لە ڕاستیدا نەماندەتوانی، هێندێ قوتابی سەرکێش هێمنکەینەوە، چونکە کاتی خۆی جەلالییەکان، زۆر سووکایەتیان پێ کردبوون و لێیاندابوون، بە تایبەتی، ئەوانەی لە بەشی نێوخۆیی قوتابییان دەژیان. بۆیە قوتابییەکان، بە دزییەوە پێیان گوتین، ئێمە هەقمان بەسەر قوتابیان و بەڕێوەبەری قوتابخانەوە نییە، دەمانەوێ تۆڵەی خۆمان لە ئەو جاشانە بکەینەوە، ئێوە دەڵێن، چی؟! ئێمەش ناچاربووین، هاوکارییانبکەین.

چونکە هێندێ لە ئەو قوتابیانە، زۆر خوێڕی و هیچوپووچ بوون. لە ئەوەشدەچوو، بۆیە پووبوون بە جەلالی، بۆئەوەی ئازاری خەڵک بدەن. لەبەرئەوە بڕیارماندا، لیژنەی (کوتەک) دروستکەین، بەڵام پێمان گوتن، بە مەرجێ بێ ئاگاداری ئێمە هیچ نەکەن. بۆ ئەو مەبەستەش، پارەگاکەی (حەمەی فەرەج)مان هەڵبژارد، چونکە لە تەنیشت خۆمانەوە بوو، چۆڵکرابوو، تەنانەت کارەباشی تێدا نەبوو، تاریکبوو، لە تالارییەکەشدا دەرگە و پەنجەرەیان پێوە نەهێشتبوو، هەر لە گرێژنەوە دەریانهێنابوو!

پلانەکەشمان وا داڕشت، ئەو قوتابییەی زۆر خراپەیکردووە و شایانی ئەوەیە، بێ عەرەقکردنەوە دەرنەچێ و سزای خۆی وەرگرێ، ئەوا هەر شەوەی لە بەشی نێوخۆیی، یەکێ بانگیەکەینە دەرەوە، تا بەردەم پارەگاکە، قسەی بۆ دەکەین. پاشان بە پاڵ دەیبەینە ژوورەوە، دوو کەسیش لە ژوورە تاریکەکە خۆیان ماتدەدەن و چاوەڕێیەکەن، بۆئەوەی کەس نەیانناسێتەوە، هەر چووەژوورەوە، بە شەق و بۆکس دایگرنەوە و چینێکی باشی لێبدەن. دوایی، هەڕەشەی لێ بکەن، گەر لە هەر شوێنێ باسیکا، ئەوا ئەم جارە خراپتری بەسەردێنین. بۆ ئەو کارەش، دوو کەسمان هەڵبژارد، (ئەسعەد) ناوێکی خەڵکی (دەربەندیخان) و (عارف) ناوێکی خەڵکی (پێنجوێن) بوون، چونکە خەڵکی شار نەبوون و زۆر داخ لە دڵیش بوون.

(ئەسعەد)، کەتەیەکی زلی بالابەرزی چوارشانەی تێکسمڕاوی دەسوپەل قەوی بوو، زلەی لە هەر کەسێ دەدا، هێندە ئازاری هەبوو، شیری دایکی خۆی پێ هەڵدەهێنایەوە! کەسیش گومانی لێ نەدەکرد، چونکە زۆر کوڕێکی بێدەنگ، هێمن و لەسەرخۆ بوو. بەڵام ئەوانەی پەرکەتبوون، بە شەپازلە و مستەکۆڵەکانیدا دەیانگوت، (ئەسعەد)یشیان لەگەڵ بوو، جا دەبێ، ئەو خوانەناسە چۆن زرمەی لێ هەستاندبێ و داخی دڵی خۆی پێ ڕشتبێ! چونکە داخی ئەو سێ ساڵەی خوێندنی (یەکرەمجی)، لە دڵ و دەروونیدا ڕوابوو!

یەکەمین شەو، قوتابییەکی خەڵکی (چەمچەماڵ)مان بانگکرد، چونکە زۆر بێ ڕەوشت و هار بوو. سەرەتا هێندێ قسەی بۆ کرا، ئیدی هەر زانی، بۆچی بانگکراوە، هەزار جنێوی

سووك و ناشیرینی، به (مام جەلال) و سەرانی جەلالییەكان دا، بەڵام ئەوە هیچ كەڵكی نەبوو، هەر چووەژوورەوە، لێدانێكی خوارد، ڕەنگە ئێستەش، ئازارەكەی هەر لە یادمابێ! هەموو شەوێ ئەو كارە نەدەكرا، بەڵكوو چەن شەوێ بەسەر یەكەم كەسدا تەپەڕی، ئینجا یەكێكی دیكە دەستنیشاندەكرا و بانگدەكرا، بۆئەوەی وا بزانن، ئەوە تەنیا ناكۆكی و ڕقی تاكەكەسیە و ڕێكخراو نییە. دوو شەوی دیكە دوو جەلالیی دیكە بانگكران، یەكێكیان (كۆیی) و ئەوی دیكەشیان (كەركووكی) بوون، لێدانێكی باشیان خوارد. ئیدی دوای ئەوە تێگەیشتن، ئەمە دەستێكی لە پشتەوەیە و شتی كەسێتی نییە، لەبەرئەوە جەلالییەكان هەر زوو فریای خۆیان كەوتن، بەشی نێوخۆییان چۆڵكرد و هەڵاتن. بەڵام بە داخەوە، دوو كەس بەرنەكەوتن، (سالاری حەمەساڵحی فەقێ سەلیمی ماوەتی) و (عادل ڕەووف چەمچەماڵی)، هەر یەكەمین ڕۆژ ڕایانكرد و بە سزای ڕەوای خۆیان نەگەیشتن. بە تایبەتی (عادل)، كوڕێكی زۆر بێ ڕەوشت و خراپ بوو، دڵی زۆر كەسی یەشاندبوو. ئەوە بوو، ئەو قەرزە كۆنەی خەڵكی نیشتمانپەروەری شاری (سولەیمانی) لەسەری بوو، هەروا بە خۆڕای نەفەوتا، ڕۆژی ڕاپەڕینەكە، لە (ئەمنەسوورەكە) لێیان سەندەوە و خەڵتانی خوێنیان كردا ئەم كارە وا دەنگیدایەوە، تەنانەت لقی چواری (پارتی)ش پێی زانی. بەڵكوو ڕاستر وایە، بڵێم: جەلالییەكان لە لق شكاتیانكردبوو. لەبەرئەوە ناردیان بە دوای مندا، تا ڕاستی لە زمانی منەوە بزانن. منیش گوتم: من ئاگام لێ نییە و ئەوانیش، هێندە بایەخیان پێ نەدا! ئیدی ئێمەش، لیژنەكەمان هەڵوەشاندەوە، چونكە بەشی نێوخۆیی كەسی تێدا نەمابوو، هەموویان هەڵاتبوون، تا پێویستبكا، لەسەر ئەو كارە بەردەوامبین و بیبازیانكەین!

سەیر ئەوەبوو، هێندێ لە كارمەندەكانی قوتابخانەكەش ئامادەبوون، بەشداری لە تۆڵەسەندنەوە و تەمبێكردندا بكەن، چونكە مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێ، هێندێ لە ئەو جەلالییانە، چ جۆرە دڕندەیەك بوون و چەندیان سووكایەتی بە خەڵك كردبوو، بۆیە هێندێ كەس وا لێیان پڕبوون و دانەدەمركانەوە!

كەچی لە ناخی دڵیشدا، ئەو كارانەم زۆر پێ ناخۆشبوو، ویژدانم ئازاریدەدام، چونكە هەمیشە لەگەڵ یەكێتی ڕیزەكانی گەلدا بووم، دژی ناكۆكی و دووبەرەكی بووم، هەرگیز حەزم نەدەكرد، ئاژاوە لەنێو قوتابخانەكەماندا هەبێ.

دوای ماوەیە، زۆربەی ئەو قوتابییە جەلالییانەی، لە ترساندا ڕایانكردبوو، وەڵامیان بۆ ناردین و تكایان لێ كردین، بگەڕێنەوە، تا تاقیكردنەوەكانیان لەكیس نەچێ و پاشە ڕۆژیان نەفەوتێ. ئێمەش وەڵامەمان بۆ ناردن و دڵنیامانكردنەوە. ئیدی ڕۆژانی تاقیكردنەوەكە

هاتنەوە و هەر لێدەبوونەوە، یەکسەر دەگەڕانەوە! دوایی وایان لێهاتبوو، خۆشیان دەیانگوت: ئێمە زۆر دەڵەبووین، هەر ئێوە لە ئێمە باشترن، گەر ئێمە سەرکەوتینایە، لە ئەوانەیە نەمانهێشتایە، لە ئەم ناوە بمێنن!

**کۆنفرانسەکانی (سولەیمانی)**

سەرکردایەتی (پارتی) بڕیاریدا، کۆنگرەی هەشت بگرێ، بەرنامە و ستراتیژی پارتەکە، بەگوێرەی ئەو قۆناغە نوێیە داڕێژێ و دەستەیەکی نوێی بەڕێوەبەر، بۆ لیژنەی ناوچە، لق، کۆمیتەی نێوەندی و پەلیتبیرۆ هەڵبژێرێ. لەبەرئەوە لە پێشدا، لە هەموو شارۆکە، شارۆچکە و شارەکان، کۆنفرانسی نێوخۆیی دەستپێکرد.

ئەوی ڕاستیبێ، هێشتا (پارتی) بڕیندەکانی ساڕێژنەبووبوونەوە، هێشتا بە تەواوی، سەرپێی خۆی نەکەوتبووەوە، ڕێکخستنەکانی زۆر لاوازبوون، لەسەر پلەوپایە و دەسەڵات، ناکۆکی، ململانێ و دووبەرەکییەکی توندوتیژ لە نێوان هەموو لایەنەکان و ڕێکخراوەکاندا دروستبووبوو، زۆربەی لێپرسراوەکان بە هەڵیان دەزانی، کۆمەڵێکیان لە خۆیان کۆکردبووەوە، دەمیان شیرینکردبوون و دەیانویست، دەنگیان بۆ مسۆگەرکەن. واتە چەندین دەستە و کۆمەڵی جیاجیا دروستبووبوون. لەبەرئەوە ئەندامانی لیژنەی ناوچە و لق، ڕۆژانە خەریکی ناوبژیکردن، ئاشتکردنەوەی ئەندامان و دۆستانی (پارتی) بوون، تا دەنگی پتر بێنن!

ڕۆژێ وەڵامەمان بۆ هات و داوایان لێ کردین، لە لق ئامادەبین، کە هەموو سەرلەنوێ بە تاقیکردنەوەی پلەی ئەندامێتی (پارتی)دا تێپەڕینەوە، ئینجا مافی ئەندامێتیمان دەدەنێ و بۆمان هەیە، بەشداری کۆنفرانسەکان بکەین. ڕۆژانە خەڵکێکی زۆر، لە هەموو توێژاڵ و چینەکانی کۆمەڵ دەهاتن و بە نۆرە تاقیدەکرانەوە، لە هەر ژوورێ، چەن ئەندامێکی لق دانیشتبوون، ناویان دەخوێندەوە و بۆ ئەو ژوورە دەچووین. من بەر ژوورەکەی (سدیق)ەفەندی کەوتم. چونکە لە ئەوێ کارمدەکرد، دەیناسیم و بە زەردەخەنەیەکەوە لێی پرسیم: (پارتی) هۆیە، یا ئامانجە؟! منیش گوتم: هۆیەکە، بۆئەوەی ئامانجەکانی گەلی کورد بەدەستبێنێ. ئیدی لەسەردەستی ئەودا، جارێکی دیکە، مافی ئەندامێتیم پێ بڕایەوە!

بە ڕاستی، من لە ئەو بار و ڕەوشە خراپە، زۆر بێزاربووبووم، گاڵتەم پێ دەهات، بە هیچ جۆرێ، دیسپلینی پاتایەتی و کوردایەتی نەمابوو، هەر کەسە هوڵی بۆ خۆی دەدا، شوێنێ بپچڕێ و گیرفان پڕکا، هەر ئەندامێ یا دۆستێکی (پارتی)ت دەدەی و دەتتوانی، خۆی بە لێپرسراوێکدا هەڵواسیبوو، شەرمیشیان نەدەکرد، بە ئاشکرا دەیانگوت: ئێمە

لەگەڵ فلان کەس داین! خەڵکانێکی وا ترسنۆک، مەلیپەرست و هیچوپووچ، هاتوچۆی بارەگایان دەکرد و پێشمەرگەکان، کوردپەروەری ڕاستەقینە، بێزی لە خۆی دەکردەوە!
کۆنفرانسی ڕێکخراوی قوتابیان لە (ئامادەیی سولەیمانی) گیرا. من و (حەمەعەلی) و هێندێ برادەری دیکە چووین، بەشداریمانکرد، تا ئەندامانی ڕێکخراوی قوتابیان هەڵبژێرین. پتر لە چوار لیست هەبوو. ئەو ڕۆژە، خاوەن لیستەکان هێندەیان ڕێز لێ گرتین، خۆمان پێکەنینمان دەهات. بە ڕاستی نەماندەزانی، ئەم هەموو ئەندامە لە کوێوە پەیدابوون و دەنگ بە کێ بدەین؟! ئێمەش، خۆمان خەریکی کۆششکردن و تاقیکردنەوەی سەری ساڵ بووین، تاقەتی ئەو بەزمەمان نەبوو، لیست درووستکەین و خۆمان هەڵبژێرین، ئەگینا لە ئەوانمان کەمتر پێ نەدەکرا!
(حەمەعەلی)، لەگەڵ لیستەکەی خوالێخۆشبوو (عومەر شەمەیی) و برادەرەکانی ڕێککەوت بوو، دەنگیان بۆ دابینکا. هات و گوتی: ئەم کوڕانە دەمێکە دەناسم، کوڕی باش و ڕووناکبیرن، با دەنگ بۆ ئەوان بدەین. منیش گوتم: باشە. ئەوەبوو، ئەو لیستەی ئێمە دەنگمان بۆ دا، یەکەمین دەنگی هێنا، لیستەکەش لە ئەم ناوانە پێکهاتبوو: (عومەر شەمەیی، فەرهاد عەبدولحەمید، مژدە تایەر، کامیل موحەممەد ئەمین ...).
بە کورتی، لە هەموو ڕێکخراوەکاندا، هەر ئەو کۆمەڵانە دەرچوون، کە لە بیروباوەڕەوە لە یەکدییەوە نزیکبوون. پاشان ئەو ئەندامانەی لە کۆنفرانسی ڕێکخراوەکاندا دەرچوون، لە کۆنفرانسی لیژنەی ناوچەشدا بەشدارییانکرد و ئەندامانی لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی)یان هەڵبژارد. لە ئەنجامدا، کۆمەڵێ ئەندامی وەک (قەشەیوسف، تۆفیقی نوری بەگ، کامیل ژیر، عەبدولفەتاح عەبدولڕەزاق، عەزیز شەفیق)، لەگەڵ ژنێکدا (ساجیدە) هەڵبژێران.
دوای ئەوەی ئەوانە دەرچوون، دەستە و کۆمەڵەکانی دیکە، بە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە قایل نەبوون، کەوتنەگەڕکردن و گوتیان: ئەمانە هەموویان (کاژیک)ن و (پارتی) نین، لەبەرئەوە دەبێ کۆنفرانس دووبارەکرێتەوە. هەرچەندە ئەو کاتە، هیچ پێوەندییەکم بە (کاژیک)ەوە نەبوو، ئەو ناوەش هەر لە نێوناواندا نەبوو، زۆربەی ئەوانەی دەرچووبوون، نەمدەناسین، بەڵام مرۆ ڕاست بڵێ و ویژدانی هەبێ، ئەوانەی بۆ ڕێکخراوی قوتابیان و لیژنەی ناوچە دەرچووبوون، چەن کەسانێکی نیشتمانپەروەر، پاک، دڵسۆز و ڕووناکبیر بوون، شایانی ئەوەبوون، سەرکردایەتی ڕێکخراو و لیژنەی ناوچە بکەن. بە تایبەتی، کاتێ دوایی لە نزیکەوە هێندێکیانم ناسی، بە تەواوی تێیانگەیشتم، چەن لێهاتوو و ڕێکوپێک بوون.

### گرفتی نێوان لیژنەی ناوچەی کۆن و نوێ

گێرەوکێشەی نێوان، ئەندامانی لیژنەی ناوچەی کۆن و نوێ و لقی چوار تادەهات، ڕۆژبەڕۆژ گەرمتردەبوو. ناکۆکییەکانی نێوانیان قووڵتردەبوونەوە. ئەمانیش، چونکە پیاوی کەس نەبوون و ماستاویان، بۆ ئەندامانی لق ساردنەدەکردەوە، ئەندامانی لقی چوار، پشتگیری لیژنەی ناوچەی کۆنیان کرد و دژی لیژنەی ناوچەی نوێ بوون. لەبەرئەوە بڕیاریاندا، ئەنجامی کۆنفرانسەکە هەڵوەشێننەوە، بە ناوی ئەوەوە گوایە، ئەو کۆمەڵە، دووبەرەکییان لە نێو ڕیزەکانی (پارتی)دا دروستکردووە. بۆیە هەموویان هەڵپەساردن و دووریانخستنەوە، کۆنفرانسێکی لاوازی هیچوپوچی دیکەیان گرت، ئەندامەکانی سەر بە خۆیان تێدا بەشداركرد، لیژنەیەکی ناوچەی لاوازی بێ کەڵکی دیکەیان دانا و بەسەر ڕێکخراوەکاندا سەپاندیانن!

لیژنەی ناوچەی هەڵپەسێرراویش، شاندێکیان پێکەوەنا و بۆ بارەگای (بارزانی) بەڕێکەوتن، بۆئەوەی شکات لە لقی چوار بکەن و ماف ڕەوای خۆیان بۆ بگێڕنەوە. بەڵام دوای ماوەیە، هەروا گەڕانەوە، لە ماندووبوون و پارەخەرجکردن پتر، هیچی دیکەیان پێ نەبڕا! ئیدی دوای ئەوە، هەموویان بە یەکجاری لە (پارتی) دوورخرانەوە. هەروەها لیژنەی ناوچەی سەر بە لق، ڕێکخراوی قوتابیانیشیان هەڵوەشاندەوە، ئەوانەی بە شێوەیەکی ڕاست و ڕەوا دەرچووبوون، هەموویان دەرکردن.

لە (ی. ق. ک.)یشدا، ئەو ئەندامانەی پێشتر ناوهێنان، بە زۆربەی دەنگ دەرچووبوون و لە لقی (سولەیمانی) کاریاندەکرد، لە ئەوێش شوێنیان پێ لەقکردن و دووریانخستنەوە، کۆمەڵێکی بێ تواناى وەك (ڕەفعەتی حەمدی بەگ، سەرکەوت تۆفیق، لاوچاك عەبدولقادر حەفید، ناسر حەفید، شێخ مستەفای شێخ ئیسماعیل و سەروەت موحەممەد ئەمین)یان دانا، هەربە جارێ قوڕیان بەسەر (ی. ق. ك.)دا کرد!

هەرچەندە، من ئەوانەی پێشووم نەدەناسی، ئەمانەش زۆربەیان هاوڕێی نزیکم بوون و زۆر پاکیشبوون، بەڵام لە ڕاستیدا هیچیان پێ نەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەنێو ئەوانیشدا (ناسر حەفید) و (شێخ مستەفای شێخ ئیسماعیل)، لە ئەوانی دیکە باشتربوون!

لە سەردەمی ئەماندا، (ی. ق. ك.) بە تەواوی بووبوو بە منداڵبازاڕ و گەڕەلاوژێیەکی گەورەی تێکەوتبوو. هەر خەریکی گاڵتەوگەپ و ڕابواردن، سەیران و ئاهەنگێڕان بوون، ڕۆژبەڕۆژ بەرەو لاوازی و داوەشان دەڕۆی، بێ لێپرسراو مابوووەوە! لەبەرئەوە، (هیوای جەلال حەمدی) لە (بەغدا) خوێندنی تەواوکردبوو، لقی چوار و سکرتاریەتی قوتابیان، (هیوا)یان هێنا و لێپرسراوێتی لقیان پێ سپارد، بۆئەوەی کەموکورییەکان پینەکەن.

بە ئەو شێوەیەش، کۆتایی بە ئاکۆکی و ململانێی باڵەکانی نێو (پارتی) هات و دوو ڕێبازی گرنگی خاوەن بیر و ئایدۆلۆژیا، لە نێو شاری (سولەیمانی)دا سەریانهەڵدا، یەکێکیان ڕێبازی نەتەوەیی و ئەوی دیکەشیان ڕێبازی مارکسییەکان بوون. ئەگینا ئەوانەی بۆ ڕێکخراوی قوتابیان و لیژنەی ناوچە دانرابوون، قڕیان بەسەر مارکسیزمەوە نەبوو، خۆشیان بە تەواوی نەیانئەزانی، لە ڕووی ئایدۆلۆژیاوە، سەر بە چ بیروباوەڕ و فەلسەفەیەکن!

### فاخیری حەمەدئاغای مێرگەسوور

دوای ئەوەی کۆنگرە تەواوبوو، کاک (فاخیر) هات و بوو بە لێپرسراوی لقی چوار. لە ئەو ماوە کەمەی لە نزیکەوە ناسیم و تێکەڵی ئێمە بوو، بۆم دەرکەوت، پیاوێکی تا بڵێی هێمن، لەسەرخۆ، بێفێز، ساکار، هێژا و ڕۆشنبیر بوو. بە ڕاستی، گەر لە (سولەیمانی) بمایە، ڕیزەکانی ڕێکخستنی چاکدەکرد. گەر نەشیانگرتایە و بە ئەو دەربە نەچووایە، یەکێ لە پیاوە هەرە دانسقەکانی کورد دەبوو. زۆر بە دەم خەڵکەوە بوو، یارمەتیدەدان، گرفتەکانی بۆ چارەسەردەکردن، کاتی بۆ نەبوو، هەمیشە بە بەرگە خاکی و بە نیتاقە سەربازییەکەیەوە، لە بارەگە دانیشتبوو، ئیشی خەڵکی ڕادەپەڕاند، ماندوونەدەبوو، هەموو کاتێکی خۆی بۆ کارکردن، چاوپێکەوتن و پێشوازیکردنی خەڵک تەرخانکردبوو.

ئێوارەیەکیان لە داڵانەکەی لق، لەنێو ئێمەدا دانیشتبوو، گوتی: ئەو دەرگەیە داخەن، با کەمێ قسەبکەین، منیش بۆ خۆم تاوێ بحەوێمەوە. سەرتاشەکەی تەنیشت بارەگەش هات بوو، لە داڵانەکە قژی دەتاشی. هێندە قژی کورتدەکردەوە، بە پەنجە نەدەگیرا! ئیدی ئێمەش لە دەوری کۆبووبووینەوە و پرسیاری جەنگەکانی پێشوومان لێ دەکرد، ئەویش زۆر بە ئاسای و ڕووخۆشییەوە وەڵامیدەدایەوە.

دوای ماوەیە، کاک (فاخیر) لیژنەی ناوچەی لە لق جیاکردەوە، بارەگەی لقی بۆ خانووەکەی (حاجی برایمی چەرمەگا) گواستەوە و ئێمەش هەر لە شوێنی خۆمان ماینەوە.



**(عادل ڕەووف)**

یەکەمین ڕۆژی تاقیکردنەوەمان بوو، هێشتا ماوەیەکی کەمی مابوو، بچینەژوورەوە، (عادل ڕەووف) پەیدابوو. (ی. ق.) کەوتنە خۆیان، بۆ ئەوەی شتێکی لێ بکەن و لە تاقیکردنەوەکە بێبەشیکەن. ئەویش (برایمی حەمەعەلی) لەگەڵ خۆی هێنابوو، لای من و (حەمەعەلی) تکای بۆ بکا. چونکە لە (چەمچەماڵ)، دراوسێی ماڵی (حەمەسەعید)ی مێردی خوشکی (برایم) بوو، هەموویشیان جەلالی بوون و تێکەڵاوییان هەبوو، کاتی خۆشی ئەو چاکەیەیان بەسەرماناوە هەبوو.

ئیدی کاتێ پێم زانی، بە لیژنەکەم گوت: وازی لێ بێنن، با تاقیکردنەوەکەی بدا، دوایی چی لێ دەکەن، بیکەن. ئەوان قایل نەبوون و گوتیان: نایەڵین و نەبێ، باجی خۆی بدا. منیش (عادیل)م پێش خۆم دا و (حەمەعەلی)ش لە پشتەوە دەڕۆی. ئیدی کە ئەوەیان بینی، وازیانهێنا و نەیانتوانی، هیچ بکەن.

بە ئەو شێوەیە، هەموو تاقیکردنەوەکانی تەواوکرد و کەسیش بە لایدانەچوو، بەڵام هەر لە هۆڵەکە دەردەچوو، لە ترساندا خێرا لەچاوونەدەبوو! دوا ڕۆژ تەواوبووین، گەلێ سوپاسی کردم، بەڵام گەر دەمزانی، وازی نەهێناوە و تەمێ نەبووە، لە دواڕۆژدا ئەو ناپیاوە دەردەچێ، هەر ئەو کاتە، تووشی هەزار دەرد و بەڵام دەکردا

**تاقیکردنەوەی کۆتایی**

دوو ڕۆژ پێش ئەوەی تاقیکردنەوەکان دەسپێبکەن، بەڕێوەبەری قوتابخانەکە پێی ڕاگەیاندین، شوێنی تاقیکردنەوەکان لە خواردنگەکەی خۆمان دەبێ. بە ڕاستی بەرنامەی خوێندنی ئامادەیی کشتوکاڵ، هێندە زۆربوو، گەر بە توندی بیانگرتایە و یارمەتی قوتابیانیان نەدایە، باوەڕناکەم، کەس دەرچووایە. چونکە هەموو بابەتەکانی پۆلی سێ، هێندێ بابەتی تایبەتی پۆلی یەک و دووش، بۆ تاقیکردنەوەی کۆتایی داخڵبوون.

لەگەڵ هێندێ برادەردا کۆبووینەوە و گوتمان: مادام تاقیکردنەوەکان، لە قوتابخانەکەی خۆمانە، با شتێ بکەین و یارمەتی یەکدی بدەین. یەکەمین کەس (ڕەفعەتی حەمەدی بەگ)، بیری بۆ ئەوەچوو، ئەو بابەتانەی قورسن و زوو بیردەچنەوە، هەرچی چۆنێبێ، شەو خۆمان بکەینەنێو خواردنگەکە، لەسەر عەرزەکە و کورسیەکان بیانووسینەوە. هێندێ تۆپیش، لەسەر پارچە کاغەزی پچووکپچووک بنووسینەوە، هەر لەنێو کورسیەکاندا بەجێیانبێڵین، نەبا لە کاتی چوونە ژوورەوەدا بمانگەڕێن. چونکە ئەوەتەی ئامادەیی کشتوکاڵ دامەزرابوو، هەر بە خراپی و تۆپیکردن ناوبدەرکردبوو!

هەموومان، ئەو پلانەی (رەفعەت) پاشامان لا پەسەندبوو. شەوێ قوتابییەکان نووستن، بە ئاسپایی بەرەو هۆڵی خواردنگەکە ڕۆیشتین. هێندێکمان لەسەر سووچەکان وەستاین و ئێشکمانتدەگرت، ئەوەك (کەمال رەمزی) یا مامۆستایەکی دیکە بێ، چونکە ئەوان لە (یەکرەچق) دەژیان.

(رەفعەت) گازێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو، هەموو بزماری سەر قەراغەکانی پەنجەرەیەکی سەر چیمەنەکەی دەرکێشا و هەر بە ئاسانی، پەنجەرەکەی دەرهێنا. ئینجا دوواتمان چوویینەژوورەوە، تەماشای کارەکەمان کرد، هەر کەس بە ئاوەکاندا، شوێنی خۆی دۆزییەوە. من چانسم هەبوو، شوێنەکەم زۆر باشبوو، لەبەردەم پەنجەرەیەکی زۆر نزمدا بوو، یەکسەر تەلی هێڵەکی پەنجەرەکەم هەڵوەشاند و کەمێ ترازانیم. هێندێ برادەریش هەبوون، ساڵانی پێشتر خوێندنیان تەواوکردبوو، بەڵێنیانیاندا، بێن و یارمەتیمانبدەن. گەر هەر پرسیارێکمان نەزانی، ئەوا بە ئاوگێڕەکەدا بۆیان بنێرین، ئەوانیش، بە کورتی وەڵامبدەنەوە و بۆمان بنێرنەوە.

هەڵبەتە ئەوە یەکەمین جار نەبوو، کاری وا بکەن، بەڵکوو ئەوان ئەوە ئیشیانبوو، ساڵانی پێشووش، هەر وایان کردبوو. بەڵام ئێمە لە کەس نەدەترساین، لە مامۆستا (عۆدە) نەبێ، چونکە ئەو زۆر تووند و سەرڕاست بوو. ئیدی ئەو ئێوارەیەی بۆ بەیانی، یەکەمین تاقیکردنەوەمان هەبوو، شەو درەنگانێ، یەکیەك لە پەنجەرەکەوە چوویینەژوورەوە، هەموو ئەو شتانەی پێویستبوون، لەسەر عەرز و کوورسییەکان نووسیمانەوە. هێندێ وردە قۆپیشمان بەجێهێشت. هەرچەندە، ئێمە خۆمان زۆر ماندووکردبوو، بەڵام بابەتەکان هێندە زۆربوون، فریانەدەکەوتین، تا شتێکمان لەبەردەکرد، شتێکی دیکەمان لەبیردەچووەوە. لە ئاواندا بابەتەکانی پۆلی یەك و دووەم هەر فڕێدا و نەمخوێندنەوە!

لە ڕاستیدا چانسمان هەبوو، ئەو ساڵە لە تاقیکردنەوەکانی ڕۆژانەماندا، گەلێ پرسیاری سووك هاتبوونەوە و زۆر باشبوو. لەبەرئەوە زۆر پێویستمان، بە نووسینەکانی سەر عەرزەکە و کوورسیەکان نەبوو. ئەوەی نەشمانەدەزانی، ئاوگێڕەکان بۆیان دەهێنایین، مامۆستاکانیش دریغییان نەکرد و یارمەتییاندداین. تەنیا ئەوەی زۆر ناخۆشبوو، دەبووایە، هەموو شەوێ بە لاستیك، نووسینە کۆنەکان بکوژێنینەوە و بابەتی نوێمان بنووسیایەتەوە!

هەرچی چۆنێبوو، دوا تاقیکردنەوەمان بە ڕێکوپێکی و لەسەرخۆ دا، هەر لە خولی یەکەمیشدا، زۆربەمان دەرچووین، بەڵام کەس نمرەی باشی نەهێنا. تێکڕاکەی من (68)

بوو. ئیدی بە ئەو شێوەیە، ئەو ساڵەشمان تەواوکرد. ماڵاواییمان لە ئامادەیی کشتوکاڵ و (بەکرەجۆ) کرد. سێ ساڵی ڕەبەقی پڕ لە خۆشی و ناخۆشی، پڕ لە ژان و ئازار، پڕ لە سەرما و گەرما، پڕ لە گرفت و ناڕەحەتیمان بەسەربرد!

کاتێ هەر سێ قۆناغەکەی خوێندنم (سەرەتایی، ناوەندیی و ئامادەیی) تەواوکرد، بەپێی ڕۆژی لەدایکبوونی تەسکەرەکەم (1. 7)، شەمەندەفەری تەمەنم، لەسەر هێڵی ئاسنینی گەشتی ژیانم، (20) ساڵی ڕێگای بڕیبوو!

گەشتی (خانەقی)

هەر دوای ئەوەی ڕێککەوتننامە بەناوبانگەکەی ڕۆژی (11. 3. 1970) مۆرکرا، هێندەی نەبرد، ڕێکخستنەکانی ڕێکخراوە دیموکراسییەکانی (کوردستان) دامەزرانەوە. برادەرانی (ی. ق. ک.) لقی (سولەیمانی)، بە باشیان زانی، یارییەکی تۆپپێ، لەگەڵ (یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان/ لقی خانەقی) سازکەن. یارییەکە هەم وەک چالاکی وەرزشی نێوان دوو تیپی دوو ناوچەی جیاوازی باشووری (کوردستان) بکرێ، هەم لەگەڵ ئەو برا کوردە خۆشەویستانەی ئەو دەڤەرەشدا، لە نزیکەوە یەکدی بناسین و پێوەندی نەتەوەییمان بەهێزتربێ.

ئەوەبوو، کۆمەڵێ وەرزشکار، نوێنەری قوتابیان و میوان کۆبووینەوە، بە پاسێ ڕۆیشتین، دووشەو و دووڕۆژ لە (خانەقی) ماینەوە. برادەرانی (لاوان)ی ئەو شارۆچکە بەڕێزەش، میوانخانەیان بۆ گرتبووین، خوارنگەیەکیشیان بەرەوڕووکرابووینەوە، سێژەمە لە ئەوێ نانمانئەخوارد.

ئەوە یەکەمین جارمبوو، شارۆچکەی (خانەقی) ببینم. جگە لە ئەوەی، ئاوەکەی (ئەڵوەند)مان بینی و چەند وێنەیەکیشمان، بۆ یادگار لەسەر پردەکەی گرت، برادەرانی (لاوان) گەشتێکی زۆر باشیشیان، بە نێو شارۆچکەکە و باخەکانیدا، بۆ سازکردین و گەلێ زانیاری بەکەڵکیان بۆ باسکردین. بە ڕاستی، ئەو پرتەقاڵەی لە ئەوێ دیم و خواردم، باوەڕناکەم، لە هیچ شوێنێکی دیکەی (عێراق) هەبێ، هێندە بە تامبوو!

گەشتەکەمان زۆر بە کەڵک و خۆش بوو، بەڵام یارییەکەمان دۆڕاند! ئێوارە لە یانەی فەرمانبەرانی (خانەقی) دانیشتین، شەوێکی زۆر خۆشمان بەسەربرد. پاشان هەر بە ئەو شەوە، بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە!

هەرگیز ئەو گەشتە و یادگارەکانیم لە بیرناچن، چونکە لە لایەکەوە: یەکەمین جاربوو، ئەو کۆمەڵە برادەرە کۆببینەوە و پێکەوە گەشتێکی لە ئەو چەشنە بکەین. لە لایەکی دیکەشەوە: ئەو برادەرانەی (خانەقی)، زۆر کوڕی باشبوون و ڕێزێکی یەکجار زۆریان گرتین. کەچی سەرەڕای ئەوەش، هێندێ لە برادەرەکانی خۆمان، پێیان ڕادەبواردن. ئیدی دەڵێی چی، خەڵکی هەر شارێ، خورەوشتێکی تایبەتی خۆیان هەیە!



**ئەم وێنەیە لە کۆتایی مانگی (10) ساڵی (1970)دا گیراوە.**

**ڕاوەستاوەکان لە ڕاستەوە: حوسێن (خۆم)، دوو برادەری خانەقینی، سەردارمەڕەش، خۆشناو موحەممەد ئەمین، ئازادەسوور، ڕاستی نوری شاوەیش، حەمەعەلی حەمەمراد، ساڵەی سمایلی پاسکیلچی. دانیشتووەکان: خوالێخۆشبوو سەروەت موحەممەد ئەمین، جەمالەقژە.**

**ڕۆژانی چاوەڕوانی لە تەواوکردنی ئامادەیی کشتوکاڵەوە ( 1. 7. 1970 )، تا یەکەمین ڕۆژی دەسپێکردنی خوێندنی زانکۆ ( 1. 9. 1971 )**

**کارگەی پوختەکردنی توتنی ( سولە یمانی )**

دوای ئەوەی خوێندنم تەواوکرد، خوالێخۆشبوو (شێخ شیتی شێخ عەزیز)، بەڕێوەبەری کارگەی پوختەکردنی توتن بوو، پیاوێکی زۆر خۆش و سوعبەتچی بوو. جگە لە ئەوەی خۆم دەمناسی، زۆر هاوڕێی باوکیشم بوو. ئەو هاوینە بۆ ماوەی دوو مانگ، من و (لاوچاکی شێخ قادری حەفید) و (حەمەعەلی) هاوڕێمی دامەزراند. بەیانیان زوو هەڵدەستاین و دەچووین بۆ ئیشکردن. شۆفێرەکەمان خوالێخۆشبوو (رەحیمەفشە) بوو، بە ترومبیلی کارگە دەیبردین بۆ (بەکرەجۆ)، لە کێڵگەی توتن کارماندەکرد. هێندێ جاریش بە دەم لێخوڕینەوە، گۆرانی خۆشی بۆ دەگوتین. سەیر ئەوەبوو، پێش چەن هەفتەیەک لە (بەکرەجۆ) دەمخوێند و ئێستاش، هەر لە ئەوێ کاردەکەم! ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (حەمەی شێخ کەریم)ی هاوڕێشم، هەر لە هەمان کارگە دامەزرابوو، ڕووژوو یەکدیمان دەبینی. هەرچی چۆنێ بوو، ئەو دوو مانگەمان بەسەربرد و بڕێ پارەمان دەسکەوت!

**لە پێشەوە: من و ( حەمەعەلی )، لە دواشەوە ( لاوچاک حەفید ) و ( ئەوزاد سدیق ) ...**
**(بەکرەجۆ – 7. 7. 1970)**

## توتیاکراتی

ئەو ڕۆژانەی کارم نەبوو، زۆربەی کات، لەبەر چاخانەی (جمهوری) کۆدەبووینەوە و بیروڕامان دەگۆڕییەوە. هێندێ جاریش تاوڵەمانتەکرد. هەموو ئێوارەیەکیش، (خولەی پاقلە) بە خۆی و عەرەبانەکەیەوە پەیدادەبوو، سڵاویدەکرد و باسی دادەمەزراند، زۆر حەزی لە دەمەتەقێ و باسی ڕامیاری بوو، هەر دەتگوت، کۆمۆنیستەکان ناردوویانە!

ئاشکرایە، هەر لە کۆنەوە ئەو پەروەردەکردن و بەرنامە ڕووناکبیرییەی، لە ڕیزەکانی پارتی (کۆمۆنیست)دا هەبوو، لە ڕیزی پارتە ڕامیارییەکانی دیکەی (کوردستان) و (عێراق)یشدا نەبوو. لەبەرئەوە ئەندامەکانیان، بە باشی پەروەردەدەکرد و گەر نەخوێندەواریش بوونایە، فێری هێندێ زانیاری سەرەکییان دەکردن. کاکە (خولە)ش، یەکێ لە ئەو کۆمۆنیستانە بوو، بەشی ئەوەی دەزانی، هەموو ئێوارەیە، سەری ئێمەی پێ بیەشێنێ!

ئێوارەیەک لە دوورەوە دەرکەوت، بە هاوڕێکانم گوت: ئەوە (خولەی پاقلە) هات، ئەم جارە کەس قسەنەکا، من پرسیارێکی لێ دەکەم، بزانین، دەڵێ چی؟ وەک هەموو ئێوارەیەک، هەر هات، دەسیپێکرد. منیش گوتم: کاک (مەحموود) واز لە ئەو قسانە بێنە، من پرسیارێکت لێ دەکەم. گوتی: فەرموو. گوتم: ئێمە لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا، بابەتێکمان خوێندەوە، زاراوەیەکی تێدابوو، هیچمان نەمانزانی، واتای چی دەگەیەنێ، مەگەر تۆ بتوانی، بۆمان ڕوونکەیتەوە. گوتی: چییە؟ گوتم: توتیاکراتی.

ئیدی کاکە (خولە) دەسیپێکرد، هێنای و بردی، توتیکراتەکان وایانکردووە و کاری کرێکارانیان داخستووە، خەریکبوو، لەسەر ڕۆڵی کرێکاران، شۆڕشێکی نوێ بەرپاکا و پەلاماری (شیکاگۆ) بدا! ئیدی ئێمەش خۆمان بۆ نەگیرا و دامانە پڕمەی پێکەنین.

ئەویش گوتی: ئەوەندە قسە بۆ ئەم پیاوە نەزانانە بکە، گوێ ناگرن وەهەر پێدەکەنن! پاشان پێم گوت: بابە گیان، تۆ بۆ خوا سەری لێشێواندووی، توتیاکراتی هیچ نییە، لە هیچ فەرهەنگێکی ڕامیاریدا نییە، ئێمە خۆمان دامانناوە، بۆ پێکەنین لە تۆمان پرسی. مەبەستیشمان لە ئەو کەسانەیە، کە هیچ نازانن و وەک توتی، فێری چەن زاراوەیەک دەکرێن و هێندێ زانیاریشیان هەیە، لە هەموو شوێنێ دەیڵێنەوە.

سەیر ئەوەبوو، بڕوای نەکرد و گوتی: نەخێر، ئەو زاراوەیە هەیە و ئێوە بە هەڵەدا چوون، چونکە پەروەردەیەکی بۆرژوایانەتان هەیە، بڕواتان بە ئەو جۆرە لێکدانەوانەی من نییە. دیارە کاکە (خولە)و بە (بیرۆکراتی) تێگەیشتووە!

هەر دوای ئەو کۆنفرانسانەی، لەنێو شاری (سولەیمانی) گیران، سەرەتا هەشتەمین کۆنگرەی (پارتی)، ڕۆژی (1. 7. 1970)، لە (ناوپردان) گیرا، ناوی کۆنگرەی (ئاشتی و یەکێتی نیشتمانیی) بوو. ئەو کاتە ئێمە، لە لقی چواربووین و هەر خەمی ڕەوانشاد (عەبدولی سوران)مان بوو، بۆ سەرکردایەتی دەرچێ!

دوایی لە پڕ برووسکەیەکمان بۆ هات و ئاگاداریانکردینەوە، کە هەڤاڵانی لقی چوار، تەنیا (عەبدولی سوران) و (سدیق)ە فەندی دەرچوون. ئێمەش زۆرمان پێ خۆشبوو، چونکە هێشتا نەماندەزانی، کاروبارەکانی لق چۆن بەڕێوەدەبرا، بە تەواوی لە کێشەکانی نێوخۆی (پارتی) و ململانێی نێوان لێپرسراوە دەسەلاتدارەکان تێ نەگەیشتبووین!

پاشان ڕۆژی (15-18. 7. 1970)، شەشەمین کۆنگرەی (ی. ق. ک.) لە (ناوپردان) گیرا. وەك دەیانگێڕایەوە، کۆنگرەی یەکێتی قوتابیانیش، هەر هەڵبژاردنێکی تەواوبووە و هیچی بەسەر هیچەوە نەبووە. ئەندامانی سکرتاریەت و مەکتەبی تەنفیزی، سەرکردایەتی (پارتی) دایاننابوون، تەنیا هەر ناوەکانیان خوێندبوونەوە و ئەندامانی کۆنگرەش دەنگیان بۆ دابوون. (ئەنوەر عەبدوڵلا)یان بە سەرۆك و (فەرهاد عەونی)شیان بە سکرتێری گشتی دانابوو، (ئەنوەر) زۆر بە توانا و لێهاتوو نەبوو، شارەزاییەکی باشیشی نەبوو. (یوسف زرار قەساب) و براکەشیان دانابوو، دوواتەبوون و زۆر لە یەکدیشیان دەکرد، ناویان نابوون (جینگۆ) و (ڕینگۆ)، سەرەولو لە ورگیانتدا نەبوو! ئەوەش نەگبەتی و بەڵایەکی گەورەبوو، چونکە (پارتي) نە لەنێوخۆیدا، نە لەنێو ڕێکخراوە پیشەیی و دیمۆکراسییەکانیشدا، کادێری باش و شارەزای نەبوو، هەموو کادێرە باش و خوێندەوار و شارەزاکان، لەگەڵ جەلالییەکان بوون. ئەم پەتایەش، بە هیچ شێوەیە چارەسەرنەدەکرا. چونکە تا کونێکیان دەگرت، دە کونی دیکەیان تێ دەبوو! تەنانەت لە کۆنگرەشدا، ئەندامێ لە داخاندا خۆی کوشت!

کاتێ ئەوانەی لقی قوتابیانیش گەڕانەوە، لەبری باسی کۆنگرەمان بۆ بکەن، باسی ڕابواردنی خۆیان دەکرد، چۆن بە شەو ڕاوەژێشکیان کردووە، بە خەڵکیان ڕابواردووە و کۆنکەنیان کردووە. ئەوەی باشبوو، ئەو ساڵە لە ئەو ئەندامانەی لقی (سولەیمانی)، جگە لە خوالێخۆشبوو (مەزنی عوسمان فایەق)، یەك کەسی دیکەیان، بۆ سەکرتاریەتی قوتابیان دەرنەچوون!

**هەواڵێکی ناخۆش**

ڕۆژی پێنجشەممەی ڕێککەوتی (4. 9. 1970) بوو، هەواڵی کۆچیدوایی (سەیید عەبدوڵڵای سەییدڕەشید)ی مێردی پورە (سەبیح)م، لە شارۆچکەی (ڕانیە)وە پێ گەیشت. دوای خۆشی چوار کوڕ و دوو کچی بەجێهێشت. بە ڕاستی، زۆرم پێ ناخۆشبوو، چونکە تا بڵێی، پیاوێکی کراوە و باشبوو، زۆر هێمن و خزمدۆست بوو. ئەو کاتەی باوکم لە (ڕانیە) گیرابوو، یارمەتییەکی زۆری ئێمەی کرد. مرۆڤێکی زۆر سەیربوو، سەری بچووبایە، تووێژی تەمەچوو، کەچی ئەندامی (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) و یەکێ لە کۆمۆنیستە ناسراوەکانی شارۆچکەکەش بوو. حەزیشی زۆر لە مەیخواردنەوە دەکرد، هەر بهاتایە بۆ (سولەیمانی)، لە ماڵی مامە (عومەر)م دادەنیشتین و دەمانخواردەوە. کاتێ کەمێ کەللەشی گەرمدەبوو، ئەو گۆرانییەی دەیگوت، ئەیدەگوتەوە!

خۆی لە بنەڕەتدا، خەڵکی شاری (بۆکان)ی خۆرهەڵاتی (کوردستان) بوو، خوشکەزای هونەرمەندی ناسراو (سەییدموحەممەدی سەقایی) بوو، هەر وەک ئەویش بەخۆ و کەڵەگەت بوو، زۆر گاڵتەوگەپیشیدەکرد و حەزیشی لە قسە خۆشەکانی مامە (عومەر)م بوو.

**(قادر جەباری)**

لە ئەو ماوەیەدا، هێندێ لە ئەو کادیرانەی لەنێو شۆڕشدا پێشمەرگە بوون، وەک (قادر جەباری، شێخ ڕەزا شێخ عارف، حەمەڕەحیم ـ خاڵەحاجی) هاتنەوە و لە لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی) کاریاندەکرد.

(قادر جەباری)، تا بە تەواوی، تێکەڵاوی بەزموڕەزمی خەڵکی شارەکە نەبووبوو، هەمیشە لە جووڵە و چالاکییەکی بەردەوام و بێ وێنەدا بوو. سەری لە هەموو شانە سەرەکی و ڕێکخراوە کوردستانییەکان دەدا، باسێکی مێژوویی دوورودرێژی، سەبارەت بە ڕێککەوتننامەکەی (11)ی مارس، جەلالییەکان، ڕەوشی ئەو سەردەمەی (کوردستان) و (عێراق)ی دەکرد. وای لێهاتبوو، ڕۆژ نەبوو، کۆبوونەوەی نەبێ! تا بڵێی، پیاوێکی ئاسایی و بە توانا بوو. تا ئەو کاتەش، هەر جلی پێشمەرگەی لەبەردەکرد و بە نێو شاردا دەگەڕا.

شەوێ لە ماڵی خۆمان دانیشتنمان هەبوو. تا درەنگانێ، ئەو بابەتانەی بۆ باسکردین، پاشان ڕۆژێکی بۆ دیاریکردین، بچین بۆ لیژنەی ناوچە و سەبارەت بە ئەو بابەتانەی بۆی

باسکردبووین، لێمان بپرسێتەوە و تاقیمانکاتەوە. هەڵبەتە (پارتی) دەیویست، بە ئەو شێوەیە، بەردی بناغەی ڕێکخستنەکانی خۆی دامەزرێنێتەوە. لە ڕاستیدا، کاتێ چووین بۆ ناوچە، ئەو هیچی بیرنەمابوو، خەریکبوو، هەڵدەسا و دەڕۆیشتەوە. ئێمە بیرمانخستەوە، ئینجا دانیشتەوە و دەستمانپێکرد.

سەرەتا، هێندێ پرسیاری لە هەڤاڵێکمان کرد، وەڵامەکەی زۆر بە دڵ نەبوو، جارێکی دیکە خۆی بۆی باسکردینەوە. پاشان لە ئەوەدەچوو، زۆر پەلەیبێ، ڕووی دەمی لە من کرد و گوتی: دەمەوێ، بەیانی بتبینم. بەڵام نە ئەو لە منی پرسیەوە، نە منیش سەرم لێ دایەوە، ئێستەش نەمزانی، بۆچی ویستی، بمبینێتەوە و چی لە من دەویست!

**یادی دامەزراندنی یەکێتی قوتابیانی کوردستان**

ڕۆژی (18. 2. 1971)، یادی هەژدەیەمین ساڵڕۆژی دامەزراندنی (ی. ق. ک.) بوو. بە ئەو بۆنەیەوە، سەرلەئێوارە لە ئامادەیی (سولەیمانی) کوڕان، ئاهەنگێ سازکرا. منیش، هەم وەک ئەندامی ڕێکخراوی (پارتی) و هەم وەک هەڵسوڕاوێکی دیاری قوتابیان، بەشداریم تێدا کرد. سەرەتا کۆمەڵێ گوتارخوێنرایەوە، پاشان ئاهەنگی گۆرانی دەستپێکرد و یادەکەی ڕازاندەوە، تا درەنگانێ ئاهەنگەکە بەردەوامبوو.



لە ڕاستەوە: قادر جەباری لێپرسراوی لیژنەی ناوچەی سولە یمانی، دلێر ڕەشید، خوالێخۆشبوو ڕەفعەتی حەمەی بەگ، حوسێن موحەممەد عەزیز (خۆم) و سەرکەوت تۆفیق.

**یەکەمین ساڵیادی ڕێککەوتننامەی (11)ی مارس**

ڕێکخراوە دیمۆکراسی و تیپی هونەریی (هاوڕێیانی گەزیزە)، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن، کۆمەڵێ لە نوێنەر و هونەرمەندەکانی خۆیان کۆکەنەوە، بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێ، بەسەر ڕێککەوتننامەکەی (11)ی مارسی (1970)دا، لەسەر تێلێڤیزیۆنی (کەرکووك)، چەن کۆڕێ بگرن و باری سەرنجی خۆیان دەربڕن.

لە (ی. ق. ل.)، من و (کەمال حەسەن چاوەمار، نووری حەمەکاکە و دلێری ڕەشی قەندی)، نوێنەری قوتابیان بووین. خوالێخۆشبووان (کەمال سابیر، عومەر عەلی ئەمین و گەزیزە)ی کچی، لەگەڵ چەن نوێنەرێکی لاوان و ئافرەتاندا، هەموو پێکەوە بەرەو (کەرکووك) سواربووین و ڕۆیشتین. هەر یەکێ وەك نوێنەری ڕێکخراوێ؛ شتێکی ئامادە کردبوو، پێشکەشیکا. بەڵام تیپی شانۆی (هاوڕێیانی گەزیزە)، شانۆگەرییەکی نوێی چکۆلانەیان ئامادەکردبوو.

ئەوەی ئێمە بڕیارماندابوو، قسەی لەسەربکەین، کێشەی (کەرکووك) و نەوت بوو. من خۆم بۆ ئامادەکردبوو، کورتەیەکی مێژوویی شاری (کەرکووك)م باسکرد، چاڵە نەوتەکانی باشووری (کوردستان)م بژارد و ناوچەکانیانم دیاریکرد. جگە لە ئەوەی، لە بایەخی نەوت و پێگەی ناوچە نەوتییەکان دوام.

بەڵام وەك دەڵێن: ئاش لە خەیاڵێك و ئاشەوان لە خەیاڵێ! ئەو بابەتانە لە ئەو ڕۆژانەدا، زۆر قەدەغە و مەترسیداربوون، بە هیچ شێوەیە ڕێیان پێ نەدەدرا، لە دەزگەکانی ڕاگەیاندنی (عێراق) بڵاوکرێنەوە. چونکە هێشتا ئەو ناوچانە، یەکلایی نەبووببوونەوە، هەموشیان کێشەی گرگرتوو و جێی ناکۆکی، نێوان دەسەڵاتدارانی دەوڵەتی (بەعس) و سەرکردایەتی شۆڕشی کورد بوون! لەبەرئەوە، بە هۆی ئەو بابەتانەی ئێمەوە، کە بۆنی خوێنیان لێدەهات، بابەتەکانی دیکەشیان بڵاونەکردەوە و بابەتەکەشیان، بە ئەو شێوەیە کردەوە، کە لە بەرژەوەندی خۆیاندا بێ!

ئەوە تەنیا هەر، یەکەمین جارم نەبوو، لەسەر تێلێڤیزیۆنی (کەرکووك) چاوپێکەوتنم لەگەڵ بکرێ و باسێکی وا گرنگ پێشکەشکەم، بەڵکوو یەکەمین و دوایەمین جاریشم بوو، تێلێڤیزیۆنی (کەرکووك) ببینم! دوای ئەوەی چاوپێکەوتنەکان، ماوەی (2) کاژێری خایاند و تەواوبوو، هەمووومان سواربووین و بەرەو لقی (پارتی) شاری (کەرکووك) ڕۆیشتین. ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (عوسمان سەعید) لێپرسراوبوو. کەمێ حەواینەوە، ڕاژەیەکی زۆریان کردین و پاشان بەرەو (سولەیمانی) گەڕاینەوە.

**ئاهەنگی نیشانەکردن**

ماوەی ساڵێ پتربوو، مامە (ساڵح)م خوێندنی زانکۆی تەواوکردبوو، لە قوتابخانەی ناوەندیی کچانی (خانزاد) دامەزرابوو، وانەی ئینگلیزی دەگوتەوە. دیارە لە زۆر شت بێزاربووبوو، بۆیە دەیویست، خێزانێکی چکۆلانە پێکەوەنێ، ژیانێکی هێمنانە و پڕ لە خۆشی باسەربەرێ.

لەبەرئەوە، مەلی خۆشەویستی دڵە گەورە بڕێو و گەڕۆکەکەی، لە ئەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕی و لەسەر هیچ چڵێ ئۆقرەی نەدەگرت، تا بازی چارەنووس، بەسەر چڵی چانسی خۆشەویستی خاتوو (گەلاوێژ)ەوە نیشتەوە! ئەوەبوو، دوای خۆشەویستییەکی کەم، داوایکرد، هەموو لایەک قایلبوون. بۆیە ئێوارەی ڕۆژی (30. 5. 1971)، لە ماڵی باوکی بوکێ، ئاهەنگێکی خنجیلانەی خێزانیی سازکرا، من و دوکتۆر (لەتیف)یش ئامادەبووین. دوای ئەوەی کەمێ دانیشتین، زاوا ئەڵقەی لە دەستی بوکێ کرد، بە شێوەیەکی فەرمی، پێوەندی هاوسەرگیری خۆیان ڕاگەیاند. ئەو پێوەندییەش، ماوەی (39) ساڵ بەردەوام بوو، تا ڕۆژی (9. 9. 2011)، مامم کۆچیدواییکرد!



لە ڕاستەوە: خۆم، خوالێخۆشبووان گەلاوێژ عەبدولکەریم و مامە ساڵح

**پیلانێکی پۆخڵ**

هێشتا ساڵێك و شەش مانگ و حەڤدە ڕۆژ، بەسەر ڕێککەوتننامەی (11. 3. 1970)دا تێپەڕیووبوو، مەبەستە گڵاوە سەرەکییە شاراوەکەی داگیرکەری دەوڵەتی (بەعس) ئاشکرا بوو. چونکە ڕۆژی (29. 9. 1971)، بە ناوی ئەوەوە، پێوەندی برایەتی نێوان هەردوو گەلی موسوڵمانی کورد و عەرەب پتەوتربێ، سەرکردایەتی پارتی (بەعس)، هێندێ مەلای ئایینی ڕاسپارد، سەردانی سەرۆك (بارزانی) بکەن، تا ئەو گرفتانەی لە نێوانیاندا هەیە، وەك چەن پیاوێکی ئایینی خێرخواز، چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوە. بەڵام هەر زوو مەبەست و دەسەچەپەڵەکەی (بەعس) کەوتەڕوو، چونکە مەلاکانیان سواری چەن ترومبیلێکی بۆمبڕێژکراو کردبوو، بێ ئەوەی ئاگایان لێبێ، وایان کۆنتڕۆڵکردبوو، هەر بگەنە بارەگەی سەرکردایەتی، هەموو ترومبیلەکان بتەقێنەوە و (بارزانی) لەنێوبەرن. بەڵام ژیان و مردن بەدەس خوایە، ترومبیلەکان تەقینەوە، یەك مەلا دەرنەچوو و هەموویان پارچەپارچەبوون، (بارزانی)ش کەمێ بریندارببوو، بە سەلامەتی ڕزگاریبوو.

ئەو شەوەی هەواڵەکە گەیی، هەموو هێزەکانی پێشمەرگە و ئەندامانی (پارتی)، لە باری ئامادەباشییدا بوون، نەبا لەگەڵ ئەو پیلانە پۆخڵەدا، هێزەکانی سوپای دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) هێرشبکەن. لەبەرئەوە هەموو ئەندامانی لق و ناوچەی (سولەیمانی)، لە گوندی (عەواڵ) بوون. منیش لەگەڵ (وریا براخاس)دا، لە (بەکرەجۆ) دامەزرابووین، بەڵام هیچ ڕووی نەدا و بەیانی زوو گەڕاینەوە.



**ڕۆمانیا**

دوای ئەوەی لە خوێندنی ئامادەیی کشتوکاڵ ڕزگارمبوو، وەک هەموو گەنجێ دەبووایە، ڕاژەی سەربازیم بکردایە، یا دەبووایە، لەسەر خوێندن بەردەوامبوومایە. ئەو ماوەیە دەستم بەتاڵبوو، وەک پێشمەرگەی شێوشار، لە لقی چوار کارمدەکرد. تازە (شێخ ڕەئووف) لە دەرەوە هاتبووە و کارگێڕی لیژنەی ناوچە بوو، ڕۆژێ پێی گوتم: چەن کورسییەکی خوێندنمان، لە (ڕووسیا) و (ڕۆمانیا)وە بۆ هاتووە، حەزدەکەی، ناوی تۆش لەگەڵ ناوی پاڵێوراوەکانی (ی. ق.)دا تێهەڵکێشکەم؟! منیش گوتم: زۆر سوپاسیشتدەکەم.

ئەو کاتە لە (یەکێتی سۆڤێت)ەوە، زەمالەیەکی زۆریان بۆ (پارتی) ناردبوو، زۆربەی کادیرە خاوەن بڕوانامە لاوەکان و مامۆستایانی شۆڕشیان نارد. بەڵام بۆ (ڕۆمانیا)، لە هەموو (سولەیمانی)ەوە، تەنیا من و (لاوچاکی شێخ قادری حەفید) پاڵێوراوبووین.

لەگەڵ (لاوچاک)دا سوواربووین بۆ (بەغدا) و نووسراوەکەی لقی چوارمان بۆ پەلیتبیرۆی (پارتی) برد. ئێوارە چووین بۆ بارەگەی ڕۆژنامەی (ئەلتەئاخی) و چاومان بە ڕەوانشاد (دارا تۆفیق) کەوت. هێندێ منجەمنجیکرد، سەرێکیبادا و گوتی: ئەمە زۆر مسۆگەر نییە! منیش هەر زوو تێگەیشتم، بۆ ناسیاوەکانی خۆیانیان داناوە!

لە لقی پێنج بیستمان، کاک (فاخیر) هاتووە و لە ئوتێل (سەمیرئەمیس) دابەزیوە. هەردووکمان چووین و ئوتێلچییەکە گوتی: جارێ میوانی هەیە، فەرموو دانیشن و چاوەڕێکەن. ئێمە دانیشتبووین، <u>لە پڕ (ڕەفیق چالاک) هاتەدەرەوە، پاشان (فاخیر میرگەسووری، مام جەلال، عومەر دەبابە) و چەن کەسێکی دیکەش بوون، ماڵاواییان لە یەکدی کرد و ئەوان ڕۆیشتن.</u> ئیدی لەگەڵ (لاوچاک)دا، سەیرێکی یەکدیمان کرد و سەرمان سوڕمابوو! ئاخر ئەمە چەندی بە چەن، لە (سولەیمانی) لیژنەی ناوچە و لق، شیروتیریان لێ دەسوون، لێرەش لەگەڵ مەڵاڵ (فاخیر)دا کۆدەبنەوە! دوایی کاک (فاخیر) بانگیکردین و زۆر ڕێزی لێ گرتین. هەواڵی (سولەیمانی) پرسی و ئێمەش زۆر شتمان بۆ باسکرد. ئینجا داوامان لێ کرد، یارمەتیماندا، بەڵام هەوڵەکەی ئەویش کەڵکی نەبوو!

لەگەڵ ئەوەشدا، هەرچی چۆنێبوو، دوایی (لاوچاک) وەرگیرا، منیش بە ئائومێدی گەڕامەوە! چوومەوە بۆ لای (شێخ ڕەئووف) و ئاگادارمکردەوە، ئەویش گوتی: وورەبەرمەدە، شتێک هەر بۆ دەدۆزینەوە، بەڵام جارێ هەر لە ئەم ناوەبە و خۆت وڕمەکە! باسی دانیشتنەکەی مەڵاڵ (فاخیر) و (مام جەلال)م بۆ کرد، گوتی: لە هیچ شوێنێ باسی مەکە، یا لە دەمی تۆوە بڵاونەبێتەوە، چونکە هێندەی ئێمە ئاگامان لێبێ، هیچ جۆرە ڕێکەوتنێ لە گۆڕێدا نییە!

**خولی سەرژمێری گشتی**

یەکێ لە خاڵە گرنگەکانی ڕێککەوتننامەی (11)ی مارس ئەوەبوو، ئەو ناوچانەی لە پێکهاتەی نەتەوەیی جیاواز (کورد، عەرەب، تورکمان و ئاسووری) پێکهاتوون، بۆئەوەی ساغکرێنەوە، سەرژمێری گشتی تێدا بکرێ، تا ڕێژەی ئەو پێکهاتانە بزانرێ و بە ئەو شێوەیەش، خاوەنی ناوچەکە دیاریکرێ. بۆ ئەو مەبەستەش، خولێکی سەرژمێری گشتی، لە شالیارگەی پلاندانان لە (بەغدا) ڕێکخرا. (پارتی) لە هەموو شارەکانی (کوردستان)ەوە، کۆمەڵێ کادێری لە هەموو ڕێکخراوەکانەوە نارد، تا بەشداری لە خولەکەدا بکەن. پاشان کە گەڕانەوە، لە ناوچە جیاجیاکانی دیکەی نیشتمانەکەمان، هاوولاتیانی کورد فێرکەن و خۆیان ئامادەکەن، بەشداری سەرژمێرییەکە بکەن.
ئێمەش ئەو کاتە، ئەو کارەمان بە کارێکی زۆر گرنگ و پیرۆزی نەتەوەیی ئەزانی، بە تایبەتی شاری (کەرکووک) و ناوچەکانی (خانەقی، شێخان، زەمار، شەنگار، مەخموور، جەلەولا ...)، هێشتا لە ڕێککەوتننامەکەدا ساغ نەبووبوونەوە و چارەنووسی ئەو شوێنانەیان، بە ئەنجامی ئەو پرۆسێسەوە بەستبووەوە!
یەکێ لە ئەو چوار کەسەی، لەسەر لقی (ی. ق. ک.)، بۆ ئەو خولە نێرران، من بووم. لە (سولەیمانی)ەوە، نزیکەی (30) کەس بووین، لە ئوتێل (هەولێر) دابەزیبووین و هەموو شتێکیشمان لەسەر لقی پێنج بوو. بەیانیان زوو دەچووین بۆ شالیارگە، یەک هەفتە لە ئەوێ دەوامماندکرد و شارەزایان هێنابوو، باسی پرینسیپە سەرەکییەکانی، سەرژمێری گشتییان بۆ دەکردین، گوێمان لە وانەکان دەگرت، هێندێ بڵاوکراوە و بلانکێتیشیان دابووینێ، تا بزانین، چۆن پڕدەکرێنەوە. هێندێ جاریش پاشنیوەڕوان، لە بارەگەی لقی پێنج، سەبارەت بە گرفتەکانی سەرژمێری گشتی، (هادی ڕەشید چاوشلی)، هێندێ زانیاری بۆ باسدەکردین. ئەو ماوەیە لە ئەو خولە بووین، زۆر هەوڵمدا، بە تەواوی، بابەتەکان فێربم و شارەزایی تێدا پەیداکەم.

( پێشبوونی )

ئەندامانی سەرکردایەتی (پارتی) وایانئەزانی، هەر کاتێ سەرکردایەتی (بەعس)ی هاوپەیمان، بەڵێنێکی دانێ و ئەو خولەیان کردەوە، ئیدی هەمووی جێبەجێدەکەن. هەر دوای چەند هەفتەیەک، یەکسەر پرۆسەی سەرژمێری گشتی دەسپێدەکەن. بەڵێنەکەی خۆیان لەبەرئەسەر و بە زیادیشەوە، خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکە جێبەجێدەکەن!

لەبەرئەوە هێندە پەلەیانبوو، هەر دوای ئەوەی بە هەفتەیەك لە (بەغدا) گەڕاینەوە، مانگی (11. 1970) بوو، لیژنەی ناوچەی (سولەیمانی)، منیان بۆ (پێنجوێن) نارد، تا خولێکی چەن ڕۆژیی بۆ کادیرە سەرەکییەکانی (پارتی)، هێندێ خوێندەوار و فەرمانبەری شارۆچکەکە بکەمەوە، ئەوەی لە (بەغدا) فێریببووبووم، منیش ئەوان فێرکەم.
لە هەمان کاتیشدا، (سەروەت موحەممەد ئەمین ـ دوکتۆر کوردۆ عەلی)، وەك نوێنەری (ی. ق. ك.) لەگەڵم هات، بۆئەوەی لیژنەیەکی ناوچە بۆ قوتابیانی (پێنجوێن) دامەزرێنێ، چونکە ئەو کاتە، ئەندامی لقی قوتابیانی (سولەیمانی) بوو.
ئێمە، دوای ڕێککەوتننامەی (11)ی مارس، یەکدیمان ناسی، بەڵام هێشتا زۆر تێکەڵاو نەبووبووین. هەرچی چۆنێبێ، پێکەوە بەڕێکەوتین و پاشان، لە یەکدی نزیکبووینەوە.
لە (پێنجوێن)، چوورینە لیژنەی ناوچەی (پارتی)، مەلا (ئەحمەد هێلکە) لێپرسراوبوو، زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کردین، هەر زوو ژوورێکیان، لە ئوتێل بۆ گرتین و خواردنگەیەکیشیان بەرەوڕووکردینەوە، سێژەمە نانی لێ بخۆین. لە ڕاستیدا، تەنیا هەر خۆم بۆ ئەو کارە نێررابووم، کەچی (سەروەت)یشم دامەزراند! بەڵام تەنیا یەك ڕۆژ، لە ئوتێلەکە ماینەوە، ئیدی (عەلی پوورەڕەحمە) ئەیهێشت، لە ئەوێ بمێنین و هەردووکمانی بردە ماڵی خۆیان
کات پاییزێکی درەنگبوو، دنیا خەریکبوو، ساردیدەکرد. ماوەی یەك هەفتە ماینەوە، لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی، کۆمەڵێ خەڵکیان بۆ کۆکردەمەوە و بە چەن ئێوارەیە، هەموو زانیارییەکانم بۆ باسکردن. ڕێککەوت وابوو، کاتی خۆی ماڵمان لە (پێنجوێن) بوو، هەر لە ئەو قوتابخانەیە خوێندبووم!
لە (پێنجوێن)، کۆمەڵێ برادەری ناسیاوی خەڵکی (سولەیمانی) لێبوو، وەك مامۆستایان (حەمەی عەبدول، موحەممەد ئەسلان و کەریم مەجید موحەممەد)، گەلێ ڕێزیان لێ گرتین و کاتێکی خۆشمان بەسەربرد. ئیدی کارەکانمان بە باشی تەواوکرد، پاشان ماڵاواییمان لە هەموو لایەك کرد و گەڕاینەوە.
لەو کۆچەی لەگەڵ (سەروەت)، پێکەوە کردمان، سەرەتای دامەزرانێنی هاوڕێیەتی و برایەتییەکی توندوتۆڵ و پتەوی نێوانمان بوو، بە شێوەیە، ئەمڕۆ نزیکەی (46) ساڵ بەسەر ئەو هاوڕێیەتییەماندا تێپەڕدەبێ، تا ئێستەش، بە باشترین شێوە هەر بەردەوامە.
وەك پێشتریش گوتم: سەرژمێرییەکە نەکرا و بۆ کاتێکی نادیار دواخرا، تا جەنگ لە (کوردستان) دەستپێکرایەوە و هەموو شتێکمان لەکیسچوو!

## هەڵبژاردنی یەکێتی قوتابیان

مانگی (10) بوو، بڕیاردرا، سەرلەنوێ هەڵبژاردنی نوێ بکرێ. دوای کۆنگرە، لیژنەی ناوچە و لقی قوتابیان، کەمێ باشتربووبوو. هێندێ کەسی نوێیان هێنابووەپێشەوە. هەرچەندە (وریا براخاس)ی هاوڕێم، پێنج ساڵیش نەبوو، وازی لە خوێندن هێنابوو، لە (بەکرەجۆ) فەرمانبەربوو، بەڵام چونکە کادیری شارەزا کەمبوو، ڕیزەکانی ڕێکخستنی (ی. ق.) شلۆقبوو، ناچاربوون، دیسانی وەک ئەو بێنن و بیکەن بە ئەندامی ناوچە. برادەران داوایان لە منیش کرد، لە هەڵبژاردنی قوتابخانەکانی ئامادەیی پیشەسازی، کشتوکاڵ و بازرگانیدا یارمەتییانبدەم. بەڵام لەسەر ناوەندیی و ئامادەییەکانی کچان، ئەندامانی ناوچە و لق شەڕیانبوو، بۆئەوەی ئۆزێ خۆیان بنوێنن و چاوبازی لەگەڵ خوشکەدەرەکانیاندا بکەن! لە هەڵبژاردنی هەموو ئامادەییەکاندا بەشداریمکرد و دوای تەواوبوونی هەڵبژاردنەکانیش، هێندێ قسەم بۆ کردن، بەڵام دوای ئەوە، نە ئەوان لێیان پرسیمەوە و نە منیش خۆم تێکەیاندن!

## هێڵێکی ڕێکخستنی نوێ

دوای ئەوەی لە (بەغدا) گەڕامەوە، ڕێکخراوی قوتابیانی (پارتی)، هەموو ئەو قوتابیانەی خوێندنیان تەواوکردبوو، تا ئەو کاتەش، هێشتا چارەنووسیان دیارنەبوو، لە هێڵێکی ڕێکخستنی تایبەتدا کۆیانکردبوەوە، ڕێکیانخستن و ناویان نا (هێڵی دەرەکی)، منیان کرد بە لێپرسراوی.

ئەو کاتە، ئەندامی ڕێکخراوی قوتابیانی (پارتی) بووم، ئەندامەکانی دیکە (کەمال جەلال، کەمالی حەسەن چاوەش، هیوای جەلال حەمدی، ئاوات عەبدولغەفوور، حەمەسەعیدی فەقێ عەلی جگەرەفرۆش ...) بوون، (جەمال قاسم)یش لێپرسراومان بوو. قوتابییەکان زۆربوون، هەر ئەو کاتە ئەو هەڤاڵانەی لە ڕێکخستنەکانی (پارتی) پچڕابوون، یا ئەو هاوڕێیانەی لە (پارتی)دا نەبوون، بەهۆی منەوە پێوەندییان پەیداکردەوە، وەک (براییمی حەمەعەلی، عەلی تۆفیقی حەسەنەقووچ، زاهیری مەلا عەلی ...)، شانەیەکی سەرەکیم لێ پێکهێنان و هەر یەکێ لە ئەندامانی ئەو شانەیەش، کۆمەڵێ قوتابی دیکەیان لابوو.

ئیدی بە ئەو شێوەیە توانیمان، ئەو هێڵەی ڕێکخستن ڕێکخەینەوە، منیش کەمێ سەرم سووکبێ، چونکە ئەو هێڵە، لە هەموو هێڵەکانی دیکە، گرفتیان زۆرتربوو، لەبەرئەوەی هەموویان خوێندنیان تەواوکردبوو، هیچ کارێکیان نەبوو، هەمیشە داوای دامەزراندن و

کاریان نەکرد. ئەو داواکارییەش لە ئەو ڕۆژەدا و لە ئەو بێ سەروبەرییەی ڕێکخستندا، کارێکی هێندە ئاسان نەبوو. هەرکەسێکیش بووایە، هەر هێندەی پێ دەکرا، ناوەکانیان بنووسێ و بۆ لیژنەی ناوچە بەرزیانکاتەوە، تا پارمەتییانبدەن و دایانمەزرێنن. کە ناوەکانیش دەگەیشتنە ئەوێ، لە ئەوەدەچوو، یەکسەر لە سەبەتەی کەمتەرخەمیدا بۆیان هەڵکرن، بۆیە هەرگیز وەڵامیان نەدەدایەوە!

یەکێ لە ئەندامانی ئەو شانە سەرەکییە، (عەلی تۆفیق) بوو، کە ئێستە بە دوکتۆر (سەرپەست ئاغا) ناسراوە و لە زانکۆی (سەلاحەددین) مامۆستایە. (عەلی) جگە لە ئەوەی هاوڕێی قوتابخانەی ناوەندیی (شۆڕش)ی ساڵەکانی (1963–1965)م بوو، بەهۆی (برایمی حەمەعەلی)شەوە، هەمیشە پێکەوەبووین، کوڕێکی بەڕێز و خوێندەوار بوو، کاتی خۆشی، هەر من لە لیژنەی ناوچە، بە (قادر جەباری)م ناساند و لە (پارتی)دا وەرگیرایەوە! ماوەیەکی زۆری پێ نەچوو، نامەی وەرگرتنەوەی هاوڕێم (حەمەی حەمەباقی)، لە لیژنەی ناوچەی (پارتی)ەوە، بۆ هێڵی ڕێکخستنەکەی ئێمە هات و خۆم پێوەندیم پێوە کرد. لە ماوەیەکی کەمدا، زۆر لە یەکدی نزیکبووینەوە و بووین بە هاوڕێ، چونکە ئەو خۆی نووسەر و هونەر بوو، کوڕێکی ڕۆشنبیریش بوو، لەبەرئەوە زیاتر لێی نزیککەوتمەوە، ئەویش ڕووبەڕوو لە جووتیاران سەری لێ دەدام.

ڕۆژێ باسی (یەکێتی نووسەران)مان کرد، من پرسیاری (شێرکۆ بێکەس)م لێ کرد. ئەو کاتە دەمزانی، (شێرکۆ) ئەندامێتی، هۆنراوەکانیم بە دڵبوو، لە دوورەوە خۆشمدەویست. گوتی: زۆر برادەرمە، گەر دەتەوێ، بە یەکدیتان دەناسێنم. منیش گوتم: زۆر سوپاستدەکەم و حەزیشدەکەم. گوتی: ئێستە بۆ لای ئەو دەچم، بۆ نایەی پێکەوە بڕۆین؟

ئەو کاتە خوالێخۆشبوو (شێرکۆ)، لە تۆمارگەی زانکۆی (سولەیمانی) کاریدەکرد، لە بارەگەی جووتیارانەوە، زۆر دوور نەبوو. چووینە لای و یەکدیمان ناسی. ئەو بە ژوورەکەیدا هەر هاتوچۆیدەکرد، خێراخێراش مژی قووڵی لە جگەرەکەی دەدا، منیش بە پرسیار دامگرتبووەوە، ئەویش یەك لە دوای یەك، وەڵامی دەدامەوە. ئیدی لە ئەو ڕۆژەوە، وردە وردە، پتر یەکدیمان ناسی و لە یەکدی زۆر نزیکبووینەوە! *

---

* لێرەدا ئامەوێ، بە درێژی باسی پێوەندی خۆم و خوالێخۆشبوو (شێرکۆ بێکەس) بکەم، چونکە دوای ئەوەی کۆچیدوایکرد، بەرهەمێکی تایبەتی (296) لاپەڕەییم، بۆ یاد و بیرەوەرییەکانی تەرخانکرد و ساڵی (2013) بڵاومکردەوە!

## زانکۆی سولەیمانی

دوای ئەوەی لە هیچ شوێنێ وەرنەگیرام و لە کورەکەی هەموو جێژنەکان بووم، چونکە کەسێ نەبوو، لەبنەوە لە باڵم بگاوێ و پاڵێ بە کارەکانمەوە بنێ، گەڕامەوە و چاوەڕوانی چارەنووسێکی نادیارم دەکرد. ئەز لە ئەنجامی ئەزموونە کەڵەکەبووەکانی خۆمدا، هەمیشە دەڵێم: مرۆ نابێ، لە سۆز و بەزەیی یەزدانی مەزن نائومێدبێ، بەڵام دەبێ، هەر هەوڵبدا، تا بە ئامانجەکانی خۆی دەگا!

ساڵی (1970)، ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی (بەعس)، کە لە (عێراق)دا باڵاترین دەسەڵاتبوو، یاسایەکی نوێی دەرکرد، یاساکەش ئەوەبوو، هەموو ئەو قوتابییانەی ئامادەییە پیشەییەکانی (کشتوکاڵ، پیشەسازی، بازرگانی ...)یان تەواوکردووە، بۆیان هەیە، لە ئەو کۆلێژانەی پەیوەندی بە خوێندن و بڕوانامەکانیانەوە هەیە، وەربگیرێن و خوێندنەکەیان تەواوکەن. لە ئەو کاتەدا دەمگوت، خوا ئەو یاسایەی بۆ من ناردووە، بۆئەوەی لە ئەو گرفتانە ڕزگارمبێ و ئامانجەکەشم بەدیبێنم!

لە ئەو سەردەمەدا، هێشتا وەرگرتن و دابەشکردنی ناوەندیی خوێندکاران لە (عێراق) دانەمەزرابوو، بەڵکوو زانکۆکان سەربەخۆبوون و خۆیان خوێندکاریان وەردەگرت. (ئیتیحادی وەتەنی تەلەبەی عێراق)ی سەر بە ڕژێم و (ی. ق. ک.)یش، وەک دوو ڕێکخراوی باوەڕپێکراو و دانپێدانراو، بۆیان هەبوو، بێ ئەوەی مەرجەکانی وەرگرتن ڕەچاوکەن، کۆمەڵێ کووڕسی خوێندن بۆ ئەندامەکانیان دابینکەن. ئەو کاتە خۆم، لە (پارتی) و (ی. ق.)یشدا کارمدەکرد و گوێیان لێ دەگرتم. لەبەرئەوە خۆم سەرپەرشتی ئەو کارەم کرد.

ئەو ساڵە، زانکۆی (سولەیمانی) هەشتا کووڕسی خوێندنیان، لە هەموو کۆلێژەکان، بۆ ئێمە تەرخان کرد. هەرچەندە من دەمویست، لە کۆلێژی وێژە و زمانی کوردی وەرگیرێم، بەڵام خوالێخۆشبوو دوکتۆر (کەمال فوواد) ئەیهێشت و گوتی: تۆ ئامادەیی کشتوکاڵت تەواوکردووە، هەر دەبێ، لە ئەو کۆلێژە بخوێنی. ڕاستیشیدەکرد، بەگوێرەی یاساکەی (بەعس) هەر دەبووایە، وا بووایە! ئیدی ئەوە بوو، یەکەمین ناو ناوی منیان نووسی. دوو برادەری دیکەشم هەبوو، هەر ئامادەیی کشتوکاڵیان تەواوکردبوو، خوالێخۆشبوو (لەتیفی قادرە فەنی حاجی فەرەج) و (مەریوان جۆرج)یش وەرگیران، بەڵام ئەوان هەمووی دوو هەفتە هاتن و دوایی وازیانهێنا. دوو کووڕسیشیان لەکیس دوو خوێندکاری کورد دا!

لەگەڵ ئەوەشدا، لە ئەنجامی ئەو کارە زۆر دڵنیانەبووم، ئایا ناوەکەم دەردەچێ، یا نا؟ لەبەرئەوە لەگەڵ خوالێخۆشبوو (شێخ مستەفای شێخ ئیسماعیل)دا، چووینە لای (قادر

جەباری)، ئەو کاتە ئەو ئەندامی لقی قوتابیان بوو. ئەویش تێلێفۆنی بۆ (موحەممەد حەسەن باڵتە) کرد، لێپرسراوی خۆیی زانکۆ و ئەندامی لیژنەی ناوچەی (پارتی)ش بوو، پێی گوت: ئەمە کادیرێکی خۆمانە و مەبەستمانە وەرگیرێ. ئیدی چووینە لای و هێڵێکی سووری، بەژێر ناوەکەی مندا هێنا و گوتی: تەواو وەرگیرای.

بە داخەوە کەس نەیدەزانی، ئەو هەتیوچەیەی (باڵتە)، هەر ئەو کاتە لەبنەوە بەعسی بوو، چونکە کاتێ ساڵی (1974)، جەنگ لە (کوردستان) دەستیپێکردەوە، نەک هەر نەهاتەدەرەوە، بەڵکوو یەکسەر بوو بە (قایمقام)، وا بزانم لە (دەربەندیخان)یش بوو!

زانکۆی (سولەیمانی)، لە ماڵی ئێمەوە زۆر نزیکبوو، بەپێ هەمووی (10) خولەک دووربوو. بەڵام من بە هیچ شێوەیە، حەزم لە خوێندنی کشتوکاڵ نەبوو، پتر حەزم لە کاری ڕامیاری دەکرد و دەمویست، بەیەکجاری واز لە هەموو شتێ بێنم و وەک کادیرێکی (پارتی) دەسبەتاڵبم.

ماوەیە دەوامکرد، بەڵام دوایی بە تەواوی بێزاربووم. لە لیژنەی ناوچە بیستم، هەردوو کۆلێژی سەربازی و پۆلیسی، لە (بەغدا) کراوەتەوە، (پارتی)ش بەشی خۆی هەیە. ئیدی سەرلەنوێ، نارەزووە کۆنەکەم بوژایەوە و گوتم: خولی مفەوەزی نەیگرت، چونکە کەسێ نەبوو، یارمەتیمبدا، ئێستە (پارتی)، هێندێ کووڕسی تایبەتی هەیە، یەکێکیان هەر بەر من دەکەوێ!

**کۆلێژی سەربازی**

هێشتا لە زانکۆ ڕانەهاتبووم، هیچ تێ نەدەگەیشتم و تەقەی سەرم دەهات، کە کۆلێژی سەربازی کرایەوە. شتێکی سەیربوو، یەکێکی وەک من لە ئامادەیی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ)وە، یەکسەر لە کۆلێژی سەربازی وەرگیرێ!

منیش، کە ئەو هەواڵەم بیست، بێ ئەوەی چاوەڕێبکەم، ناوەکەم بە هێڵی ڕێکخستنی (پارتی)دا بڕوا، یەکسەر چووم بۆ لیژنەی ناوچە و یەکەمین ناو، ناوی منیان نووسی. ئەو برادەرانەی لە لیستەکەشدا، ناویان تۆمارکرابوو، ئەمانە بوون: خوالێخۆشبووان (ستاری سەعید خەڵەف، حەمەشەوقی، مەنسووری شێخ کەریم، شێرکۆی عەبدوڵڵا دەرویش، عەلی تۆفیقی حەسەنە قووچ، موعتەسەم عەبدولکەریم، جەمال حوسێن، ئەنوەری حاجی ئەورەحمانی مەلاسەعید و زاهیر) ناوێکیش بوو، کە ڕۆژی دەرچوونی لە (بەغدا)، مەلەی کردبوو، خنکا.

لیستی کۆلێژی پۆلیسیش (کەریمی شێخ سەلام، برایمی قالە تەگەراتی، فەرەیدوونی شێخ تەیبی گولانی، عەبدوڵڵا عەبدولکەریم ...) و چەن کەسێکی دیکەش بوون. زۆربەی ئەوانەی بۆ هەردوو کۆلێژەکە پاڵێورابوون، جگە لە (ئەنوەری حاجی عەبدوڕەحمان)، هەموویان ئەندامی (پارتی) بوون. زۆربەی ئەو کەسانەش، لە کۆلێژێکی دیکە وەرگیرابوون و دەیانخوێند، بەڵام وەک من دەیانویست، کۆلێژەکەیان بگۆڕن. جا ئەوە هەر لە (سولەیمانی)ەوە، هێندە ناو نێررابوو، ئاخۆ دەبێ، لە هەموو شارەکانی دیکەی (کوردستان) و (عێراق)ەوە، چەن ناوی دیکە نێررابێ!

هەر زوو لیستەکەمان، لە ناوچە و لق دەرکرد و بێ ئەوەی لە ژانکۆ پرس بە کەس بکەم، سواری ترومبێل بووین و بەرەو (بەغدا) ڕۆیشتین، وەک ئەوەی وەرگرتنمان زۆر مسۆگەربێ!

سەرلەبەیانی زوو، هەموو لە بارەگەی لقی پێنج کۆبووینەوە، لیستەکەم بردە ژووری (مونزیر نەقشبەندی) ئەندامی لق بوو، لێی وەرگرتم و گوتی: دەبێ، چاوەڕێبکەن، تا وەڵامتان لێ دەگێڕینەوە. ئەو کاتە من لە ماڵی پورە (نەسرین)م دابەزیبووم. ماوەی هەفتەیەک چاوەڕێمانکرد، هیچ دەنگی نەبوو. ئەو هەموو کوڕە کوردانەش، لە شارەکانی (کوردستان)ەوە هاتبوون، نەیان دەزانی، چی بکەن! (بەغدا)ش بە ئەو گرانییە، گاڵتەی پێ نەدەکرا و پارەی دەویست!

پاشان، یەکەمین ڕۆژی هەفتەی دووەم، هەموومان لە بارەگەی لق کۆبووینەوە و بڕیارماندا، دوو کەس لە نێو خۆماندا هەڵبژێرین، نوێنەرمان بن و قسە لەگەڵ هەڤاڵانی لقدا بکەن. من و برادەرێکی خەڵکی (هەولێر)یان هەڵبژارد. کە چووینەوە لای ئاغای (نەقشبەندی) گوتی: ئێمە هەر هێندەمان پێ دەکرێ و دەسەڵاتمان هەیە، ناوەکانمان لە هەموو لقەکانی (پارتی)ەوە وەرگرتووە و بۆ برادەرانی سەرکردایەتیمان ناردووە، ئیدی ئەوان خۆیان دەزانن، چیتان بۆ دەکەن. منیش گوتم: جا باشە، ئەم برادەرانەی سەرکردایەتی ناویان چییە؟ لە کوێ دەیبینین؟ ئاخر وا ئێمە لێرە پارەمان پێ نەماوە و کەسیش لێمان ناپرسێتەوە! گوتی: ئێوارە بچن بۆ بارەگەی ڕۆژنامەی (ئەلتەئاخی) و لە ئەوێ بپرسن، پێتان دەڵێن. بە کورتییەکەی، شێرێ بۆ داپیرێ، پیاوەکە لە کۆڵ خۆی کردینەوە!

ئێوارە هەر زوو، لەگەڵ (مەنسوور حەفید)دا چووین و هێشتا کەسی وا نەهاتبوو، وەڵامی ئەو پرسیارەی ئێمە بداتەوە. لەبەردەرگە چاوەڕێبووین، دوای ماوەیە، خوالێخۆشبوو (ئیدریس بارزانی)، بە تەنیا بە ترومبێلێ هات. خێرا بەردەرگەکەم لێ گرت، خۆمم پێ ناساند و گرفتەکەم بۆ باسکرد. ئەویش هەر هێندەی گوت: بچنە لای کاک (دارا تۆفیق).

پاشان، خوالێخۆشبوو کاکە (دارا)ی کاڵی کوردیش هات، چووینە لای و هەموو شتێکمان تێگەیاند. گوتی: نوێنەرێکمان هەیە، ناوی عەقید (ڕەووف ڕەشید)ە، با بێ، پێتان دەناسێنم و هەر کارێکتان هەبوو، لەگەڵ ئەو قسەبکەن.

ئەوەبوو، لەگەڵ عەقید (ڕەووف)، یەکدیمان ناسی و خەڵکی (سولەیمانی) دەرچوو. بڕیارماندا، لە بارەگەی لق کۆبوونەوەیەکی گشتی بکەین. لە کۆبوونەوەکەدا، هێندێ شتی بۆ ڕوونکردینەوە و وای پیشاندا، گوناهی ئەم نییە، سستی و کەمتەرخەمی، لە هەموو لایەکەوە هەیە و ئەم دەسەڵاتی نییە. بەڵام هەوڵمان بۆ دەدا، ئاوەکان لەگەڵ براەمراندا چاپکا و بە زووترین کات، بیبا بۆ کۆلێژی سەربازی. ئێمە بە تەمابووین، مژدەی خۆشتیمان بداتێ؛ کەچی تازە ئاوەکان چاپدەکەن و بۆ شوێنی مەبەستی دەبەن، دەردی (ڕەشۆل) دەیگوت: تازە تێ!

هەفتەیەکی دیکەشی پێ چوو، هەر دەنگ نەبوو. ئەم جارەشیان چووینەوە سەر بارەگەی لق. ئەو ڕۆژە گوتیان: (حەبیب موحەممەد کەریم)ی سکرتێری (پارتی) هاتووە. ئێمەش هەموو لە هۆڵەکەی بەردەمی دانیشتین، ویستمان، بیبینین. گوتیان سەری زۆر قاڵە و کەس نابینێ. منیش گوتم: کوڕینە! لێرە چاوەڕێدەکەین، هەر دێتەدەرەوە، خۆ لێرە ناڕوێ؛ ئەو کاتە بەری پێ دەگرین و دەردی دڵی خۆمانی بۆ هەڵدەڕێژین. یا دەبێ قسەیەکی ڕاستمان پێ بڵێ، یا دەبێ چارەمانبکا، جێ و ڕێیەکمان بۆ دانێ و خەرجیمان بداتێ.

ئەوەبوو، زۆر چاوەڕێمانکرد. دوایی هاتەخوارەوە و هەموو بەرەوپیری چووین. من و (برایمی قاڵە تەگەرانی) بەرەدممان پێ گرت، گوتم: ڕۆژباش. ئەویش گوتی: ئەهلەن. من بە کوردی، تێکەی دە خولەک هەموو شتێکم بۆ باسکرد، ئەویش پەلەیبوو، بە عەرەبییەکی ڕێکوپێک و جوان گوتی: (روح یمه ئەلفەخوان، های مو یمی، حەلا یساعدوکم) کە ئەوەم گوێ لێبوو، خەریکبوو، دڵم بتەقێ و خێرا گوتم: خۆ تۆ لای خۆی لە جێی (برایم ئەحمەد) دانیشتووی، کەچی کوردیش نازانی، لەگەڵ مەڤاڵەکانی خۆتدا، بە عەرەبی دەدوێی؟! ئیدی هیچ قسەی نەکرد و لێیدا ڕۆی. ئینجا برادەران بە شێوازی (سولەیمانی)، بە تاک و بە کۆ، جنێویان بۆ خۆی و هەموو مەڤاڵەکانی دیکەشی نارد!

بە ڕاستی بێ تامبووبوو، هێز و توانامان لێ بڕابوو، پارەمان کۆتبووبوو، وازمان لە لق هێنا و دامانە دەس خوا. گوتمان: هەفتەیەکی دیکە ڕۆژی شەممە، هەموومان لێرە یەک دەبینینەوە. ئەو هەفتەیەش ڕۆی، کاتێ چووینەوە، گوتیان: ڕۆژی دووشەممە دەبێ،

هەمووتان لە کۆلێژی سەربازی ئامادەبن، لیژنەی پشکنینی پزیشکی و لیژنەی چارپێکەوتن دادەنیشن. هەموومان چووین و لیستەکەشیان دایێ، تا پیشانی پاسەوانی بەردەرگەکەی بدەین و ڕێمانبدا، بچینەژوورەوە.

کۆلێژی سەربازی لە (ڕۆستەمیە) بوو، شوێنێکی زۆر دووربوو. بە چەن میکرۆپاسێ چووین و لیستەکەم پیشانی پاسەوانەکە دا. پاسەوانەکە تەماشایەکیکرد و گوتی: چارپێکەوتن و پشکنین نییە. منیش گوتم: ئێمە لە لقی پێنجی (پارتی)ەوە هاتووین، ناوەکانمان لە ژوورەوە هەیە، تکایە ڕێمانبدە، یا تێلێفۆنێ بکە، بۆئەوەی بزانی، ئێمە هەر لە خۆمانەوە نەهاتووین. گوتی: (روح گوله للبارتي، مەحموود ئەلحلو ما يقبەل) واتە: بڕۆ بە (پارتی) بڵێ، مەحموودی حیلو قبووڵی ناکا! ئیدی لە داخاندا نەماندەزانی، چی بکەین، ئەو هەموو ڕێیەمان بڕیبوو، ماوەی کاژێرێ لەبەر ئەو خۆرە گەرمەی (بەغدا) وەستابووین، ئەوەش وەڵامی کاکە (خولەی شیرین) بێ، لە داخیشدا ڕستەکەیمان دەگوتەوە!

ناچاربووین، گەڕاینەوە. ئێوارە من و (شێخ مەنسووری شێخ کەریم) چووینەوە لای (دارا تۆفیق)، هەمووییم بۆ گێڕایەوە. ئەویش گوتی: برایینە، پاسەوانێ ئەو قسەیەی کردووە، قابیلە لەبەر خاتری ئەو قسەیە، ڕێککەتننامەی (11)ی مارس تێکبدەینەوە؟! منیش گوتم: من نالێم، تێکیبدەنەوە، بەڵام دەبێ، ئەوە بزانن، گەر ئەو عەریفەیان فێرنەکردبێ و دەسەڵاتیان نەدابێتێ، چۆن هەر لە خۆیەوە دەتوانێ، ئەو قسانەبکا؟! ئێمە دەمانەوێ، چارەسەرێکمانبکەن، گەر پێتان ناکرێ، با لە ئەوە زیاتر لێرە نەمێنینەوە و هەر کەس بۆ ماڵی خۆی بگەڕێتەوە. ئیدی ئەو قسانە کاریتێکرد و گوتی: چاوەڕێبکەن. دوای ماوەیە هاتەوە و گوتی: دووبەیانی بچنەوە، عەقید (ڕەووف) خۆی لە ئەوێ دەبێ. دووبەیانی چووین و باشبوو، ئەم جارە عەقید (ڕەووف) خۆی لە ئەوێ ڕەستابوو. هەموو چووینە ژوورەوە و ئەوی پێویستبوو، بۆیان کردین.

لە ئەو ژوورەی چاوپێکەوتنەکەیان لەگەڵ کردین، وێنەیەکی گەورەی کورە کوردەێ هەڵواسرابوو، لە ژێریدا ناوەکەی نووسرابوو، ناوی شەهید (سەردار ئەبوبەکر) بوو. گوایە لە کاتی مەشقدا گوللەی بەرکەوتووە! ئینجا دەبووایە، چاوەڕێی ئەنجامی چاوپێکەوتنەکەمان و پشکنینمان بکردایە، زۆر درێژەیکێشا و هەر دەرنەچوو، تەنانەت (عەلی تۆفیق) وای لێهات، خەریکبوو، لە (بەغدا) خزمێکی خۆیان بێنێ!

**چاوەڕوانییەکی بێ ئەنجام و پشوویەکی کورت**

لە ئەو ماوەیەدا، (ڕەفعەتی حەمدی بەگ، سەرکەوت تۆفیق ...) و گەلێکی دیکەش، لە پەیمانگەی کادێرانی (پارتی) لە (بەغدا) بوون. (مەنسووری شێخ کەریم، کەمالی جەمال موختار)، هەردوو ڕەوانشاد (ئەریمانی فوواد مەستی) و (حەمە ڕەشید حەمەڕەفیق) و هێندێ برادەری دیکەش، لە کۆلێژی (ئاداب)ی زانکۆی (بەغدا)ی بەشی کوردی دەیانخوێند. گیانێکمان بە ئەوان بوو، ڕووبەڕوو دەمانبینین و پێکەوە دەگەڕاین.



یانەی خوێندکارانی کۆلێژی (ئاداب)ی زانکۆی (بەغدا)، ڕۆژی (21. 12. 1970)
مەنسووری شێخ کەریمی حەفید، خۆم و شێرکۆی عەبدوڵڵا دەرویش

بەزمی خوالێخۆشبوو (ڕەفعەتی حەمدی بەگ) هەر تەواونابێ. ڕۆژێ لە (بەغدا) تووشی (عەلی تۆفیق) بووم. گوتم: ئەوە چییە، بۆ وا بێ تاقەتی؟ گوتی: تو خوا ئەمە بەزمە، لە ئەم بێ پارەییەدا دەبێ، ئێستە سواربم و بچم بۆ (حلە). گوتم: بۆ، خێرە؟ گوتی: لە شالیارگەی دارایی ئیشێکم هەیە، ئێستە تووشی (ڕەفعەت) بووم، لێم پرسیوە، لە کوێیە؟ ئەویش گوتی: لەبەر جەنجاڵی و بێ جێیی، گواستوویانەتەوە بۆ (حلە)!

منیش دامە قاقای پێکەنین و گوتم: هەتیو تۆ بۆ هێندە خۆشباوەڕی، بە قسەی کەسیش نا، بە قسەی (ڕەفعەت) بڕوادەکەی، شالیارگە چۆن دەگوێزرێتەوە، خۆ شێلمانی ئاسن نییە! ئەویش گوتی: ماڵاوابێ، وەڵڵا تۆ نەبوویتایە، ئێستە سواردەبووم و دەڕۆیشتم، ئەو پارەیەشم بۆ گەڕایەوە!



حەوشەکەی کۆلێژی (ئاداب)ی زانکۆی (بەغدا)، ڕۆژی 15. 1. 1971 گیراوە، لە ڕاستەوە: ڕەوانشاد حەمە ڕەشید حەمەڕەفیق، حەمە پێنجوێنیی، (خۆم)، ڕەوانشاد ڕەفعەتی حەمدی بەگ، شێخ مەنسووری حەفید، مامۆستا حەسەن.

## دواهەواڵ

چاوەڕوانییەکەمان زۆری پێچوو، من هەموو ئەو ماوەیە لە (بەغدا) بووم و سەرم لە (سولەیمانی) نەدایەوە. ڕۆژێ چوویتەوە لای عەقید (ڕەووف) و دەردی دڵی خۆمان بۆ هەڵڕشت. گوتی: ئەوڕۆ هەوڵدەدەم، تەلیفۆن بۆ کۆلێژی سەربازی بکەم و کاتێ وەرگرم، بەیانی زوو وەرە، پێکەوە بۆ لای (داود جەنابی) فەرماندەی کۆلێژەکە دەچین و خۆت گوێبگرە، بزانە، من چی پێ دەڵێم، ئەویش چی دەڵێ، پاشان تۆش، بۆ هاوڕێکانتی بگێڕەرەوە؟!

بەیانی زوو چووم بۆ لق، لەگەڵ عەقید (ڕەووف) سوواربووم و ڕۆیشتین. چووینەژوورەوە و گوتی: لێرە دانیشە، تا بانگتدەکەین. دوای ماوەیە سەربازێ هات و گوتی: فەرموو. چوومەژوورەوە، پیاوێکی بەخۆ دانیشتبوو، هەموو سەرشانی بە تاج و ئەستێرە داپۆشرا بوو. فەرمووی لێ کردم و دانیشتم. عەقید (ڕەووف) گەلێ قسەی جوانی کرد و (جەنابی)ش وەک بایە بە لای گوێیدا تێپەڕبووبێ، وابوو! گوتی: ئێمە هەموو شتەکانمان تەواوکردووە و لەبەردەمی (سەیید ئەلنائب) دایە. ئەو کاتە (سەددام حوسێن) ئەو پۆستەی هەبوو، بە ئەم زووانە، ئەنجامەکەی دەردەچێ. ئیدی پێکەوە گەڕاینەوە.

عەقید (ڕەئووف) خەڵکی (سولەیمانی) بوو، ئەفسەری خانەنشینبوو، ئەڵقەی پەیوەندی نێوان (پارتی) و کۆلێژی سەربازی بوو، (داود جەنابی) دەناسی و پیاوێکی زۆر بەڕێز بوو. بە قسەکانیدا وا دەردەکەوت، لە کوردە ڕەسەنە تۆخە نیشتمانپەروەرەکان بێ، چونکە گوتی: ئەم عەرەبانە هیچمان بۆ ناکەن و هەر دەسیسەمان پێدەکەن، هێندێ شتی دیکەشی باسکرد. منیش داخی دڵی خۆمم بە تەواوی بۆ هەڵڕشت، باسی ڕەوشی (سولەیمانی) و هەڵبژاردنەکانم بۆ کرد، ڕەخنەیەکی زۆرم لە سەرکردایەتی (پارتی) و شۆڕش گرت، ئەویش زۆر بە بێدەنگی، گوێی لێ گرتبووم. پاشان لێی پرسیم: (کاژیک)ەکان ماون؟ لە (کوردستان) چالاکییان هەیە؟ منیش وەک لە باخێ بەرمدەنەوە، وا تێکەیشتم، ئەو من بە (کاژیک) دەزانێ! گوتم: هەر دەنگیان هەیە و ڕەنگیان نییە! گوتی: من لە مێژە لەنێو عەرەبدا دەژیم، ئەمانە کوردیان خۆش ناوێ، تەنیا هیوایەک هەبێ، کورد ڕزگاربکا، هەر ئەوانن. ئیدی من بێدەنگبووم و هەر بیرم لە ئەو قسەیەی ئەو پیاوە کوردپەروەرە دەکردەوە: (تەنیا هیوایەک هەبێ کورد ڕزگاربکا، هەر ئەوانن). تۆ بڵێی، وابێ؟!!

گەڕاینەوە و لە لقی پێنج دابەزین، هەموو هاوڕێکانم چاوەڕێیاندەکردین. عەقید (ڕەئووف) پێی گوتن: من هیچ نالێم، با نوێنەرەکەی خۆتان بۆتان باسکا. منیش هەرچیم دیبوو، هەرچیم گوێ لێبووبوو، هەموویم بۆ گێڕانەوە. گوتیان ئەی چارە؟! گوتم: چار هەر شۆڕە!

( عەزیز ئەحمەد )

ڕۆژێکیان لە شەقامی (جمهوری)، لای چاخانەی (کندی)یەوە، خوالێخۆشبوو کاک (عەزیز ئەحمەد)م بینی، کە بە (عەزەی ئەحمبۆق) بە ناوبانگبوو. گوتی: ئەوە لێرە چی دەکەی؟ منیش بۆم باسکرد. گوتی: واسیتەت هەیە؟ گوتم: لە لیستی (پارتی)دا یەکەم ناوم و خواش کەریمە.

پێکەنی و گوتی: ئەوە ناخوا و وەریش ناگیرێی. گوتم: ئەی (حەمەشەوقی) ژێرات، بە دوو قاچی خوار و باڵایەکی کورتەوە، چۆن وەردەگیری؟ گوتی: ئەوانە هیچ نییە، من بۆی دەکەم. گوتم: چۆن؟ گوتی: هەمووی تەنەکەیە هەنگوینی کوردەی ڕەسەن و نیوگوێتی گوێزی (هەورامانی) دەوێ! منیش گاڵتەم لێدەهات، کەچی قسەکەی کاک (عەزیز) ڕاستدەرچوو، ئەو وەرگیرا و منیش بە دەسی بەتاڵ گەڕامەوە!

لە ئەو ڕۆژە ناخۆشانەدا، زۆر بێ تاقەتبووم. ئێوارەیەکیان لە (یەڵقیس) دانیشتبووین، لە پڕ (سەروەت) خۆی کرد بە ژوورا و چاوی بۆ ئێمە دەگێڕا. منیش بانگمکرد و هات. گوتم:

ئەوە کەی هاتووی؟ لێرە چی دەکەی؟ گوتی: ئەوڕۆ هاتووم و بۆ ئێوە دەگەڕێم. گوتم: جا تۆ چۆن زانیت، ئێمە لێرە دانیشتووین؟ گوتی: ئەی لێرە زیاتر، کوێتان بۆ بگەڕێم! ئیدی ئەو ماوەیە پێکەوە بووین و پاشان گەڕاینەوە.



لە ڕاستەوە: سەروەت موحەممەد ئەمین، مەنسووری شێخ کەریم و حوسێن موحەممەد عەزیز. ڕۆژی چوارشەممەی ڕێککەوتی (20. 1. 1971)، لە گۆڕەپانی کۆلێژی (ئاداب)ی زانکۆی (بەغدا) گیراوە.

**ئەنجام**

زۆری پێ نەچوو، لە لق پێیان گوتین: ناوی وەرگیراوەکان، لەبەردەرگەی کۆلێژی سەربازی هەڵواسراوە، بڕۆن، سەیرکەن. هەموو بە پەلە بەرەو ئەوێ سوواربووین. زۆرمان پەلەبوو، ئەنجامەکەمان دەرچێ، بریا هەر دەرنەچووایە! بریا هەر نەچوومایە، ئەو هەموو ئەرکەم تەکێشایە و ئەو ناخۆشیەم نەدیایە، یەکێ ئەنجامەکەی پێ بگوتمایە!

ئاخر لە ئەو هەموو کوردە، تەنیا هەر (ستاری سەعید خەڵەف، شێرکۆی عەبدوڵڵا نەرویش، مەنسووری شێخ کەریم، حەمەشەوقی و زاهیر) لە (سولەیمانی) وەرگیرابوون. لە (هەولێر، کەرکووک و بادینان)یش، چەن کەسێکی دیکە وەرگیرابوون. ئیدی بۆ ئەوانی دیکە نووسرابوو، (راسب في اللائحة). گوایە ئێمە لە تاقیکردنەوەی تیشککگرتنی سنگدا کەتبووین! ئاخر تیشکی چی؟ کەس نەیدەزانی، چۆن بوو؟ وەک ئەوانەی وەرگیرابوون، هەموویان مرۆی خاوەن تەندرووست و بەژنوباڵا نموونەیی بووین، ئێمەش سیلی قوورگ و

جیلوولتەفەسمان بوویی؟ من هەر لە ئەوێ گوتم: ئەوەیان بە هەڵە نووسیوە، دەبووایە، بیاننووسیایە: (راسب في الواسطة، ئەم وڵاتە هی ئەوە نییە، تەنیا هەر خوا پشتیوانیتی، چونکە ئەوانەی بەرپرسیدەبەن، خوا ناناسن!

ئیدی ئەوانەی وەرگیرابوون، دوای چەن ڕۆژێ دەوامیانکرد، ڕۆژی (17. 8. 1973)یش تەواویانکرد و لە سوپای (عێراق)دا بوون بە ئەفسەر. من و ئەو برایانەی وەریش نەگیرابوون، دوای (3) مانگ چاوەڕوانی و خەرجییەکی زۆر، بەرەو شوێنەکانی خۆمان، بە نائومێدی گەڕاینەوە، ئەم جارەش دەسم بە زاخا چوو، ماری (واستە) پێوەی دام و بە دڵشکاوی گەڕامەوە، هیچ چارێکیشم نەما و لە ناواندا، پەنام بۆ زانکۆی (سولەیمانی) بردەوە!

## هەواری نوێ

ماوەی سێ مانگ لە (بەغدا)، بە دیار کۆلێژی سەربازییەوە دانیشتم، ئەوەش ئەنجامەکەی بوو. کاتێ گەڕاشمەوە، ماڵی باوکم لە ئەو ماڵەدا نەمابوون و کەمێ سەرووتر، لەنێو دارەسووتاوەکاندا خانوویەکیان، لە (حاجی حەمەقزڵەری) گرتبوو. بەڵام ماڵی مامم، هەر لە شوێنی خۆیان مابوون.

ئەم خانووە، تازە تەواوبووبوو، ئێمە یەکەمین کرێچیبووین، شەومان تێدا ڕۆژکردەوە و ناوەدانمانکردەوە. دوو نهۆمبوو، لە خوارەوە سێ ژوور و هەیوانێکی مامناوەندی بوو، حەوشەیەکی خنجیلانەی هەبوو، لە تەنیشت دەرگەکەوە ئەوالێت، گەرماو و موبەق ڕیزبووبوون، لەژێر خانووەکەشدا ژێرزەمینێکی گەورە و تاریکی تێدابوو، بە ڕۆژی نیوەڕۆ دەبووایە، گڵۆپمان هەڵکردایە، ئینجا بەرپێی خۆمان دەبینی. بەڵام هێندە فێنک بوو، هاوینان جێمان لێ ڕادەخست و دەنووستین، دەبووایە، خۆشمان داپۆشیایە.

لە سەریشەوە ژوورێ بوو، سەربانێکی چکۆلانەشی هەبوو، شەوانی هاوین لێی دەنووستین. خانووەکە تا بڵێی، دڵگیر و خۆش بوو، لە هەموو شوێنێکەوە نزیکبوو، بە تایبەتی، بەردەمەکەی گۆڕەپانێکی گەورەبوو. ئەو دیویشمان لە پشتەوە، ماڵی پورە (شەمسە) بوو، چونکە دوو خانووبوون، بە سکێ لەدایکبووبوون، لە هیچ جۆرە شتێکدا جیاوازییان نەبوو، تەنیا هەر ئەوەبوو، یەکێکیان ڕووی لە (گۆیژە) و ئەوی دیکەشیان، ڕووی لە ڕووگە بوو، ئەوەی دووەمیان بەر ئێمە کەوتبوو، هەردووکیشیان هی خوالێخۆشبوو (حاجی حەمەقزڵەری) بوون!

پێش هەموو شتێ، بەیانی زوو چووم بۆ زانکۆ. پەیوەندیم بە لێپرسراوی قوتابیان (جەمال مستەفا ئابلاخی)ەوەکرد و گرفتەکەم تێگەیاند. ئەو کاتە دوو مانگ پڕببوو، خوێندن دەستپێکردبوو. پێکەوە چووین بۆ لای خوالێخۆشبوو دوکتۆر (نووری باڵندار)، ڕاگری کۆلێژبوو، خۆشی هەر ئەندامی (پارتی) بوو. گوتی: گوێمەدەرێ، دەوامی خۆت بکە، ئێمەش یارمەتیتدەدەین. بەڵام من بە هیچ شێوەیەک، توانا و ئارەزووی خوێندن و دەوامکردنم نەبوو. بە تەواوی وەڕسبووبووم، بە تایبەتی کە سەیرمکرد، زۆربیان خوێندووە و هێندێ لە وانەکانیش، بە ئینگلیزی بوون، ئیدی بە جارێ زراوم‌چوو. ئاخر منێ لە ئامادەیی کشتوکاڵی (بەکرەجۆ)وە هاتبم، لەگەڵ زمانی ئینگلیزیدا کوجا مەرحەبا! گوتم: گەر یارمەتیمبدەی، ئەم ساڵ نەخوێنم و ساڵێکی دیکە دەستپێبکەم، چۆن دەبێ؟ گوتی: دەبێ، مۆڵەتی نەخۆشی لای دوکتۆر بێنی، ئێمەش بۆت جێبەجێدەکەین.

**مۆڵەتی نەخۆشی**

لە ڕەوانشاد (شێخ عوسمان) زیاتر، کەسی دیکەم شک نەدەبرد، پەنای بۆ بەرم. چونکە ئەو هەم زۆربەی پزیشکەکان هاوڕێیبوون، هەم منی خۆشدەویست. لەبەرئەوە دەستی بە ڕوومەوە ئەدەنا و هەمیشە بە هانامەوەدەهات.

کاکە (شێخ)ی خزمم، ئەم جارەش لە پەلم ئەوی و ئەیهێشت، بگلێم. دوکتۆر (ئومێد محەمەد موبارەك)، زۆر هاوڕێی بوو، پێکەوە چووین بۆ لای و منی پێ ناساند. گوتی: حەوکردنی جگەرت بۆ بنووسم؟ منیش گوتم: هەر نەخۆشییەکبێ، پێی قایلم، تەنیا هەر ئەم ساڵم بۆ دەرخەن و کۆلێژەکەم لەکیس نەچێ!

ڕاپۆرتێکی پزیشکی بۆ نووسیم، گوایە، پێویستم بە چارەسەرکردن و حەواندنەوە هەیە! ئیدی ئەو ساڵەیان بۆ نەژمارنەکردم. هەرچەندە ئەو ساڵەم لەکیسچوو، بەڵام لەدەس هاتوچۆی زانکۆ ڕزگارم بوو، چونکە باری دەروونیم باش نەبوو، هی ئەوە نەبوو، بخوێنم و بکۆشم. باشیبوو، کەمێ مێشکم حەوایەوە، بە تایبەتی دوای ئەوەی، لە کۆلێژی سەربازی سەرکەوتوو نەبووم، پێویستم بە ئەوە هەبوو، ماوەیە لە ئەو جۆرە شتانە دووربکەومەوە!

**دواپێوەندی**

کەمێ هاتمەوە سەر خۆم و پاشان هەواڵی (ژیان)م زانی، داواکاری هەیە و دەیەوێ بمبینێ. پەیوەندیم پێوە کرد و لەسەر ئەوە ڕێککەوتین، داوایبکەم. لە مامە (ساڵح)م زیاتر، کەسی دیکەم نەبوو، ئەو باسەی لا بکەمەوە، داوای یارمەتی لێ بکەم و باوکم قایلکا.

هەرچی چۆنێبوو، هەموو لایە ڕازیبوون، کۆمەڵێ ژنمان کۆکردەوە و چووین بۆ خوازبێنی. لەگەڵ ئەوەشدا، دایک و باوکی دەیانزانی، ئێمە نزیکەی سێ ساڵ دەبێ، پێوەندیمان هەیە و یەکدیمان خۆشدەوێ، هەموو دەمێ دەیانویست، من داوایکەم و ئەو دەنگۆیە، لەنێو خەڵکی گەڕەکدا نەمێنێ. کەچی کاتێ دایکم و ئەوان چوون، دایکی لە وەڵامدا گوتبووی: ئێمە وامانزانی، بۆ مامۆستا (حەمەساڵح) داوایدەکەن، جا ئەو ماڵ بە چی پێکەوەدەنێ و ژن بە چی بەخێودەکا؟! ئیدی ئەوانەی ئێمەش، لەسەر بیانوویبوون، حەزیان نەدەکرد، بچن و داوایکەن، یەکسەر هەستابوون و گەڕابوونەوە. کاتێ ئەو هەواڵەم زانی، سەرەتا باوەڕم نەکرد، تا ڕاستیم بۆ دەرکەوت، ئینجا لە داخاندا و لە ڕقاندا، ماوەیە پشتگوێمخست و لێم نەپرسییەوە.

ڕۆژێ ژنەکەی مامە (عومەر)م پێی گوتم: (ژیان) دەڵێ، باوکم بە زۆر بەشوومدەدا، گەر مێ دەوێ، با هەوڵبدا و فریاکەوێ! منیش وامزانی، ئەم جارەش هەر تاکتیک و پلانی خۆیانە، بۆئەوەی جارێکی دیکە داوایکەمەوە. کەچی ڕۆژێ لە پڕ شەکراویانخواردەوە و ئێوقەدم وشکبوو، بەری چاوم تاریکبوو، ئاگام لە هیچ نەما، یەکسەر ڕامکرد و ڕەوانشاد مامە (حەمە)یم دۆزییەوە. ئەو مامەیان زۆر هاوڕێم بوو، بانگمکرد و لێم پرسی: ڕاستە، برازاکەت داواکاری هەیە؟ گوتی: بەڵێ، هەموو شتێ تەواوبووە و شەکراویشخوراوەتەوە. منیش هەموو شتێکم بۆ گێڕایەوە، بەڵام هیچ کەڵکی نەبوو. گوتی: تۆ ئێستە قسەدەکەی، تازە کارلەکارترازاوە، گەر تۆ ئەو کچەت خۆشدەوێ و ڕێزی ئێمە دەگری، ئەوا بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ شوێنێ، باسی مەکە، لەبیر خۆتی بەرەوە. منیش لە ناچاریدا بەڵێنم دایە، لەبیر خۆمی بەرمەوە و بەڵێنەکەشم بردەسەر.

هەرچەندە بە زۆریی خەتای کەللەڕەقی و کەمتەرخەمی خۆم بوو، بەڵام خوا بێدەسەڵاتی و بێنەرامەتی بگری! دوایی لێکمدایەوە و لەبەر خۆمەوە دەمگوت: ئاخر گەر کەسوکارم یارمەتیان نەدامایە و بۆیان داوا نەکردمایە، من کێ بووم و بەچی بمهێنایە؟!

خۆ (کوردستان)ەکەی خۆمان، (ئەورووپا) نییە، کوڕ و کچ بە ئارەزوو و ویستی دڵی خۆیان، بڕیاری چارەنووسی خۆیان بدەن و ژیانیان مسۆگەربێ! بەڵێ، هەرچی چۆنێبوو، خۆشەویستەکەم لەدەستچوو، ئینجا تێگەیشتم، مەرج نییە، ئەوەی ئاشقی مرۆ دەبێ، بە ئارەزووی دڵی ئەو بگەڕێ و بۆی سەربگرێ! ئەوەشم بە تەواوەتی بۆ دەرکەوت، حەز و ئارەزووی مرۆ هەموو شتێ نییە، بەڵکوو ئەوەی لە چارە نووسراوە، هەر ئەوە گرنگە و ڕۆڵێکی یەکجار گەورە، لە ژیانی مرۆدا دەبینێ. بەڵێ (ژیان) خۆشەویستمبوو، بەڵام بۆ من نەبوو!

ئیدی بە ئەو شێوەیە، بوخچەی ئەم چیرۆکە ڕۆمانسییە خاریێنەی دووەمین خۆشەویستیش، لەگەڵ یەکەمین خۆشەویستیی دڵمدا پێچرایەوە و بوو بە یادگار. ئەوا لە ژیانی تایبەتی خۆمدا، مێژوی دڵەی خێرنەدیووم، دوو جار خۆشەویستیم کردووە، بەڵام هەردووکیان هیچیان لێ سەوز نەبوو! چونکە هێندێ جار پەروەردگاری مەزن، ئاواتەکانی دڵی مرۆ بەدیدێنێ، بەڵام گەر مرۆ خۆی زۆر بە باشی، بەپیرییەوە نەچێ، زۆر بە کولوونەوە، لە ئامێزی ئەگرێ، ئەوەی پێیداوە، لێی دەسەنێتەوە، ئەمەش لە من ڕوویداوە!

هەرچەندە ئەم چیرۆکی خۆشەویستییەی (ژیان)یش، وەک چیرۆکی خۆشەویستییەکەی (حەلیمە) وایە و کۆتاییەکی ناخۆشی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییان هەیە، چونکە جگە لە ئەوەی ئێمە منداڵبووین و چیرۆکەکەشمان، بە ساوایی و پێش تەمەنی خۆی لەدایکبوویبوو، لە ئەو ڕۆژەشەوە لە (پێنجوێن)، ماڵاوایییم لە یەکەمین خۆشەویستیی دڵم کردبوو، نەک هەر (حەلیمە)م نەبینیوەتەوە، بەڵکوو بە هیچ جۆرێکیش هەواڵی نازانم. کەچی کاتێ دووەمین خۆشەویستیی دڵم لە لێدانکەوت، جگە لە ئەوەی گەورەبووم، نەک هەر چەندین جار (ژیان)م بینیوەتەوە، بەڵکوو قسەشم لەگەڵ کردووە و ئێستەش وەک دوو هاوڕێ واین!

دەنگۆی تێکەڵاوبوونەوە

لە ئەو ڕۆژەوە، خاڵەکانی ڕێککەوتننامەکەی (11)ی مارس بڵاوکرایەوە، جەلالییەکان بە جارێ پشتیانشکا، ڕێکخستنەکانیان تەما و پەرشوبڵاوبوونەوە. هەر زوو خوالێخۆشبوو مامۆستا (قادر مستەفا)ی هاوڕێم، بڕیارەکانی خۆیانی بۆ باسکردم و گوتی: بە ئەم زوانە، کۆنگرەیەک دەگیرێ و هەردوولامان تێکەڵاودەبینەوە. من لە کاتەکەی بڵەوە پێم خۆشبوو، خواخوامبوو، ڕۆژێ زووتر، ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە نەمێنێ، ڕیزەکانی گەلی کورد یەکگرێتەوە و بەرانبەر دوژمنی داگیرکەر، وەک شوورایەکی پۆڵایین بووەستێ. بەڵام هێندێ گێرەشێوێن، ئاژاوەچی و هەلپەرست هەبوون، ئەو کارەیان پێ ناخۆشبوو، هەمیشە پڕوپاگاندەی خراپیان بڵاودەکردەوە و دژی ڕێککەوتنەکە بوون. بە تایبەتی هێندێ لە ئەو دژانە، لە ڕیزی ڕێکخراو و ناوچە و لقەکانی (پارتی)دا کاریاندەکرد، لە نێو ڕێکخراوە کوردستانییەکاندا خۆیان حەشاردابوو. ئاخر، گەر بنەماڵەی شەهیدانیش دژبوونایە، دەمانگوت: مافی خۆیانە، چونکە قوربانییانداوە. بەڵام زۆربەی ئەوانەی دژبوون، لە ئەو جۆرە کوردە نیشتمانپەروەرانە نەبوون، بەڵکوو تەنیا خەمی پلەوپایەی خۆیان بوو!

هەرچەندە ئەو جۆرە کەسانە بەیاننووسیبەت، ئەو دەنگۆیە کپکەن، بەڵام دەنگوباسی یەکگرتنەوە ئامادەمات، ئاوێدەسەند و لە هەموو شوێنێ بڵاوەدەبوورەوە. لەبەرئەوە لقی چواری (پارتی)، بە ناوی (یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستان)ەوە، بڵاوکێکیان بڵاوکردەوە، ناونیشانەکەی (بڕوامان بە ئەڵێن نییە) بوو، لە زۆربەی شوێنە گرنگەکانی شاردا هەڵیانواسیبوو. من و (عەلی تۆفیق)، لە شەقامی (مەولەوی) پیاسەماندەکرد، یەکێ لە ئەو بڵاوکراوانەمان، بە دیواری دەرمانگەی (کاوە)وە بینی. کاتێ خوێندمانەوە، زۆر سەیرم لێهات، چونکە من لە (بەغدا)، بە چاوی خۆم (مام جەلال، عومەربەببابە و قاضی مێرگەسووری)م بینیبوو!

یەک دووانێ وەستابوون، دەیانخوێندەوە، منیش لە داخاندا، یەکسەر لێم کردەوە و دڕاندم. (عەلی) گوتی: ئەوە بۆ لێت کردەوە؟ گوتم: سەرکردایەتی هەردوولا، لە بنەوە خەریکن رێکدەکەون، ئەمانیش دەیاننووی، لەسەرەوە خەڵکی بەگژیەکدیدا بکەن! ئەویش زۆری پێ خۆشبوو، دوو برادەرەکەش هیچ قسەیان نەکرد!

بۆ ڕۆژی دوایی لە لیژنەی ناوچە، لە (شێخ رەووف)م پرسی: تا چەن ئەمە ڕاستە؟ گوتی: شتی وا نییە، درۆی جەلالییەکانە، ئێمە بە فەرمی هیچمان بۆ نەهاتووە. منیش گوتم: بڕواناکەم، ئەوە درۆبێ، هەق وایە، ئێوەش پێتان خۆشبێ و لە ئەوە زیاتر، دووبەرەکی نەمێنێ، تا لە سەرکردایەتیشەوە وەڵامتان بۆ دێ، هیچ شتێ بڵاونەکەنەوە. ئەویش هێندە زۆڵبوو، هەر دەیگوت: هەرچی چاکە، خوا ئەوەمان بۆ بکا!

من لەسەداسەد لە ئەوە دڵنیابووم، ئەو دەنگۆیە ڕاستە و جەلالییەکان هەر لە خۆیانەوە، ئەو هەواڵە بڵاوناکەنەوە، بەڵکوو لە ڕێکخستنەکانی خۆیانەوە پێیانگەیشتووە. ئەوانەی ئێمەش سەرکەوتن و ڕاپەڕاندن، بەری چاوی گرتبوون و ڕاستییان نەدەبینی، ئاگایان لە هیچ نەبوو، بەڵکوو لە گێڕانی بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە، شتیان نەردەهێنا و بە هەموو شێوەیە دژبوون. ئەوەشم دەزانی، هاورێ جەلالییەکانم درۆم لەگەڵ ناکەن و هیچ بەرژەوەندییەکیشیان، لە ئەو دەنگوباسانەدا نییە، تا پڕوپاگەندەی درۆ بڵاوکەنەوە!

**خۆزی ڕاستی**

زۆری بەسەردا ڕانەبورد، ئاواتەکەم هاتەدی و پووڕەشیش، بۆ ئاژاوەچی و داخ لە دڵەکان مایەوە. ئەوەبوو، جەلالییەکان کۆبوونەوەیەکیان لە (بەغدا) سازکرد و ناوی خۆیان گۆڕی، بە ناوی (پارتی شۆڕشگێڕانی کوردستان)ەوە تێکەڵبوونەوە، ئەندامەکانیان لە لیژنەکانی

(پارتی)دا، تا ئاستی لق دەستبەکاربوونەوە و ئاوپانتنان (براندەرانی ئیستیعاب). بەڵام ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و پەلیتبیرۆیان دانیشتن و بڕیاریاندابوو، کۆنگرەیە بگیرێ، ئەو کاتە خۆیان هەڵبژێرن و لە دەزگە باڵاکانی پارتدا کاربکەنەوە.

سەرەتای ئەو تێکەڵاوبوونەوەیە، لە لێبووردنە گشتییەکەی سەرۆک (بارزانی)ەوە دەستپێکرد. ئەوە هەر ژیریی و ئاوەزی ئەو بوو، هەموو پیلانەکانی دوژمنانی نێوخۆ و داگیرکەرانی (کوردستان)ی پووچەڵکردەوە. چونکە ئەوان لەسەر ئەو هیوایە دەژیان، هەر کە ڕێککەوتننامەکەی (بارزانی) و (بەعس) واژۆکرا، ئیدی لە هەموو (کوردستان)، جەلالی و مەلایی خراپتر لە جاران، پەلاماری یەکدی بدەن، لافاوی خوێن هەڵسێ و جەستەی ڕۆڵەی کورد ببا. بە ئەو شێوەیەش، ئامانجە چەپەڵ و گڵاوەکانیان بەدیبێ، کە چەندین ساڵبوو، خەونیان پێوە دەبینی و کاریان بۆ دەکرد.

بەڵام (بارزانی)، هێندە لاواز و دڵڕەش نەبوو، بە دەستی خۆی نیشتمانەکەی وێرانکا، هەر زوو هەستی بە ئەو مەترسییە گەورەیە کرد، پەنجەی ژیریی و دڵسۆزی خۆی، لە چاڵی چاوی دوژمنانی کورد چەقان، گوڵی هیوای تەبایی و یەکێتی ملیۆنان کوردی دڵسۆز و نیشتمانپەروەریش، گەشایەوە و بەریکرت!

**کێ زیانی لە یەکێتی ڕیزەکانی کورد کرد؟!**

لە ئەم یەکگرتنەوە و تێکەڵاوبوونەوەیەدا، دوو لایەنی (عێراق)ی زیانیانکرد. یەکەمیان: (بەعس) وەک پارتێکی شۆڤێنی ڕەگەزپەرستی داگیرکەر، بۆچوونەکانیان وا دەرنەچوو. دووەمیشیان: (پارتی کۆمۆنیستی عێراق) بوو. هەرچەندە بەسەرزارەکی پێخۆشحاڵی خۆیان دەبڕی، بەڵام چاکیان دەزانی، گەڕانەوەی ئەو هەموو کادیرە شارەزا و زیرەک و بە توانایانەی جەلالییەکان، هەم لە ڕووی چەندایەتییەوە، ژمارەیان زیاددەکا، هەم لە ڕووی چۆنایەتیشەوە، (پارتی) دەگەشێتەوە و پێشدەکەوێ. ئەوانیش لە (کوردستان) بە تایبەتی و لە (عێراق) بە گشتی، بە تەواوی لاواز و بێدەسەڵات دەبن. چونکە لە لایەکەوە، ڕێکخستنەکانی (پارتی) زۆر بەهێزدەبێ. لە لایەکی دیکەشەوە، ئەو بۆشایی و کەلەبەرە ئایدۆلۆژی و بیروباوەڕە لاوازەی، لەنێو ڕیزەکانی (پارتی)دا هەبوو، بە تەواوی پڕدەبێتەوە و ماوەی ئەوەیان نامێنێ، ئاژاوەبنێنەوە، خۆیان بە نیشتمانپەروەر، دڵسۆزی کورد و خەڵکی دیکەش، بە خۆفرۆش و ناپاک ناوزەدکەن. ئەو دید و بۆچوونەش بە ئاشکرا، لە قسەکانیاندا دەربەکەوت.

هەر بۆیە دواییش، لە (بارزانی) دووریکەوتنەوە و ڕوویان لە (بەغدا) کرد، یەکێ لە ئەو خاڵانەی پاڵیشی پێوەنان، لەگەڵ (بەعس)دا ڕێککەون، پێش ئەوەی جەنگیش لە (کوردستان) دەستپێبکاتەوە، پەلاماری هێزی پێشمەرگە بدەن، ئەو مەترسییە گەورەیە بوو، کە لە یەکگرتنەوەی ڕیزەکانی (پارتی) و بەهێزبوونی دەسەڵاتی شۆڕش دەترسان، بە تەواوی، بەرژەوەندی پارتایەتییان لە مەترسیدابوو. وایاندەزانی، گەر (پارتی) لە (کوردستان) لاوازبێ یا نەمێنێ، ئەوان دەتوانن، جێیبگرنەوە و جەماوەر لە دەوری خۆیان گردکەنەوە!

ئەوەیان نەدەزانی، ئەوە تەنیا ئەندێشەیەکی پووچ و بیرێکی قرچۆک نەبێ، هیچی دیکە نییە، گەر ڕێزێکیشیان لای (بەعس) و جەماوەری کورد هەبێ، ئەوە تەنیا لەبەرئەوەیە، لە بەرەی شۆڕش و دژی فەرمانڕەوایانی دەوڵەتی داگیرکەری (عێراق) بوون. ئەگینا (بەعس) هەمیشە، وەک دوژمنێکی سەرسەختی بیری کۆمۆنیزم و پارتی کۆمۆنیست وابووە، بە هەموو توانایەوە هەوڵیداوە، پەڕ و باڵیان بکا، وەک دواتر بە چاوی خۆمان بینیمان، کاتێ ئیشی پێیان نەما، چۆن داری بۆ ئەوانیش کرد و ویستی، بە یەکجاری پاکتاویانکا. ئەوە بوو، ئەو جارەش هەر پەنایان بۆ چیا سەرکەشەکانی (کوردستان) و شۆڕشی کورد بردەوە، ئەگینا هیچ چارێکی دیکەیان نەبوو!

بە لای منەوە، هیچ سەیر نییە، گەر لە یادی دووەمین ساڵڕۆژی ڕەوانشاد (عوسمانی قالەمتەوەر)دا، ڕۆژی (16. 6. 1996) لە شاری (ستۆکهۆڵم)، کۆنەکۆمۆنیستێکی وەک (حەمەسەعی حەسەن)، گوتارێ بخوێنێتەوە، لە کۆتایی گوتارەکەیدا بڵێ: (ئەگەر بارزانی لە هەموو ژیانی خۆیدا، هەڵەیەکی کردبێ، ئەوەبوو، لە جەلالییەکان خۆش بوو!)

چونکە گەر گەورەیی، دڵسۆزیی، زانایی و ژیریی (بارزانی)، لە هیچدا دەرنەکەوتبێ، ئەوا لە ئەو کارەیدا، وەک تیشکی خۆر دەدرەوشێتەوە و بە یەکێ لە کارە هەرە چاکەکانی دەژمێردرێ. بەڵێ (حەمەسەعی) دەیویست، (بارزانی) لە جەلالییەکان خۆش نەبێ، برینەکان ساڕێژنەبنەوە، ڕیزەکانی (پارتی) و گەلی کورد یەک نەگرنەوە، دیسانەوە لە هەموو ماڵە کوردێکدا، شیوەن و گریان نوێببێتەوە، لە بن هەموو تاشە بەردێ، لە ژێر هەر دار و لە پاڵ هەر دەوەنێکدا، جەنگی پۆخڵی نێوخۆی کوردکوژی سەرهەڵباتەوە، دوای ئەو هەموو چەرمەسەری و کوێرەوەرییە، دوای ئەو هەموو فرمێسک و خوێنڕشتنەش، دوژمن زەفەرمان پێ بەرێ و تا سەر هەر کورد کورد بکوژێ، بۆئەوەی ئاوات و ئامانجەکانی، ئەو کاتەی خۆی و پارتەکەی بەدیبێ!

ئاخر، سەیری ئەو ئید و بۆچوونەکان و بزانن، ئەو جۆرە بیرکردنەوە قرچۆلە و لەرزۆکانە، لە بەرژەوەندی کێ دایە؟! جا سەیر ئەوەبوو، ئەندامە بیرتەسک و نەزانەکانی (پارتی)ش، هەموو سەریان بۆ (حەمەسەعی) دەلەقاند و دەیانگوت: بە خوا ڕاستدەکا! نازانم، چۆن دەیانوێرا، وا بڵێن و ڕەخنە لە ئەو کارە پیرۆزەی (بارزانی) بگرن؟! چونکە ڕەخنەگرتن لە ئەو کارە مەزنەی ئەو پیاوە گەورەیە، وەک ئەوە وایە، هاوبەش بۆ خودا پەیداکەی و لێبووردنی نییە!

## یەکێتی جووتیاران

دوای تێکەڵبوونەوەکە، هەموو ڕێکخراوە پیشەیی، دیموکراسیی و سەندیکاکانیش یەکیانگرتەوە. یەکێ لە ئەو ڕێکخراوانە، (یەکێتی جووتیارانی کوردستان) بوو. ئەو ماوەیە هەر لە لیژنەی ناوچە بووم. (شێخ ڕەووف) سەرۆکی جووتیاران و (شێخ عومەر عەوڵانی)یش جێگری بوو. لەگەڵ ئەوەشدا، (شێخ ڕەووف) هەر ئەندامی ناوچە بوو، هەر لە ئەوێش دادەنیشت و هێندە بایەخی بە جووتیاران نەدەدا.

(قادر جەباری) لێپرسراوی ناوچە بوو، (حەمەڕەحیم)یش ئەندامی کارگێڕی ناوچە و لێپرسراوی دەزگەی پاراستن بوو. ئیدی ئەندامەکانی دیکە (جەمال قاسم، فوواد ئیبراهیم، فایەقڕەش، شێخ تەیبی گوڵانی)، هەر بە ناو ئەندامی ناوچە بوون و هیچ دەسەڵاتێکیان نەبوو!

کاتێ جەلالییەکانیش وەرگیرانەوە، (جەمال تاپەر، عەبدوڵڵا سەعید و حەمەسابیر) ئەندامی ناوچە و (ئەحمەدی دەی، یاسین حەسەن ، یاسینەڕەش و جەلال)، ئەندامی جووتیاران بوون. مام (ئەحمەد) سکرتێر و ئەو دووانەی دیکەش، ئەندامی دەستەی کارگێڕ بوون. سەرەتا بە هیچ جۆرێ، باوەڕیان بە کادیرەکانی جەلالی نەدەکرد، بەڵکوو زۆر ڕێزیان لێ نەدەگرتن، زۆر شتیان لێ دەشاردنەوە و هێندێ جاریش، چاودێرییاندەکردن و دەیانگوت: ڕێکخستنێکی نهێنییان هەیە!

لیژنەی ناوچە، من و (سالاری ئەحمەدی سەروپی)یان، بۆ جووتیاران نارد، لە ئەوێ کاری ڕۆژانەی چاپ و سەرپەرشتی بەرەگاکە بکەین. من هەر زوو، خۆم بە چاپکردنەوە خەریککرد و بە باشی فێربووم. بەیانیان کاژێری (9–12) و پاشنیوەڕوانیش، کاژێری (14–17) کارماندەکرد. هەرچی گرفتی جووتیارانی پارێزگەی (سولەیمانی)ش هەبوو، هەمووی بەرەوڕووی ئێمە کرابووە و دەبووایە، چارەسەریان بۆ بدۆزراییەتەوە. ئەو ماوە

دووروودرێژه، له ئەویّ کارمکرد، به هیچ شێوەیه یارمەتییان نەدام، هێندێ جار (سالار) یارمەتی وەردەگرت، به زۆر لەگەڵ منیدا دەیکرد به دووبەشەوە! (سالار) هاوڕێی منالّی و کوری گەڕەکی (شێخان) بوو، سووکە خزمایەتییەکیشمان هەیه، لەبەرئەوه تێوانمان زۆر خۆشبوو، لەسەر هەموو شتێکیش ڕێکدەکەوتین!

لەنێو ئەندامانی جووتیارانیشدا، له هەموویان پتر له هەردوو ڕەوانشاد مام (ئەحمەد) و (یاسین)ەوه نزیکتر بووم. چونکه مام (ئەحمەد)م له مێژەوه دەناسی و خۆشمدەویست، هاوڕێی باوکم و مامه (بەکر)یشم بوو. (یاسین)یش زۆر کوڕێکی باش و دڵسۆز بوو، هەر زوو له یەکدی نزیکبووینەوه و بووین به هاوڕێ. هەردووکیان زۆر باوەڕیان به من دەکرد، که خۆمان سێ قۆڵی دادەنیشتین، هەموو شتێکیان به ئاشکرا، لەبەردەمی منیدا باسدەکرد، هەموو جارێ (دادی) دەیگوت: تۆ لای ئێمه بووبیتایه، هەر زوو پێشدەکەوتی، بەڵام ده ساڵی دیکەش لێره کاربکەی، به هیچ نابی. تۆ هێشتا گەنجی، وەك ئێمه تووش نەبووی، بۆ ناچی، خەریکی خوێندنی خۆت بی!

هێندێ جار (حەمەڕەحیم) بانگیدەکردم و دەیگوت: دەبێ، چارێك لەسەر ئەو جەلالییانه بێ، بزانه، چی دەکەن و کێ دێ بۆ لایان. بەڵام من گاڵتەم به ئەو جۆره قسانه دەهات و هیچی له من هەڵنەدەکران، چونکه خۆی و بنەماڵەکەشیم باش دەناسی، له (سەرچنار) چی بوون و ڕەوشتیان چۆن بوو! زۆربەی کات (ئەحمەدی حەمکۆل)ی هاوڕێم، بۆ لای مام (ئەحمەد) دەهات. برادەرەکانی خۆشم، زۆر جار سەریان لێ دەدام و بارەگاکه هەمیشه جەنجاڵبوو، لەبەرئەوه بێ ئاقەت نەدەبووین!

سەرەتای پێوەندی من و (کاژێك)

(عەلی تۆفیق)، هاوڕێی ڕۆژانی خوێندنی ناوەندیی (شۆڕش)م بوو، له (پارتی)شدا لێپرسراوی بووم. زۆر جار پێکەوەبووین، زۆر خۆی له من نزیکدەکردەوه، هەمیشه خەریکی دەمەتەقێی نەتەوەیی و رامیاری بووین. زۆربەی کات باسی جوگرافیای (کوردستان)، مێژوو و کێشەی کوردمان دەکرد، دەمەتەقێمان لەسەر بیری نەتەوەیی و مارکسیزم دەکرد و بەراوردمان له نێوانیدا دەکردن. هێندێ جاریش، پەرتووکەکانی (ساتیع ئەلحەسەری) و دوکتۆر (عەبدوڵڵا عەبدولدایم)ی بۆ دەهێنام و دەیگوت: ئەمانه بخوێنەرەوه، زۆر کەڵکیان لێ دەبینی. دواتریش پێکەوه، نێوەرۆکی پەرتووکەکانمان، بۆ یەکدی باسدەکرد و دەمەتەقێمان لەسەردەکرد.

هەموو جارێ دەیگوت: کورد پێویستی بە چەن بیریارێکی وا بلیمەت و شارەزا هەیە، تا بتوانن، تیۆرییەکی ڕێکوپێك بۆ کورد داڕێژن و پارتێکی نەتەوەیی شۆڕگێڕی، خاوەن دیسیپلین دامەزرێنن. ئەویش پێدەکەنی و دەیگوت: زۆر ڕاستە!

کەمێ درەنگتر، زەرفێکی بۆ هێنام، دوو نامیلکە و پەرتووکێکی تێدابوو، کردمەوە و بینیم، بە کوردی نووسرابوون و گوتی: ڕەنگە ئەمانە بۆ تۆ باشترین، چونکە سەبارەت بە کێشەی کورد و ڕەوشی (کوردستان) نووسراون. بەڵام پێی گوتم: کامیان لە پێشدا بخوێنمەوە.

لە ماڵەوە تەماشامکردن، یەکەم نامیلکە هی (کامیل ژیر) بوو، هەمووی هۆنراوەبوو. پێشەکییەکەیم خوێندەوە، (جەمال نەبەز) نووسیبووی، زۆرم بە دڵبوو. لەبەرئەوە یەکسەر دەسم بە خوێندنەوەی هۆنراوەکانیش کرد، زۆر ئاسان و ڕەوان بوون. چونکە هەمووی باسی کوردبوو، بیر و هۆشی ڕێبوارێکی ماندووی ڕێی کوردایەتی، وەك مێتی ڕووناك دەکردەوە.

ئینجا وەڵامەکەی خوالێخۆشبوو (حەمەی مەلاکریم)م خوێندەوە، بە هیچ شێوەیە بۆنی بیر و تێڕوانینی کوردانەی لێ نەدەهات، لە ئەوەدەچوو، پێیان گوتبێ، شتێکی وا کرچوکاڵ بنووسێ و دژی بیری کوردایەتی بێ! جگە لە ئەوەی بە زمانێکی خراپ نووسرابوو، کوردییەکەشی ڕەوان و پاراو نەبوو.

بەڵام کاتێ وەڵامەکەی (نەبەز)م خوێندەوە، لە سەداسەد باری دید و بۆچوونەکانی گۆڕیم. هەر زوو (عەلی)م دۆزییەوە، داوام لێ کرد، هێندێ زانیاریم سەبارەت بە ئەو دوو نووسەرە بداتێ. ئەویش هەرچی زانی، بۆی باسکردم، ئیدی وەك ئەوە وابوو، هەردوو نووسەر (کامیل ژیر) و (جەمال نەبەز)، لە مێژەوە بناسم!

ئەو کاتە، ئەو بیروباوەڕانەم زۆر بە دڵبوو، چونکە ئەك هەر ئەو کاتە، بەڵکوو ئەوەتەی (پارتی) دامەزرابوو، هێڵێکی بیر و فەلسەفەیەکی دیاریکراو و ستراتیژێکی نەتەوەیی ڕووتی نەبوو، لە ئەو باوەڕەشدابووم، هەرگیز ناشیبێ!

لەبەرئەوە، لە نێو ڕیزەکانی (پارتی)دا، گەڕەلاوژێیەکی ئایدۆلۆژی و فەلسەفی بڵاوبووبووە، هەر کەسێ بە ئارەزووی دڵی خۆی، لە ئاوازێکی دەخوێند، بە گەز و جاوی خۆی، ڕووداوەکانی دەپێوا و لێکیدەدایەوە. لە شانەکانیشدا، بۆ ئەندامەکانی باسدەکرد، کەسیش نەبوو، لێیان بپرسێتەوە، چی بۆ ئەو خەڵکە باسدەکەن!

لەنێو ڕیزەکانی (پارتی) خۆشیدا، هیچ جۆرە کەرەسەیەکی ڕووناکبیری و خۆراکێکی نەتەوەیی نەبوو، تا دەرخواردی مێشکی ئەندامەکانی بدەن و پێیانبگەیەنن. منیش هەروا

بووم، هەموو ئەو پەرتووکە نەتەوەییانەی دەمخوێندنەوە، بۆ ئەندامانی شانەکەم باسدەکرد و ئەوانیش زۆریان پێ خۆشبوو، چونکە تا ئەو کاتە هیچ لێپرسراوێ بابەتی ڕۆشنبیری وای بۆ باس نەکردبوون، بەڵکوو لە کۆبوونەوەی شانەکاندا، تەنیا هەر باسی گرفت و ڕەوشی (کوردستان) دەکرا، ئابوونەی مانگانەیان لێ وەردەگرتن، ئیدی خاوبینەوە و دەسبشۆ!

لەبەرئەوە بیرمدەکردەوە و بە دەنگی بەرز لەبەرخۆمەوە دەمگوت: ئاخر نەتەوەیەک، خاکی داگیر و دابەشکرابێ، دەوڵەتە داگیرکەرەکان بە هەموو شێوەیە هەوڵبدەن، لە بۆتەی نەتەوەکانی خۆیاندا بیتوێننەوە، چۆن بە ئەو شێوەیە، لە بندەستی و چەوساندنەوە ڕزگاریدەبێ؟! چۆن دەتوانێ، ئامانجە نەتەوەیی و ڕامیارییەکانی خۆی بەدیبێنێ، گەر ڕابەر و پارتە ڕامیارییەکانی، بە ئەو شێوەیە، ئەندامەکانی خۆیان گۆشبکەن و هەڵسوکەوتبکەن ؟!

(عەلی) ڕۆژبەڕۆژ یارمەتیدەدام و هانیدەدام، تا بخوێنمەوە و پتر لە گرفتەکان بگەم. ئێوارەیەکی پاییزبوو، لە نێو شار پیاسەمانەدەکرد، بە درێژی باسی ئەو ڕەوشە خراپەی (پارتی)مان دەکرد، بە دوای چارەسەرێکی بنەبڕیدا دەگەڕاین و هەردووکیشمان لەسەر ئەوە ڕێکبووین، تەنیا چارەسەر هەر بیری نەتەوەیی و پارتێکی نەتەوەیی دەبێ، هیچ شتێکی دیکە دادی کورد نادا!

گوتم: کەواتە چی بکەین، باشە؟ ئەم نەتەوەییانەی تۆ باسیاندەکەی کێن و لە کوێن؟! گوتی: لە (کوردستان)ن و دەتەوێ، بیانناسی؟ گوتم: بەڵێ، با بزانین، بەرنامەیان چییە؟ چۆن بیردەکەنەوە؟ کێ سەرکردایەتیاندەکا؟ گوتی: باشە، دوای ماوەیەکی دیکە، من برادەرێکت پێ دەناسێنم.

دوو ڕۆژی پێچوو، هات و برادەرەکە خۆی دەرچوو. گوتی: با قسەبکەین. زۆر شتی بۆ باسکردم و هێشتا، لای من تەمومژی هەبوو، دەمویست، هەموو شتەکان ڕوونبنەوە. دوایی پێم گوت: (وریا براخاس)ی هاوڕێشم، هەر لە هەمان گێژاودا دەژی، با هەرسێکمان پێکەوە دانیشین و دەمەتەقێ بکەین. جا هەر بە ڕاستی، هیچ بڕوایەکمان بە (پارتی) نەما بوو، چونکە ئەو پارتە نەبوو، لە ڕووی بیروباوەڕ و سەرکردایەتییەکەیەوە، هیواکانی خۆمانی لەسەر هەڵچنین. تا دەهات، من لێی بێزار دەبووم، ئەو لێپرسراوانەی لە (سولەیمانی) دەمناسین و دەمبینین، هیچیان پێ نەبوو، شایانی ئەوە نەبوون، ئەندامی ناوچە و لق بن، چونکە لە ئەو ماوەیەی گەڕابوونەوە و دەسبەکاربوون، هەوڵێکیان نەدا، ئەو بەرەڵاخانەیە چاککەن، کۆڕێ بۆ ئەندامان و جەماوەری پارتەکەیان بگرن، هێندێ

بابەتی ڕۆشنبیرییان بۆ باسکەن. هەرچی مرۆڤی خراپ و هەلپەرست هەبوو، وەک مێش چۆن بە شیرینییەوە دەنیشێتەوە، پێیانەوە نیشتبوونەوە. بە تایبەتی خۆم لە لیژنەی ناوچە و لقەوە نزیکبووم، ڕۆژانە ئاگام لە زۆر شت بوو، کەلێ گرفت ڕوویدەدا، بۆیان چارەسەر نەدەکرا، هیچ کارێکیان نەبوو، چالیان بۆ یەکدی هەڵدەکەن. یا هەموو نیشەکانیان لە ئەوەدا چڕکردبووەوە، چاودێری جەلالییەکان و نەتەوەییەکان بکەن، بۆئەوەی ڕێکخستنەکانیان بدۆزنەوە. لەبەرئەوە زۆر کەسیان وەک تووله و تانجی ڕاستکردبوو، ڕاوەکەروێشکی ئەو دوو ڕێبازەیان پێ دەکردن، بە تایبەتی لە ڕیزەکانی ڕێکخراوی قوتابیان و یەکێتی قوتابیاندا، ئەو کارە قێزەونە بە زەقی دیاربوو. جگە لە ئەوەی هەموو شەوێ، ئەندامانی لق و ناوچە لە یانەی فەرمانبەران، شوێن و مێزی تایبەتی خۆیان هەبوو، تا درەنگانێ دادەنیشتن، دەیانخواردەوە و ڕایاندەبوارد! بە کورتییەکەی، لە ئەو ماوەیەدا، هەموو شتێکیان دەکرد، تەنیا هەر کوردایەتی و پارتایەتی نەبێ!

گوتم: با بچین، (وریا) لە ماڵەوەیە و چاوەڕێمانەکا. ئەو شەوە تا درەنگانێ، هەرسێکمان پێکەوە دانیشتین، دەمەتەقێیەکی تێروتەسەلمان کرد، لە زۆر بابەتی گرنگ دواین، دوای ئەوەی زۆر بە ڕوونی و بە ئاشکرا قسەمانکرد، هەموو سەرەداوەکانمان پێکەوە بەستەوە، بڕیارماندا، نامە بۆ سەرکردایەتی (کاژیک) بنووسین.

ئیدی بە ئەو شێوەیە کۆتاییهات، لە ڕۆژی (12. 10. 1970)وە، خۆمان بە نەتەوەیی دەزانی و لە ڕیزەکانی (کاژیک)دا، بۆ (کوردستان)ێکی ئازاد و گەلێکی یەکسان هەوڵماندەدا و خەباتمانەکرد! تا ماوم، ئەو مێژووەم بیرناچێتەوە، ئەوە جاری دووەمیشبوو، لە ڕیزی ئەو پارتەدا خۆم ببینمەوە، هەرچەندە یەکەمین جار هیچ نەبوو، هەر باوەڕیشم پێی نەبوو، بەڵکوو بە گوشاری باوکم بوو، بەڵام ئەم جارە بە تەواوی، بە هەموو هێزی بیر و هۆشی خۆمەوە بوو، ئەو بیر و ڕێبازەم هەڵبژارد!

دوای ماوەیە وەڵامەمان بۆ هاتەوە و وەرگیراین. (عەلی) لێپرسراوی هەردووکمان بوو، چەن کۆبوونەوەیەکمان کرد، هێندێ بابەتی سەبارەت بە (یەکێتی خوێندکارانی نەتەوەیی کورد) بۆ باسکردین، زۆری نەخایاند، چووەدەرەوە و لە هێزی (خەبات) بوو بە لێپرسراوی دارایی هێز. دواکۆبوونەوە گوتی: هاوبیرێکی دیکە دێ و پێوەندیتان پێوە دەکا، ئیدی ئەو ڕۆژی.

**پرۆژەی ڕووناکبیری**

هەر لە منداڵیمەوە، زۆر حەزم لە خوێندنەوە و گوێگرتن لە هۆنراوەی کوردی کردووە، بەڵام هەرگیز ڕۆژێ لە ڕۆژان، نە دڵم لێیداوە، نە بیریشم لێ کردووەتەوە، ببم بە هۆنەر و تەنانەت یەک دێڕ هۆنراوەش بنووسم. بەڵکوو هەر لە ئەو کاتەوە هۆشمکردووەتەوە، پتر هۆگری خوێندنەوەی کورتەچیرۆک، ژیاننامە و بەسەرهاتی پیاوە ناسراوەکان بووم. دواتریش، کاتێ تەمەنم هەڵکشاوە، فێری زمانی عەرەبی بووم و لێی تێگەیشتووم، حەزم لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی (بیار ڕۆفایل، ئیحسان عەبدولقدوس، شارلۆت برۆنتی و ڤیکتۆر هۆگۆ) کردووە، بەڵام بیرم لە چیرۆکنووسین نەکردووەتەوە.

بە ڕاستی، بەرهەمەکانی (بیار ڕۆفایل)، بە تایبەتی (عندما تذوب الثلوج)، کاتێ بەفر دەتوێتەوە، (غدا يطل الربيع) سبەی بەهاردێ، کارێکی زۆریان لە هەست و هۆشم کرد. چیرۆکەکانی (ئیحسان عەبدولقدوس)یش، بە تایبەتی (فی بیتنا رجل) پیاوێ لە ماڵمان دایە، هەستی نەتەوەیی و نیشتمانپەروەری بەهێزترکردم. هیچ چیرۆکێکی دیکەش، هێندەی چیرۆکی (ئالحەرام)ی (یوسف ئیدریس) نەیهەژاندووم، چونکە دژی هەژاری و ستەمی کۆمەڵایەتی، دڵ و دەروونی کردمەوە و هەستی پاراوترکردم، هیچ نووسەرێکی دیکەش، هێندە کاری لە ویژدانی کۆمەڵایەتیم نەکردووە!

سەرەتای دەسپێکی نووسینیش، هەر بە نامەنووسین دەسپێکردووە، جگە لە ئەو نامانەی بۆ خۆمم نووسیوە، هێندێ جاریش، نامەی خۆشەویستیم، بۆ هێندێ هاوڕێی نزیکم نووسیوە. پاشان دەسم بە گوتارنووسین کرد و خوم پێوە گرت. ئیدی تا وردەوردە، لە بوارەکانی دیکەی نووسیندا توانیم، بە ئەو شێوەیەی پێویستە، ئەسپی پێنووسەکەم تاودەم، بەردەوامبووم!

بەڵام دوای ئەوەی پێوەندیم بە (کاژیک)ەوە کرد، چەن زانیارییەکم سەبارەت نەتەوەی کورد و خاکی (کوردستان)، دەوڵەتە داگیرکەرەکان و شێوازی خەبات، بیری نەتەوەیی و کاری ڕامیاری پەیداکرد، هەستم کرد و تێگەیشتم، ئەو ڕێکخراوانەی (کوردستان)، بە تەنیا ناتوانن، ئاسۆی بیری ئەندامەکانیان فراوانکەن و فێری زۆر شتی بەکەڵکیان کەن.

بۆیە بڕیارمدا، بەرنامەیەکی چڕوپڕی ڕووناکبیری بۆ خۆم دانێم و دەس بە خوێندنەوە بکەم. لە ماوەیەکی کەمدا توانیم، هێندێ لە ئەو بەرهەمانەی، لەسەر بیری نەتەوەیی نووسرابوون، وەک پەرتووکەکانی (ساتیع ئەلحەسەری، د. عەبدوڵڵا عەبدولدائیم، د. مونیف ڕەزاز، د. کەمال یوسف ئەلحاج) بخوێنمەوە. لە هەمان کاتیشدا کورتیانکەمەوە و پوختەکانیان بنووسمەوە، تا لە کاتی پێویستدا بیانخوێنمەوە و کەڵکیان لێ وەرگرم.

پاشان، دەستم بە خوێندنەوەی مێژووی کورد کرد، هەردوو پەرتووکی شەرەفنامەی (شەرەفخانی بەدلیسی) و مێژووی کورد و کوردستانەکەی (موحەممەد ئەمین زەکی بەگ)م خوێندەوە. جگە لە ئەوەی، بە شێوەیەکی بەردەوام و هاوتەریبیش، مێژووی ئەدەبی کوردی (عەلائەدین سەججادی)، شیعر و ئەدەبیاتی کوردی (رەفیق حیلمی)، گەلێ کۆهۆنراوەی هۆنەرە کلاسیکییەکانی کورد و بەرهەمەکانی دیکەی ویژەی کوردیم خوێندەوە. دواتریش بەرهەمەکانی نووسەر و هۆنەرەکانی دیکەی کوردی وەک: (گۆران، شێرکۆ بێکەس، کامیل ژیر)م بە تاسەوە دەخوێندەوە.

بە ڕاستی، کوردایەتییەکەی (کامیل ژیر) و وەڵامەکەی (جەمال نەبەز) بۆ (حەمەی مەلاکەریم)، کارێکی زۆریان لە بیروباوەڕی ڕۆڵەکانی کورد کرد. چونکە پەتای بڵاوبوونەوەی بیری بیانییەپەرستی، تانوپۆی کۆمەڵی کوردی تەنیبوو. دەتوانم بڵێم: هێندەم ئەو دوو بەرهەمە خوێندبووەوە، هێندێکیم هەر لەبەربوو. هەردوو کۆهۆنراوەکەی (شێرکۆ بێکەس)یش، تریفەی هەڵبەست و کەژاوەی گریان، جێی تایبەتی خۆیان، لە دڵ و دەروونمدا کردبووەوە. تەنانەت ئەو کاتە (شێرکۆ)م نەدەناسی، خواخوامبوو، ببینم و پێکەوە دانیشین، گوێ لە قسەکانی بگرم.

ئیدی بە تەواوی، وازم لە نووسینەکانی (پارتی) هێنا، گەرچی جگە لە هەردوو ڕۆژنامەی (خەبات) و (برایەتی)، گۆڤاری (ئەلکادر)یش بە چەن مانگێ ژمارەیەکی دەردەچوو، ئیدی هیچی دیکەی وایان نەبوو، مرۆ خۆی پێوە ماندووکا، ئەویش هیچی لێوە فێرنەدەبووی!

مارکسیزمیش وەک بیروباوەڕ و فەلسەفەی باوی ئەو سەردەمە، بەرانبەر بیری نەتەوەیی و ئایین، بایەخێکی زۆرم پێ دابوو. لەبەرئەوەی دەبووایە: لە دژەباوەڕەکەی خۆشم شارەزابم و لە بێژنگی بدەم، چی بەکەڵکی بزووتنەوەی کوردایەتی نەهاتایە، پشتگوێم دەخست و ئەوی باشیش بووایە، ئەوا کەڵکم لێ وەردەگرت. چونکە کورد خاوەنی خەرمانی بیر و فەلسەفەی نەبوو، یا هەیبوو، بەڵام لاوازبوو، بەرەقەتی ئەو هەموو بیر و فەلسەفانەی نەدەدا، کە بیریارە بەناوبانگە بلیمەتەکانی جیهان، بە زمانە جیاوازەکان نووسیبوویان!

بۆیە پێم وابوو، کورد دەبێ، کەڵک لە هەموو سەرچاوەکان وەرگرێ، لە هەر کوێ هەوای خاوێن و سازگار هەبێ، پێویستە هەڵیمژێ! لەبەرئەوە، بە شێوەیە خۆم دابووە گۆڤار و پەرتووک کڕین، پارەم بە دەستەوە نەمابوو، لە ماوەیەکی کەمیشدا، پەرتووکخانەیەکی خنجیلانەم لە ماڵەوە پێکەوەنا.

ئیدی دوای سالێ دەمتوانی، لە زۆربەی بوارەکانی مێژوو، نەتەوەیی، ڕامیاری و ڕووناکبیریدا، لەگەڵ بەرانبەرەکانمدا دەمەتەقێیکەم، بە شێوەیە هێندێ لە مارکسییەکان وایاندەزانی، من یەکێ لە بیریارەکانی بیری نەتەوەییم، تەنانەت هێندێ برادەری وەک (حەمەی شێخ کەریم، حەمەعەلی حەمەمووراد و وریا براخاس) پێیان دەگوتم: (مسەقەف سەریع)، بە تایبەتی (حەمەی شێخ کەریم)، چونکە ماوەیەکی زۆر، لە (پارتی کۆمۆنیستی عێراق)دا کاریکردبوو، لە هەموومان وریا و زیرەکتر بوو!

دوای ئەوەش، هەر زوو هەوای نووسین لە کەللەی دام، جاروبار شتێکی کورتم دەنووسی و پیشانی برادەرانم دەدا. یەکەمین جار، لە وەڵامی چاوپێکەوتنێکی (دڵزار)ی هۆنەردا، گوتارێکم نووسی، کە لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)دا بڵاوکرابووەوە. بەڵام من نووسینەکەی خۆم، بۆ (برایەتی) نارد، چونکە ئەو کاتە (پارتی) بووم، پێم وابوو، (هاوکاری) سەر بە ڕژێمە و کوردپەروەری ڕاستەقینە نابێ، شتی تێدا بڵاوکاتەوە! کەچی (ڕەفیق چالاک)، لە گۆشەی پۆستەی نووسەراندا وەڵامیدابوومەوە و نووسیبووی: بە داخەوە ناتوانین، گوتارەکەت بڵاوکەینەوە، چونکە چاوپێکەوتنەکەی (دڵزار)، لە ڕۆژنامەیەکی دیکەدا بوو، گەر تۆ هێندە ڕۆشنبیری، بۆ تا ئێستە هیچت دیار نییە؟! بە ڕاستی، ئەو ڕستەیەی دوایی، کاریتێکردم و دەستم بە نووسین کرد.

ئەو کاتە (کەمالی جەمال موختار) و ڕەوانشاد (ئەریمانی فوواد مەستی)، لە (برایەتی) کاریاندەکرد، ئەوان گوتارەکەیان برد و هەر ئەوانیش پێیان گوتم: ئەو وەڵامە (چالاک) بوو.

بەڵام دوایی، کۆمەڵێ گوتارم بۆ ناردن، بە ناوی (دۆستێک)ەوە نووسیبووم و هێندێکیان بڵاوکردەوە. لە گۆڤاری (ئەستێرە)ی ساوایانیشدا، هەر فریای گوتارێ کەوتم، لە ژمارە (2)دا بڵاویکەمەوە و بۆ منداڵانی بنووسم، ئیدی جەنگ دەستیپێکردەوە و هەڵاتم!

ئەوا لێرەدا، بەرگی یەکەمی کەڵاوەرییەکانی درەختی ژیانی تایبەتی خۆمم تەواوکرد، پێشکەشی بە هاوڕێیان و هاونەتەوەکانی خۆمی دەکەم، بە ئەو هیوایەی، چێژی لێ وەرگرن و کەڵکێکی هەبێ، لە هەمان کاتیشدا هیوادارم، ئەو هەڵانەی لە ژیانی خۆمدا کردوومن، ئەوان نەیکەن و لێی دوورکەونەوە!

ئێستەش، بەگوێرەی تەسکەرەبێ، تەمەنم (65) ساڵە، ئاخۆ مەرگ مەوداددەدا، بەرگی دووەمیش بڵاوکەمەوە؟!! ئیدی ئێوە و بەرگی یەکەمی بەرهەمەکەم لەبەردەستان دایە و ڕێزی بێ ئەندازەشم، قەبووڵ بفەرموون!

* * *

## درەختی بنەماڵەی
## (حاجی شێخ عەزیزی شێخساڵحی شێخ حوسێنی باراوی)

باپیرە و داپیرە، (4) کوڕ (موحەممەد، بەکر، عومەر، ساڵح) و (4) کچ (سەبیحە، مەلیحە، فاتمە، نەسرین)یان بووە. هەر یەکێ لە ئەم منداڵانەش، کۆمەڵێ نەوەیان خستووەتەوە و نەوەکانیشیان، کۆمەڵێ منداڵی دیکەیان بووە. ئیدی بە ئەو شێوەیە زیادیانکردووە و بنچینەی بنەماڵەکەیان دامەزراندووە. لە ئەنجامیشدا، لە ئەندامانی بنەماڵەکە، (96)یان کوڕ و (72)شیان کچ بوون. واتە بە هەموویان، تا ئەمڕۆ (168) کەسن. بێگومان بووک و زاوا نەژمارنەکراون، چونکە لە نەوەی (شێخ عەزیز) نین!

یەکەم: موحەممەد (1924–2008)

1. حەسەن: شاکۆ، ژینۆ، ژیانۆ، ئارەزوو.
2. حوسێن.
3. شەوقم: هەردی، خۆشی، هەریەم، هێڤار. (خۆشی: ساریا و ئاریا)
4. سەلاح: هاوری، ئێلێی.
5. بارزان: پاڵێڵ، پاوان.
6. گاوان: رابەر، رۆژا.
7. سۆران: رێژوان، لاڤۆ.
8. کامەران: دیلان، دیە.
9. شنە: سافا.

دووەم: بەکر (1934 — 2009)

1. حەمەعەلی: پەرزی، پەهات و شایان.
2. عەزیز: موحەممەد، گلزاق، باخان وگوڵان.
3. عەبدولڕەزاق: ئەحمەد، سارا و سافا.
4. عەبدولجەبار: ئەحمەد.
5. پێشڕەو: رەوا.
6. ئاسۆ.
7. بەفرە.

8. پەخشان: ڕەوەز و ڕەوەند.

9. ئەیلا: نوها، شادی و عەبدولڕەحمان.

سێیەم: عومەر (1938– 2016)

1. مهاباد.
2. شاهۆ.
3. میهرەبان.
4. شامیل: شانیا.
5. جوانە.
6. ژیان.
7. شوان: ڕێحانە.
8. شۆڕش.
9. هێرش: لیقە.

چوارەم: سالح (1942–2011)

1. ئەحمەد: مەروا، میر.
2. شالیا: ئۆسکار، سافە.
3. موحەممەد: سارا.

پێنجەم: سەبیحە (1927– )

1. دلاوەر: ئەڤین، بێریڤان، کازیوە، سۆکار، سابات، عومەر.
   - ئەڤین: سنایی، ڕۆنیا، موحەممەد.
   - سۆکار: موحەممەد، مەیلی.
   - کازیوە: یامور.
   - سابات: لاوێ.
   - عومەر: ئاریێز
2. موعلا: نیگار، ڕۆژگار، هاوکار، هاوژین، هەڵکەوت، پێشکەوت، ڕێکەوت، هەڵوێست.
3. سیروان: مەریەم، هەرێز، هێڤی.
4. دلشاد: نیشان، ڕشتی و پاڵەوان.
5. دلێر: سۆما و موحەممەد.

6. دیاری: ڤینک.

شەشەم: مەلیحە (1929- 2011)

1. عەقاب: ئاران، یارە
2. پرشنگ.
3. مژدە: ئاسەد، ئاروز، ئارش.
4. ئەحمەدە: پاڤێل، یارۆ - دالین.
5. شاخەوان: میوان - دیلان.
6. شادمان.
7. پشتیوان.

حەوتەم: فاتمە (1940- 2017)

1. سەعادەت: ئاران و یارە.
2. حامید: ئەڤیار و ئانو.
3. سەعیدە: ئەرین و لەرین
4. ئەسعەد: دارین و دانیار.
5. سەحەر: ئارۆ و ئارێن.
6. رەنگین: لیڤە و لالۆ.
7. ئەحمەد: پۆلۆ.

هەشتەم: نەسرین (1949- )

1. سۆزان.
2. ژاڵە: ساڤیا، ساوان.
3. جوانە: شڤان، ئیڤان، ئالی.
4. رازاو:
5. کاژاو.
6. دانا: لیڤە.

* * *

دره‌ختی بنه‌ماڵه‌ی شێخانی (باراو)، پتر له‌ (200) ساڵ له‌مه‌وپێش،
(شێخ مارفی نۆدێیی) په‌سه‌ندیکردووه‌.



## ئەلبوومی وێنەی بنەماڵەی ( حاجی شێخ موحەممەدی شێخ عەزیز )



1964 - 1963



2006 - 2005



لە ژوورەکەی خۆی ئەو کاتەی سەرۆکی بریتیپێچان بوو ( 08. 10. 1967 )



1973 – 1972



شةوتم ( 1953 - )



سةلاح ( 1956 - )



بارزان ( 1961 - )



كاوان ( 1963 - )



سۆران (1964- )



کامەران (1968 - )



شنە (1972 - )

## قۆناغەکانی ژیانی خۆم بە وێنە



سالی ( 1950 ) لە تەمەنی سێ مانگیدا، لەگەڵ ( زیباری نووری بەگ ی شێربرام لە ( پێنجوێن )، لە تەنیشت منەوە دایکم دەسی بە پشتمەوە گرتووە.



( پێنجوێن ) لە تەمەنی دە سالیدا ( 1960 )



(سوله یمانی) له تەمەنی سیازده ساڵیدا (1963)



(سەرچنار) له تەمەنی پازده ساڵیدا (1965)



سەرچنار سالی ( 1967 )



ئامادەیی کشتوکالی بەکرەجۆ ( 1968 )



باخی گشتی سەرە یمانی، پۆلی دووی کۆلێژی کشتوکاڵ ( 1972 )



( پێنجوێن ) هێزی خەبات ( 1974 )



( نەمسا ) کۆتایی سالی ( 1981 )



شاری ( کیشینیۆ ) یەکێتی سۆڤێت ( 1983 )



سوله یمانی ساڵی ( 1999 )




سوله یمانی ساڵی ( 2006 )




دەربەندی بازیان ساڵی ( 2009 )



( سولەیمانی )، ڕێستۆرانی ( ڕەمادە ) ئێوارەی ڕۆژی ( 6. 12. 2014 )

# بەرهەمە بلاوکراوەکانی نووسەر

## زمانەوانی

01. سەلیقەی زمانەوانیی و گرفتەکانی زمانی کوردیی، چ1، سولەیمانیی، 1999، چ2، سولەیمانیی، 2005، ل591.

02. هێندێ بابەتی زمانەوانیی و وێژەیی، بەرگی1، چ1، 2006، ل297 .

03. هێندێ بابەتی زمانەوانیی و وێژەیی، بەرگی 2، چ1، 2015، ل204 .

## وێژە

04. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی1، چ1 سولەیمانیی، 2003، ل 27 .

05. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی2، چ1، سولەیمانیی، 2004، ل227.

06. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی3، چ1، سولەیمانیی، 2007، ل317 .

07. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی4، چ1، سولەیمانیی، 2013، ل529.

08. یاقووت و زمڕووتی کوردیی، بەرگی5، چ1، سولەیمانیی، 2015، ل757.

## ڕۆژنامەنووسی

09. پێنج کاتژمێر لەگەڵ براییم ئەحمەددا، چ1، سوید، 1995. چ2، سولەیمانیی، 1996، چ3، سولەیمانیی، 2002، ل139.

10. نامەیەکی درێژ بۆ نەوشیروان مستەفا، چ1، سوید، 1995. چ2، سولەیمانیی، 2006، ل70.

11. خولانەوە لە بازنەیەکی بۆشدا، چ1، سوید، 1997. چ2، سولەیمانیی، 2002، ل165.

12. سنوورە قەدەغەکان مەشکێنن، چ1، سولەیمانیی، 2003، ل249.

## یاد و بیرەوەری

13. مەسعوود موحەممەد و دوو دیداری دۆستانە، چ1، سولەیمانیی، 2002، ل81.

14. شێرکۆ بێکەس، بیرەوەریی و یاد، سولەیمانی، 2013، ل296.

15. بارانی خوێن و بای مەرگ، چ1، چاپخانەی موکریان، هەولێر،2015، ل210.

16. گەڵاوەریوەکانی درەختی تەمەنم، بەرگی1، چ1، چاپخانەی ڕۆژهەڵات، هەولێر، 2015، ل 352.

17. دوکتۆر کوردۆ هەڵی یاد و بیرەوەری ( 46 ) ساڵی تەمەن، چ1، چاپخانەی کارۆ، سولەیمانی، 2017، ل 106 .

## سائیر

18. بەڵێ لێکۆڵینەوە و ڕەخنە نەك شێواندنی ڕاستیی، چ1، سوید، 1996، ل53.

19. خلتەی بیرێکی ئازادیی، چ1، سولەیمانیی، 2000، ل296.

20. دیدی نەتەوەیی و نانەتەوەیی، چ1، سولەیمانیی، 2007، ل336.

21. نووسەری ساختە، چ1، سولەیمانیی، 2008، ل263.

## کۆمەڵناسی

22. ڕۆڵی سیستێمی بنەماڵە لە بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتمانیی کوردستاندا، چ1، سوید، 1997،
چ2، سولەیمانیی، 2001، ل116.
23. ئێمە بۆ واین، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2003، ل233.
24. دەربارەی کێشەکانی خۆشەویستیی و ژیانی هاوسەریی، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2011، ل100.

## مێژوو

25. کورد و شۆڕش و هەلی مێژوویی، چ1، سوید، 1996. چ2، کوردستان، 2000، ل351.
26. پەیمانێکی ڕەش و ڕۆژێکی سوور، چ1، سولەیمانیی، 2003، ل121.

## جوگرافیا و جیۆپۆلیتیک

27. گرفتە سەرەکییەکانی کورد، چ1، سوید، 1998. چ2، سولەیمانی، 2000، ل82.
28. شەکرە شارەکەم سولەیمانیی، چ1، سولەیمانیی، 2003، ل151.

## ڕامیاری و نەتەوەیی

29. دەربارەی پرۆژەکەی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان، چاپی1، سوید، 1994، ل32.
30. دوا پرۆژە، چ1، سوید، 1994، ل11.
31. پێنج ووتاری غەمگین، چ1، سوید، 1994، ل77.
32. دیمۆکراسیی، ئایدۆلۆژیی و جەنگی نێوخۆ، چ1، سوید، 1994، ل84.
33. ململانێی ئایدۆلۆژیی لە کوردستاندا، چ1، سولەیمانیی، 1993. چ2، سوید، 1995، ل125.
34. فیدرالیزم و دەوڵەتی فیدراڵ، چ1، سوید، 1996. چ2، سولەیمانیی، 1996. چ3، سولەیمانیی، 2004، ل142.
35. ئۆجەلان ئەزموونێکی نوێ و پەندیی مێژوویی، چ1، سوید، 1999. چ2، سولەیمانیی، 1999، ل104.
36. حەوت گوتاری قەدەغەکراو، چ1، چاپخانەی ئەزمەڕ، سولەیمانیی، 2004، ل122.
37. برایەتی درۆزنانە، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005، ل223.
38. کورد و کێشەی کەرکووک، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2005، ل135.
39. دۆزەخی ژێردەسیی، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2006، ل189.
40. هێندێ پەتای کوردکوژە، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2009، ل204.
41. بزووتنەوەی گۆڕان بەرەو کوێ؟ چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2010، ل90.
42. کێشەی کورد و ئایندەی کوردستان، چ1، چاپخانەی سیما، سولەیمانیی، 2013، ل198.

* * *

## پوختەی ناسنامەی نووسەر



ساڵی ( 1950 )، لە شارۆچکەی ( پێنجوێن ) لەدایکبووە. هەموو قۆناغەکانی خوێندنی، لە شاری ( سولە یمانی ) تەواوکردووە.
ساڵی ( 1976 )، لە کۆلیژی کشتوکاڵی زانکۆی ( سولە یمانی )، بە پلەی بەرز دەرچووە و و ساڵی ( 1977 )یش، هەر لە هەمان کۆلێژ، بە مامۆستا دامەزراوە. پاشان لەبەر گەلێ هۆی تایبەتی، رووی لە دەرەوەی وڵات کردووە و لە ( یەکێتی سۆڤیێت ) گیرساوەتەوە، تا سەرەتای ساڵی ( 1987 )، بڕوانامەی دوکتۆرای بە پلەی بەرز، لە زانستی کشتوکاڵدا وەرگرتووە. لە ساڵی ( 1988 )یشەوە، وەک پەنابەری رامیاری لە ( سوید ) ژیاوە.
هەر لە سەرەتای لاوێتیشەوە، لە ڕیزەکانی ( ی. ق. ك. ) و ( پ. د. ك. )دا، تێکەڵی کاری رامیاری و خەباتی کوردایەتی بووە. پاشان ساڵی ( 1970 )، لە ڕیزەکانی ( کاژیك ) و ( پاسۆك )دا، درێژەی بە خەبات و چالاکی رامیاری و نەتەوەیی داوە. تا دوا جار، لە ساڵی ( 1981 )ەوە و تا ئەمڕۆش، بە تەواوی وازی لە کاری پارتایەتی هێناوە و ئەندامی هیچ جۆرە پارتێکی رامیاری نییە.
نووسەر تا ئێستە، بە دەیان گوتاری لە رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی نێوەوە و دەرەوەی وڵاتدا بڵاوکردووەتەوە، پتر لە ( 50 ) کۆڕی رامیاری، نەتەوەیی، زمانەوانی، وێژەیی و کۆمەڵایەتی، لە وڵاتەکانی ( ئەورووپا ) و ( کوردستان ) گرتووە. ( 43 ) نامیلکە و پەرتووکی بڵاوکردووەتەوە و بە هەمووشی نزیکەی ( 10.000 ) لاپەڕەی نووسیوە..
ساڵی ( 2005 )، بە یەکجاری گەڕاوەتەوە بۆ ( کوردستان )، لە زانکۆی ( سولە یمانی ) بە مامۆستا دامەزراوەتەوە و پاشان ساڵی ( 2016 ) خانەنشینکراوە. ساڵی ( 2007 ) سەرنووسەر و لێپرسراوی زمانەوانی گۆڤاری ( چەرمۆ ) بووە، کە گۆڤارێکی وەرزانەی ئەکادیمی، کۆمەڵایەتی و کەلتووری بوو، فاکەڵتی زانستە کشتوکاڵییەکانی زانکۆی سولە یمانی، بە زمانی کوردی دەریدەکرد و تا خانەنشینیشکرا، ( 28 ) ژمارەی لێ دەرکردووە.

* * *



وەك هەموو مێردمناڵێكی كورد، چاوم بە ڕاونان، گرتن، كوشتن و برین هەڵهێناوە، گوێم بە دەنگی هاواری لیقەوماوان و جەرگسووتاوان زرنگاوەتەوە، ( پارتـی ) ڕووگە و ( بارزانـی ) پەیامبەری كوردایەتیم بوون،( كوردستان ) لانەی بەهەشت و كوردیش برای ڕەسەنم بوون، بە تایبەتـی، دوای ئەوەی شۆڕشی ( 11. 09. 1961 ) بەرپابوو، وەك چۆن دەروێشێكی خاوەن باوەڕی گەورە، بڕوا بە شێخەكەی دەكا، منیش هەر بە ئەو چەشنە، تەلیسمی خۆشەویستـی نیشتمان و نەتەوەكەم كاریتێكردبووم، بەڵام كارەساتی دووبەرەكیی ساڵی ( 1964 )، هەر زوو لە ئەو خەونە خۆشە ڕایچڵەكاندم و هەموو گوڵی هیواكانیشمی، هەر بە خونچەیی هەڵوەراند!

گرفتەكە لە ئەوەدا نییە، ساڵ بە ساڵ گەڵاكانی تەمەنی مرۆ هەڵدەوەرن، بەڵكوو گرفتەكە لە ئەوە دایە، مرۆ چۆن هەوڵیدا، ئەو گەڵایانەی هێشتا هەڵ نەوەریون، بە خێرایی هەڵ نەوەرێن! چونكە گەر مرۆ بە هەمان بیركردنەوە و بۆچوونەوە، لە گەڵاكانی تەمەن بڕوانێ، ڕوویەڕووی ڕووداوەكانی ژیان ببێتەوە، ئەوا ئەو گەڵایانەی ماویشن، وەك ئەوانەی بە خێرایی هەڵوەرین، ئەوانیش هەڵدەوەرێن!

# THE FALLEN LEAVES OF THE TREE OF MY AGE

## Dr. Hussein M. Aziz

## 2018 - 2719